





# كاریگەرییا لاساییكرنێ لسەر وێنەیێ شعرا كلاسیكییا كوردی

كامەران ابراهیم خلیل




## سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

| | |
|---|---|
| پەرتووك | **کاریگەرییا لاساییکرنێ لسەر وێنەیێ شعرا کلاسیکییا کوردی** |
| نڤێسەر | د. کامەران ابراهیم خلیل |
| چـــاپ | ئێکێ/ ٢٠١٩ |
| دیزاین و بەرگ | وارهێل عبدالباقی<br>دیـــار عـەبـدوڵڵا |
| ISBN | ٩٧٨-٩٩٢٢-٩٠٨١-٦-٨ |
| ژمارا سپاردنێ | ١٩ / ٢٣٠١٧ / - D |






zcks@uoz.edu.krd +964 (0) 751 536 1550
Iraq-Kurdistan Region, Zakho- Univesity of Zakho

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بۆ ڤەکولینێن کوردی

# کاریگەرییا لاساییکرنێ
# لسەر وێنەیێ شعرا کلاسیکییا کوردی

د. کامەران ابراهیم خلیل

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بۆ ڤەکولینێن کوردی

لاساییکرن ئێکە ژ کەڤنترین باسێن ڤەکۆلینا ئەدەبی، گەلەك ڤەکۆلەر و نڤیسەران ل ژێر ناڤونیشانێن جودا و ب بیر و نێرینێن جۆراوجۆر باسێ ڤی بابەتی کریە. لاساییکرن د ئەدەبیاتناسیا رۆژئاڤاییدا ب تنێ دیاردەکا ئەدەبی نینە، بەلکو ژ لایەکیڤە تیۆرەکە کو بۆ ماوەیەکێ درێژ بۆ شرۆڤەکرنا ئەدەبیاتێ پشتبەستن لسەر هاتیەکرن و ژ لایەکێ دیڤە رێبازەکە کو نڤیسەران باوەری پێ هەبوویە و لسەر بناغەیێ وێ بەرێخۆدابنە شاکارێن ئەدەبیێن بەری خۆ و گەلەك رەخنەگران هەولێن خۆ تەرخانکرینە بۆ جێگیربوون و بەردەوامبوونا وێ. دیارە لگەل سەرهلدانا ئیسلامەتیێ، ل رۆژهەلاتێ ژی لاساییکرنەکا شعری کو سەروکانییا وێ قەسیدەیا عەرەبیە دهێتە دیتن. ڤێ لاساییکرنێ ژی رێرەوێ خۆ یێ تایبەتی هەیە و شاعر و رەخنەگرێن رۆژهەلاتا ئیسلامی پێکڤە بەشداریێ تێدا دکەن.ب شێوەیەکێ گشتی شعرا کلاسیکییا کوردی ژی بەشەکە ژ ڤی رێرەوی، لەوما گەلەك ئەدگارێن وێ بریتینە ژ تایبەتمەندیێن لاساییکریێن شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی. وێنەیێ شعریێ شعرا کلاسیکییا کوردی ژی ژ گەلەك لایانڤە پەیوەستە ب ڤێ لاساییکرنێڤە، لاساییکرنەك کو پرانیا جاران رەهـ و ریشالێن وێ بۆ قەسیدەیا عەرەبی وقەسیدەیا فارسییا سەبکێ خوراسانی دزڤریت.

**ـ گریمانەیا ڤەکۆلینێ:**

ل رۆژهەلاتا ئیسلامی رێرەوەکێ لاساییکرنا شعری هەیە و شعرا کلاسیکییا کوردی ژی بەشەکە ژ ڤی رێرەوی؛ ڤێجا چێدبیت گەلەك ژ تایبەتمەندیێن وێنەییێن شعرا کلاسیکییا کوردی بەرهەمێ ڤێ لاساییکرنا شعرییا رۆژهەلاتا ئیسلامی بن.

**- گرنگییا ڤەکۆلینێ:**

دگەل خویابوون و بەلاڤبوونا ئیسلامەتیێ تێکەلیەکا رۆشنبیری و ئەدەبییا بهێز دناڤبەرا مللەتێن رۆژهەلاتا ئیسلامیدا پەیدابوویە و بوویە بناغەیێ سەرهلدان و دەرکەڤتنا دیاردە و بەرهەمێن جۆراوجۆر. شعرا کلاسیکییا کوردی ژی وەکو بەشەك ژ ئەدەبیاتا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی ژ ڤالاتیێ نەهاتییە، بەلکو ژبلی ئەو پەیوەندییا کو لگەل ئەدەبێ فلکلۆری و مللی هەیی، تا رادەیەکێ زۆر پەیوەستە ب لاساییکرنا شعرا کلاسیکییا فارسی و عەرەبی. گرنگییا ڤێ ڤەکۆلینێ ژی ئەڤەیە کو دخوازیت ژ ڤێ گۆشەنیگایێ بەرێخۆبدەتە شعرا کلاسیکییا کورد و چەمکێ لاساییکرنێ ژ چارچووڤێ پەیوەندییەکا دوو لایەنە و چەمکێ دزیا شعرییا باو د ئەدەبیاتا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی دەربێخیت و وێ وەکو دیاردەکا مێژوویی و خودان رێرەو نیشان بدەت.

خالەکا دیا گرنگ د ڤێ ڤەکۆلینێدا ئەوە کو شعرا چ دیالێکتێن دیارکری نەبوویە ئامانجا ڤەکۆلینێ، بەلکو شعرا کلاسیکییا کوردی ب گشتی بوویە جهێ گرنگیپێدانێ، ڤەکۆلین شیایە ب رێکا گرێدانا شعرا کلاسیکییا کوردی ب شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی هندەك ئەدگارێن باوێن وێنەیێ شعرا کلاسیکییا کورد دەستنیشان بکەت.

گرنگییەکا دیا ڤێ ڤەکۆلینێ ئەڤەیە کو دشێت ببیتە دەروازەیەك بۆ ئەنجامدانا ڤەکۆلین و دویڤچوونەکا بەرفرەه بۆ راستڤەکرن و گۆهرینا رێکار و ئالاڤێن رەوانبێژییا عەرەبی - ئیسلامی کو هەتا نهۆ ژی بۆ شرۆڤەکرنا شعرێ دهێنە بکارئینان و نەشێن ب دروستی خزمەتا وێنەیێ شعرا کلاسیکییا کوردی بکەن.

ـ ئامانجا ڤەكۆلینێ:

ب شێوەیەكێ گشتی ئامانجێن ڤەكۆلینێ بریتینە ژ:

١. دیاركرنا چەمك و رۆلێ لاساییكرنا ئەدەبی و كاریگەرییێن وێ.

٢. دەستنیشانكرنا رێرەوێ لاساییكرنا شعرێ ل رۆژهەلاتا ئیسلامی و دیاركرنا جهێ شعرا كلاسیكیا كوردی د ڤی رێرەویدا.

٣. دیاركرنا چەوانیا سەرهلدان و جێگیربوونا ئەدگارێن وێنەیێن لاساییكرییێن شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی و چەوانیا هاتنا وان بۆ ناڤ شعرا كوردی ب رێكا لاساییكرنێ.

٤. پیشاندنا ئەدگارێن لاساییكرییێن وێنەیێ شعرا كلاسیكیا كوردی.

٥. نیشاندانا كاریگەرییا لاساییكرنێ لسەر ئاڤابوون و پێكهاتە و شێوەیێ وێنەیان د شعرا كلاسیكیا كوردیدا.

ـ سنوورێ ڤەكۆلینێ:

ژبەر ڤێ چەندێ كو ئەو لاساییكرنا ئەم باس ژێ دكەین، خودان رێرەوەكێ مێژوویيە، لەوما سنوورێ ڤەكۆلینێ بەرفراوانە. لایەنێ تیۆرییێ ڤەكۆلینێ پەیوەستە ب رێرەوێ لاساییكرنێ كو ژ قەسیدەیا جاهلییا عەرەبی دەستپێدكەت و شعرا كلاسیكیا فارسی ب خۆڤەدگریت و دگەهیتە شعرا كلاسیكیا كوردی. لایەنێ پراكتیكی ژی چ شاعرێن دەستنیشانكری ناكەتە ئامانج، بەلكو شعرا كلاسیكیا كوردی ب شێوەكێ گشتی دبیتە كەرستەیێ ڤەكۆلینێ. ئەڤ ڤەكۆلینە، كو د بنەرەتدا نامەیەكا دكتۆراییێیە.

ـ رێبازا ڤەكۆلینێ:

د ڤێ ڤەكۆلینێدا پتر پشتبەستن لسەر میتۆدا وەسفی ـ شرۆڤەكاری هاتیەكرن.

**- پلانا ڤەکۆلینێ:**

ئەڤ ڤەکۆلینە ل ژێر ناڤونیشانێ (کاریگەرییا لاساییکرنێ لسەر وێنەیێ شعرا کلاسیکییا کوردی) هاتیە پێشکێشکرن و لسەر سێ بەشان هاتیە دابەشکرن:

**پشکا ئێکێ:** ئەڤ پشکە ل ژێر ناڤونیشانێ (چەمک و ڕەهەندێن لاساییکرنا ئەدەبی) لسەر حەفت باسان هاتیە پارڤەکرن، باسێ ئێکێ واتە (خویابوون و جێگیربوونا زاراڤێ لاساییکرنێ د ڤەکۆلینێن ئەدەبیێن ڕۆژئاڤاییدا) تایبەتە ب پێداچوونەکا کورت لسەر تیۆرا لاساییکرنا ڕێبازا کلاسیزمی و چەوانیا گۆهرینا ئاراستەیا لاساییکرنا ئەرەستویی یانکو میمێسا وی بۆ لاساییکرنا بەرهەم ونموونەیێن بەرێ، ل ڤێرێ ب کورتی باسێ نێرینا ڕەخنەگر و ڤەکۆلەرێن کلاسیکی بۆ بابەتێ لاساییکرنێ هاتیەکرن. باسێ دوویێ واتە (زاراڤێن نێزیک ژ لاساییکرنا ئەدەبی) هەولدانەکە بۆ دەستنیشانکرنا زاراڤێن نێزیک ژ لاساییکرنێ و پێشاندانا ڤێ ڕاستیێ کو سەرەرای هەبوونا هندەك تایبەتمەندییێن جیاواز لێ گەلەك جاران ئەڤ زاراڤە ژی تارادەیەکێ زۆر هەڤواتا لاساییکرنێنە. باسێن سێیێ و چوارێ و پێنجێ ژی تایبەتن ب پێشاندانا نێرین و ڕێکارێن مێژوویا ئەدەبی و ئەدەبێ بەراورد و هەڤتێکستیێ ل هەمبەر لاساییکرنا ئەدەبی. باسێ شەشێ ژی هاتیە تەرخانکرن بۆ بەرجستەکرنا وان فاکتەران کو هاریکارن بۆ بهێزبوونا لاساییکرنێ، دویماهک باس ژی لدور دەستنیشانکرنا کاریگەرییێن نێگەتیڤێن لاساییکرنا ئەدەبیە.

**پشکا دوویێ:** ل ژێر ناڤونیشانێ (لاساییکرن د شعر و ڕەخنەیا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا)، لسەر دەروازەیەك و دوو باسێن سەرەکی هاتیە دابەشکرن. باسێ ئێکێ (ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی)، هەولدانەکە بۆ دەستنیشانکرنا ڕێرەوێ مێژوویێ لاساییکرنا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی هەتا دگەهیتە شعرا کلاسیکییا کوردی. ئەڤ باسە چەند سەرەبابەتان ب خۆڤە دگریت کو ئەو ژی بریتینە ژ ئەو قوناغێن کو تێدا نموونەیا لاساییکریا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی هاتیە چەسپاندن. ل ڤێرێ گرنگی ب ڕۆلێ شاعران د بەردەوامیدان ب لاساییکرنا

ئەدگارێن قەسیدەیێ کو سەروکانییا لاساییکرنا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیە هاتیە دان، زێدەباری ڤێ چەندێ ئاماژە ب هندێ ژی هاتیەدان کو ل هەر قوناغەکێ ب تایبەت د شعرا فارسی و کوردیدا، ئاراستەییێن وەها ژی هەبووینە کو هەولا دەرکەفتن ژ چارچووڤێ لاساییکرنێ داینە. هەر وەسا باسێ سێ فاکتەران هاتیە کرن کو شیاینە هندەك گۆهرینان بێخنە لاساییکرنا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی، ئەڤ سێ فاکتەرە ژی بریتینە ژ قالبێن ئەدەبیێن جودا ژ قەسیدەیێ و بەرهەمێن داستانی و سۆفیگەریێ. باسێ دوویێ واتە (ڕۆلێ ڕەخنەیا عەرەبی - ئیسلامی د لاساییکرنا شعریدا)، تایبەتە ب نیشاندان و بەرجستەکرنا ڤێ چەندێ کو چەوا ڤەکۆلینێن ئیسلامی خزمەتا چەسپاندنا ئەدگار و تایبەتمەندیێن قەسیدەیێ وەکو تاکە قالبێ زال لسەر شعرا عەرەبییا جاهلی کریە، جەخت لسەر ڤێ چەندێ هاتیەکرن کو ب تنێ شاعر بەشەك نەبووینە ژ لاساییکرنا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بەلکو ڤەکۆلینێن ئیسلامی و ب تایبەت ڤەکۆلینێن ڕەوانبێژیێ ڕۆلەکێ مەزن د ڤی بواریدا هەبووینە. ل ڤێرێ باسێ ڕۆلێ ڤان ڤەکۆلیناندا د لاساییکرن و پاراستنا ئەدگارێن وێنەیێن قەسیدەیا عەرەبی و ڤەگوهاستنا وان بۆ ناڤ شعرا فارسی و مللەتێن دیێن ئیسلامی ژی هاتیەکرن.

**پشکا سێیێ** واتە (کاریگەرییا لاساییکرنێ لسەر وێنەیێ پاژەیی و گشتیێ شعرا کلاسیکییا کوردی) گرنکیێ ددەتە ئەو ئەدگار و تایبەتمەندیێن وێنەیێ شعرا کلاسیکییا کوردی کو بەرهەمێ لاساییکرنا نموونەیێن بەرێنە، لێ نە لاساییکرنەکا دوولایەنەیا سنووردار، بەلکو لاساییکرنەك کو ڕەهـ و ڕیشالێن وێ بۆ ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دزڤریت، واتە ئەو لاساییکرنا کو شاعر و ڤەکۆلینێن شعری و ڕەخنەیێن کەڤن هەولا پاراستن و بەردەوامیدانا وێ داینە. ئەڤ بەشە لسەر دەروازەك و دوو تەوەرێن سەرەکی هاتیە دابەشکرن، ل تەوەرێ ئێکێ کو چەند سەرەبابەتان ب خۆڤەدگریت، باسێ کاریگەرییا لاساییکرنێ لسەر وێنەیێن پاژەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی هاتیەکرن. ئەڤ تەوەرە ژی لسەر دوو سەرەبابەتێن سەرەکی هاتیەدابەشکرن، ل دەستپێکێ لژێر ناڤونیشانێ (لاساییکرنا

وێنەیێن شعرا کەڤن وەك ژێدەرێ سەرەکیێ ئاڤاکرنا وێنەیان)، گرنگی ب کاریگەرییا لاساییکرنێ لسەر ئەدگار و تایبەتمەندی و ژێدەرێن وێنەیێ شعرا کلاسیکییا کوردی هاتیەدان. سەرەبابەتێ دوویێ ژی کو چەند بابەتان بخۆڤەدگریت هاتیە تەرخانکرن بۆ نیشاندانا کاریگەرییا لاساییکرنا سیستەمێ روونبێژی و وێنەسازیا شعرا کەڤن لسەر شعرا کلاسیکییا کوردی. ل تەوەرێ دوویێ باسێ کاریگەرییا لاساییکرنێ لسەر وێنەیێ گشتیێ شعرا کلاسیکییا کوردی هاتیەکرن. ئەڤ تەوەرە ژی سێ سەرەبابەتان بخۆڤە دگریت، ل دەستپێکێ باسێ رۆلێ لاساییکرنا مەبەستێن شعری د بەردەوامبوونا وێنەیەکێ گشتیێ لاساییکریدا هاتیە کرن، پاشی د دوو بابەتان دا باسێ وان ئەدگارێن لاساییکرییێن شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی هاتیەکرن کو دبنە ئەگەرێ لاوازبوونا پەیوەندییا د ناڤبەرا وێنەیان د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا و وێنەیێ گشتیێ شعرا کلاسیکییا کوردی بەرەڤ لاوازییێڤە دبەن، ئەڤ دوو ئەگارە ژی بریتینە ژ سیستەمێ قەسیدەیا کەڤن ـ فرەمەبەستی و ئێکەتیا تاکەدێرێ.

## ـ ئاستەنگێن ڤەکۆلینێ:

باسکرنا لاساییکرنێ بوو ئەگەر کو ئەم توشی کێشەیا زاراڤان ببین، دیارە ئەڤ کێشەیە ژی چەندین رەهەندان ب خۆڤە دگریت و ب تنێ تایبەت نینە ب رەخنەیا کوردیڤە، بەلکو بەری هەر جهەکی ئەڤ گرفتە د رەخنە و ڤەکۆلینێن رۆژئاڤاییدا دهێتە دیتن؛ ژبلی ڤێ چەندێ کو لاساییکرن ب خۆ بۆ چەند واتایێن جیاواز دهێتە بکارهینان و زاراڤێن جیاواز بۆ هەنە، کۆمەکا زاراڤێن دی ژی د ڤەکۆلینێن ئەدەبیدا دهێنە بکارهینان کو نێزیکن ژ لاساییکرنێ. مە هەولدایە ڤێ ئاریشێ د ڤەکۆلینا خۆ دا چارەسەربکەین لێ وەکو خویایە ئەڤ بابەتە ژی وەکو گەلەك ژ بابەتێن پەیوەست ب زانستێن مرۆڤایەتیڤە ب ساناهی ناهێتە ئێکلاکرن.

# پشکا ئێکێ

# چەمک و ڕەهەندێن لاساییکرنا ئەدەبی

- خویابوون و جێگیربوونا زاراڤێ لاساییکرنێ د ڤەکۆلینێن ئەدەبیێن ڕۆژئاڤاییدا
  - زاراڤێن نێزیک ژ لاساییکرنا ئەدەبی
  - لاساییکرن د چارچووڤێ مێژوویا ئەدەبێدا
  - ئەدەبێ بەراورد و لاساییکرنا دەرەکی
  - هەلویستێ هەڤتێکستییێ ل هەمبەر لاساییکرنێ
  - فاکتەرێن هاریکار بۆ بهێزکەفتنا لاساییکرنێ
  - کاریگەرییێن نێگەتیڤێن لاساییکرنێ

## ١. ١. خويابوون و جێگيربوونا زاراڤێ لاساييكرنێ د ڤەكۆلينێن ئەدەبيێن رۆژئاڤاييدا:

### ١. ١. ١. ميمێس و لاساييكرنا ئەدەبی ل يونان و رۆما كەڤن:

دەمێ ئەم باسێ لاساييكرنێ دكەين، بەری هەر تشتەكی هزرا مە بۆ تيۆرا لاساييكرنێ دچيت كو ژ بير و بۆچوونێن (ئەفلاتون)ی دەست پێ دكەت و د هەمبێزا پەرتووكا (هونەرێ شعر)ا (ئەرەستو)يدا مينا تيۆرەكا ئەدەبی و ب ئاوايەكێ نوی و جياواز جهێ خۆ دگريت. ژ لايەكێ ديڤە هزرا مە بۆ چەمكەكێ دیێ ڤی زاراڤی ژی دچيت كو بريتيە ژ لاساييكرن و پێرەويكرنا نڤيسەرەكی ژ نڤيسەرێن بەرێ يان وەكهەڤيا د ناڤبەرا بەرهەمێن دوو قوناغان و چەندين دياردەيێن ديێن ب ڤی رەنگی.

(تيۆرا لاساييكرنێ) ئێكەمين تيۆرا ئەدەبيە كو پرەنسيپێن وێ ل سەدێ چوارێ بەری زايينێ ژ لايێ (ئەفلاتوون)يڤە هاتينە باسكرن و پاشی ژلايێ (ئەرەستو)يڤە پەرەپێهاتيەدان. بەری ڤێ تيۆرێ ب تنێ هندەك بۆچوونێن پەرتەوازە و لاواز دەربارەی سروشت وئەركێ ئەدەبێ هەبوون)[1]. لاساييكرن وەكو تيۆرەكا ئەدەبی و ب نێرينەكا نێگەتيڤ ژ ئەفلاتونی دەست پێ دكەت. وی باوەری ب هەبوونا جيهانا نموونەيی هەبوو و ب ديتنا وی تەڤايا تشتێن جيهانا ماتريالی بريتينە ژ لاساييكرنا جيهانا نموونەيی لەوما پێنگاڤەكێ ژ راستيێ دوورن. هونەرمەند و شاعر لاسايیا تشتێن جيهانا ماتريالی دكەن و لاساييكرنا وان بريتيە ژ لاساييكرنا لاساييكرنێ و ب ڤی رەنگی دوو پێنگاڤان ژ راستيێ دوورن و د جيهانا سيبەراندانە، لەوما هونەرمەند و شاعر دبنە ئەگەر كو مرۆڤ پێنگاڤەكا دی ژ

ڕاستیێ دووربکەڤیت.ئەو نموونەیا کورسیکێ و چێکرنا وێ ژ لایێ دارتاشیڤە و پاشی وێنەکیشانا وێ ژلایێ هونەرمەندیڤە ب ناڤودەنگە[٢]

ئەفلاتون شعرێ وەکو لاساییکرن (mimesis)پێناسە دکەت. لاساییکرنا شاعری (لاساییکرنەکە کو هندەك مرۆڤ... پێ ڕادبن و ئەڤ مرۆڤە د ڤی کاریدا سەرکەفتی بن یان نەبن؛بەرهەمێ داویێ کارێ وان هەست کرن ب ژان یان چێژێیە))[٣]، ئەڤە ژبلی هندەك مەسەلێن ڕەوشتی و پەروەدەیی کو ب دیتنا ئەفلاتونی سروشتێ لاساییکرنا شعرێ کارتێکرنەکا خراب دکەتە سەر وان. ((ئەفلاتوونی باوەری ب نموونەیان هەبوو، هەمی چەمکێن جیهانا بەرهەست و ڕاستەقینە وەکو جوانی، باشی، دادوەری، و یێن دی ب تنێ ڕەنگڤەدانا چەمکێن نموونەییێن بەهەشتێنە لەوما بۆ ئەفلاتوونی لاساییکرن، نواندنا شێوەییێن نموونەیییە. تەڤایا ئەو تشتێن کو هونەرمەند لاساییا وان دکەت سیبەرن و لاساییەکن ژ ڕاستیێ، لەوما کارێ وی لاساییکرنا لاساییکرنێیە. هەرچەندە بەرێ ئەفلاتونی ل هونەرێ نیگارکێشانێیە لێ نێرینا وی هونەرێن دی و شعرێ ژی بخۆڤە دگریت))[٤]

ب ڤی ڕەنگی (هونەر لسەر بناغەیێ لاساییکرنێ ئاڤا بوویە و دوورە ژ ڕاستیێ. هونەر دشێت لاساییا هەمی تشتان بکەت لێ وەسا خویایە کو ب تنێ دشێت بەشەکێ بچویک یانکو پاژەیەکێ ژ هەر تشتەکی نیشان بدەت کو ئەو ژی ب تنێ تارماییەکە)[٥]. تەنانەت ئەفلاتوونی لسەر بناغەیێ ڤی چەمکی جۆرێن ئەدەبی ژی پۆلین کرن ل بەراهیێ گرنگیدا شعرا لیریکی چونکە تێدا شاعر دەربارەی خۆ دئاخڤیت و لاسایێ ناکەت؛ ئەڤ شعرە شعرا پەسن و ئاڤاکرنێ یە و شاعر مینا پاسەڤانەکی کوماری ڕۆلێ خۆ دبینیت، پاشی گرنگیدایە داستانێ کو تێدا شانازی ب قارەمانێن نیشتیمانی دهێتەکرن. دراما ژی لدەڤ وی ل پلا سێیێ دهێت چونکە پترین ڕێژا لاساییکرنێ د تراژیدیا و کومێدیاییێدا هەیە؛ ئەڤە ژی دژی ئامانجێن ویێن ڕەوشتی بوون.[٦]

ئەرەستوی ژی زاراڤێ (mimesis) بکارئینایە لێ بکارهینانا وی گەلەك ژ یا ئەفلاتوونی جیاوازە. ئەو بەروڤاژی ئەفلاتونی کو شعر ب کۆپیکرنەکا ڕووت تاوانبار دکر، حەزا لاساییکرنێ ب حەزەکا سروشتی و ساخلەما مرۆڤی ل قەلەمدایە، (غەریزا لاساییکرنێ هەر ژ ڕۆژێن دەستپێکێ ل دەڤ مرۆڤی هەیە و میراتگریە... مرۆڤ ب ڕێکا لاساییکرنێ فێری ئێکەمین وانەیێن خۆ دبیت و چێژێ ژ لاساییکرنێ وەردگریت)[٧]، کەواتە بەری هەر تشتەکی نێرینا وی بۆ لاساییکرنێ پۆزەتیڤە.

ئەرەستو جیاوازیێ دئێخیتە د ناڤبەرا مێژوونڤیس و شاعری، شاعر ڕویدانان وەکو خۆ ناڤەگێریت بەلکو وەکو پێدڤینە یان وەکو ئەو حەز دکەت وەسا بن وان ڤەدگێریت، کەواتە کارێ شاعری داهێنەرانەیە و گەلەك جاران دشێت نموونەکێ باشتر یانکو جوانتر ژ وێ نموونا کو لاساییا وێ دکەت پێشکێش بکەت[(٨)]، لەوما لدویڤ دیتنا ئەرەستوی شاعر داهێنەرە و دشێت نموونەکا باشتر یان جوانتر ژ ڕاستیێ ژی پێشکێش بکەت.

جیاوازیەکا مەزن د ناڤبەرا چەمکی لاساییکرنا ئەفلاتوون و ئەرەستویدا هەیە، یا ئێکێ لاساییکرنەکا دەقاودەق و دوور ژ داهێنانێیە و یا دوویێ داهێنەرانەیە و نویکرنێ بخۆڤەدگریت و دگەهیتە ڕادەیێ داهێنانەکا زیندی. زێدەباری ڤێ چەندێ، ئەرەستوی بەروڤاژی ئەفلاتوونی پتر ژ هەمی ژانرێن ئەدەبی گرنگیدایە دراما و نەخاسمە (تراژیدیایێ).لاساییکرن لدەف ئەفلاتوونی بریتی بوو ژ لاساییکرنا تشتێن هەستپێکری لێ لدەف ئەرەستوی بریتی بوو ژ کەسایەتی و ئازریان و کارێن مرۆڤان، واتە بریتی بوو ژ لاساییکرنا ژیانا عەقلی و هەست و سۆزێن مرۆڤی.[٩]هەر لسەر ڤی بناغەی وەرگێرانا زاراڤێ (mimesis) بۆ لاساییکرنێ کارەکێ ڕەوا نینە چونکە وەکو ئەم دبینین چەمکێ لاساییکرنا ئەفلاتوونی گەلەك جیاوازە ژ یا ئەرەستوی، تا وی ڕادەی کو ئەم دشێین بێژین لاساییکرنا (ئەفلاتوونی) یان (ئەرەستویی)، لێ ب هەر ئاوایەکی بیت لاساییکرن ل ڤێ قوناغێ دبیتە تیۆرەك بۆ ڕاڤەکرنا پەیوەندییا ئەدەبێ لگەل واقعی. لگەل بەرچاڤگرتنا چەمکێ یونانیێ ڤی

زاراڤی و رۆلێ وێ د رەخنەیا ئەدەبییا کەڤندا، یا باش ئەوە کو ل جهێ لاساییکرنێ زاراڤێ (سروشتگەرایی)ێ بکاربینین واتە ئەو پەیوەندییا کو بەرهەمێ ئەدەبی د گەل سروشتی سازدکەت.

تیۆرا لاساییکرنێ د مێژوویا ئەدەب و رەخنەیا رۆژئاڤاییدا، زێدەتر لسەر بناغەیێ پەرتووکا (هونەرێ شعر)ا ئەرەستوی هاتیە دانان، کو تێدا زاراڤێ لاساییکرنmimesis بۆ چەوانیا سەرەدەریکرنا درامانڤیسان لگەل واقعی یانکو لاساییکرن و نواندنا واقعی هاتیە بکارهینان، لێ ئەڤ زاراڤە پشتی سێ سەدەیان ژ ڤی دەمی و ژ بەر هندەك ئەگەران ب واتایا (لاساییکرنا نڤیسەران هاتە بکارهینان)[١٠]

(دیونیس هالیکارناسوس)ی سێ پشک ژ پەرتووکا خۆ یا ژناڤچوویی ب ناڤێ (دەربارەی لاساییکرنێ- on mimesis) بۆ لاساییکرن ژ وان نیڤسەرێن کو هەژی لاساییکرنێنە و باشترین رێک بۆ لاساییکرنا وان تەرخانکر، هەروەسا پەرتووکا (لاساییکرن imitatio) یا (دیونیس)ی دەربارەی لاساییکرنا رەوانبیژیا لاتینی جهێ لاساییکرنا (ئەرەستو)ی وەکو رێکەکا ئەدەبی گرت.[١١] ئەڤ گوهرینا مەزن زێدەتر لسەر دەستێ (هۆراس)ێ رۆمانی جێگیر بوو ((ب دیتنا ئەفلاتون و ئەرەستوی لاساییکرن بریتیە ژ لاساییکرنا سروشتی لێ ژ سەردەمێ هۆراسیڤە لاساییکرنێ واتایەکا دی وەرگرت و هاتە گۆهرین بۆ لاساییکرنا نڤیسەرێن دی...))[١٢]، هەر لسەر ڤی بناغەی ئەڤ باوەریە لدەڤ رەخنەگرێن نیوکلاسیکی چێبوو کو نڤیسەر دشێن ب رێکا لاساییکرنا بەرهەمێن کلاسیکیێن یونانی و رۆمانی ئەمانەتدارێن سروشتی بن، ئەڤ ژی هەر وەکو لاساییکرنا واقعییە.[١٣] بکورتی ئەڤ هزرە جێگیر بوو کو سروشت ب ئاوایەکێ راستەوخۆ ناهێتە لاساییکرن، چونکە سروشت نەشێت نموونەیێن بێ کێماسی و جوان پێشکێشی مرۆڤی بکەت، لێ شاعرێن بەرێ شیاینە د ناڤ دیاردەیێن سروشتی باشترین و گونجاوترین نموونەیان هەلبژێرن و د بەرهەمێن خۆ دا ب ئاوایەکێ هەژی پێشکێش بکەن. هونەرمەندێ کلاسیکی د ڤێ باوەرییێدایە کو پێدڤیە د بەرهەمێن شاعرێن کەڤن دا لدویڤ جوانیا نەمر و هەتاهەتایی بگەرین[١٤]، کەواتە ئێدی ژبلی

چەمکێ (mimesis)ا ئەرەستویی، چەمکەکێ دیێ لاساییکرنێ د مەیدانا ڤەکۆلینێن ئەدەبیدا خویابوو کو باوەری ب پێرەویکرن ژ نموونەیێن ئەدەبیێن کەڤن هەبوو و پتر داکۆکی لسەر لاساییکرنا نڤیسەران دکر تاکو لاساییکرنا واقع و سروشتێ مرۆڤایەتیێ. ب ڤی رەنگی لاساییکرن د ڤەکۆلینێن ئەدەبیدا واتا و مەبەستێن جیاواز بخۆڤە دگریت، تا وی رادەی کو گەلەك جاران مرۆڤ هەست ب هەبوونا مەبەستێن هەڤدژ ژی دکەت و ئێدی هەبوونا هندەك زاراڤێن دی بۆ چارەسەرکرنا ڤێ چەندێ وەکو پێدڤیاتیەکێ دهێتە زانین. ڤێجا هندەك جاران زاراڤەك بۆ هەر دوو مەبەستان دهێتە بکارهینان و هندەك جاران ژی هەول دهێتەدان کو ب رێکا دوو زاراڤێن (mimesis) و (imitation) ژهەڤ بهێنە جوداکرن.(*)

(ام. اچ. ئیبرێمز) د پەرتووکا خۆ (فەرهەنگا شرۆڤەکاریا زاراڤێن ئەدەبی) وەسا ددەتە خۆیا کرن کو زاراڤێ لاساییکرن (mimesis)د رەخنەیا ئەدەبیدا دوو بکارهینانێن سەرەکی هەنە، یا ئێکێ ژبۆ ناساندنا ماهییەتا ئەدەبیات و هونەرێن دی و یا دوویێ بۆ نیشاندانا پەیوەندییا بەرهەمەکێ ئەدەبی لگەل بەرهەمەکێ دی کو دبیتە نموونە بۆ بەرهەمێ ئێکێ. بکارهینانا ئێکێ کو لاساییکرنا رەفتارێ مرۆڤانە ژ زاراڤێ (mimesis)ێ ئەرەستوی هاتیە و مەبەستا وێ زێدەتر تشتەکێ وەکو رەنگڤەدانێیە (representation). شعر نموونەیەکێ ژ رەفتارێ مرۆڤی وەردگریت و لاساییا وێ دکەت و ب رێکا ئامرازەکێ نوی- واتە پەیڤ- ب رەنگڤەدانا وێ رادبیت. بکارهینانا دوویێ بەرهەمێ زانا و رەخنەگرێن کەڤنە کو بەردەوام شیرەت ل شاعران دکرن کو لاساییا نموونەیێن چەسپاوێن ژانرەکێ ئەدەبی بکەن واتە شێوەیێ گونجای بۆ شاعران ئەوە کو لاساییا فۆرم و شێوازێ باوێ گەورە شاعرێن یونانی و رۆمانی بکەن. هەرچەندە مەبەستا وان ئەو بوو کو ئەڤ لاساییکرنە فۆرم و شێوەیێ نموونا کلاسیکی بخۆڤە دگریت نە هویرکارییێن بەرهەمی[١٥]، لەوما پەیڤا یونانیا (mimesis) ژبەر وێ بەرفرەهیا واتایا کو هەیە ل دەمێ وەرگێران بۆ زمانێن جیاواز واتایێن جۆراوجۆر وەردگریت، بۆ نموونە د زمانێ ئینگلیزیدا بۆ لاساییکرن (imitation) و نواندنا ژیانێ

(representation) و د زمانێ عەرەبی و فارسیدا بۆ زاراڤێن (تقلید، تشبیە، تخییل، محاكات، بیان....) هاتیە وەرگێران.[١٦] .

ئەگەر لاساییكرنا سروشتی و لاساییكرن ژ نڤیسەرێن بەرێ ب دوو بكارهینانێن سەرەكییێن زاراڤێ لاساییكرنێ ل قەلەم بدەین و پشتا خۆ بدەینە مەبەست و واتاییێن دیێن ڤی زاراڤی دێ بینین كو ئەڤ دوو واتا یانكو مەبەستە گەلەك ژێك دویرن و دیارە لگەل دەربازبوونا دەمی و ژێر كاریگەرییا چەندین فاكتەران تەڤلیهەڤ بووینە، لەوما پێدڤیە دوو زاراڤێن جودا بۆ بهێنە دانان. (ایرنا ریما مكاریك) د (ئینسكلۆپیدیا تیۆرێن ئەدەبی) دا داكۆكیێ لسەر ڤێ چەندێ دكەت كو وەرگێرانا پەیڤا میمێسا یونانی بۆ پەیڤا لاساییكرن د زمانێ ئینگلیزی زێدەتر ڤەگۆهاستنا پیت ب پیت و دەقاودەقە تاكو وەرگێران بیت. ب دیتنا وی هەر چەندە میمێس (mimesis) و لاساییكرن (imitation) ئاماژەیێ ددەنە وی هونەری كو لسەر بناغەیێ ڕەنگڤەدان و وەكهەڤیێ ئاڤا بوویە لێ جۆرێ داكوكیكرنا وان ژهەڤ جودایە. لاساییكرن كو جۆرە وەرگرتنەكا لاتینییە ژ (mimesis)ا یونانی ئاماژەیێ ددەتە تشتەكێ نەلڤوك، كۆپیەك، بەرهەمەكێ ب دوماهیك هاتی، لێ (mimesis)ب خۆ تشتەكێ لڤوك یانكو دینامیكی بخۆڤەدگریت و جۆرە میكانیزمەكە، ئاماژەیێ ددەت جۆرە پەیوەندیەكا چالاك لگەل واقعی.[١٧]

رەنگە پرانیا جاران هەولێن مە بۆ جوداكرنا زاراڤێن (mimesis) و (imitation) سەركەفتی نەبن چونكە میراتا ڕەخنەیی و كەلەكەبوونا ئەزمونێن بەری نهویە كو بڕیارا داویێ دەربارەی ڤی زاراڤی ددەت، لگەل دەربازبوونا دەمی تەڤلیهەڤبوونەكا بهێز د ناڤبەرا ڤان هەر دوو زاراڤان دا پەیدابوویە ((د رەخنەیا ئەدەبیدا هندەك جاران ل جهێ زاراڤێ (mimesis) هەر ب واتا خۆ یا ئەرەستوویی زاراڤێ لاساییكرن (imitation) هاتیە بكارهینان...)).[١٨]

رەنگە ئێك ژ ئەگەرێن سەرەكییێن تەڤلیهەڤبوونا زاراڤێ لاساییكرنێ د گەل زاراڤێ (mimesis)ێ ئەرەستوی پەیوەندییا موكوما وان د هەمبێزا

کلاسیزمێدا بیت. دەمێ باشترین نموونەیێن لاساییکرنا سروشتی شاعرێن بەرێ بن؛ لاساییکرنا شێوازێ وان بخۆ دبیتە ئەگەر کو شاعر بکەڤیتە پێڤاژۆیا دروستا لاساییکرنا سروشتێ مرۆڤایەتیێ.ئەو تشتێ ئەرەستوی داکۆکی لسەر کری لاساییکرنا سروشتی یانکو واقعی ب ئاوایەکێ داهێنەرانە بوو، پەیاما وی لاساییکرنا وان شاعران نەبوو کو وی شعرێن وان وەك نموونە بکارئینابوون، لێ ئەڤ چەندە پشتی ئەرەستوی و ب تایبەتی ل سەدێن ناڤەراست و ڕێنسانسێ جهێ خۆگرت.

ئەم د ڤەکۆلینا خۆ دا زێدەتر داکوکیێ لسەر لاساییکرنا شاعر و نموونەیێن بەرێ دکەین و مەبەستا مە تیۆرا لاساییکرنێ نینە، چونکە لدویف نێرین و تێگەهشتنا مە ئەدەبێ کلاسیکیێ ڕۆژهەلاتا ئیسلامی زێدەتر ژێر کاریگەرییا ڤی جۆرە لاساییکرنێ گەشەکریە.

## ١.١.٢. پشتبەستنا کلاسیزمێ لسەر لاساییکرنا نموونەیێن بەرێ:

لگەل تێپەربوونا دەمی دیاردەیا لاساییکرنا نڤیسەر و نموونەیێن کەڤن ب ئاوایێن جۆراوجۆر د مەیدانا ئەدەبیاتێدا زال بوویە، هەتا وی ڕادەی کو پرانیا یاسا و چارچووڤە و شێوازێن ئەدەبی لسەر ڤی بناغەی هاتینە دانان. هۆراس- کو ب دیتنا گەلەك نڤیسەران بەرپرسێ سەرەکیێ وەرچەرخانا چەمکێ لاساییکرنێیە- بەرێ خۆ ددەتە نڤیسەرێن مللەتێ خۆ و دبێژیت ((لدویف نموونەیێن یونانیان هەرن، ب ڕۆژێ دەمێ خۆ بۆ ڤەکۆلینا وان تەرخان بکەن و ب شەڤێ ژی بەردەوام بن لسەر ڤەکۆلینا وان))[١٩]

(هۆراس) مینا مرۆڤەکێ نەریتگەرا زێدەتر گرنگیێ ددەتە ئەو تشتێن کو ب دەربازبوونا دەمی ماینە و بەردەوام بووینە مینا ئەدەبیاتا یونانی. ئەو شیرەتێ ل تەڤایا وان کەسان دکەت کو حەز دکەن ببنە شاعر و دبێژیت (هەمیشە پەنایێ بۆ شاکارێن ئەدەبیاتا یونانی ببەن. ئەو دژی توندرەوییێیە، ب دیتنا وی دەربڕینێن تەیسۆك چەند ڕەوان و سەرنجراکێش ژی بن، پێدڤیە بهێنە لادان، ڕەسەنایەتیا ژ

رادەبەدەر د شعرێدا مەترسیدارە و چێدبیت بیتە ئەگەر کو شاعر مینا خەونێن مرۆڤەکێ نەخۆش تشتێن ئەستەم بینیتە ناڤ شعرێن خۆ دا. ب دیتنا وی شاعر دشێت ب داهێنانا پەیڤێن نوی ڕابیت لێ پێدڤیە ئەڤ پەیڤە سنووردار بن و ب تنێ ژ ئەدەبیاتا یونانی بهێنە وەرگرتن)[٢٠]. ئەڤ ئێگەهشتنا تایبەت بۆ لاساییکرنێ ڕۆژ ب ڕۆژ پتر جهێ خۆ گرت و د مەیدانا رەخنەیا ئەدەبیدا وەکو بناغەیەکی لێهات و گەهشتە وی ڕادەی کو ل سەردەمێ ڕێنسانسێ لسەر هزرا پرانیا نڤیسەران زال بوو، ئێدی پێناسا لاساییکرنێ مینا لاساییکرن ژ نڤیسەرێن دی کو ژ باوەرییێن (هۆراس) و (لانگینوس)ی بوون هاتە پەسندکرن.[٢١] ئەڤ چەندە هەتا داوییا ڕێنسانسێ و دەستپێکا سەردەمێ کلاسیزما نوی ژی بەردەوام بوویە. هەر وەکو (دوبیللی) ب ئاشکرایی شیرەتێ ل نڤیسەران دکەت و دبێژیت ((ئەی شاعرێ پاشەرۆژێ بخوینە، بەری هەر تشتەکی خۆ بۆ خواندنێ بەرهەڤ بکە، ڕۆژ و شەڤان ب خواندنا دەقێن یونانی و ڕۆمانیان ببورینە..)) [٢٢]

ل سەردەمێ کلاسیزما نوی ئێدی بناغەیێ سەرەکییێ رەخنەیا ئەدەبی هەر ئەڤ لاساییکرنا نڤیسەرێن بەرێ بوو، لێ هێدی هێدی بابەت ژ شیرەت و ئاراستەکرنا ئامۆژگاریان دەربازبوو و بوو یاسا و چارچووڤە. (بوالو)ی ڕۆلەکێ سەرەکی د ڤی واریدا هەبوو. (بوالۆ)ی لاساییکرنا سروشتی ب لاساییکرنا بەرهەمێن ناڤدارێن کلاسیکیڤە گرێدا. شیرەتا وی بۆ لاساییکرنا سروشتێ مرۆڤی هەڤدەم بوو لگەل لاساییکرن و خواندن و کویربوون د بەرهەمێن کلاسیکیدا. ئەو لسەر ڤی بناغەی یاسایان بۆ تەڤایا جۆرێن ئەدەبیێن سەردەمێ خۆ دەستنیشان دکەت[٢٣]. ئەو یاسایێن کو (بوالو) پێشکێش دکەت، یاسایێن ڕەخنەییێن سەردەمێ ڕێنسانسێ دهینە بیرامە لێ جیاوازیا وان ئەڤەیە کو ڕەخنەگرێن ڕێنسانسێ باسێ هەبوونا کۆمەکا یاسایان بۆ شعرێ دکەن کو ب دیتنا وان ژلایێ شاعرێن بەرێڤە هاتینەدانان، لێ (بوالو) ژبەر ڤی چەندێ کو عەقل و هزر هەبوونا ڤان یاسایان دسەپینن باسێ وان دکەت. تیۆرا (د ئەدەبیاتێدا ژ پێن بەرێ پێرەوی بکەن)یا سەردەمێ ڕێنسانسێ تا ڕادەکێ ئازادیا کارکرنێ ددەتی شاعری لێ د دروشما

(بوالو)یدا واته (د ئەدەبیاتێدا ژ یێن بەرێ پێرەوی بکەن چونکە ئەو ژی پێرەوێن پیڤەرێن عەقلی بوون)، ئەڤ هەلبژاردن یانکو ئازادیە ناهێتە دیتن.[٢٤]

ل سەردەمێ کلاسیزما نویدا، ئێدی لاساییکرن ژ بەرهەمێن نڤیسەرێن بەرێ ب تەمامەتی ب تیۆرا لاساییکرنا سروشتیڤە[*] هاتەگرێدان، هەتا وی رادەی کو گەلەك جاران مرۆڤ هەستێ ب ڤێ چەندێ دکەت کو لاساییکرنا نڤیسەر و بەرهەمێن بەرێ لدەڤ وان گرنگتر بوویە ژ لاساییکرنا سروشتی. ئەم دشێین بێژین پۆختەیا باوەریا هونەرمەندێ کلاسیکی ب ڤی رەنگی بوویە ((بەرهەمێن نوی رەنگە باش بن یان خراب بن، پرانیا ڤان بەرهەمان زوی یان درەنگ دێ هێنە ژبیرکرن، لێ ب تنێ شاکارێن بێ گومانێن وەکو (ئەنیادە) بەرهەمێ (ڤێرژیل)ی و (ئیفی ژێنی) بەرهەمێ ( ئورپید)ینە کو دکارن پشتی دەربازبوونا دوهزار سالان ببنە جهێ ستایشکرنێ. ئەڤ بەرهەمە ب شێوازەکێ هەژی هاتینە نڤیسین و ئەو کەسێ کو دڤێت بەرهەمێ وی زیندی بمینیت پێدڤیە لاساییا وان بکەت، لەوما پێویستە بابەت و جۆر و نەخاسمە شێواز و تەکنیکا وان بهێتە لاساییکرن...))[٢٥].کەواتە ئێدی ئەڤ باوەرییە جێگیربوو کو ((سروشت ب ئاوایەکێ راستەوخۆ و بێ واستە ناهێتە لاساییکرن، چونکە هەمی نموونەیێن کو سروشتی دانایینە بەر چاڤێن مرۆڤی ژ لایێ جوانییێڤە خودان ساخلەتێن تەواو و بێ کێماس نینن، یێن بەرێ شیاینە د ناڤبەرا ڤان دیاردەیێن سروشتی باشترین و گونجاوترینان هەلبژێرن و د بەرهەمێن خۆ دا ب ئاوایەکێ هەژی وان پێشکێش بکەن لەوما هونەرمەندێ کلاسیکی دخوازیت کو د بەرهەمێن یێن بەرێدا لدویف جوانیا هەروهەری بگەریت))[٢٦].

### ١.١.٣.٠ دانانا مەرجان بۆ لاساییكرنێ، لاساییكرنا پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ:

راستە كو لاساییكرنا سروشتی وەكو تیۆرەكا ئەدەبی جهێ خۆ دایە لاساییكرنا بەرهەمێن بەرێ و نموونەییێن ئەدەبی، لێ هەمی دەمان كاریگەرییا میمێسا یونانی لسەر خویایە. هەر نڤیسەرەك ب شێوازەكێ تایبەتی دخوازیت رێككەفتن یانكو هەڤسەنگییەكێ بێخیتە د ناڤبەرا لاساییكرنا نڤیسەر و بەرهەمێن بەرێ و لاساییكرنا سروشت یانكو واقعی، بۆ نموونە (ڤێرجیل) دبێژیت ((دەمێ من ڤەكۆلین لسەر تەڤایا پاژەیان كر گەهشتمە ڤی ئەنجامی كو هومیروس و سروشت هەر ئێكن.))[٢٧]، كەواتە لاساییكرنا (هومیرۆس)ی هەر وەكو لاساییكرنا، سروشتیە.

ئێك ژ كاریگەرترین و دیارترین نموونەییێن لاساییكرنێ كو د مێژوویا ئەدەبیاتا جیهانیدا دهێتە باسكرن، لاساییكرنا رۆمانیان ژ یونانیانە. ئەڤ چەندە زێدەتر ژبەر هەژاریا رۆشنبیریی و ئەدەبییا رۆمانیان سەرهلدا. ئەو شیان ژ لایێ سەربازیڤە لسەر یونانیان سەركەڤن، لێ یونانی بوون كو ژلایێ رۆشنبیری و ئەدەبیڤە شیان رۆمانیان بیخنە ژێركاریگەرییا خۆ. ئێدی رۆمانیان هەولدا كو لاساییا كلتورێ بەرزترێ یونانییێن بندەستێ خۆ بكەن و وێ بكەنە نموونا كارێ خۆ. هوراس دبێژیت ((یونانا دیل، نهو داگیركەرا خۆ یا هوڤ ب دیل گرتییە، ئەو فێری هونەرێ كریە))[٢٨]. ل تەڤایا ماوەیێ دەستەلاتداریا ئیمبراتورییەتا رۆمانی زمانێ یونانی، زمانێ دوویێ رۆمانییێن خواندەڤان بوو. شاعرێن رۆمی بەرێ دەست بهاڤێژنە ئافراندنا شعرێن خۆ، بەرێ خۆ ددانە نموونەییێن خۆ یێن یونانی، لگەل هندێ ژی هندەك گفتگو و دانوستاندن ژی دەربارەی ڤێ چەندێ كو تا چ رادە نویكرن و لادان ژ ڤان نموونەیان مومكینە بەردەوام بوو لێ چ جاران گومانەك سەبارەت ب ڤێ چەندێ كو پێدڤیە سەرچاوەیا ئیلهاما دەستپێكیا شعران ژ دەقێن نڤیسەرێن یونانییێن مەزن بیت ل گورێدا نەبوو.[٢٩] هەر ژوی سەردەمیڤە ئەم دبینین كو ئەڤ لاساییكرنە دبیت هێڤێنێ تیۆر و نێرین و تێگەهەشتنا گەلەك نڤیسەر و

تیۆرڤان و ڕەخنەگرێن ئەدەبیاتێ. هندەك تا وی ڕادەی گرنگیێ پێ ددەن کو مرۆڤ هەست ب هندێ دکەت کو ئێدی نموونە ب چاڤەکێ پیرۆز دهێتە تەماشاکرن و لاساییکرن نێزیکی کۆپیکرنێ دبیت و پشتا خۆ ددەتە نویکرنێ، بۆ نموونە دشێین ئاماژەیێ بدەینە گوتنا (سکالیگر)ی دەمێ دبێژیت (شاعرێ ئاسمانی چ تشتان لانادەت، کەس نەشێت چ تشتان لسەر بەرهەمێ وی زێدە بکەت یان بگۆهریت ژبلی کەسێن ئەحمەق و نەزان)[٣٠]. لگەل ڤێ چەندێ ژی هەر ژ سەردەمێ ڕۆمانیان پرانیا ئاخفتنێن کو سەبارەت ب ڤی بابەتی هاتینە کرن ب ئاوایێن جۆراوجۆر هەولددەن چەمکێ لاساییکرنێ ژ وەکهەڤی و کۆپیکرنێ جودا بکەن و دەلیڤا داهێنان و نویکرنێ بدەنە نڤیسەری لێ چەوانیا نویکرنێ و ڕادەیا لادان ژ بەرهەمێن بەرێ ژ نڤیسەرەکی بۆ نڤیسەرەکێ دی جیاواز بوویە.

مەبەستا هوراسی ب خۆ ژ لاساییکرنێ لاساییکرنەکا بەرهەمدار بوویە، ئەو لاساییکرنا کو ڕەسەنایەتیا شاعری ژناڤنەبەت.هەر پشتی هوراسی ڕەخنەگرێ لاتینی کانتلیان (٣٥- ٩٦ز) پێنگاڤێن مەزن د ڤی واریدا هاڤێتن. وی بۆ ڤێ لاساییکرنێ هندەك بنەما دانان: یا ئێکێ لاساییکرن پرەنسیپەکە ژ پرەنسیپێن گشتیێن ئەدەبی کو کەس نەشێت دەستان ژێ بەردەت، مەبەستا وی ژی لاساییکرنا یونانی و ڕۆمانیانە. یا دوویێ ئەڤ لاساییکرنە ب ساناهی نینە و پێویستە نڤیسەر خودان بەهرەکێ تایبەت بیت، ئەڤە ژی هەر وەکو لاساییکرنا، سروشتیە.یا سێیێ پێدڤیە لاساییکرن پەیڤ و دەربڕینان ب خۆڤە نەگریت، بەلکو پتر جەوهەرێ بابەتی و کاکلك و ڕێبازێ ب خۆڤە بگریت. یا چوارێ ئەو کەسێ کو ب لاساییکرنا یونانیان ڕادبیت پێدڤیە وان نموونەیان هەلبژێریت کو بشێت ب ساناهی لاسایيا وان بکەت، واتە بشێت تشتێ باش و خرابێ وان ژێک جودا بکەت و پاشی لدویف شیانێن خۆ لاسایيا لایەنێن باش بکەت.ل داویێ (کانتلیان) داکوکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو ب تنێ لاساییکرن بەس نینە و پێدڤیە لاساییکرن نەبیتە ئاستەنگەك د ڕێکا داهێنان و ڕەسەنایەتیێ دا.ب ڤی ڕەنگی ئەڤ تیۆرە ژ لایەکیڤە دبیتە ئەگەرێ گەشەکرنا ئەدەبیاتا ڕۆمانی و ژ لایەکێ دیڤە

ڕەسەنایەتیا نڤیسەری ژێ دەستەبەردکەت.[٣١]کانتلیان ب ئاشکرایی دبێژیت ((شەرمە بۆ تە ئەگەر ب تنێ ڕازی بی کو بگەهییە ئاستێ وێ نموونا کو تو لاساییا وێ دکەی)).[٣٢]واتە ئەو پشتەڤانیا لاساییکرنەکا وەسا دکەت کو بەرهەمدار بیت و ببیتە ئەگەرێ نویکرن و داهێنانێ.

گرنگیدان ب چەمکێ لاساییکرنێ پشتی (کانتلیان)ی ژی بەردەوام بوویە و هەمی دەمان ڕەخنەگر و نڤیسەران ڤیایە وەسا بدەنە دیارکرن کو مەبەستا وان زارڤەکرنەکا دەقاودەق نینە، بەلکو کارەکێ وەسایە کو نابیتە ئەگەرێ نەمان و ژناڤچوونا کەسایەتییا نڤیسەری. هەر لسەر شوپا (کانتلیان)ی نڤیسەرێن کلاسیکییێن سەدێ شازدێ و هەڤدێ ل ئیتالیا هەولدان تێگەهشتنەکا باش لدور چەمکێ لاساییکرنێ پێشکێش بکەن نەخاسمە کو ئێدی میمێسا ئەرستوی ژ لاساییکرنا نڤیسەر و بەرهەمێن بەرێ نەدهاتە جوداکرن. وان سێ پرەنسیپێن گشتی بۆ لاساییکرنێ دانابوون، ((یا ئێکی پێدڤیە نڤیسەر نموونەیێن خۆ هەلبژێریت، واتە تشتێ دروست ژ یێ سەختە جودا بکەت چونکە یێن بەرێ ژی مرۆڤ بووینە و مرۆڤ ژی جار دروستن جار هەلەیان دکەن، ستوونا ڤی کاری ژی شارەزایا هونەرییە.یا دوویێ نڤیسەر وەسا ب لاساییکرنێ ڕابیت کو لگەل سەردەمی وی بگونجیت، هەر وەکو چەوا نڤیسەرێن بەرێ بۆ سەردەمێ خۆ دنڤیسین. یا سێیێ نڤیسەر لاساییا نڤیسەرێن هەڤزمانێ خۆ نەکەت))[٣٣].

لگەل دەرکەفتنا ئێکەمین چریسکێن کلاسیزما نوی ل فرەنسا و جێگیربوونا هزرا لاساییکرنا نڤیسەرێن یونانی و ڕۆمانی، گرنگیەکا تایبەت ب مەسەلا لاساییکرنێ و چەوانیا لاساییکرنێ هاتە دان و گەنگەشە و دانوستاندنێن زۆر دەربارەی ڤێ چەندێ هاتنە کرن. (دوبیللی) و (مونتانی) کو ژ کەسایەتییێن ناڤدارێن وی سەردەمینە، سەرەرای ئەو جیاوازییێن کو د ناڤبەرا واندا هەیە داکوکیێ لسەر زاراڤێ هەرەسکرن (digestive)ا کلاسیکی بۆ کرداری خواندنێ دکەن، واتە ئەو هەر دوو د ڤێ باوەرییێدانە کو پێدڤیە نڤیسەر چالاکانە لاساییا کارێن بەرێ بکەت، وەل وان بکەت کو لگەل پێدڤیاتییێن وی بگونجن. (دوبیللی) داخوازێ ژ نڤیسەرێ فەرەنسی دکەت کو بەرهەمێن بەرێ داعویریت

(devour)، هەر وەكو چەوا نڤیسەرێن لاتینی یێن یونانی هەرەسكرن و وەكو ئاڤ و خوارنێ بكارهینان و شیان خۆ وەكو وان لێ بكەن.[٣٤] (مونتانی) ب نێرینەكا بەرفرەهتر ژ نڤیسەران دخوازیت مینا مێشا هنگڤینی بن كو مفای ژ هەمی گولان وەرگریت لێ تشتەكێ باشتر و جیاواز پێشكێش دكەت، واتە بلا نڤیسەر ژی بەرهەمێن بەری خۆ هەرەسكەن و بحەلینن و تشتەكێ نویتر و باشتر ژێ چێكەن.[٣٥]

د كلاسیزما نویا فرەنسیدا و د قوناغا جێگیربوون و گەشەكرنا وێ دا، لاساییكرن مەسەلەكا بەرفرەهە كو تەڤایا ڕەهەند و تایبەتمەندییێن ئەدەبی ل بن سیبەرا وێ دهێنەشرۆڤەكرن، لێ (پێدڤیە ئەڤ لاساییكرنە ب بەندەواری نەهێتە هژمارتن، چونكە بریتیە ژ بەرچاڤگرتنا یاسا و شێوەیەكێ دیاركری.هەر هونەرمەندەك خودان نرخ و بهایەكێ جیاوازە و دشێت تەكنیكێن نوی پێشكێش بكەت، لەوما دەمێ نڤیسەرەكی دڤێت ب ڕێكا لاساییكرنا نڤیسەرێن بەرێ بەرهەمەكی پێشكێش بكەت پێدڤیە نویكرنێ ژبیرنەكەت، ئەڤ نویكرنە ژی ب ڕێكا كویربوون و بناڤداچوونێ بەرهەم دهێت.)[٣٦]وەسا خویایە كو ڕۆژ ب ڕۆژ دانوستاندن و گەنگەشە لسەر مەسەلا لاساییكرنێ زێدەتر و زێدەتر بەرفرەهی بخۆڤە دیتیە و پرانیا هەولان د ڤێ ئاراستەییێدا بووینە كو سەرەرای جەختكرن لسەر گرنگییا لاساییكرنا نڤیسەرێن بەرێ سنوورەكێ د ناڤبەرا لاساییكرن و كۆپیكرنێ ژی دانن.

لسەر بناغەیێ چەمكێ لاساییكرنێ و وەرارا وێ د ڤەكۆلینێن ڕۆژئاڤاییدا ئەم دشێین بێژین كو لاساییكرنا ئەدەبی تشتەكە كو داناڤبەرا نڤیسەری و نمونەیەكێ دیاركریدا ڕوی ددەت واتە ب تنێ بریتی نینە ژ پەیوەندییا دوولایەنەیا د ناڤبەرا دوو نڤیسەران دا. ئەڤ دیاردەیە گەلەك بەرفرەهە و گەلەك فاكتەرێن مێژووی و سیاسی و جڤاكی ڕۆلێ خۆ تێدا دبینن و پرانیا جاران بریتیە ژ پێرەویكرنا نڤیسەران ژ كۆمەكا یاسا و ئەدگاران كو ژبەر هۆكارێن جۆراوجۆر جهێ خۆ گرتینە و ب نموونەیی هاتینە ل قەلەم دان و بووینە بەشەك ژ نەریتێ ئەدەبی، هەر ئەڤە ژی بوویە ئەگەر كو د ڤەكۆلینێن ئەدەبیدا كۆمەكا زاراڤان بۆ چارەسەركرنا حالەتێن جوداجودایێن لاساییكرنێ بهێنە دانان. بناغەیێ دانانا ڤان زاراڤان ژی باوەری هەبوون ب لاساییكرنا پۆزەتیڤ و نێگەتیڤە.

## ٢.١. زاراڤێن نێزیک ژ لاساییکرنا ئەدەبی:

### ١.٢.١. نەریتێن ئەدەبی:

گەلەك ژ ئەدگار و رەگەزێن ئەدەبی کو د بنەرەت دا بەرهەمێ رێککەفتن و چاڤلێکرنەکا بهێز و کاریگەرن ؛ ئێدی ب لاساییکرن ناهێنە ل قەلەمدان و زاراڤێن وەکو نەریتێن ئەدەبی یان بنەماییێن ئەدەبی بۆ وان دهێنە بکارهینان.

ژ گەلەك لایانڤە نەریت و بنەماییێن ئەدەبی (conventions) پەیوەستن ب لاساییکرنێڤە. نەریتێن ئەدەبی ( ئەدگارێن بەرجستەییێن ئەدەبییێن گرێدای ب رۆخسار یان ناڤەرۆکێ بخۆڤە دگریت وەکو جۆرێن کەسایەتیان، جۆرێن جیاوازێن گرێ، فۆرمێن جودا جوداییێن ڤەهاندنا شعرێ و شێواز و شێوەییێن دەربڕینا ئەدەبی، کو ب بەردەوامی د بەرهەمێن ئەدەبیدا دهێنە دووبارەکرن... )[٣٧]، کەواتە ((نەریت کو لسەر هەستا بەردەوامییێ تێ ئاڤاکرن یان ب رێیا بەرهەمێن کانۆنیک ب ئاوایەکی هۆشمەندانە تێ چەسپاندن، یان ب ئاوایەکێ رەمەکی و بێحەمد د ناڤبەرا هەلبەستڤان و نڤیسکارێن سەردەمێن جودا جودا دە گرێدانەکە هزری و ئافرێنەرییێ سازدکەت، ژبەر ڤێ ژی پێڤاژۆیا لاساییکرن، پەژراندن، ڤەدەرکرن و ژنووڤە شیرۆڤەکرن میراتێ دەردکەڤە هۆلێ))[٣٨]. هەر لسەر ڤی بناغەی د بوارێ شعرێدا ژی ((هەر هەلبەستڤانەك د ناڤ نەریتەکە ئەدەبیدە پێدگەهژە و پۆتیکایا وییا ئەدەبی حەتا رادەیەکێ د چارچوڤەیا چێژ، خەیال، رۆخسار و ناڤەرۆکا بەرهەمێن پێشییێن ویدە تەشە دگرە. ب گۆتنا بلۆمی بێ لاساییکرن مرۆڤ نکارە بنڤیسە، هین بکە، بفکرە حەتا بخوینە ژی، لەورا نەریت ڤەگۆهاستنا کاریگەرییا بۆرییە))[٣٩]. نهۆ ئەم د شێین بێژین لاساییکرنەکا کۆمیا زێدە یانکو ئەو لاساییکرنا کو ژ نەوەیەکی بۆ نەوەیەکێ دی دهێتە ڤەگۆهاستن ب نەریت و جارنا بنەماییێن ئەدەبی دهێتە هژمارتن، ب دەربڕینەکا دی نەریت لاساییکرنەکا خودان رەهـ و ریشەیە د رابردوویا ئەدەبی دا، ب ئاوایەکێ وەسا کو کەس نەشێت کەسێ ل دەمێ پێگیریکرن ب نەریتێن ئەدەبی ب لاساییکرنێ

تاوانبار بکەت، ئەڤە ل وی دەمی کو ڕەنگە هندەك جاران کاریگەرییا نەریتێن ئەدەبی خرابتر بیت ژ لاساییکرنا نڤیسەرەکی ژ نڤیسەرەکێ دی.

ڕەنگە گەلەك د ڤێ باوەرییێدا بن کو ڕەنگڤەدانا نەریتێن ئەدەبی د بەرهەمێن نڤیسەران دا ناچیتە چارچووڤێ لاساییکرنێ یان ب کێماتی لاساییکرنەکا نێگەتیڤ نینە، لێ ئەگەر ئەم ڤان نەریتێن ئەدەبی یان بنەماییێن ئەدەبی ژ ڕوانگەها فۆرمالیستێن ڕووسی ب فاکتەرێن زالێن سەردەمەکی ل قەلەم بدەین،[*] پێدڤیە قوناغەك یانکو سەردەمەك بۆ ڤان نەریتان بهێتە دەستنیشانکرن. ئەگەر بهێت و لگەل دەربازبوونا چەندین قوناغ و سەردەمان هێشتا ئەڤ نەریتە د ئەدەبێدا بهێنە پێرەوکرن؛نیشانا ڤێ چەندێیە کو بووینە بەشەك ژ لاساییکرنەکا نێگەتیڤ.بۆ نموونە ڕاستە کو ژانرێ ئەدەبی ژ ئەنجامێ لاساییکرنەکا بەردەوام و ڕێککەفتنا نڤیسەران جهێ خۆ دگریت و ئێدی پێرەویکرن ژ ژانرەکێ ئەدەبی نە ب تنێ ب لاساییکرن ناهێتە هژمارتن بەلکو پێرەوی نەکرن ژ تایبەتمەندییێن وێ ب کێماسی دهێتە زانین، لێ ئەم دبینین کو ((ب درێژییا سەردەمێ ڕێنسانسێ و بەشەکێ مەزن ژ سەدێ هەژدێ، هزرا پرانیا خەلکی ئەڤەیە کو جۆرێن ئەدەبییێن بەرنیاس- یان ئەو تشتێ کو ل وی سەردەمی ب جۆرێن شعرێ دهاتە ناڤکرن- هەر وەکو جۆرێن زیندەوەران د جیهانا زیندەوەران دا بریتینە ژ جۆرێن ئەدەبییێن ڤەبڕ و چەسپاو. گەلەك ژ ڕەخنەگرێن کلاسیزما نوی باوەریەکا تەواو ب ڤێ چەندێ هەبوون کو پێدڤیە هەر ئێک ژ ڤان جۆران ڕەسەنایەتیا خۆ بپارێزیت- واتە لگەل جۆرین دی نەهێنە تێکەلکرن- هەر وەسا وان هندەك بنەماییێن دەستنیشانکری بۆ ناڤەرۆك و بنیات و شێواز و کاریگەرییا سۆزداریا هەر ژانرەکی دانان))[٤٠]، ب ڤی ڕەنگی کۆمەکا تەکنیک و ئەدگارێن کو ل سەردەمەکی بەشەك بووینە ژ بنەماییێن ئەدەبی و بەرهەمێ ڕێککەفتنا نڤیسەران بووینە مینا بنەما و یاساییێن ئەدەبی بۆ ماوەیەکێ درێژ هاتینە لاساییکرن؛ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو هێدی هێدی کاریگەرییا نێگەتیڤانەیا وان لسەر ئەدەبێ خۆیا ببیت.

دەستبەرداربوون ژ بنەما و نەریتێن ئەدەبی کارەکێ ئەستەمە بۆ نموونە (مەحالە کو مرۆڤ بشێت پۆلینکرنا ژانران د گووتارا ئەدەبیدا فەرامۆش بکەت چونکە هەمی دەمان بابەتێن وەکو تراژیدیا، رۆمان و جۆرێن شعرێ و گەلەك ژانرێن دی کو ئەدەبیات ب درێژییا چەندین سەدەیان لژێر سیبەرا وان هاتیە پۆلینکرن دبنە جهێ گرنگیپێدانێ)[٤١]، لێ لگەل هندێ ژی نابیت ئەم ڤێ ڕاستیێ ژبیربکەین کو ئەڤ بنەما و نەریتێن ئەدەبی بەرهەمێ لاساییکرن و چاڤلێکرنێنە و ئەگەر بهێت و ئەڤە نەریتە ب ئاوایەکێ ڕادەبدەر بهێنە پێرەوکرن و بسەر چەندین قوناغێن مێژوویدا بهێنە سەپاندن دێ چنە چارچووڤێ لاساییکرنەکا کۆمیا نێگەتیف. هەر لبن سیبەرا ڤێ ڕاستییێیە کو (محمد حسين الاعرجی) زاراڤێ (تەقلیدی) بۆ شعرا عەرەبی بکاردهینیت. ئەو دبێژیت ((مەبەست ژ واتا پەیڤا تەقلیدی د بوارێ شعرێدا ئەوە کو شعر ب کێمی پێرەویا هندەك مەرجێن کو نڤیسەرێن سەردەمەکی لسەر رێککەفتینە بکەت...))[٤٢]، ئەو کێش و سەروایێ وەك نموونە دهینیت، هەر پشتی ڤێ گوتنێ ئێکسەر داکوکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو تەقلیدی ب واتایەکا دی ژی دهێتە بکارهینان، ئەو ژی ئەوە کو شعر ب هندەك مەبەستێن تەقلیدیڤە بهێتە گرێدان و شاعر پێگیریێ ب وان مەبەستان بکەن بۆ نموونە ل سەردەمێ عەباسیان قەسیدەیا ستایشکرنێ بنەما و یاساییێن خۆ هەبووینە شاعران دەلیڤە نەدایە کوگۆهرینەکا وەسا د بنەماییێن وێدا بهێتەکرن.[٤٣] ئەم دشێین شێوەیێ ستوونیێ شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی ب نەریت یان بنەمایێ شعرێ بدەینە نیاسین، لێ وەکو دبینین ئەڤ نەریتە یان ئەڤ بنەمایە ب خۆ ((دەستەلاتەکا توند و پیڤەرەکێ موسیقییە کو چ هەلەیان قەبوول ناکەت و هەر ژ ئەنجامێ نەبوونا تێگەهشتنەکا هونەری بۆ ڤان یاسا و بنەمایان هزاران شاعر کو هزردکرن ب تنێ پێگیریکرن ب ڤان یاسایان دێ شعرێ ئافرینیت، بووینە قوربانی)).[٤٤]

### ١.٢.٢.١. كاريگەری و پێكاریگەربوونا ئەدەبی:

جوداكرنا چەمكێ لاساییكرنێ ژ كاریگەرییێ و دانانا سنوورێن ڤەبر د ناڤبەرا وان دا كارەكێ ب ساناهی نینە. هەر چەندە كو هندەك ڤەكۆلەران باوەریەكا تەمام ب جودا بوونا وان هەیە لێ د وارێ پراكتیكی و واقعێ ڤەكۆلینێن ئەدەبیدا تەڤلیهەڤبوونەكا زۆر د ناڤبەرا وان دا دهێتە دیتن.

گرنگیدان ب مەسەلا كاریگەری و پێكاریگەربوونێ بناغەیێ كارێ رەخنەیا ژێدەران بوویە. رەخنەگر د ڤێ رەخنەییێدا هەولددەت ئاواییێن جۆراوجۆرێن پێكاریگەربوونا نڤیسەرەكی ب نڤیسەرێن دی بدەتە خویاكرن.ڤەكۆلینا وان ژی زێدەتر پەیڤ و هندەك جاران هزرێ بخۆڤە دگرت و كێمتر گرنگی ب روخسار و فۆرمێ بەرهەمی دهاتە دان[٤٥]. هەر وەسا پرانیا جاران رەخنەیا ژێدەران و رەخنەیا كەڤن داكوكیێ لسەر ڤەگەریان بۆ واقعی و میمێسێ دكەن و هەولددەن پەیوەندییێن دەرڤەی دەقی و كاریگەرییا فاكتەرێن سروشتی و جڤاكی ژی لسەر دەقی بدەنە دیاركرن[٤٦]، ب ڤی رەنگی ل دەستپێكێ چەمكێ كاریگەرییێ گەلەك جیاواز نەبوویە ژ چەمكێ لاساییكرنێ، هەر وەكو چەوا لاساییكرن ژ سەردەمێ ئەرستویڤە بەرەڤ دوو ئاراستەیانڤە چوویە واتە لاساییكرنا نڤیسەران ژ واقعی و لاساییكرنا وان ژ نڤیسەرێن دی، كاریگەری ژی د رەخنەیا ژێدەران دا لسەر ڤان دوو تەوەران كاركریە.

لگەل دەربازبوونا دەمی و ئەو گوهرینێن كو ل سەدێ نوزدێ و بیستێ د وارێ ڤەكۆلینێن ئەدەبیدا ب تایبەتی مێژوویا ئەدەبی و ئەدەبێ بەراورد دا چێبووین، هەول هاتیە دان كو كاریگەری ژ لاساییكرنێ بهێتە جودا كرن، یانكو كاریگەری مینا روویێ پۆزەتیڤێ لاساییكرنێ هاتیە نیشان دان، لێ ئەڤ چەندە نەبوویە ئەگەر كو لاساییكرن و كاریگەری ب تەمامەتی ژهەڤ جودابن.گەلەك جاران ئەم دبینین داكۆكی ل ڤێ چەندێ دهێتەكرن كو ((ڤەكۆلینا كاریگەرییان بیاڤەكێ گەلەك هەستیارە و پێدڤیە ڤەكۆلەر گەلەك هشیار بیت، ڤەكۆلەر دێ توشی

گەلەك حالەتێن جۆراوجۆر بیت هەر ژ لاساییکرنا تەواو و خوازراو کو ڕەنگە ژ دزیێ کێمتر نەبیت بگرە، هەتا دگەهیتە ئەو پالدەرێن کو دەستنیشانکرنا وان ژبەر جیاوازیا پلەیا کارایا وان کارەکێ بزەحمەتە))[٤٧]، ئەڤە ب خۆ نیشانا هەستکرن ب فرەجۆری و ئالۆزبونا چەمکێ کاریگەرییێیە.

### ١.٢.٢.١. کاریگەری وەك پلەیەکا بلندتر ژ لاساییکرنێ:

(ڤایسشتاین) مینا ڤەکۆلەرەکێ ناڤداریێ واریێ ئەدەبێ بەراوردی، د ڤێ باوەرییێدایە کو (ئەگەر مە بڤێت شیمانەیێن (احتمالات) چارەسەرکرنا بابەتەکی سنووردارکەین، یا باش ئەوە کو لیستەکێ چێکەین کو ژ دیاردەیا وەرگێرانێ دەست پێدکەت و ب وەرگرتن و لاساییکرنێ دەربازدبیت و دگەهیتە کاریگەریێ. ئەڤ لیستە مینا هێلەکا بەرزەرۆیە کو بەردەوام بەرەڤ سەریڤە دچیت هەتا دگەهیتە کاریێ هونەریێ ڕەسەن. ب ڤی ڕەنگی ئەم دێ ل ڤێ چەندێ گەهین کو ڕەسەنایەتی بریتیە ژ پێکهاتەیێن نوی کو ژ لایێ ناڤەروك و دروستبوونێڤە پشتبەستنێ لسەر نموونەیێن بەریێ دکەن.)[٤٨]شارەزاییەکێ دیێ واریێ بەراوردکاریێ ژی داکوکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو لاساییکرن و کاریگەری ژ هەڤ جیاوازن، ئەو نڤیسەرێ کو دکەڤیتە ژێر کاریگەریێ بەرهەمەکی پێشکێش دکەت کو د جەوهەرێ خۆ دا تایبەتە.ب دیتنا وی د لاساییکرنێدا نڤیسەر هندی دشێت لسەر کیستێ کەسایەتییا نڤیسەرەکێ دی یان بەرهەمەکێ دی دەستان ژ کەسایەتییا خۆ بەرددەت لێ د هەمان دەم دا خۆ ژ ئەمانەتداریا دەقاودەقا پێدڤی د وەرگێرانێدا ڕزگار دکەت.[٤٩]ب دیتنا ڤان ڤەکۆلەران جیاوازی د ناڤبەرا چەمکێ لاساییکرنێ و چەمکێ کاریگەرییێدا هەیە، کاریگەری پلەکا بەرزترە ژ لاساییکرنێ و ڕەسەنایەتی د پرۆسەیا کاریگەرییێدا خۆیادبیت لێ لگەل هندێ ژی نکۆلیێ ل نرخێ لاساییکرنێ ژی ناکەن نەمازە کو وێ دادننە بەری وەرگێران و وەرگرتنێ.

ئەو تشتێ کو گەلەك جاران مینا بناغەیێ کاریگەریێ دهێتە ل قەلەمدان هەبوونا دوو لایەنان واتە ڤرێکەر و وەرگرییە هەر وەکو (ئۆلدریدج) د

پێناسەیا کاریگەرییێدا دبێژیت (( تشتەك د بەرهەمێ نڤیسەرەکیدا دهێتە دیتن، هەبوون بۆ وی تشتی نەدبوو، ئەگەر وی نڤیسەری بەرهەمێ نڤیسەرەکێ بەری خۆ نەخاندبا))[50]، لەوما هەول دهێتە دان کو لسەر بناغەیێ شرۆڤەکرنا پەیوەندی و سەرەدەریا د ناڤبەرا ڤان دوولایەنان دا تایبەتمەندییێن کاریگەرییێ بهێنە خویاکرن. گرنگترین خالا کو داکۆکی لسەر دهێتەکرن ژی ئەڤەیە کو ((رۆلێ ڤرێکەری د کاریگەرییێدا ل قوناغا بەری داهێنانا بەرهەمێ دوویێ خۆیادبیت و بەشداریەکا سەرەکی د پێکهینانا بەرهەمێ دووییێدا ناکەت، واتە بەرهەمێ دوویێ نابیتە کۆپیەك ژ بەرهەمێ ئێکێ، کاریگەری ب تنێ فاکتەرەکێ هاریکارە بۆ داهێنان و بەرهەمهینانێ، مەبەست ژ کاریگەرییێ ئەو نینە کو لایەنێ دوویێ تەڤایا پێنگاڤێن لایەنێ ئێکێ دووبارە بکەت، ئەگەر ب ڤی ڕەنگی بیت دێ چیتە د چارچووڤێ لاساییکرنێدا.[51]

ئەم دشێین چەمکێ کاریگەرییێ لدویف شیانا داهێنەرانەیا وەرگری بسەر دوو جۆران واتە کاریگەرییا پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ دابەش بکەین.مەبەست ژ کاریگەرییا پۆزەتیڤ ئەوە کو بەرهەمێ دوویێ ژ لایێ جۆری و داهێنان و ڕەسەنایەتی و موکومییێ ڤە ژ بەرهەمێ ئێکێ کێمتر نەبیت، واتە پەیوەندی د ناڤبەرا وان دا هەبیت، لێ دەمێ ئەم بەرهەمێ دوویێ دخوینین هەستێ ب ڤێ چەندێ نەکەین کو ئەڤ دەنگە بریتیە ژ دەنگڤەدانا دەنگێ بەرێ، ئەڤ دەنگە دەنگەکێ جیاواز و سەربەخۆیە و خودان ڕێرەوێ خۆ یێ تایبەتە[52]، لەوما گەلەك جاران لاساییکرن دبیتە جۆرەك ژ کاریگەرییێ، لێ ب کاریگەریەکا نێگەتیڤ دهێتە ل قەلەم دان. ئەو کاریگەرییا کو پێرەویکرن و ملکەچی تێدا بیت ب لاساییکرن دهێتە نیاسین و ئەو کاریگەرییا کو گوهڕین و ڕەسەنایەتیێ بەرهەم بینیت ب پۆزەتیڤ دهێتە ل قەلەمدان.

ئەگەر ئەم ژ ڤی ڕوانگەهی تەماشەی ڤی بابەتی بکەین دێ دشێین پرەنسیپێن وەکهەڤی و بەرامبەرییێ بکەینە پیڤەر بۆ جوداکرنا کاریگەرییێ ژ لاساییکرنێ. وەکهەڤی مەرجەکە ژ مەرجێن کاریگەرییێ چونکە دبیتە بەلگە بۆ

هەبوونا دوولایەنان واتە لایەنێ بەرێ و لایەنێ دویف دا؛ وەکهەڤیێ حەزا کەسێ دویڤدایە بۆ وەکهەڤبوون لگەل کەسێ بەرێ لژێر کاریگەرییا داخباربوونێ یان بۆ نیشاندانا ڤێ چەندێ کو پێرەویا وی دکەت، ئەگەر یێ دویڤدا هەر د ڤی چارچووڤەیدا بەردەوام بیت دێ وێنەیەکێ بێسەروبەر ژ کارێ یێ بەرێ پێشکێشکەت، واتە دێ ب دووبارەکرنا کارێ بەرێ ڕابیت، ب ڤی ڕەنگی بەرهەمێ نوی دێ کەڤیتە د بازنەیا لاساییکرنێدا. ل هەمبەر ڤێ چەندێ پرەنسیپێ بەرامبەریێ هەڤرکی و گەهشتن و سەرکەفتن و دەربازبوونێ ب خۆڤە دگریت. هەرچەندە دەم دبەرژەوەندیا نموونەیا ئێکێدایە چونکە دکەڤیتە بەری نموونا دوویێ و ڕولێ بابینیێ دگێریت لێ نموونا دوویێ دشێت ژ لایێ هونەری ڤە بکەڤیتە بەری نموونا ئێکێ، ئەو دشێت لگەل وێ پێشکەفتن و سەرکەفتنا کو بسەر نموونەیا بەری خۆ بدەستڤە دهینیت پەیوەندییا خۆ لگەل وێ ژی بپارێزیت، کەواتە لاساییکرن ل ڤێرێ دێ بیتە لاساییکرنەکا ئەرەستویی.[٥٣]

چەوا ل سەردەمێن کەڤن باس ژ لاساییکرنا باش و خراب دهاتەکرن، واتە ئەو لاساییکرنا کو نڤیسەر ژ چارچووڤێ نموونا بەری خۆ دەرناکەڤیت و پێنگاڤێن وێ دووبارەدکەت و ئەو لاساییکرنا کو هونەرییە و نڤیسەر لسەر بناغەیێ بەرهەمێ بەری خۆ بەرهەمەکێ نوی و جیاواز د ئافرینیت. کاریگەری ژی ب هەمان شێوە گەلەك جاران بسەر دوو جۆرێن خراب و باش دهێتە دابەشکرن و جۆرێ وێ یێ باش نێزیکی میمێسا ئەرەستویی دبیت و جۆرێ خراب ژی گەلەك جاران ب لاساییکرن دهێتە ناڤکرن، ب ڤی ئاوایی ئەم دشێین بێژین بکارهینانا زاراڤێ کاریگەریێ ب تنێ هەولەکە بۆ ئاماژەدان ب لایەنێن پۆزەتیڤێن لاساییکرنێ و خۆ دویرکرن ژ واتایێن وێ یێن نێگەتیڤ.

## ١.٢.٢.٢. كاريگەری و ئاریشا زالبوونا ڕۆلێ ڤڕێكەری:

لگەل هەبوونا هەولێن بەرچاڤ بۆ جودا كرنا كاریگەرییێ ژ لاساییكرنێ لسەر ڤی بناغەی كو د كاریگەرییێدا وەرگری ڕۆلەكێ ئەكتیڤ هەیە، لێ هێشتا كاریگەری نەشیایە خۆ ژ ڤێ ئاریشێ ڕزگاربكەت و سروشتێ پەیڤا كاریگەرییێ و بكارهینانا وێ د زمانیدا زێدەتر داكوكییێ لسەر ڕۆلێ ڤڕێكەری دكەت، بۆ نموونە د زمانێ ئنگلیزیدا ئەڤ پەیڤە پتر ڕولی ددەتە لایەنێ ئێكێ و ناڤێ لایەنێ دوویێ كو ب ڕۆلەكێ سەرەكی د كاریگەرییێدا ڕادبیت، پشتی لایەنێ ئێكێ دهێتە گوتن، ب ڤی ڕەنگی ڕۆلێ پۆزەتیڤێ بەرهەمێ دوویێ ب ڕەنگەكێ نێگەتیڤ خۆیادبیت، واتە دەمێ ئەم دبێژین شاعرێ ژمارە ئێك كاریگەری لسەر شاعرێ ژمارە دوو هەبوویە ژ لایەكیڤە ئەم ڕولەكێ ددەینە شاعرێ ژمارە ئێك هەر وەكو ئەو ب كارەكی ڕابوویە و خوازراوانە ئەڤ كارە كریە و ژ لایەكێ دیڤە ڤێ چەندێ ددەینە دیاركرن كو شاعرێ ژمارە دوو ملكەچێ شاعرێ ژمارە ئێك بوویە.(٥٤) ئەڤ ئاریشە د زمانێ كوردیدا ژی خویایە چ ئەم بێژین (أ)ی كاریگەری لسەر (ب)ی هەبوویە یان بێژین (ب) كەفتییە ژێر كاریگەرییا (أ)ی ڕولێ لایەنێ دوویێ لاواز خۆیادبیت و مینا پێرەو یان پاشكۆیێ لایەنێ ئێكێ دەردكەڤیت و چ جیاوازیەكا وەسا لگەل لاساییكرنێ نابیت، لەوما گەلەك ڤەكۆلەران هەست ب ڤێ ئاریشەیا كەڤن كریە و هەولداینە ڕەنگڤەدانا ڤێ واتایا نێگەتیڤ لاوازبكەن.

(ڤایسشتاین) ئاماژەیێ ددەتە ڤێ چەندێ كو د جیهانا ئەدەبێ بەراورد دا جیاوازی د ناڤبەرا بهایێ ڤڕێكەر و وەرگریدا نینە. چ شەرم و كێماسی تێدا نینە ئەگەر نڤیسەرەك تشتەكی وەربگریت هەر وەسا ئەو كەسێ كو كاریگەریەكێ پێشكێش دكەت ژی شایانێ پەسن و ستایشێ نینە. پێدڤیە ئەم وەسا بەرێخۆبدەینە ڤی بابەتی كو ڤڕێكەر خوازراوانە ب ڤی ڕۆلی نارابیت و مەبەستا وەرگری ژی ئەو نینە كو بكەڤیتە د پەیوەندیەكا پێرەویانە و ببیتە دیڤەلانك، ب تنێ د هندەك حالەتێن دەگمەندا نەبیت، یا باش ئەوە كو ئەم وەسا بەرێ خۆبدەینە لاساییكرنێ

کـــو کاریگەریـــەکا ئاگەهدارانەیـــە و کاریگـــەری لاســـاییکرنەکا نـــە ئاگەهدارانەیـە.[٥٥] ب ڤـی ڕەنگـی ئـەم دشـێین بێـژین کـو د کاریگەریێـدا وەرگـری ڕۆلەکێ ئەکتیڤ و کاریگەر هەیە و خوازراوانە بەشداریێ د پرۆسـەییێدا ناکـەت و د لاساییکرنێدا ڤریکەر بالادەستە و وەرگر خوازراوانە ب ڤـی کـاری ڕادبیت، لێ ئـەو تشـتێ کـو نکـۆلی لێ ناهێتـە کـرن ئـەوە کـو کاریگـەری چ جـاران نەشـێت خـۆ ژ واتـایێن نێگەتیڤ و کارتێکرنا زاراڤێ لاساییکرنێ ڕزگاربکەت، هەر ئەڤ چەندە ژی هۆکـارێ سـەرەکیێ ڕەتکرنـا گرنگییـا چـەمکێ کاریگـەریێ ژ لایـێ ڤەکۆلـەرێن قوتابخانەیا ئەمریکی و ڤەکۆلەرێن وارێ هەڤتێکستیێ بوویە.

## ١.٢.٢.٣. ئارمزۆمەندانە بوونا ئاراستەکرنا کاریگەریێ:

ئاریشەکا دیا کاریگەریێ ئەڤەیە کو گەلەك جاران لدویڤ نێرینا ڤەکۆلەری دهێتە ئاراستە کرن. ڕەنگە مەبەستا ڤەکۆلەری سەلماندنا ڕەسەنبوونا بەرهەمێ ژێخواستی یانکو وەرگرتی بیت، ل ڤی دەمی دێ پشتبەستنێ لسەر وان گوهرینان کەت کو نڤیسەری ئێخستینە د وی بەرهەمی دا. بەروڤاژی ڤێ چەندێ ژی ڤەکۆلەر دشێت وەکهەڤیێن د ناڤبەرا هەر دوو بەرهەمان بکەتە بەلگە بۆ ئارەزۆیا دزیێ. ب ڤی ڕەنگی ڤەکۆلینا کاریگەریێ دێ بیتە بەشەك ژ زانستێ گونەهباریا ئەدەبی.نڤیسەر بخۆ حەژ ڤان هەر دوو ئاراستەیان ناکەن، لێ ڕەخنەگرێن ئەدەبی هەستێ ب ئارامیێ دکەن دەمێ ڤەکۆلینا خۆ بەرەڤ ئاراستەیەکا پۆزەتیڤ دبەن واتە ڕەسەنبوونا بەرهەمی ب ڕێکا جودابوون و دوورکەفتنا وێ ژ ژێدەرێن کاریگەریێ ددەنە دیارکرن.[٥٦]

ئایدیۆلۆژیا و حەزا ڤەکۆلەری ڕۆلەکێ سەرەکی د ڤی بواریدا دبینن، ئەگەر ڤەکۆلەر داخبار بیت ب بەرهەمێ پێکاریگەر دێ هەول دەت ڤێ چەندێ بسەلمینیت کو نڤیسەرێ بەرهەمی شیایە ب ڕێکا گوهرین و خۆ گونجاندن لگەل سەقایەکێ نوی بەرهەمەکێ نوی و ڕەسەن پێشکێش بکەت. بەروڤاژی ڤێ چەندێ ئەگەر ڤەکۆلەر لایەنگرێ بەرهەمێ کاریگەربیت دێ هەول دەت ڤێ چەندێ

بسەلمینیت کو ئەو بەرهەمێ ئەو ڤەکۆلینێ لسەر دکەت بوویە ژێدەر بۆ هندەك نڤیسەرێن دی و ب ڤی ئاوایی کاریگەری دێ چیتە د چارچووڤێ دیڤەلانکبوون و پێرەوییێدا.

### ٤.٢.٢.١. دەربرینێن وەکهەڤ وەك بناغەیێ کاریگەرییێ:

هەر ژبۆ جوداکرنا کاریگەرییێ ژ لاساییکرنێ گرنگی ب رۆلێ داهێنەرانەیا کاریگەرییێ دهێتە دان. ((بەروڤاژی لاساییکرنێ د کاریگەرییێدا نڤیسەر بەرهەمهێنەرێ کارەکێ تایبەت ب خۆیە. کاریگەری ب تنێ تشتێن پاژەیی و هویر بخۆڤە ناگریت بەلکو بابەتەکێ گشتگرە، تشتەکە کو ب ئاوایەکێ ئۆرگانیک د بەرهەمێن هونەریدا خۆیادبیت))[٥٧]، ئەڤە ب خۆ ئێکە ژ مەزنترین ئاستەنگێن کو دکەڤنە د رێکا کاریگەرییێدا. لسەر ڤی بناغەی کو کاریگەری پرۆسەیەکا داهێنەرانەیە و ئەنجامێ وێ بەرهەمهاتنا تشتەکێ نوی و جیاوازە پێدڤیە ئاماژە ب وان فاکتەران بهێتە دان کو جەوهەری و کارانە، ئەڤە ل وی دەمی کو گەلەك جاران ئەو ڤەکۆلەرێن کو باسێ کاریگەرییێ دکەن هەبوونا چەند دەربرینێن وەکهەڤ دکەنە بەلگە بۆ هەبوونا کاریگەرییێ و کێمتر بەرەڤ فاکتەرێن کارا دچن کو دبنە ئەگەرێ دروستبوونا کارلێکەکا داهێنەرانە.

تەنانەت بهێزترین وەکهەڤیێن ئاشکرا ژی نابنە بەلگە بۆ ڤێ چەندێ کو نڤیسەرەکی کەرەستەیێ خۆ ژ نڤیسەرەکێ دی وەرگرتییە، هەر وەسا تشتێن ئافراندی و نوی ژی هاریکاریا ڤەکۆلەری ناکەن، چونکە هەمی دەمان کۆمەکا بەرهەمان هەنە کو هێشتا ژ لایێ ڤەکۆلەری نەهاتینە خواندن، هەر وەسا گەلەك جۆرێن کاریگەرییێ هەنە کو ب رێکا ڤەدیتنا دەربرینێن وەکهەڤ ناهێنە شرۆڤەکرن.تشتێ هەڤدژ ئەوە کو دیارترین بەلگە کو دڤی کاریدا ڤەکۆلەر دشێت پشتبەستنێ لسەر بکەت ڤەدیتنا دەربرینێن وەکهەڤە کو پرانیا جاران بێنرخ و رێژەیینە. ئەڤە ل وی دەمی کو ڤەدیتنا کاریگەریەکا سەرەکی گەلەك ب زەحمەتە[٥٨]، لەوما سەرەرای بەرزکرنا دروشمێ کاریگەری وەك بەرهەمهاتنا

بەرهەمەكێ نوی و جیاواز، ڤەكۆلەر پرانیا جاران لدویڤ تشتێن پاژەیی و بێ نرخ دچن كو گەلەك جاران ژ سیماییێن ڤەكۆلەرێن رەخنەیا ژێدەرانە.

دەمێ چ بەلگەییێن بهێز بۆ كاریگەرییێ بەردەست نەبن، رێكارێ بەربەلاڤ ئەوە كو هەولبدەین هندەك بەلگەیان ب رێكا هەڤبەركرنا دەقان بدەستڤە بینین، مەبەستا مە ژی سەلماندنا ڤێ چەندێیە كو نڤیسەرێ (ب) پەیڤ یان دەربڕین یان وێنەییێن خۆ ژ (أ) وەرگرتینە. ڤێجا رەنگە گەلەك جاران پشتبەستن لسەر وەكهەڤییێن بێسەروبەر و بێ بنەما ژی بهێتە كرن[٥٩]، واتە هەمی دەمان ئاستەنگەك دكەڤیتە د رێكا كاریگەرییێدا، ئەو ژی مەترسیا تێكەلكرنا وەكهەڤیێ لگەل پێرەویی و لدویڤچوونێیە.ل ڤێرێ پیڤەرەكێ لۆژیكی ژی دهێتە بكارهینان: چونكە (ب) پشتی (أ) هاتیە، واتە ب پێرەویا (أ)ێ كریە. ئەڤ پەیوەندییا هۆكاری هەمی دەمان دروست نینە و رەنگە گەلەك جاران مە توشی هەلەیان بكەت، چونكە ئەم دەربارەی لێكدانێن داهێنەرانە و وەرچەرخان و گوهرینێ دئاخڤین و نەشێین هەمی دەمان سروشتێ كاریگەرییێ دەستنیشان بكەین. كاریگەری هندەك جاران ب هندەك پرۆسەیان دەرباز دبیت كو ئەم نەشێین دویڤچوونا وان بكەین، بۆ نموونە هندەك بەرهەم د مێژوویا ئەدەبێدا دهێنە دیتن كو كاریگەرییا سەدان بەرهەمێن دیێن بەرێ لسەر وان خویایە، ل ڤی دەمی ئەم نەشێین باسێ پێرەوییێ بكەین[٦٠]. ب ڤی ئاوایی بكارهینانا پیڤەرێ دەمی بخۆ دبیتە ئاریشە، هەبوونا دەربڕینێن وەكهەڤ د ناڤبەرا دوو بەرهەمان مە هان ددەت كو باسێ كاریگەرییێ بكەین ئەڤە ل وی دەمی كو چێدبیت چ پەیوەندی د ناڤبەرا وان دا نەبیت، ئەگەر پەیوەندییا وان ژی بهێتە سەلماندن؛هەر وەرگرتن و تێهەلكێشانەك نابیتە كاریگەری، چونكە كاریگەری ب تشتەكێ جەوهەری دهێتە ل قەلەمدان.هەر ل ڤێرێ ئاریشەكا دیا كاریگەرییێ خۆیادبیت، ئەو ژی دوولایەنیكرنا وێیە، ئەڤە ل وی دەمی كو چێدبیت نڤیسەرەكی مفا ژ گەلەك بەرهەم و نڤیسەران وەرگرتبیت و بەرهەمەكێ نوی و كاریگەر پێشكێش كربیت، ل ڤی دەمی سنووردارکرنا كاریگەرییێ د ناڤبەرا دوو لایەنێن دیاركری كارەكێ بێ مفایە.

## ۱.۲.۲.۰.۵. کاریگەری د ناڤبەرا ئاگەهی و بێ ئاگەهییێدا:

جوداکرنا کاریگەریێ ژ لاساییکرنێ لسەر بناغەیێ ڤێ چەندێ کو کاریگەری لاساییکرنەکا نەخوازراوانە و لاساییکرن کاریگەریەکا خوازراوانەیە؛ دبیتە ئەگەر کو ئالۆزیێن چەمکێ کاریگەریێ زێدەتر بن، ئێدی گرنگیەکا زۆر ب ئاگەهیێ ناهێتە دان و ڕۆلێ بێ ئاگەهیێ بەرز دهێتە نرخاندن ب تایبەت ئەگەر چ بەلگە بۆ سەلماندنا پەیوەندیێ د ناڤبەرا بەرهەمێ بەرێ و دویڤدا نەبن، بۆ نموونە دەمێ نڤیسەرەك نکۆلیێ ل ڤێ چەندێ دکەت کو وی بەرهەمێ نڤیسەرەکێ بەری خۆ دیتبیت یان خواندبیت ڤەکۆلەر بەرەڤ هندەك شرۆڤەکرنێن دی بۆ هەبوونا دەربڕینێن وەکهەڤ دچن، ئێک ژ ڤان شرۆڤەکرنا مەسەلا ژبیرکرنێیە. ئەو دبێژن تەڤایا ئەو تشتێ کو نڤیسەر دخوینن ناهێتە بیرا وان[٦١]، یانکو دەمێ چ ئاماژە بۆ ڕولێ هشیارانە و ئاگەهدارانەیا بیردانکێ نەبیت، سایکۆلۆژیا دێ کویراتیێ ئازرینیت و دێ ئاماژەیێ دەتە ڕولێ بێ ئاگەهیێ، واتە دێ ڤێ یەکێ دەتە دیارکرن کو نڤیسەرێ ( أ) د بێ ئاگەهیا خۆ دا دەربڕینەك ژ نڤیسەرێ (ب) وەرگرتییە، ئەڤ وێنە و دەربڕینە جهێ خۆ د بێ ئاگەهیا نڤیسەریدا دگرن و و سەرژنوی وەکو ئیلهامەکێ ژدایک دبن.[٦٢]

هەرچەندە کو سەلماندنا بابەتێ ژدایکبوونا بێ ئاگەهانە ئەستەمە لێ د هەمان دەمدا ئامرازەکێ دبلوماسیە بۆ وان کەسێن کو هەستەکێ باش بەرامبەر ب وەکهەڤیان نینە و دترسن کو بەرهەمێن وان بچنە د چارچووڤێ پێرەویکرن و دزییێدا، ئەو ڤی بابەتی مینا ئامرازەکی بۆ سەلماندنا بێ گونەهیا نڤیسەری بکاردهینن، کەواتە مەسەلا بەرهەمهاتنا بێ ئاگەهانە تشتەکێ گەلەك گرنگ نینە ب تنێ لدەڤ وان کەسان نەبیت کو گەلەك گرنگیێ ددەنە ڕەسەنایەتیێ. تشتەکێ ئاساییە کو گەلەك تشتێن وەکهەڤ د ناڤبەرا ژیانا مرۆڤێن جوداجودا دا هەبن.هەر ژ ڕۆژا ژدایکبوونێ تاکو مرنێ پرانیا ئەزمونێن مرۆڤان وەکو هەڤن و ب ڕاستی ژی حەزا دووبارەکرنا ڤان ئەزموونێن گرنگ د ژیانێدا دهێتە دیتن و

پرانیا جاران ژی ئەڤ ئەزموونە ب ڕێکێن وەکهەڤ دووبارەدبن.هەر وەکو (جونسون) دبێژیت پرانیا نڤیسەرێن سەردەمەکی خودان هەستەکێ وەکهەڤن، چونکە د هەر سەردەمەکیدا نڤیسەران ئامانجێن هەڤبەش بۆ هزرکرنێ هەنە[٦٣]، ب ڤی ئاوایی گرێدانا کاریگەریێ ب بێ ئاگەهیێڤە دبیتە ئەگەر کو ژ لایەکیڤە هەر وەکهەڤییەك بچیتە دچارچووڤێ کاریگەریێدا و دیاردەیێن وەکو گیانێ سەردەمی و وەکهەڤیا ئەزموونان نەهێنە بەرچاڤگرتن و ڕوویەکێ نێگەتیڤ وەرگرن و ژ لایەکێ دیڤە هندەك دیاردەیێن وەکو دزیێ و وەرگرتنێن دەقاودەق بچنە د چارچووڤێ بێ ئاگەهیێ و ڕوویەکێ پۆزەتیڤ وەربگرن، کەواتە ژ لایەکیڤە مە نێزیکی لاساییکرنێ دکەت و ژ لایەکێ دیڤە مە ژ لاساییکرنێ دویردئێخیت.

## ۱.۲.۳. دزیا ئەدەبی:

دزیێ تایبەتمەندیێن خۆ هەنە لێ ب ئێکجاری ژ لاساییکرنێ ناهێنە جوداکرن.ئەم دشێین بێژین کو گەلەك جاران دزی ب خرابترین جۆرێ لاساییکرنێ هاتیە هژمارتن لێ جارنا ژی نڤیسەر و ڤەکۆلەران نێرینەکا جیاواز بۆ هەبوویە؛ تا وی ڕادەی کو هندەك ڤەکۆلەران باسێ نێزیکبوونا دزیێ ژ هەڤتێکستیێ کریە و گوتینە کو (دزیا ئەدەبی هەڤواتایا هەڤتێکستیێ نینە لێ شێوەیێن دزیێ دچنە چارچووڤێ وان حالەتان کو زاراڤێ هەڤتێکستیێ پێکدهینن...)[٦٤]

(عبدالعزیز عتیق) د ڤێ باوەریێدایە کو دزی ئەوە کو شاعرەك تشتەکی ژ شاعرەکێ دی وەرگریت یان بەشەك ژ شعرا وی تالان بکەت و وێ بدەتە بال خۆڤە، لێ ئەڤ ڤەکۆلەرە پشتی ڤێ پێناسەیێ هەستێ ب ڤێ چەندێ دکەت کو بابەتێ دزیێ ژ ڤێ یەکێ دەرباز دبیت و هندەك بابەتێن دی وەکو (تێهەلکێش، ژێوەرگرتن (اقتباس)، لاساییکرن، دووبارەکرنا واتایێ ژی) بخۆڤەدگریت[٦٥]، یانکو سنووردارکرنا دزیا ئەدەبی و جوداکرنا وێ ژ وەرگرتن و جۆرێن دیێن پەیوەندیێ گەلەك ساناهی نینە.

### ١.٢.٣.١.١ دزيا پۆزەتيڤ و دزيا نێگەتيڤ:

رەنگە پرانيا جاران دزيا ئەدەبی زاراڤەکێ نێگەتيڤ بيت و بۆ خرابترين جۆرێ پەيوەنديیا دەقەکی لگەل دەقێن بەرێ بهێتە ل قەلەم دان، لێ لگەل هندێ ژی د مەيدانا ڤەکۆلينێن ئەدەبيدا ئەڤ زاراڤە ب دوو ئاواييێن جياواز دهێتە بکارهينان، ب ئاوايەکێ پۆزەتيڤ هەر وەکو (ئەليوت) دبێژيت ((شاعرێن پێنەگەهشتی لاسايێ دکەن و شاعرێن پێگەهشتی ب دزيێ ڕادبن))[٦٦]و ب ئاوايەکێ نێگەتيڤ هەر وەکو (گيل دوز) دبێژيت ((دزيکرن، غەش و لاساييکرن و کۆپيکرن و ڤەهاندنە لسەر شێوازێ کەسێن دی))[٦٧]، يان ب دەربڕينەکا دی (دزی وەرگرتنەکا دەقاودەق و بێ ئاگەهدارکرنە کو نڤيسەرەکێ فێلباز پێ ڕادبيت و وەسا ددەتە خوياکرن کو (ئەو داهێنەرێ تشتەکييە ئەڤە ل وی دەمی کو تنێ ب ڤەگۆهاستنا وی تشتی ڕابوويە. ئەو دەستدرێژيێ دکەتە سەر خاوەنداريێتيا ئەدەبی، هەمی دەمان ئەڤ چەندە ب توندی هاتيە ڕەتکرن لێ لگەل هندێ ژی ئەڤ چەمکە ب بەردەوامی بەرفرەهـ و بەرفرەهتر بوويە:دزی بريتيە ژ زێدەرۆيی د دانەبال خۆيا تشتان و دز ژی ئەوە کو دەستێ خۆ دادنيتە سەر وان وتارێن کو ملکێ وی نينن)[٦٨].کەواتە ئەڤ زاراڤە ژی مينا کاريگەری و لاساييکرنێ بۆ دوو مەبەستان دهێتە بکارهينان هندەك جاران مەبەست پێ کارەکێ داهێنەرانەيە و جارنا ژی کارێن کۆپيکری و بێ نرخ ب خۆڤە دگريت.

ل هەمبەر زاراڤێ دزيا ئەدەبی د زمانێ ئنگليزيدا زاراڤێ (plagiarism) دهێتە ديتن (ئەڤ زاراڤە بۆ دوو واتاييێن جياواز دهێتە بکارهينان، ژ لايەکيڤە بۆ دزيا ئەدەبی و ژ لايەکێ ديڤە بۆ قەرکرن يانکو وەرگرتنا ئەدەبی دهێتەبکارهينان.دزيا ئەدەبی بريتيە ژڤێ چەندێ کو کەسەك نڤيسين يان شعرێن کەسێن دی بدەتە بال خۆڤە واتە نڤيسين يان شعرا کەسەکێ دی بێ دەستکاری يان ب دەستکاريکرنەکا کێم پێشکێش بکەت و وەسا بدەتە دياركرن کو بەرهەمێ وی بخۆيە، دزيا ئەدەبی ل ڤێرێ ناهێتە سنووردارکرن بەلکو گەلەك لايەنێن دی وەکو جۆرێن لاساييکرنێ؛

لاساییکرنا شێوازی، ناڤەرۆك و قالب و پێن دی و جۆرێن وەرگرتنێ (اقتباس) بخۆڤەدگریت. ئەڤە ژی ئەو لایەنن کو دچنە چارچووڤێ واتایا دوویێ یا ڤی زاراڤی، واتە قەرکرن یان ژێوەرگرتنێ کو بدیتنا گەلەك ڤەکۆلەر و نڤیسەران پۆزەتیڤن و دبنە ئەگەرێ وەرچەرخان و گوهرینا شاعران و سەرهلدانا شاعرێن ناڤدار د بوارێ ئەدەبیێدا.هەر لسەر ڤی بناغەی ڤەکۆلەرەکێ مینا (کالریج)ی ژی زاراڤێ (plagiarism) وەکو قەرکرن یانکو ژێوەرگرتنێ بکارهینانیە. ب ڤی ڕەنگی ئەڤ واتایا زاراڤێ (plagiarism)ێ نێزیکی واتایا زاراڤێ میمێسا ئەرەستویە)[٦٩].

سەرەرای هندێ کو دزی ژ لایێ جڤاکی و ڕەوشتیڤە کارەکێ ناپەسەندە لێ د هەمان دەمدا ئەدگارەکێ دزیێ سەرنجراکێشە، ئەو ژی ئەوە کو دز ب دزیێ ڕادبیت بێ کو کەس هەستێ پێ بکەت. ئەوێن دزیێ ب واتایەکا پۆزەتیڤ بکاردهینن زێدەتر مەبەستا وان ئەڤ ئەدگارەیە، واتە دەمێ نڤیسەر ب ڕەنگەکێ وەسا مفای ژ دەقێن بەری خۆ وەردگریت کو ل دەمێ خواندنا بەرهەمێ وی مرۆڤ زوی ب زوی هەستێ ب ئامادەبوونا دەقێن بەرێ نەکەت. ( مۆلێر دەبارەی ڤێ چەندێ دبێژیت ئەز واتایێن باش وەردگرم و داهێنانێ تێدا دکەم ب ڕەنگەکێ وەسا کو مۆرك و کەسایەتییا (مۆلێر)ی پێڤە دیار بیت)[٧٠]، کەواتە دەمێ زاراڤێ دزی ب واتایا خۆ یا پۆزەتیڤ دهێتە بکارهینان ئێدی چ جیاوازی د ناڤبەرا وێ و وەرگرتنێدا نامینیت، تەنها ئەڤە نەبیت کو مرۆڤ هەستێ ب ڤێ چەندێ دکەت کو دزی ب واتایا خۆ یا پۆزەتیڤ هونەریترە ژ وەرگرتنێ، هەر وەسا جارنا ژی ل هەمبەر لاساییکرنا داهێنەرانە دهێتە بکارهینان.

### ١.٢.٣.٢.١ ئامازەنەدان ب ناڤێ نڤیسەری و دەقاودەق بوون:

سەرەرای هەبوونا بکارهینانێن پۆزەتیڤ بۆ زاراڤێ دزیێ لێ دانەنیاسینا دزیا ئەدەبی وەکو خرابترین جۆرێ لاساییکرنێ و هەولا جوداکرنا وێ ژ جۆرێن جیاوازێن لاساییکرن و کاریگەری و ژێوەرگرتنێ بەردەوامە. ل ڤێرێ ژی داکۆکی لسەر دوو پیڤەرێن سەرەکی دهێتەکرن، ئەو ژی دەقاودەق بوونا پەیوەندیێ و ئامازەدان و نەدان ب ناڤێ نڤیسەریە، هەر وەك (محمد مندور) دبێژت ((دزی بریتیە ژ وەرگرتنا دەقاودەقا رستە و هزرێن رەسەن و دانەبال خۆ یا وان بێ ئامازەدان ب ژێدەرێ وان)).[٧١]ب دیتنا ڤی ڤەکۆلەری و گەلەك ڤەکۆلەرێن دی دەقاودەق بوون و ئامازەنەدان ب ناڤێ وی نڤیسەری کو کەرەستە ژێ هاتیە وەرگرتن ژ ئەدگارێن دزیا ئەدەبینە.

سەبارەت ب ئامازەدان یان نەدان ب ناڤێ نڤیسەری پێدڤیە بێژین کو ئەڤە زێدەتر نێرینەکا رەوشتییە بۆ ڤی بابەتی، ئەگەر ئەم ڤی فاکتەری بدەینە لایەکی و بتنێ پەیوەندییا د ناڤبەرا دەقان بکەینە پیڤەر دێ بۆ مە خۆیا بیت کو ئامازەدان یان ئامازەنەدان ب ناڤێ خودانی چ کارتێکرنەکا وەسا لسەر دەقی ناکەت یانکو ئەم دشێین بێژین دزی وەرگرتنەکا نارەوشتییە و وەرگرتن ژی دزییەکا رەوشتییە.ئەم نەشێین بێژین ئامازەدان یان نەدان ب ناڤێ نڤیسەریە کو دزیێ دکەتە پەیوەندیەکا نێگەتیڤ چونکە وەکو خویایە د مەیدانا ئەدەبیدا گەلەك دیاردەیێن دی هەنە کو ب دزی دهێنە ل قەلەم دان بێ کو ئەڤ چەندە ژ وان بگریت، بۆ نموونە شاعر هندەك جاران ( واتایەکا نوی و رەسەن پێشکێش دکەت لێ پاشی ئەو بخۆ ب دووبارەکرنا وێ رادبیت واتە ژ خۆ ددزیت، ئەڤ چەندە د رەخنەیا ئورووپیدا ب ژخۆدزین (selfplagiarism) دهێتە ناڤکرن).[٧٢] ل ڤێرێ مە چ گرفت لگەل ئامازەدان یان نەدان ب ناڤێ نڤیسەری نینە بەلکو ئاریشە یا د ڤێ چەندێدا کو نڤیسەر ب رێکا دووبارەکرنا واتایەکا دیارکری کەفتییە د رێرەوێ لاساییکرنێدا، کەواتە ژلایێ سروشت و کارێگەریێ ڤە چ جیاوازیەکا وەسا د ناڤبەرا دزی و

وەرگرتنێدا نینە، ئاماژەدان یان نەدان ب ناڤێ نڤیسەری بابەتەكێ رەوشتییە و چ تایبەتمەندییێن هونەری پێشكێشی دەقی ناكەت.

دەقاودەق بوون یان نیمچە دەقاودەقبوون ژی ئەدگارەكە كو گەلەك جاران دزی و ژێوەرگرتنێ ژ جۆرێن دیێن پەیوەندییان جودا دكەت. ئاماژەدان ب ناڤێ نڤیسەری د وەرگرتنێدا روویەكێ پۆزەتیڤ ددەتە ڤێ دەقاودەقبوونێ ئەڤە ل وی دەمی كو ئاماژەنەدان ب ناڤێ نڤیسەری دبیتە ئەگەر كو ڤێ دەقاودەقبوونێ روویەكێ نێگەتیڤ هەبیت، لێ لگەل ڤێ چەندێ مەرج نینە هەمی دەمان دەقاودەق بوونا پەیوەندییا د ناڤبەرا دوو دەقان ژی تشتەكێ نێگەتیڤ بیت و بچیتە چارچووڤێ دزیا نێگەتیڤ یان وەرگرتنا خراب یان لاساییكرنەكا سەرەتایی، هەر وەكو ئەم دبینین گەلەك جاران هندەك وەرگێر ل دەمێ وەرگێرانێدا كو رەنگە دەقاودەقترین جۆرێ پەیوەندییا د ناڤبەرا دوو بەرهەمان بیت بەرهەمێن وەسا پێشكێش دكەن كو هاوتا یان كاریگەرترن ژ دەقێ سەرەكی.

(فایسشتاین) جەختێ لسەر ڤێ چەندێ دكەت كو (دەمێ نڤیسەر ب وەرگرتن (اقتباس)ژ بەرهەمەكێ بیانێ رادبیت د ئێكەم پێنگاڤ دا ژ وەرگێرانا دەقاودەق دەست پێدكەت.ئەم ل ڤی دەمی دێ خۆ ل هەمبەری دوو حالەتان بینین:یان ئەڤ وەرگرتنە هەولا خۆ نێزیككرنێ ددەت داكو بهایێ هونەریێ وێ یێ تایبەت نیشان بدەت یان ئەڤ وەرگرتنە هەولدانەكە بۆ خۆ گونجاندن لگەل چێژا جەماوەرەكێ جیاواز، واتە چێدبیت ئەڤ چەندە بگەهیتە وی ئاستێ كو (ڤایسشتاین) دبێژیتێ خیانەتا داهێنەرانە، هەر وەكو گەلەك شاعر ب وەرگێرانا شعران ژ زمانێن دی رابووینە و پشتی دارشتنا وان ب ئاوایەكێ نوی شیاینە بەرهەمێن رەسەن پێشكێش بكەن).[٧٣] فاكتەرێ گرنگ ل ڤێرێ ئاماژەدان و نەدان ب ناڤێ نڤیسەری یان دەقاودەقبوونا پەیوەندیێ نینە بەلكو ئەڤەیە كو نڤیسەری چەوا سەرەدەری لگەل دەقێن بەرێ كریە و ئایا شیایە گوهرینێ بێخیتە د واندا یانكو داهێنانەكێ بكەت یان ب دەربرینا(فایسشتاین)ی شیایە خیانەتەكا داهێنەرانە بكەت یان نە.

### ١.٢.٣.٣. واتايێن بەربەلاڤ و دزيا ئەدەبى:

مەسەلەكا دى كو ژ بهايێ دزيا ئەدەبى كێم دكەت ئەڤەيە كو گەلەك ڤەكۆلەر دزيێ ژى مينا كاريگەريێ د چارچووڤێ پەيوەنديەكا دوولايەنە سنووورداردكەن.ئەو د ڤێ باوەرييێدانە كو (بكارهينانا وان واتايێن گشتى يان تايبەتى كو گەلەك هاتينە بكارهينان و بەربەلاڤن و بووينە گشتى ب دزى ناهێتە هژمارتن. هەر وەسا گوتنێن بەربەلاڤ ناچنە د چارچووڤێ دزييێدا بەلكو دزى ب تنێ وەرگرتنا گوتنێن ئۆرجينال و ڕەسەن بخۆڤە دگريت).[٧٤] ئەگەر ئەم ب ڤێ نێرينێ تەماشەى دزيێ بكەين دشێين بێژين دزى بەس دهێتە دان بال وى كەسيڤە كو بۆ ئێكەمين جار ب وەرگرتنەكا دەقاودەق يان نيمچە دقاودەقا تشتەكى ڕادبيت كو ب ئاوايەكێ ئورجينال ژ لايێ نڤيسەرەكێ ديڤە هاتيە پێشكێشكرن و دەمێ وەرگرتن ژ بازنەيا ڤێ پەيوەنديا دوولايەنە دەردكەڤيت ئێدى ب دزى ناهێتە هژمارتن. ب دەربڕينەكا دى ئەگەر تشتەك گەلەك هاتە دزين ئێدى ب دزى ناهێتە هژمارتن و دبيتە تشتەكێ ئاسايى.هەر ژ ڤى ڕوانگەهيڤە دشێين بێژين ڕاستە كو هژمارتنا هەمى پەيوەندييان وەكو دزى كارەكێ هەلەيە لێ سنووورداركرنا وێ ژى د چارچووڤەكێ دوولايەنەدا كارەكێ ڕەوا نينە و پێدڤيە باس ژ ميراتگرى و دەستاودەستكرنا دزيێ د مێژوويا ئەدەبێدا بهێتەكرن. يانكو ئەم دشێين گەلەك جاران لاساييكرن و دزيێ پێكڤە گرێدەين و بێژين (لاساييكرن ئەدەبەكێ دەستكرد پێشكێش دكەت، ئەدەبەك كو گەلەك ب ساناهى دشێين وێ ب دزى ل قەلەم بدەين. سويكا وێ ژى ب بيانۆيا ڤێ چەندێ خۆشە كو خەلك پتر حەژ مفا وەرگرتن ژ ييێن بەرێ دكەن تاكو تشتێ نوى)[٧٥]. نهۆ دشێين بێژين گەلەك جاران جياوازيەكا وەسا د ناڤبەرا دزى و لاساييكرنێدا نينە ب تنێ ئەڤە نەبيت كو ئەو دزيێن گەلەك دووبارەبووين بەشەكن ژ نەريتى و دهێنە پاراستن و خەلك حەز ناكەن ناڤێ دزيێ بۆ وان بكاربينن.

ل داویێ فەرە بێژین سەرەرای هندێ کو زاراڤێن وەکو نەریت و کاریگەری و دژێی تایبەتمەندییێن خۆ هەنە، لێ پرانیا جاران ژ چارچووڤێ چەمکێ لاساییکرنێ دەرناکەڤن و گەلەك جاران ژی ب هەمان واتایا لاساییکرنێ دهێنە بکارهینان تەنانەت زۆربەی جاران ئەڤ زاراڤە ژی وەکو لاساییکرنێ لسەر دوو جۆرێن پۆزەتیف و نێگەتیف دهێنە دابەشکرن.

## ۱.۳. لاساییکرن د چارچووڤێ مێژوویا ئەدەبێدا:

مێژوو بخۆ دوو واتاییێن سەرەکی و بنەرەتی بخۆڤە دگریت، ((ئێک ژ وان (رویدانێن بەرێ)نە کو کەرەستەیێ مێژووییێنە و یا دوویێ چەمکێ (ڤەگێران)ێیە کو ڕویدانێن بەرێ دئێخیتە هێلەکا دیارکریا دەمیدا))[٧٦]، لەوما دەمێ باس ل مێژوو و ئەدەبێ دهێتەکرن دوو بیاڤێن ڤەکۆلینێ بەرجستە دبن یێ ئێکێ بریتیە ژ وان ئاراستەیان کو ڤەکۆلینێ لسەر پێکهاتنا دەقی لژێر کاریگەرییا فاکتەرێن مێژوویی دکەن و یێ دوویێ بریتیە ژ نیشاندانا چەوانیا وەرار و گوهرینا ئەدەبیاتێ ب درێژییا دەمی. هەر چەندە کو ئەڤە ب دوو بیاڤێن جیاواز دهێنە هژمارتن لێ هندەك هەر دوو بیاڤان دبەنە بن سیبەرا چەمکێ مێژووا ئەدەبێ و وەسا بۆ دچن کو مێژوویا ئەدەبێ دوو واتایان بخۆڤە دگریت، ((یا ئێکێ بریتیە ژ ڤەکۆلینا پەیوەندییا د ناڤبەرا دەقان ب درێژاهیا دەمی:چەوا دهێتە گوهرین و بزاڤا وێ چەوایە و بۆچی ئەو دیاردەیا کو ڤەکۆلین لسەر دهێتە کرن بەردەوام د گوهرینێ دایە. یێ دوویێ بریتیە ژ پەیوەندییا دەقان ب زەمینەیا مێژوویا وانڤە، ئەڤ هەر دوو لایەنە زێدەتر هەڤدوو تەمام دکەن تاکو دژی هەڤدوو بن...))[٧٧].هندەك ژی دژی ڤێ چەندێنە، بۆ نموونە (یوری تینانوف) کو ژ فۆرمالیستنان بوو ل سالا (١٩٢٩) داکۆکی لسەر ڤێ چەندێ کر کو بابەتێ مێژوویا ئەدەبێ گوهرینا ئەدەبێیە، نە پێکهاتنا وێ، پێکهاتنا ئەدەبێ دچیتە چارچووڤێ سایکۆلۆژی یان سۆسیۆلۆژیا ئافراندنێ و نابیتە بابەتێ مێژوویا ئەدەبێ.[٧٨]

ب ڤی ڕەنگی گەلەك جاران لژێر سیبەرا چەمکێ مێژوویا ئەدەبێ ژبلی ڤەکۆلینا وەرارا ئەدەبی ب درێژییا دەمی هەول دهێتە دان بۆ شرۆڤەکرنا وێ پەیوەندییا کو د ناڤبەرا دەقێ ئەدەبی و زەمینەیا مێژووییا وێدا هەیە. ئەڤە ژی دبیتە ئەگەر کو جۆرە ڕەخنەیەکا ئەدەبی ژی د وارێ مێژوویا ئەدەبێدا ڕۆلێ خۆ ببینیت. ب هەر ئاوایەکی بیت دوو خالێن سەرەکی د مێژوویا ئەدەبێدا هەنە کو بێ وان مەسەلا لاساییکرنێ ناهێتە شرۆڤەکرن، یا ئێکێ ئەوە کو مێژوویا ئەدەبێ ڤەکۆلینەکە لدور ڕابردوویا ئەدەبێ و یا دوویێ ژی ئەوە کو مێژوویا ئەدەبێ گرنگیێ ددەتە چەوانیا گوهرین و وەرارا ئەدەبێ ب درێژییا دەمی یانکو دبیتە پرەك د ناڤبەرا نهو و ڕابردوویێ دا. هەلویست و بەرێخودانا مە بۆ ڤان لایەنان دبیتە ئەگەر کو تێگەهشتنا مە بۆ بابەتێ لاساییکرنێ ڕەهەندێن جوداجودا بخۆڤە بگریت:

## ١. ٣. ١. گرنگیدان ب بەهرەیا تاکەکەسی و فەرامۆشکرنا ڕۆلێ لاساییکرنێ:

هەرچەندە هەبوونا مێژوویێ بۆ ئەدەبیاتا هەر مللەتەکی وەکو بابەتەکێ مسوگەر هاتیە پەسەندکرن لێ ((هندەك نڤیسەرێن مەزن د ڤێ باوەرییێدانە کو د شیاندا نینە بۆ ئەدەبیاتێ مێژوویەك بهێتە دانان. ئەڤ نێرینە ژی بۆ شکاندنا ئەدەبیاتێ و ڕەتکرنا بهایێن وێ نینە، بەلکو ئەڤە بۆ ئەدەبیاتێ پلەیەکا وێڤەی دەم و جهی دەستنیشان دکەت، ئەو بەرهەمێن ئەدەبی ب دیاردەیێن ئەزەلی و هەمیشەیی و پەرە مێژوویی ل قەلەم ددەن.ئەڤ ڤەکۆلەرە دڤێ باوەرییێدانە کو ئەدەبیات یا هەمی دەمانە، دەستپێک و دوماهیک تێدا پێکڤە گرێداینە، هەبوونەکا ئێکانە و کولییەتەکا چەسپاو و نەمرە...))[٧٩]. ڕەنگە ئەڤ بۆچوونە سەرەتا لژێر کاریگەرییا فەلسەفا دەربڕینی (تەعبیری) یا (کانت) و (هیگلی) سەرهلدا بیت، کو بوو ئەگەرێ خویابوونا تیۆرا دەربڕینێ د وارێ ئەدەبیاتێدا. (کانت) دبێژیت ((بەهرە و شارەزایی د هونەریدا ناهێتە ڤەگوهاستن، سروشت ڤی بەهرەی ددەتە کەسەکی و ب مرنا وی کەسی ئەو بەهرە دێ ب دویماهیک دهێت، پشتی هنگی ڤێت ئەم

چاڤەرێبین هەتا سروشت جارەکا دی و ب هەمان شێوە ڤی بەهرەی بدەتە کەسەکێ دی))[٨٠]، ڤێ دیتنێ ب ئاوایێن جۆراوجۆر کاریگەری کریە سەر ڤەکۆلەرێن بوارێ ئەدەبیاتێ و بوویە ئەگەر کو جۆرە بێ باوەریەك ل هەمبەر مێژوویا ئەدەبێ پەیدا ببیت.

(والتر پیت) د پەرتووکا (فەلسەفا مێژوو)یێدا داکوکیێ لسەر جیاوازیا د ناڤبەرا مێژوویا هونەری و یا سیاسی دکەت، چونکە (مێژوونڤیسێ وارێ هونەری سەرەدەریێ لگەل تشتێن ئامادە و زیندی دکەت، ئەڤە ل وی دەمی کو تەمەنێ دەولەتدار و رێبەران بدوماهیک هاتیە.ب دیتنا وی مێژوویا ئەدەبێ وەکو موزەخانەکێیە کو ئەگەر تشتێن وێ ب رێکوپێکی ژی نەهاتبنە دانان؛ مرۆڤ هەر دشێت مفای ژ وان وەرگریت. هونەر و ئەدەبیات مینا بۆنەوەرێن زیندینە کو داکوکیێ لسەر هەبوونا خۆ ل هەمبەر مێژوویێ دکەن و کەس نەشێت ب تنێ وان بێخیتە چارچووڤێ زنجیرەیا ڤەگێرانەکا رووت دا).[٨١] رەخنەگرێ ئەلمانی (فرانتس گریلپارتسر) ژی نکۆلی ل پەیوەندییا د ناڤبەرا شعر و مێژوویێ دکەت ب دیتنا وی پێشکەفتنا هونەری ب شیانێڤە گرێدایە نە ب رویدانێن مێژوویيڤە.هەمیشە هەبوونا نڤیسەرێن مەزن پەیوەست نینە ب هەبوونا دەستەلاتدارێن بهێز، هەر وەسا جارنا شۆرەشێن مەزن و کاریگەر نەشیاینە تەنانەت شاعر یان نڤیسەرەکێ باش پێشکێش بکەن.[٨٢]

ب دیتنا پشتەڤانێن تیۆرا دەربڕینێ چەوانیا سەرەدەریکرنا بەرهەمەکی لگەل بەرهەمێن بەرێ د وارێ ئەدەبیاتێدا خودان سروشتێ خۆ یێ تایبەتە، هەتا وی رادەی جیاوازە کو هندەك ڤەکۆلەر داکوکیێ لسەر جیاوازیا چەمکێ (وەرار) و (پێشکەفتنێ) دکەن و د ڤێ باوەرییێدانە کو د ئەدەبیاتێدا وەرار هەیە نە پێشکەفتن. (چەمکێ وەرارێ جیاوازە ژ چەمکێن پێشکەفتن و وەرچەرخانێ. پێشکەفتن بریتیە ژ وێ گوهرینا کو بەرەڤ باشتر بوونێڤە دچیت لێ وەرار واتە گۆهرین، ڤێجا ئەڤ گوهرینە پۆزەتیڤ بیت یان نێگەتیڤ بیت، لەوما پێشکەفتن لسەر بناغەیێ باشتربوونێ دهێتە هەلسەنگاندن لێ وەرار ب تنێ برپاردانا واقع و راستییێیە...)[٨٣].

وەرارا زانستی بەرهەمێ دوو راستییا نە، (یا ئێکێ ئەوە کو راستییا زانستی لسەر بناغەیێ ڕاستییێن کەڤن ئاڤا دبیت واتە گۆهرینێن جۆری و چەوانی د زانستیدا ژ ئەنجامێ کەلەکەبوونا ڕاستییێن کەڤن (کەلەکەبوونەکا چەندی) خۆیادبن. یا دوویێ ئەوە کو راستییا زانستیا نوی، ڕاستییێن بەرێ ژکاردئێخیت. ئەڤ دوو ڕاستییە د وەرارا ئەدەبیدا ناهێنە دیتن چونکە بەرهەمێ ئەدەبیێ باش و یێ نوی ڕەنگە ژ ئەنجامێ پشتبەستن ب بەرهەمێن ئەدەبییێن بەری خۆ نەهاتبیتە بەرهەمهینان. هەر وەسا ژ لایەکێ دیڤە بەرهەمێ ئەدەبیێ باش و نوی نەشێت بەرهەمێن بەری خۆ ژکاربێخیت بەلکو نرخ و بهایێ بەرهەمێن کەڤن تا ماوەیەکێ دویر و درێژ هەر دمینیت)[٨٤]، کەواتە د بوارێ دیرۆکا هونەریدا هەر (ئافراندنەك ب نویکرن و دیاردەکا هونەریا تایبەت دهێتە هژمارتن. هونەر ڕویدانەکە کو ب تنێ جارەکێ ڕویددەت و چ پەیوەندی ب ڕویدانێن بەری خۆ و یێن پشتی خۆڤە نینە. ڤان ڤەکۆلەران باوەری ب لپەیهەڤهاتنا زنجیرەیی د دیرۆکا ئەدەبیاتێدا نینە، ب دیتنا وان بەرهەمێن ئەدەبی مینا بازنەییێن سەربەخۆنە کو نە چ پەیوەندی ب هەڤدوو هەنە و نە لدویف هەڤ دهێن)[٨٥]. ب ڤی ڕەنگی ئەڤ نڤیسەر و ڤەکۆلەرە گرنگترین بنەماییێن مێژوویا ئەدەبێ واتە پەیوەستبونا بەرهەمێن ئەدەبی بهەڤدوو د هێلەکا دەمیدا و کاریگەرییا وان لسەر هەڤدوو و پەیوەندییا بەرهەمان ب واقعێ سەردەمیڤە ڕەتدکەن و تنێ باوەرییێ ب بەهرە و داهێنانا تاکەکەسی و ڕۆلێ خەیالا ئەدەبی دهینن.

ئەڤ تیۆرە نێزیکی وێ هزرا کەڤنە کو داهێنانا هونەری دبەتە ژێر سیبەرا هێزا ئیلهامێ و گرنگیەکا وەسا نادەتە ڕۆلێ عەقلی.راستە کو وەرارا ئەدەبی جیاوازە ژ یا زانستی لێ ئەڤە نابیتە بەلگە کو ئەم بتنێ بەهرا تاکەکەسی بکەینە پیڤەر بۆ داهێنان یانکو ئافراندنا ئەدەبی، بەلکو ل ڤێرێ یاسا و نەریتێن ئەدەبی و کاریگەرییا نڤیسەران لسەرهەڤدوو و لاساییکرن ڕۆلەکێ مەزن د داهێنانا ئەدەبیدا دبینن.ئەوێن کو باوەری ب مێژوویا ئەدەبیاتێ نینن وەسا هزر دکەن کو چ جاران بەرهەمێن ئەدەبی کەڤن نابن و نابنە بەشەك ژ ڕابردوویێ. ب دیتنا وان ئەدەبیات

زیندیه و نامریت هەر لسەر ڤی بناغەی ئەدەبیات ناکەڤیتە ژێر ڕکێفێ چەمکێ زنجیرەیی بوونا مێژوویێ یانکو ڤەگێرانا مێژوویی، کەواتە مەبەست ژ مێژوویا ئەدەبی زێدەتر دانە نیاسینا بەرهەمێن ئەدەبی و دەستنیشانکرنا پلە و پایە و کاریگەرییا وانە.ئەگەر ئەم وەسا تەماشای ئەدەبیاتێ بکەین پێدڤیە نێرینا خۆ بۆ مەسەلا لاساییکرن و کاریگەریێ بگوهڕین، ئێدی لاساییکرن دێ ڕەهەندێ خۆ یێ دەمی و مێژوویی ژ دەست دەت و پتر دێ رەوابوونێ بدەستڤە ئینیت، چونکە ژ لایەکیڤە تشتەك نامینیت کو ب سەردەمێ بوریڤە گرێدایی بیت یانکو تشتەکێ کەڤن نامینیت کو لاساییکرنا وێ ب کێماسی بهێتە هژمارتن و ژ لایەکێ دیڤە لژێر سیبەرا باوەری هەبوون ب داهێنانا تاکەکەسی دێ لاساییکرن ب فاکتەرەکێ بێ بها و لاوەکی هێتە هژمارتن، لێ لگەل هندێ ژی ئەڤ تیۆرە ڤێ دەلیڤێ دەتە مە کو لدویڤ وان نڤیسەر و شاعران بگەڕین کو ژ شوپا گشتی لاددەن و خودان شێوازێ خۆ یێ تایبەتن.

## ٢.٣.١. ڤەکۆلینێن فیلۆلۆژی و ڕەواکرنا لاساییکرنێ:

فیلۆلۆژی ب زمانڤانیا کەڤن دهێتە نیاسین و نابیتە دەستپێکەکا ڕاستەقینە بۆ مێژوویا ئەدەبێ لێ ئەو ڤەکۆلینێن کو ڤەکۆلەرێن فیلۆلۆژیک ئەنجامدایین ب ئاوایێن جۆراوجۆر کاریگەری کرینە سەر چەمکێ مێژوویا ئەدەبێ و بووینە ئەگەر کو تێگەهشتنەکا تایبەت بۆ بابەتێن مینا کاریگەری و لاساییکرنێ دروست ببیت.

د بوارێ ڤەکۆلینێن زمانیدا(زاراڤێ فیلۆلۆژی کەڤنترە ژ (لینگوستیک)ێ، ئەڤ زاراڤە نهو ژی هندەك جاران ل هەمبەر زمانڤانیێ دهێتە بکارهینان. ب درێژاهیا سەدێ نوزدێ ڤی زاراڤی دوو لایەن بخۆڤە دگرتن: یا ئێکێ پراکتیکی، واتە ڤەکۆلینا وەکهەڤی و جیاوازییێن گروپەکێ زمانان کو لگەل هەڤ پەیوەندیداربوون و یا دوویێ مێژوویی کو بریتی بوو ژ شرۆڤەکرنا پێڤاژۆیا پێگەهشتنا کۆمەکا زمانان یان ڤەکۆلینا گۆرانکارییێن زمانی د قوناغەکا درێژ

دا. ئەڤ لایەنێ دوویێ واتە ڤەکۆلینا گورانکارییێن زمانەکی د پاژەیەك ژ دەمی ب ڤەکۆلینا مێژوویی هاتیە ناڤکرن.)[٨٦]

ب تنێ زمان بابەتێ ڤەکۆلینێن فیلۆلۆژی نینە، (ئەڤ زانستە بەری هەر تشتەکی گرنگیێ ددەتە چەسپاندن و شرۆڤەکرنا دەقان، لەوما گرنگیێ ددەتە مێژوویا ئەدەبیاتێ و دابونەریتان و ئۆرگانێن جڤاکی، د تەڤایا ڤان چالاکیان دا ژی شێوەیێ خۆ یێ تایبەت واتە (رەخنەگرتن ژ دەقان) بکاردهینیت. دەمێ ڤەکۆلەرێن فیلۆلۆژیست گرنگیێ ددەنە بابەتێن زمانی زێدەتر مەبەستا وان پیڤانا دەقان د قوناغێن جوداجودا دا و دەستنیشانکرنا زمانێ تایبەتیێ هەر نڤیسەرەکی یان نیاسینەڤە و ڤەخواندن و راڤەکرنا وان نڤیسار و بەردەنڤیسانە کو ب زمانەکێ کەڤن یان نامۆ هاتبینە نڤیسین. ژ کێماسییێن رەخنەیا فیلۆلۆژی ئەڤەیە کو ب ئاوایەکێ ژ رادەبدەر داکوکیێ لسەر زمانێ نڤیسکی دکەت و پشتا خۆ ددەت زمانێ زیندی. سەبارەت بێ دەقێن نڤیسی ژی دشێین بێژین ب تەواوەتی پشتبەستنێ لسەر بەرهەمێن یونان و رۆما کەڤن دکەت.)[٨٧]

هەر ل ڤێرێ پێکڤەگرێدانەکا بهێز د ناڤبەرا ئەدەب و مێژوویێدا پەیدا دبیت چونکە فیلۆلۆژی ئامرازەکە کو مرۆڤ نەشێت د بیاڤێ مێژوویێدا دەستان ژێ بەردەت، زانایێ فیلۆلۆژی دەقان دپارێزیت و ناهێلیت کو ژناڤبچن.ئەڤە ژی ب دوو رێکان یا ئێکێ مینا ماموستایەکی هەولددەت کو تێکستێن جڤاکی د بیردانکا نەوەیێن نویدا جێگیر بکەت و یا دوویێ هەولا خویاکرنا واتایا وان یا رەسەن ددەت، واتە ئەو رامانا کو پێدڤیە دەق پێشکێش بکەت. دەق ب تنێ د سیاقێ خۆ یێ مێژوویيدا واتا و مەبەستا خۆ یا رەسەن پێشکێش دکەت و ئەڤ سیاقە تەمامکەرێ دەقییە. لگەل بورینا دەمی گوهرین دکەڤیتە ڤی سیاقی و ژبەر گوهرینێن جڤاکی یان گوهرینێن زمانی دەق دسیاقەکێ نویدا دهێتە خواندن. ئەرکێ زانایێن فیلولوژی ئەوە کو هەمی دەمان پەیوەندییا دەقی ب سیاقێ ویێ رەسەن بپارێزن و ب راڤەکرنا وان دەقان رابن کو جەماوەر ژ وان ناگەهیت، واتە نیشاندانا واتایا کەڤنا وی دەقێ کو ژلایێ وانڤە هاتینە پاراستن.[٨٨]

ئەڤ هەولا زانایێن فیلۆلۆژی ب تنێ دەقەکێ دیارکری بخۆڤە ناگریت بەلکو (گەلەك دەق دکەڤنە بەر ڤەکۆلینێن وان، ئەڤ چەندە ژی بوو ئەگەر کو ئەو هەولا ڕێکخستن و پۆلینکرنا ڤان دەقان بدەن کو ئەڤە ژی بریتیی بوو ژ ڕێکخستنا پەرتووکخانێ لدویف ناڤێ نڤیسەران یان بەرهەمان یان جۆرێ وان. ژ بۆ ڤان ڕێکخستنان ژی یان ڕێزکرن لدویف پیتێن ئەلفوبێ یان لپەیهەڤهاتنا وان یا مێژوویی دهاتە بکارهینان. پاراستنا بەرهەمان ژی لسەر بناغەیێ لپەیهەڤهاتنا دەمی دبیتە ئەگەر کو ئەو بەرەڤ مێژوویا ئەدەبێ ڤە بچن کو ئەو بخۆ بەشەکە ژ مێژوویا ڕەوشەنبیری و مێژوویا جیهانێ)[٨٩].کەواتە هەر ل سەردەمێ فیلۆلۆژیان ئەڤ چەندە جێگیر بوو کو پاراستنا نڤیسەر و بەرهەمان د زنجیرەیا مێژوویا وان دا گرنگە و پێدڤیە هەر بەرهەمەك لدویف زمان و ڕۆشنبیریا سەردەمێ خۆ بهێتە خواندن و شرۆڤەکرن، لێ ئەو جیاوازیا فیلۆلۆژیێ لگەل تیۆر و بۆچوونێن پشتی خۆ هەیە ئەڤەیە کو بەرێخودانا وان بۆ گوهرینێ پرانیا جاران نێگەتیڤە. پرانیا پێشەنگێن فیلۆلۆژیێ ((گوهرینێن زمانی مینا هەرفتنا دۆخێ ڕەسەنێ زمانەکی ل قەلەمددان، ئەو دۆخێ کو تێدا زمانەك ب ئاوایەکێ ئێکرەنگ دهاتە بکارهینان))[٩٠]

فیلۆلۆژیستان وەسا هزردکر کو (ب ڕێکا پیڤانێ دشێن بگەهنە قوناغێن دەستپێکیێن مێژوویێ. وان دگوت گوهرین چ نینە ژبلی پویچبوون و دوورکەفتن ژ ئێکرەنگی و ئێکانەبوونا دەستپێکێ)[٩١]، کەواتە ڕاستە کو زانایێن فیلۆلۆژی ب ڕێکخستن و پاراستنا بەرهەمێن کەڤن د زنجیرەییەکا مێژووییدا ڕابوون لێ کەڤن بوون و ڕابردوو پیڤەرەکێ گرنگ بوو دکارێ وان دا، وان وەسا هزر دکر کو گوهرین د زمانیدا بوویە ئەگەر کو زمان ڕوییێ خۆ یێ دروست ژ دەست بدەت و پێدڤیە ئەڤ ڕوییێ دروست ب ڕێکا ڤەکۆلینا دەقێن کەڤن بهێتە خویاکرن؛ ئەڤ چەندە ژی بوو ئەگەرێ جێگیربوونا ڤێ تێگەهشتنێ کو بەرهەمێن کەڤن باشتر و دروستتر و ڕەسەنترن. ب ڤی ڕەنگی دشێین بێژین کو ئاراستەیا فیلۆلۆژیا مێژوویا ئەدەبێ ڕەوابوونێ ددەتە لاساییکرنێ. ئەگەر ئەم باش تەماشەی ڤەکۆلینێن

شعرییێن ئیسلامی - عەرەبی بکەین دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو تارادەیەکێ زۆر مۆرکەکێ فیلۆلۆژی لسەر وان ژی زالە و پرانیا وان ب ئاوایەکێ ڕاستەوخۆ یان نەراستەوخۆ پشتەڤانیا لاساییکرنێ دکەن.

## ١.٣.٣. لاساییکرن وەك بەشەکێ سروشتی ژوەرارا ئەدەبی:

مێژوویا ئەدەبێ وەکو لقەك ژ ڤەکۆلینێن ئەدەبی لژێر کاریگەرییا فەلسەفا (ئەزموونگەرا) یا (جون لوك) و (هوبز)ی و پاشی تیۆرا (داروین)ی سەبارەت ب گەشەکرنێ سەرهلدایە. وان هەولدایە ب نێرینەکا زانستی تەماشای مێژووا ئەدەبیاتێ بکەن. ب دیتنا وان نڤیسەر بۆنەوەرەکێ جڤاکیە کو ژێر کاریگەرییا کاودانێن مێژوویێن هەر قوناغەکێ بەرهەمێ خۆ پێشکێش دکەت، ب ڤی ئاوایی بەهرە و شیانێن تاکەکەسی ڕۆلەکێ وەسا نابینن و پێدڤیە یاساییێن گشتی بۆ ئەدەبیاتا هەر قوناغەکێ هەبیت و ئێدی چێژ و بڕیارێن خودی چ ڕۆلەکێ وەسا ناگێرن. پێشەنگێن ڤێ نێرینێ ژی (سانت بیف) و (ئاپولیت تین) و (برۆنتیر) بوون[٩٢]. ل دویف نێرینا ڤان ڤەکۆلەران نکۆلی ل حەتمییەتا مێژوویا ئەدەبی ناهێتەکرن، بەرهەمێن ئەدەبی ژ لایەکیڤە ب کاودانێن سەردەمێ خۆڤە گرێداینە و ب ڕەنگڤەدانا قوناغێن مێژوویی یێن مللەتێن جودا جودا دهێنە هژمارتن و ژ لایەکێ دیڤە ژانرێن ئەدەبی ژی مینا گیانەوەران ژ ئەنجامێ وەرارێ ژدایک دبن و گەشەدکەن و ژێرکاریگەرییا جۆرێن بهێزتر ژناڤدچن، لێ خالا گرنگ د ڤێ نێرینێدا باوەری هەبوونە ب زنجیرەیبوونا ڕویدانێن ئەدەبی واتە وەکهەڤیا مێژوویا ئەدەبێ لگەل مێژوویا سیاسەت یان زانستی.

(فردیناند برۆنتێر) کو داخبار بوو ب تیۆرا داروینی باوەری (ب دیرۆکا ناڤخۆیا ئەدەبیاتێ) هەبوو، ((مێژوویا ناڤخۆیا ئەدەبیاتێ بریتیە ژ کارتێکرنا بەرهەمەکێ ئەدەبی لسەر بەرهەمەکێ دی، ڤێجا پۆزەتیڤ بیت یان نێگەتیڤ بیت. ئەڤە مەزنترین فاکتەرە د گۆهرین و وەرچەرخانا ئەدەبیاتێدا. ب دیتنا وی مەزنترین ئەرکێ مێژوونڤیسێ ئەدەبیاتێ دیارکرنا شەجەرەنامەیا بەرهەمانە.

ڕابردوو ب هەمی گرانیا خۆ فشارێ دئێخیتە سەر دەمێ نهو، مەزنترین هێزا کاریگەر د ئەدەبیاتێدا بریتیە ژ کاریگەرییا بەرهەمەکی لسەر بەرهەمەکێ دی. پەیوەندیەکا دوو لایەنە د ناڤبەرا ئەدەبیاتا نهو و ئەدەبیاتا بەرێدا هەیە، یان دێ لاساییا وێ کەت و یان دێ وێ ڕەتکەت، د هەر دوو هەلویستان دا ب ڕابردوویێڤە گرێدایە، واتە کار و کارڤەدان، نەریت و نویکرن بناغەنە بۆ بزاڤا ئەدەبیاتێ.))[٩٣]

ئەڤ جۆرە تێگەهشتنە بۆ مێژوویا ئەدەبیاتێ دبیتە ئەگەر کو ئێدی چ گرنگی ب ڕۆلێ بەهرە و داهێنانا تاکەکەسی نەهێتە دان، کەڤن و نوی، داهێنان و لاساییکرن دێ بنە هندەك دیاردەیێن ئاسایی کو کاودان و قوناغێن مێژوویی وان دسەپینت، واتە جیاوازی د ناڤبەرا نڤیسەرێ خودان بەهرە و داهێنەر لگەل نڤیسەرێن دی تەنها جهێ وانە د هێلا مێژوویێدا. ئەڤە ل وی دەمی کو هەر ژ ئێکەمین قوناغێن سەرهلدانا ئەدەبێ، لاساییکرن مینا هێزەکا سەرەکی د ئەدەبیاتێدا ڕۆلێ خۆ دیتیە و مێژوونڤیسان هەست ب هندێ کریە کو بەشەکێ مەزن ژ ئەدەبیاتێ لسەر بناغەیێ لاساییکرنێ هاتیە ئاڤاکرن، لێ ل ڤێرێ لاساییکرن و نویکرن ب چاڤەکی هاتینە تەماشاکرن چونکە دەرڤەی ئیرادا مرۆڤینە و بەشەکن ژ وەرارا ئەدەبی، هەر وەکو وەرارا زیندەوەران د تیۆرا داروینیدا.

ئەڤ ڕوانگەها دەستپێکیا مێژوویا ئەدەبێ کو لسەر بنگەهێ وەکهەڤیا ئەدەبێ لگەل دیاردەیێن سروشتی و بایلۆجی هاتبوو دانان پشتی ماوەیەکی کەفتە بەر هێرشا هندەك ڤەکۆلەران. (گوستاڤ لانسون)ێ فەرەنسی ئێک ژ پێشەنگێن ڤێ گۆرانکاریێ بوو. ب دیتنا وی ئەدەب بەروڤاژی زانستی خودان ئامادەبوونەکا زیندیە، بەرهەمێن ئەدەبی و هونەری هەمیشە چێژبەخشن و دشێن شیانێن بێ دویماهی پێشکێشی مرۆڤایەتی و شارستانیەتێ بکەن، دشێن مرۆڤایەتیێ بئازرینن و وەلێ بکەن کو هەستێ ب جوانیا هونەری و ئافراندنێ بکەت[٩٤]. ب دیتنا (لانسون)ی (چێ نابیت چ زانستەك لسەر بناغەیێ زانستێن دی بهێتە شرۆڤەکرن، بەلکو هەر زانستەك لسەر بناغەیێ سەربەخۆیی و جیاوازبوون ژ زانستێن دیە کو پێشدکەڤیت...)[٩٥].

ب ڤی ئاوایی نە ئەو بۆچوون و نێرینە ب تەواوەتی دروستن کو ئەدەبێ ب بەرهەمێ بەهرە و داهێنانا تاکەکەسی ل قەلم ددەن و چ بهایێ نادەنە کاریگەرییا پەیوەندییێن مێژوویی و نە ئەو بۆچوون کو چ بهایێ نادەنە بەهرە و عەبقەریتا نڤیسەری و کاودانێن مێژوویی ب تاکە فاکتەرێ سەرەکی د وەرار و گوهڕینا ئەدەبی ل قەلەم ددەن. ئێدی پێدڤیە گرنگی ب هەردوو لایەنان بهێتە دان، لەوما لانسون دبێژیت ((کارێ مە یێ سەرەکی بریتیە ژ نیاسینا دەقان و هەڤبەرکرنا وان داکو بشێین یێ کۆمی ژ یێ تاکەکەس و یێ ڕەسەن ژ یێ لاساییکری جودا بکەین، پاشی وان د جۆر و قوتابخانە و بزاڤاندا کۆم بکەین، پاشی پەیوەندییا ڤان دەستەیان لگەل ژیانا عەقلی و ڕەوشتی و جڤاکی د ناڤ وەلاتێ واندا و پاشی دەرڤەی وەلاتی، واتە ڕۆلێ وان د گەشەپێدانا ئەدەبیات و شارستانیەتا ئورووپی نیشان بدەین...)).[٩٦]

شێوەیێ کارکرنا مێژوویا ئەدەبی ژبۆ دەستنیشانکرنا قوناغ و ئاراستەیێن ئەدەبی لسەر بناغەیێ نیاسین و هەلبژارتنا (ساتێن گوهڕینێ)یە، ژێدەرێ پەیدابوونا مێژوویا ئەدەبی ب واتایەکا هویر ئەو دەمە کو مرۆڤ هەست ب مەسەلا وەرار و وەرچەرخانا ئەدەبیاتێ و ساتێن گوهڕینێ دکەت. بەری سەدێ هەڤدێ د ئەدەبیاتا ئورووپیدا هەست ب جیاوازیەکا وەسا د ناڤبەرا دەمێ نهو و ڕابردوو دا نەدهاتەکرن، بەرهەمێ سەردەمێ کەڤن مینا بەرهەمێن (هومیرۆس) و (ڤێرجیل)ی ب هەمان نێرین و تێگەهشتنا ئەدەبیاتا هەڤچەرخ دهاتنە خواندن. ل نێزیکی نیڤا ئێکێ ژ سەدێ نوزدێ ل ئوروپا هەستەك پەیدابوو کو ب ژێدەرێ مێژوویا ئەدەبیاتێ دهێتە نیاسین، ئەو ژی بریتی بوو ژ هەستکرن ب جیاوازبوونا کلاسیکێ ژ ڕۆمانتیکێ، لگەل هەستکرن ب جیاوازیا چێژا کلاسیکی ژ چێژا ڕۆمانتیکی، هەستکرن ب وەرچەرخانا دیرۆکی هاتەکرن، تا وی ڕادەی کو سروشتێ کلاسیکی ژ سروشتێ ڕۆمانتیکی هاتە جوداکرن و ب ڕوانگەهێن فەلسەفیێن جودا جودا گفتگو لسەر گوهڕینا چێژ و ئەدەبیاتێ هاتەکرن. ڕەخنەگر و نڤیسەران داکۆکی لسەر راستییا وەرار و گوهڕینا ئەدەبی و هونەری کر و جەخت سەر ڤێ یەکێ کرن کو

ئەدەبیاتێ ژی گوهرینێن مێژوویێن تایبەت ب خۆ هەنە و پێدڤیە سروشتێ هێلئاسایێ وێ د کاودانێن مێژوویێدا بهێتە دیراسەکرن و رێرەوێ وەرارا وێ بهێتە دیارکرن.[٩٧]

ب ڕاستی پێدڤیە مێژوویا ئەدەبێ لسەر بناغەیێ هەر دوو فاکتەران بهێتە ئاڤاکرن واتە نەریت یان کەلەپورێ ئەدەبی و بەهرە و داهێنانا کەسی.مێژوویا ئەدەبیاتێ گرنگیێ ددەتە بابەتێن ناڤخۆیا ئەدەبیاتێ (نەریتێن ئەدەبی) و وەرچەرخان و وەرار و پەیوەندییا د ناڤبەرا بەرهەمێن ئەدەبی. مێژوویا ئەدەبیاتێ دەربڕینە ژ نەریتەکێ گرنگ، نەریتەك کو ڕاوەستیایی و مەند نینە، بەلکو ڕێکخستنەکا بەردەوامە د هەمی قوناغاندا نهو یا وێ گرێدایە ب ڕابردویا وێڤە.نەریت (بهایێن کۆمی) و عەبقەریەت (بەهرا تاکەکەسی) هێزێن بزوێنەرێن دیرۆکا ئەدەبیاتێنە. شاکار و دەقێن مەزنێن ئەدەبی د بیردانکا دەمیدا بەردەوامن و کاریگەریێ لسەر مێژوو و چێژ و بیردانک و تێگەهشتنا نەوەیێن ئایندەیێ دکەن. ئەگەر مێژوونڤیسێ ئەدەبیاتێ ڕویدانێن ئەدەبی ب ئاوایەکێ ژهەڤ جودا بێخیتە بەر ڤەکۆلینێ و د ڤەکۆلینا خۆ دا زنجیرەییبوونا و بەردەوامبوونا چەوانیێن ئەدەبی بەرچاڤ نەگریت، دێ مێژوویەکا بێ گیان و مری نڤیسیت، مێژوویەکا پڕ ژ ڕویدانێن ئەدەبیێن ژهەڤقەتیای و پەرتەوازە کو پشتی ژدایکبوونێ ئێکسەر مرینە، هەروەکو چ ژیان و بەردەوامی بۆ وان نەبوویە)).[٩٨]

نەریتێ ئەدەبی بریتی نینە ژ بەرماییکێن بێ جان و مرییێن ڕابردوویێ، بەلکو مینا سیستەمەکێ زیندی لگەل نەوەیان بەردەوامە، نەریت لسەر بناغەیێ بەردەوامی و درێژەپێدان و وەرچەرخان هاتیە ئاڤاکرن.د ناڤ ڤی سیستەمێ بەردەوام دا تاکەکەس ڕۆلێ خۆ دبینیت. تاکەکەسییا هونەری و نەریتێ ئەدەبی پێکڤەگرێداینە، هەر شاعر یان نڤیسەرەکێ ناڤدار، لژێر کاریگەرییا نەریتێن ئەدەبی، شاکار و پێڤاژۆیێن ئەدەبی و هەلومەرجێن دیرۆکی ئافراندنێ دکەت، بەردەوامی و زیندیبونا نەریتی گرێدایە ب داهێنانا نڤیسەریڤە، تاکێتی و ئێکانەبوونا نڤیسەری د ناڤ ڕەگەزێن نەریتی و د رێرەوێ ئەدەبیاتێدا دهێتە نیاسین.

هەر نڤیسەرەکی نویخواز و شاعرەکێ ڕەسەن پەیوەندیەکا دوو لایەنە لگەل نەریتی هەیە هندەك تشتان ژ دیرۆکا ئەدەبی و نەریتی وەردگریت و هندەك تشتان ژی لسەر زیدە دکەت و ب ڤی ڕەنگی جهێ خۆ د زنجیرەیا مێژوویا ئەدەبیاتێ دگریت[٩٩]، کەواتە ل وی دەمی ئەم دشێین دیاردەیا لاساییکرنێ د ئەدەبیاتا مللەتەکی بدەینە خویاکرن کو د شرۆڤەکرنا مێژوویا ئەدەبیاتا وی مللەتی لسەر هەردوو فاکتەران کاریکەین :یا ئێکێ نەریت و پەیوەندییا دەق و نڤیسەران ب درێژییا دەمی و یا دوویێ تاکێتی یانکو داهێنانا تاکەکەسیا نڤیسەری. ئەڤ هەر دوو فاکتەرە تەواکەرێن هەڤدوونە، بێ هەڤدوو بێ واتانە، تەنانەت بەشەکن ژ هەڤدوو، چونکە هەر نەریت یان تشتەکێ لاساییکری ل سەردەمێ خۆ داهێنانەکا تاکەکەسی بوویە و هەر داهێنانەکا تاکەکەسی ژی ل باشەرۆژێ دێ بیتە بەشەك ژ نەریت و لاساییکرنێ، هەر لسەر ڤی بناغەی (عبدالوهاب البیاتی) سەبارەت ب لاساییکرنێ دبێژیت ((... هەر شێوازەك یان ڕێبازەك ل دەستپێکێ شورشەکە لێ پشتی ماوەیەکی دبیتە دژە شورش. ئەگەر ئەڤ دەربڕینە د جهێ خۆ دا بیت، واتە دێ هشك بیت و دهێتە گوهرین بۆ یاسا و بەند و دیوارێن کو شاعر تێدا دبیتە دیل و دهێتەچارچووڤەکرن.))[١٠٠]

## ١.٣.٤. لاساییکرن و نێرینا فۆرمالیستان بۆ وەرارا ئەدەبی:

ل دەستپێکێ ( فۆرمالیستان لسەر دەقێن سەربەخۆ کاردکر، لێ ئامانجا وان ژ ڤی کاری دەستنیشانکرنا تایبەتمەندییێن وی دەقی نەبوو بەلکو وان هەولددا خالا هەڤپشکا تەڤایا دەقێن ئەدەبی، یانکو ڕەگەزێ هەڤپشك و زال بسەر ڤان دەقان دەستنیشان بکەن. لدویف دیتنا فۆرمالیستان ڤەکۆلینا ئەدەبێ زانستە، لەوما مینا زانایێن ڕاستەقینە گرنگیددانە یاساییێن گشتی، ب دیتنا وان هندی یاسایەکا گشتی هەبیت باشترە)[١٠١]، هەر ئەڤ چەندە ژی بوو ئەگەر کو ئەو لایەنێ وەرار و لاساییکرن و داهێنانێ فەرامۆش بکەن.

دەمێ كو فۆرمالیزم پێشكەفتی یانكو دەمێ نەوەیێ دوویێ ژ فۆرمالیستان ب ڕێبەراتیا (تینیانۆف)ی سەرهلدای؛ گوهڕینەكا مەزن كەفتە نێرینا فۆرمالیستان، ئەو گەهشتنە ڤی ئەنجامی كو پێدڤیە ڤەكۆلینێن ئەدەبی ببنە زانستەكێ سیستەماتیك و دانانا یاساییێن گشتی بۆ ئامرازێن ئەدەبی كارەكێ هەلەیە.وان گرنگیدا ب نائاشناكرنێ و گەهشتنە ڤی ئەنجامی كو نائاشناكرن ب تنێ ژ ئەنجامێ هەڤدژی و جیاوازییێ دروست دبیت.[١٠٢] بۆچوونا وان ئەڤە بوو كو ئەم (ژبلی هندێ كو دشێین بەرهەمەكێ ئەدەبی كو هەمی بەشێن وێ لگەل هەڤ پەیوەندیدارن و پێكڤەگرێداینە وەكو سیستەم یان بنیاتەكی تەماشا بكەین. چێدبیت یانكو پێدڤیە تەڤایا ئەدەبیاتێ ژی مینا سیستەم یانكو بنیاتەكی وەرگرین، ئەو دەقێن سەربەخۆ كو تەنیشت هەڤ ئەدەبێ پێك دهینن بەری هەر تشتەكی ژ ئەنجامێ ڤەگەریان بۆ دەقێن دیێن سەر ب وی ژانری و پاشی بۆ تەڤایا ئەدەبێ خۆ دچەسپینن.)[١٠٣]

گرنگترین فاكتەر كو بوو ئەگەر ڤەكۆلینێن فۆرمالیستان بەرەڤ گرنگیدان ب وەرارا ئەدەبی و باوەری هەبوون ب سیستەمێ ئەدەبی و پەیوەندییا دەقان ب هەڤدووڤە بچیت چەمكێ نائاشناكرنێ (ostranenie)یێ بوو، (ئەڤ زاراڤە بۆ ئێكەمین جار ژ لایێ شكلوڤێسكیڤە هاتە باسكرن، ل دەستپێكێ بریتی بوو ژ وی شێوەیێ كو بەرهەمێ ئەدەبی دشێت ب ڕێكا وێ هەستێ مە بەرامبەر دیاردەیێن ژیانێ نوییكەتەڤە. ب دیتنا وی هەستپێكرنا مە بۆ ژیانێ ژ ئەنجامێ دووبارەبوونێ چێژا خۆ ژدەست ددەت و دبیتە ئۆتۆماتیك، ئوتوماتیكبون ژی دبیتە ئەگەر كو تشت كەڤن ببن، لێ ئەدەب ڕوانگەهێن نائاشنا و نامۆ و شێوەیێن نەچاڤەرێكری بۆ دیتنا وان پێشكێشی مە دكەت داكو تشتان وەسا ببینین هەر وەكو ئێكەم جارە وان دبینین. مەبەستا (شكلوڤێسكی) ژ نائاشناكرنێ ب تنێ نێرین و هەستپێكرنەكا نوی نەبوو، بەلكو یا گرنگتر بكارهینانا كۆمەكا تەكنیكان بوو كو دبوونە ئاستەنگ د ڕێكا وەرگرتن یانكو تێگەهشتنا ڕاستەوخۆ دا)[١٠٤]، واتە بۆ گەهشتن ب ئامانجا نائاشناكرنێ پێدڤیە هەمی دەمان مفا ژ تەكنیكێن نوی و نائاشنا بهێتە

وەرگرتن، ئەگەر ئەڤ تەکنیکە گەلەك دووبارەبوون دێ وەکو دیاردەیێن ژیانێ ئۆتۆماتیک بن و کاریگەرییا خۆ ژ دەست دەن.

ب ڤی ڕەنگی نائاشناکرن ڕووبەروویێ ئۆتۆماتیککرنا هەستێن ژیانا ڕۆژانە و ئۆتۆماتیککرنا پەیڤ و تەکنیکێن ئەدەبی ڕادوەستیت. فۆرمالیست گەهشتنە ڤێ قەناعەتێ کو ڕوانگەهێن نائاشنا ڕۆژەکێ دێ ئاشنا بن و لادانێن نەچاڤەرێکری ژی دێ ل داویێ چاڤەرێکری بن. لدویف دیتنا (تۆماشفێسکی) تەکنیک ژدایک دبن و دژین و پیر دبن و دمرن، هندی بکارهینانا وان ئۆتۆماتیکتر بیت مفا وکاریگەرییا وان دێ کێمتر بیت و ئێدی ناکەڤنە بن سیبەرا تەکنیکێن پەسندکری، ژبۆ ڕێگریکرن ژ ڤێ چەندێ ئەم پێدڤی تەکنیکێن نوی ب واتا و کاریگەرییێن نوینە.[١٠٥] ل ڤێرێ مەسەلا شعریەتێ ب وەراریڤە هاتەگرێدان، چ شعریەت نەمر نینن، واتە ژ ئەنجامێ دووبارەکرن و لاساییکرنێ سنوورێ د ناڤبەرا زمانێ ئەدەبی و زمانێ ئۆتۆماتیکی نامینیت یانکو نائاشناکرن بەرەڤ لاوازییێڤە دچیت و ئێدی ئەدەب پێدڤی شعریەتەکا نوییە، لێ لگەل هندێ ژی چ تەکنیک یان ڕەگەزێن ئەدەبی ژی ب ئێکجاری نامرن، واتە چێدبیت پشتی دەربازبوونا دەمەکێ درێژ ژ فەرامۆشکرنا کۆمەکا تەکنیکێن ئەدەبی جارەکا دی نڤیسەر بۆ ڕابردوویێ بزڤرن و وان تەکنیکان ساخکەنەڤە. هەر لسەر ڤی بنەمای فۆرمالیستان باسێ فاکتەرێ زال یانکو فاکتەرێ ئاڤاکەر د هەر قوناغەکا ئەدەبیدا کر.

ل هەر قوناغەکا ئەدەبی ئێک ژ ڕەگەزێن ئاڤاکەرێن دەقی مینا ئاراستەیا زال دهێتە نیاسین و ب ڕێکا وێیە کو ئەدەبیات خۆ ژ توتوماتیکبوونێ ڕزگار دکەت، لێ ژ ئەنجامێ دووبارەبوونێ ئەو فاکتەرێ زال دبیتە ئۆتۆماتیک و فاکتەرەکێ دی جهێ وێ دگریت؛ داکو جارەکا دی ئەدەبێ ژ ئوتوماتیکبوونێ ڕزگار بکەت، کەواتە ئێدی باوەری ب چ فاکتەرێن ئاڤاکەر یان ئاراستەیێن زالێن هەمیشەیی بۆ ئەدەبیاتێ نامینیت.ئەو تشتێ کو ل ڤێرێ گرنگە ئەوە کو فۆرمالیستان باوەری ب میراتگریا ئەدەبی ب چەمکێ خۆ یێ کەڤن نینە واتە ژ لایەکیڤە وان باوەری ب هندێ نینە کو هەر نەوەیەك ژ نڤیسەران تەمامکەرێ

کاریٚ نەوەییٚ بەری خۆیە و ژ لایەکیٚ دیڤە باوەری ب هندیٚ هەنە کو هەر فاکتەرەکیٚ ئاڤاکەریٚ نوی ژ کەلەپوری ئەدەبی دهێتە وەرگرتن لیٚ ب ئاوایەکیٚ نەراستەوخۆ.

(تینیانوف) دبێژیت وەرارا زمانیٚ ئەدەبیٚ مینا گوهرینا رێکوپێک وبەرنامەبودانانییا نەریتیٚ نینە، بەلکو جێگورکێیا مەزنا نەریتانە. نڤیسەر دشێن وەك کارڤەدانەك دژی ئاراستەیا زالا جێگیرا ئەڤرو بەریٚ خۆ بدەنە ئاراستەیا زالا جێگیرا بەری خۆ، بۆ نموونە د ئەدەبیاتا ئنگلیزیدا نڤیسەرێن رۆمانتیک گرنگی ددانە سەردەمیٚ رێنسانسیٚ و سەدێن ناڤەراست و نڤیسەرێن مودێرنیزم ژ گرنگییٚ ددەنە نڤیسەرێن باروك و میتافیزیکگەرا. (شکلوڤێسکی) ئەڤ پێڤاژۆیە ب پێڤاژۆیا ژ باپیری (یان بابیٚ باپیری) بۆ نەڤیان ناڤکر. هێلەکا دی ژی رەنگە هەبیت ئەو ژی هێلا گوهرینا ئەدەبیە ژ خالی بۆ خوارزای یان ژ مامی بۆ برازای کو تێدا جۆرەك کو بەری هنگی هاتیە پەراوێزخستن جارەکا دی دبیتە سەنتەریٚ پیتەپێدانیٚ، بۆ نموونە رۆمانتیکێن ئنگلیزی گرنگیدانە چیرۆکێن پەریان و رۆمانس و رۆمانێن گوتیک و مللی. لسەر ڤی بناغەی پێگەهشتنا ئەدەبیٚ دینامیکییە و پێدڤی وان گوهرینان نینە کو د جڤاکیدا روی ددەن، لۆژیکا شورەشیٚ، لۆژیکا فۆرمییە نە لۆژیکا ناڤەروکیٚ. ب دیتنا شکلوڤێسکی (فۆرمیٚ نوی) ژبۆ دەربرینا ناڤەروکەکا نوی نینە، بەلکو بۆ گوهرینا فۆرمەکیٚ کەڤنە کو ژییٚ ویٚ ژ مفاداربوونا ویٚ یا هونەری درێژتر بوویە. (تینیانوف) ل سالا ١٩٢٤ز راگەهاند کو بزاڤا ئەدەبی وەکو پێڤاژۆیا بەردەواما نویکرن و ڤەژاندنا فۆرمێن ئەدەبییە. ئەو بۆ ڤیٚ پێڤاژۆییٚ چوار قوناغان دەستنیشان دکەت:١- پەیدابوونا فاکتەرەکیٚ ئاڤاکەریٚ نوی ل هەمبەر فاکتەرەکیٚ ئاڤاکەریٚ ئوتوماتیک، ٢- بکارهینانا ڤی فاکتەری لسەر بناغەیەکیٚ نوی، ٣- بکارهینانا بەرفرەها ڤی فاکتەری، ٤- ئۆتۆماتیکبوونا ڤی فاکتەری و دەرکەفتنا فاکتەرەکیٚ ئاڤاکەریٚ هەڤدژ.[١٠٦]

ب ڤی رەنگی فۆرمالیستان کۆمەکا گوهرینان ئێخستە تێگەهشتنا وەرارا ئەدەبی، بەری هەر تشتەکی وان داکۆکی لسەر ڤیٚ چەندیٚ کر کو وەرارا ئەدەبی

وەرارا شعریەتێیە و چ پەیوەندی ب ناڤەروکێڤە نینە.ل هەر قوناغەکێ هندەك ئامراز یان شێوەیێن ئەدەب دبنە فاکتەرێن زال یان فاکتەرێن ئاڤاکەر د ژانرەکێ ئەدەبی دا، لێ چ فاکتەرێن ئاڤاکەر یان ئاراستەییێن زال هەتا هەتایی نینن، بەلکو ژ ئەنجامێ دووبارەبوونێ وبکارهینانا زێدە چێژا خۆ ژ دەست ددەن و فاکتەر یانکو ئاراستەییێن نوییێن زال جهێ وان دگرن. د هەمان دەم دا داکۆکی لسەر ڤێ چەندێ ژی کرن کو ئەڤ نویکرنا د ئەدەبیاتێدا چێدبیت، بریتی نینە ژ ڤەگۆهاستنەکا رێکوپێک ژ نەوەیەکی بۆ نەوەیەکێ دی، بەلکو بریتیە ژ ململانە و رەتکرنێ. راستە کو فاکتەرێ ئاڤاکەرێ نوی پشتبەستنێ ب کەلەپورێ ئەدەبێ دکەت لێ ئەڤ پشتبەستنە د هێلەکا راستدا نینە واتە یان بریتیە ژ مفاوەرگرتن ژ فاکتەرێن کو هاتینە ژبیرکرن یان هاتینە پەراوێزخستن.هەر وەسا فۆرمالیستان گەلەك باوەری ب رۆلێ تاکەکەسی د ڤێ گوهرینێدا نینە و ڤێ وەرارێ وەکو بەشەك ژ سروشتێ ئەدەبێ ددەنەنیاسین.

نهۆ ئەم دشێین بێژین کو مێژوویا ئەدەبێ نێرینەکا چەسپاو بۆ مەسەلا لاساییکرنێ نینە. هەبوونا هەر جیاوازیەکێ د تیۆر و بۆچوونێن مێژوونڤیسان دبیتە ئەگەرێ خویابوونا نێرینەکا جیاواز بۆ مەسەلا لاساییکرنێ؛ ب ڤی رەنگی گەلەك ئاراستەییێن هەڤدژ و نەگونجاو لدور ڤی بابەتی دهێنە دیتن، واتە جارنا لسەر بنەمایێ نکۆلیکرن ل هەبوونا مێژوویا ئەدەبێ چ بها ب لاساییکرنێ ناهێتە دان، جارنا ژی نە بتنێ دان پێ دهێتە دان بەلکو جۆرە رەوابوونەك ژی پێدهێتەدان، جارنا جەختکرن لسەر رۆلێ تاکەکەسی دبیتە ئەگەرێ فەرامۆشکرنا لاساییکرنێ و جاران گرێدانا ئەدەبێ ب کاودانێن جڤاکی و مێژوویی و شرۆڤەکرنا وێ ل بن سیبەرا حەتمییەتا مێژوویی دبیتە ئەگەر کو سەرەدەریەکا وەکهەڤ لگەل لاساییکرن و داهێنانێ بهێتەکرن، هندەك جاران ژی بایەخ ب لاساییکرنێ دهێتە دان و مینا جۆرە پیڤەرەك بۆ هەبوون و نەبوونا نویکرنێ سەرەدەری لگەل دهێتەکرن.

## ١.٤. ئەدەبێ بەراورد و لاسایيكرنا دەرەكی:

سەبارەت ب جهێ ئەدەبێ بەراورد د ناڤ ڤەكۆلینێن ئەدەبیدا یان مەرجێن وێ و ئامانجێن وێ چ ڕێككەفتنەك د ناڤبەرا قوتابخانەیێن ئەدەبێ بەراورد و ڤەكۆلەرێن سەر ب ڤان قوتابخانەیانڤە ناهێتە دیتن و تەنها تشتێ كو تەڤایا ڤەكۆلەر و بسپورێن ڤی بواری لسەر ڕێككەفتینە ئەڤەیە كو (( ئەدەبێ بەراورد بریتیە ژ ڤەكۆلینا ئەدەبێ ژ دەرڤەی سنوورێن نەتەوەیی))[١٠٧]. هندەك لایەنێن گرێدای ب دابێشا بەرواردكرنێ مینا جیاوازیا زمانی كو ئێك ژ تەوەرێن سەرەكییێن ناكۆكیا د ناڤبەرا قوتابخانێن ئەدەبێ بەراوردە، پەیوەندیەكا ڕاستەوخۆ ب بابەتێ مەڤە نینە، لەوما نابنە جهێ گرنگیپێدانا مە. گرنگترین لایەنێ ئەدەبێ بەراوردێ كو پێویستە ئەم لسەر ڕاوەستین ڕۆلێ فاكتەرێ مێژوویی و مەسەلا كاریگەریكرن و پێكاریگەربوونێیە كو پەیوەندیەكا ڕاستەوخۆ ب بابەتێ لاساییكرنێڤە هەیە.

### ١.٤.١. كاریگەری و فاكتەرێ مێژوویی:

پەیوەندییا ئەدەبێ بەراورد ب مێژوویا ئەدەبێ ئێك ژ وان خالانە كو گەلەك دانوستاندن لسەر هاتیەكرن، چەوانیا بەرێخودانا ڤەكۆلەری بۆ كاریگەرییا ڤی فاكتەری. پەسەندكرن یان ڕەتكرنا وێ، گوهڕینێن ڕیشەیی دئێخیتە ڤەكۆلینێن بەراوردیدا و بابەتێ كاریگەری یان لاساییكرنێ ژی بەرەڤ ئاراستەییێن جیاوازڤە دبەت.

زالبوونا بەرێخوادانا مێژوویی لسەر ڤەكۆلینێن ئەدەبییێن سەدێ نوزدێ و بەشەكێ مەزن ژ سەدێ بیستێ زەمینەیا سەرەكیا سەرهلدانا ئێكەمین قوتابخانەیا ئەدەبێ بەراورد ل فەرەنسا بوو، لەوما ئەڤ قوتابخانەیە لسەر بناغەیێ پرەنسیپێن سەرەكیێن ڤان ڤەكۆلینان واتە (ڕێژەیی بوونا دەم و جهی، هۆكاریبوونا دیرۆكا ئەدەبی، وەرار و گوهڕینا ئەدەبی، بەلگەداربوون و سەلماندن)ێ هاتە ئاڤاكرن،

کەواتە بنەمایێن کارێ مێژوویا ئەدەبی بوو بنەمایێ کارێ ئەدەبێ بەراورد لێ ب ئاوایەکێ جیاواز.(١٠٨)

(ڤان تیگم) کو ب ئێک ژ دامەزرێنەر و پێشەنگێن ڤێ قوتابخانەیێ دهێتە نیاسین، لدەستپێکێ مێژوونڤیسێ ئەدەبێ بوو و پاشی بوو بەراوردکار، لەوما تێگەهشتنا خۆ یا مێژوویی ڤەگوهاستە بوارێ ئەدەبێ بەراوردی(١٠٩). گرنگیدان ب فاکتەرێ کاریگەریکرن و پێکاریگەربوون د ڤەکۆلینا مێژوویا ئەدەبێ لسەر بناغەیێ باوەری نەبوون ب ڕەسەنایەتی و گۆشەگیریا ڕەها یا بەرهەمێن ئەدەبی د چارچووڤێ ئەدەبێ نەتەوایەتیدا، بوو ئەگەر کو (ڤان تیگم) داکوکیێ لسەر ڤێ چەندێ بکەت کو چەوا بەرهەمێ ئەدەبی د چارچووڤێ ئەدەبێ نەتەوەیەکێدا گوشەگیر نینە، واتە ب دانوستاندنێ رادبیت، ژ دەرڤەی سنوورێ ئەدەبێ نەتەوەیی ژی گۆشەگیر نینە و کاریگەری کرن و پێکاریگەربوون د ناڤبەرا ئەدەبێن نەتەوەییدا ژی هەیە.(١١٠)

ئەدەبێ بەراورد ژ ناڤ جەرگێ ڤەکۆلینێن مێژووییدا دەرکەفت و لسەر پرەنسیپێن وێ هاتە ئاڤاکرن لێ ئەو تشتێ بوو ئەگەر کو مینا ڤەکۆلینەکا سەربەخۆ بهێتە تەماشاکرن، ئەڤە بوو کو پێشاندانا کاریگەریکرن و پێکاریگەربوونێ د ناڤبەرا دوو ئەدەباندا د بسپۆری و شیانا مێژوونڤیسێ ئەدەبێدا نینە و پێدڤیی ب بسپۆریەکا تایبەت هەیە(١١١)، کەواتە ڤەکۆلەرێن قوتابخانەیا فەرەنسی باوەری ب ڤێ چەندێ هەنە کو ڤەکۆلینا بەراوردکاری لسەر بناغەیەکێ مێژوویی دهێتە ئەنجامدان، ئەو ئەدەبێ بەراورد دکەنە بەشەك ژ مێژوویا ئەدەبێ، ب دیتنا وان لقەکە ژ لقێن وێ. مەعریفا مێژوویی مەرجەکە ژ مەرجێن بەراوردکرنێ، ئەو دخوازن کو پەیڤا بەراوردێ چ واتایێن ئیستاتیکی نەبیت و ب تنێ ڕەهەندێ مێژوویی بخۆڤە بگریت(١١٢). هەر لسەر ڤی بنەمای ((گرنگترین مەرج د قوتابخانەیا فەرەنسیدا بهەڤگەهشتن و کاریگەریە، ئەڤە ژی گرێدایە ب پەیوەندییا مێژوویا د ناڤبەرا دوو لایەنان:ڤرێکەر و وەرگر. پێدڤیە ئەڤ دوو لایەنە ژلایێ زمانیڤە ژهەڤ جودا بن و دڤێت ئێک ژ وان بەری یێ دی بیت و پەیوەندی د

ناڤبەرا وان دا هەبیت، بڤی ڕەنگی پەیوەندی، پەیوەندیەکا هۆکاریە، یێ ئێکێ دێ کارتێکرنەك لسەر یێ دوویێ هەبیت...)).[113]

پێدڤیە دەڤێن ئاشکرا یان بەلگەیێن مێژوویێن بهێز هەبن داکو پەیوەندییا د ناڤبەرا دوو لایەنێن کو ڤەکۆلینا بەراوردی لسەر وان دهێتە کرن بسەلمینن، چونکە وەکهەڤیا دوو دەقان تشتەکێ خاپینۆکە و چێدبیت ئەڤ وەکهەڤیە بەرهەمێ وەکهەڤیا کاودان یان ڕێبازا نڤیسەران و تەنانەت ڕێکەفتنێ بیت[114]، کەواتە هەبوونا وەکهەڤیێن گەلەك ئاشکرا د ناڤبەرا دوو دەقان بۆ سەلماندنا پەیوەندییا د ناڤبەرا وان یان بکارهینانا ڤان وەکهەڤیان وەك بەلگەیەك بۆ سەلماندنا هەبوونا پەیوەندییێن مێژوویی ژ لایێ ڤان ڤەکۆلەرانڤە ناهێتە پەسەندکرن.

لگەل ئەو گوهرینێن کو ل سەدێ بیستێ چێبووین نەمازە گەشەکرنا ئاراستەیا سنکرونیکی و لاوازبوونا ڤەکۆلینێن دایکرۆنیکی، گرنگیدان ب مێژوویا ئەدەبێ بەرەڤ لاوازیێڤە چوو، پرەنسیپێن ڤەکۆلینێن مێژوویی هاتنە ڕەتکرن و گرنگیدان ب ڕەخنەیا ئەدەبی وەکو ڤەکۆلینەکا سنکرۆنیکی جهێ وێ گرت، ئێدی ماهییەتا ئەدەبێ و شعریەت و فۆرمێ ئەدەبێ بوونە جهێ گرنگیپێدانێ. ئەڤ چەندە ب ئاوایەکێ بهێز ل زانکۆیێن ئەمریکی و ژ ناڤەراستا سەدێ بیستێ ڤە دهێتە دیتن.هەر ئەڤ نێرینا نوی بوو ئەگەر کو قوتابخانەکا نوی د وارێ ئەدەبێ بەراورد دا سەرهەلبدەت کو باوەری ب گرنگبوونا پەیوەندییا کاریگەریکرن و پێکاریگەربوونێ د ناڤبەرا دوو ئەدەبێن جیاوازدا و سەلماندنا وێ ب ڕێکا بەلگەیێن مێژوویی وەکو بەشەك ژ ئەرکێ ڤەکۆلینێن بەراوردکاریێ نەبیت.لاوازبوونا باوەریا ڤان ڤەکۆلەران ب زنجیرەیی بوونا مێژوویا ئەدەبێ بوو ئەگەر کو ئەدەبێ بەراورد لدەڤ وان بریتی بیت ژ ڤەکۆلینا دیاردەیێن ئەدەبییێن وەکهەڤ د ناڤبەرا دوو یان چەند ئەدەبێن جیاواز دا بێ گرنگیدان ب لایەنێ مێژوویی و هەبوونا مەرجێ کاریگەری و پێ کاریگەربوونێ[115]. کەواتە ئەگەر قوتابخانەیا فەرەنسی بەرهەمێ ڤەکۆلینێن دایکرۆنیکی بیت، قوتابخانەیا ئەمریکی ژی بەرهەمێ ڤەکۆلینێن سنکرۆنیکیە.

ئەو رێکا کو قوتابخانەیا فەرەنسی بۆ شرۆڤەکرنا مەسەلا لاساییکرن و کاریگەریێ بکاردهینیت گەلەك جاران دشێت هاریکاریا مە بکەت بۆ زانینا ڤێ چەندێ کو هەر نڤیسەرەکی تا چ ڕادە لاساییا ئەدەبێ بیانی کریە و تا چ ڕادە شیایە ئافراندنێ د ئەدەبێ نەتەوەییدا بکەت یان چەوا شیایە کاریگەریێ لسەر ئەدەبیاتا مللەتێن دی بکەت. قوتابخانەیا فەرەنسی ب هەر ئاوایەکی بیت مەسەلا ڕەسەنایەتی و لاساییکرنێ بۆ ئەدەبیاتا هەر مللەتەکی دئازرینیت، لێ قوتابخانەیا ئەمریکی ژ بەر گرنگینەدان ب فاکتەرێ مێژوویێ نەشێت یانکو باشتر بێژین نەڤێت لسەر ڤی بابەتی ڕاوەستیت، لەوما چ ڕێکاران بۆ ڕاڤەکرنا مەسەلا لاساییکرنێ پێشکێش ناکەت.

## ١.٤.٢. بەرزنرخاندنا کاریگەرییا دەرەکی:

ڤەکۆلەرێن قوتابخانەیا فەرەنسی سەبارەت ب سروشت و چەوانیا کاریگەری و لاساییکرنا د ناڤبەرا دوو نڤیسەر یان دوو بەرهەم یان دوو ئەدەبێن سەر ب دوو نەتەوەیێن جودا د چارچووڤەکێ مێژووییدا خودان بیر و بۆچوونێن تایبەتن کو ئەگەر ئەم باش تەماشەی وان بکەین دێ بینین کو ژ ئەنجامێ کاریگەرییا کلاسیزما فەرەنسی لێ ب ئاوایەکێ نوی هاتینە پێشکێشکرن. ب دیتنا ڤان ڤەکۆلەران لاساییکرن و کاریگەرییا ڕاستەقینە و بەرهەمدار ئەوە کو د ناڤبەرا دوو لایەنێن سەر ب دوو نەتەوە و زمانێن جودا دا چێ دبیت. (ڤان تیگم )سەبارەت ب ڤێ چەندێ دبێژیت ((خالەکا مای کو مە وەکو پێدڤی ئەو ڕۆهن نەکریەڤە، مە باسێ وان کاریگەرییا کر کو نڤیسەر وان دئافرینیت یان دکەڤیتە ژێر کارتێکرنا وان، مەبەستا مە ژێدەر و وەرگرتنا بابەتان یان هزران یان فۆرمێن هونەری بوو، بێ گومان ڤان کاریگەرییان گرنگییا خۆ د چارچووڤێ ئەدەبەکێ دیارکریدا هەیە... لێ ئەگەر لاساییکرن د سنوورێ نەتەوەیەکیدا بهێتە چارچووڤەدارکرن گەلەك ب پیت نابیت... یان دێ ب تنێ بریتی بیت ژ کاریگەریەکا گشتی و هشیارکرنا بەهرەیێن ڤەشارتی ب ڕێکا داخباربوون ب نڤیسەرەکێ کەڤن و

پێرەویکرنا وی یان دێ بیتە جۆرەك ژ كۆپلایەتیێ كو ڕەسەنایەتیێ ژناڤدبەت...)).[١١٦] وەكو خویایە ئەڤ تێگەهشتنە هەر ژ سەردەمێ ڕۆمانیان تاكو سەرهلدانا ڕۆمانتیسیزمێ بسەر ئەدەبێ ئورووپی زالبوویە، هەر ئەڤە ژی بوویە ئێك ژ ئەگەرێن جوداكرنا ئەدەبێ بەراورد ژ مێژوویا ئەدەبێ. ب دیتنا قوتابخانەیا فەرەنسی پێكاریگەربوون ب ئەدەبێ نەتەوەیێن دی مفادارە لێ كاریگەرییا نڤیسەرێن سەر ب ئەدەبەكێ دیاركری ب هەڤدوو پتر لاساییكرن یان كۆپیكرنەكا بێ بەرهەمە، لێ ئەڤ خالا كو قوتابخانەیا فەرەنسی داكوكیێ لسەر دكەت بریتیە ژ ئەدگارەكێ ئەدەبێ ئورووپی و مەرج نینە هەمی دەمان كاریگەری و پێكاریگەربوونا نڤیسەرێن سەر ب ئەدەبەكێ دیاركری ب تنێ لاساییكرنەكا بێ بەرهەم بیت. ئەگەر ئەم باوەریێ ب ڤێ چەندێ بینین پێدڤیە بۆ پێشكەفتنا ئەدەبێ یونانی ژی لدویف كاریگەرییا ئەدەبێ نەتەوەیێن دی لسەر یونانیان بگەڕین.

## ١.٤.٣. جوداكرنا كاریگەرییا پۆزەتیڤ ژ لاساییكرنێ:

تایبەتمەندیەكا دیا قوتابخانەیا فەرەنسی ئەڤەیە كو ب نێرینەكا تایبەت بەرێخو ددەتە كاریگەریكرن و پێكاریگەربوونا د ناڤبەرا دوو نڤیسەر یان دوو كتێب یان دوو ئەدەبێن سەر ب دوو نەتەوەیێن جیاوازڤە. (جان ماری كاریە) ـ وەكو قوتابیێ (ڤان تیگم)ی ـ ددەتە دیاركرن كو ئەدەبێ بەراورد ب ئاوایەكێ جەوهەری گرنگیێ نادەتە بها و ڕەسەنایەتیا بەرهەمان، (( بەلكو پتر گرنگیێ ددەتە ئەو گوهەڕینێن كو وەلاتەك یان نڤیسەرەك د تشێن وەرگرتیدا ئەنجام ددەت. ب ڕاستی ژی پرانیا جاران واتا پەیڤا كاریگەریێ بریتیە ژ ڕاڤەكرن، كارڤەدان، بەرگری و ڕووبەرووبوونێ))[١١٧]. هەروەسا (ئەلكساندەر دیما) ژی پشتی دیاركرنا تایبەتمەندیێن قوتابخانەیا فەرەنسی سەبارەت ب كاریگەریێ دبێژیت: (( لێ پێدڤیە ئەڤە وەكو بۆماوەیا جیهانا گیانەوەر و ڕووەكان نەهێتەزانین، چونكە بریتی نینە ژ بەرهەمهینانەكا وەكهەڤ. بەرهەمهینان د وارێ ئەدەبێدا جیاوازە؛ ژبەر جیاوازیا زمان و سروشت و ناسنامەیێ، ڤێجا چێدبیت لایەنێ كاریگەر ب تنێ داهێنانا

ڤەشارتیا دەروونێ کەسێ پێکاریگەر بئازرینیت، ب ڕەنگەکێ وەسا کو نڤیسەرێ پێکاریگەر سەربەخۆیا خۆ بپارێزیت))[118]، کەواتە ئەدەبێ بەراورد گرنگییێ ددەتە ڤەکۆلینا پەیوەندییا د ناڤبەرا نڤیسەران، ڤێجا هەر چەوا بیت؛ بیت، وەرگێران یان لاساییکرن بیت، یان ئەو کاریگەری بیت کو نڤیسەر ملکەچی کاریگەرییێ بوویە یان ئەوا کو گۆهرین ئێخستینە بەرهەمێ وەرگرتی یان ئەوا کو بەرگری ل دژی وێ کریە.[119]

ل ڤێرێ ئەدەبێ بەراورد نێزیکی بۆچوونا نڤیسەرێن کلاسیکی دەربارەی مەرجێن لاساییکرنێ دبیت. قوتابخانەیا فەرەنسی ب تنێ لدویف هندێ نینە کو ڕەسەن بوون یان لاسایی بوونا بەرهەمەکی یان نڤیسەرەکی یان ئەدەبەکێ نەتەوایەتی نیشان بدەت بەلکو تشتێ گرنگتر مەسەلا ڤەگۆهاستنا دیاردەکێیە بۆ دەرڤەی سنوورێن نەتەوەیی و چەوانیا سەردەریکرن لگەل ڤێ دیاردەیێ ژ لایێ ئەدەبێ مللەتێن دیڤە، واتە ئەزموون و هەولێن قوتابخانەیا فەرەنسی دێ مفای گەهیننە مە بۆ ڤاڤارتنا جۆرێن کاریگەری و لاساییکرنێ، هەر ژ لاساییکرنەکا ناهونەری و بێ داهێنان بگرە تاکو کاریگەرییێن بەرهەمدار کو دشێین بێژیین ژ سنوورێ لاساییکرنێ دەردکەڤن، لێ دهەمان دەم دا چێدبیت وەکو ئامرازەکێ بهێتە بکارهینان بۆ ڕەواکرنا لاساییکرنێ ب تایبەت دەمێ ئایدلۆژیێن نەتەوەیی یان ئایینی ڕۆلێ خۆ دبینن.

## ١. ٤. ٤. گرنگیدان ب پەیوەندی و کاریگەرییا دوولایەن:

تایبەتمەندیەکا دیا قوتابخانەیا فەرەنسی ئەڤەیە کو ب تنێ باوەری ب پەیوەندییێن دوو لایەنە هەیە و نەڤێت ڤەکۆلینا بەراوردکاری ژ ڤی چارچووڤی دەرکەڤیت، گرنگترین بەلگە ژی جوداکرنا ئەدەبێ بەراوردە ژ زانستێ ئەدەبێ گشتی. (ڤان تیگم) ( د ڤێ باوەرییێدایە کو ئەدەبێ بەراورد ب تنێ ڤەکۆلینێ لسەر پەیوەندییێن دوو لایەنە دکەت، ڤێجا چێدبیت ئەڤ لایەنە دوو نڤیسەر یان دوو پەرتووک یان دوو کۆمێن نڤیسەران یان دوو کۆمێن کتێبان یان دوو ئەدەبێن جودا

بن، لێ زانستێ ئەدەبێ گشتی وان ڤەکۆلینان بخۆڤە دگریت کو گرنگییێ ددەنە ڕویدان و لایەنێن هەڤپشک د ناڤبەرا چەندین ئەدەباندا، ئەڤە ژی وەکهەڤی و ئالوگۆڕییێ بخۆڤەدگریت لەوما زانستێ ئەدەبێ گشتی جیاوازە ژ مێژوویا ئەدەبێ نەتەوەیی و ئەدەبێ بەراورد، ئەڤ زانستە لسەر بناغەیێ وەرارا مێژوویی ئاڤا نەبوویە و گرنگترین ئەدگارێ وێ ژی بەرفرەهیا جهی و ڕووبەرێ جوگرافییە.[١٢٠]کەواتە (ڤان تیگم) ئەدەبێ بەراورد سنووردارکریە ب ڤەکۆلینا پەیوەندییێن دوو لایەنە د ناڤبەرا دوو ئەدەباندا. ئەدەبێ گشتی ژی گرنگییێ ددەتە بزاڤ و جۆرێن بەربەلاڤ کو چەندین ئەدەبان بخۆڤەدگریت، لێ ب دیتنا (رینیە ویلک)ی ئەڤ جوداکرنە ناکەڤیتە د وارێ کارەکیدا و ئەگەر ب هویری ڤەکۆلینێ لسەر بکەین دێ بینین کو دروست نینە، لەوما ئەڤ مەترسیە هەیە کو ئەدەبێ بەراورد ببیتە هندەك بەشێن پەرتەوازە کو چ پەیوەندی د ناڤبەرا وان دا نەبیت؛ ب ڤێ واتایا بەرتەنگ ڤەکۆلەرێ بەراوردکار نەشێت چ کاران ژبلی ڤەکۆلینا کاریگەرییان و هۆکار و ئەنجامێن وان بکەت. ب دیتنا (رینییە ویلک)ی هەر هەولەك بۆ دانانا دیوارێن دەسچێکەر د ناڤبەرا ئەدەبێ بەراورد و ئەدەبێ گشتیدا بهێتەدان سەرکەفتنێ بدەستڤە نائینیت، چونکە مێژوویا ئەدەبێ و ڤەکۆلینا ئەدەبی ڤەکۆلینێ لسەر بابەتەکی دکەن کو ئەو ژی ئەدەبە. سنووردارکرنا ئەدەبێ بەراورد د چارچووڤێ بازرگانیا د ناڤبەرا دوو ئەدەباندا واتە گرنگیدان ب تشتێن دەرەکی، نڤیسەرێن پلە دوو، وەرگێران و گەرۆك و ناڤبەندان؛ ب ڤی ڕەنگی ئەدەبێ بەراورد دێ بیتە زانستەك کو ئامانجا وێ کومکرنا زانیاریانە دەربارەی ژێدەرێن دەرەکی و ناڤودەنگێ نڤیسەری.[١٢١]

(رینییە ویلک) وەکو ئێک ژ جەمسەرێن سەرەکییێن قوتابخانەیا ئەدەبێ بەراوردێ ئەمریکی و وەکو ئێک ژ درێژەپێدەرێن فۆرمالیستا ڕوسی باوەری ب ڤێ جوداکرنێ نینە ڕەنگە ئەڤە ژی دەرئەنجامێ باوەری نەبوونا وی ب ڕۆلێ فاکتەرێ مێژوویی د ڤەکۆلینێن ئەدەبی بیت، لێ لگەل هندێ ژی رەخنەیا وی د جهێ خۆ دایە. جوداکرنا ئەدەبێ بەراورد ژ زانستێ ئەدەبێ گشتی دبیتە ئەگەر کو نێرینا مە بۆ دیاردەیێن ئەدەبی وەکو پێدڤی نەبیت. ئەم نەشێین هەمی ڕەهەندێن

کاریگەریێ یانکو ڤەگوهاستنا دیاردەکا ئەدەبی بدەینە دیارکرن. پرانیا جاران لاساییکرن د پەیوەندییێن دووو لایەنە دا ناهێتە شرۆڤەکرن و پێدڤیە وەکو دیاردەیەك ژ ڤی چارچووڤی دەرکەڤیت، ژ لایەکیڤە مینا دیاردەکا بەربەلاڤ د ناڤبەرا چەند نەتەوەیان و ژ لایەکێ دیڤە د چارچووڤێ ئەدەبێ نەتەوەییدا بهێتە شرۆڤەکرن.

## ١.٠٤.٠٥. رۆلێ نەرێنییێ ڤەکۆلینێن بەراوردکارییێ:

رەخنەیەکا دی کو بۆ ڤەکۆلینا کاریگەرییێن دووو لایەنە د ناڤبەرا دووو ئەدەبێن جیاواز دا دهێتە ئاراستەکرن، کاریگەرییا ئایدیۆلۆیا ڤەکۆلەرانە ب تایبەتی ئایدۆلۆژیا نەتەوەیی و نیشتیمانی. (رینییە ویلک) رەخنەیێ ژ ڤێ چەندێ دگریت؛ ب دیتنا وی ئەو فاکتەرێ نیشتیمانی کو ل پشت گەلەك ژ ڤەکۆلینێن بەراوردکاری ل فەرەنسا و ئیتالیا و ئەلمانیا و وەلاتێن دی هەیە بوویە ئەگەرێ دروستبوونا سیستەمەکێ نامۆ د وارێ رۆشنبیرییێ دا، هەر ڤەکۆلەرەك هەولددەت ب رێکا ڤان ڤەکۆلینان کۆگەها ئەدەبێ خۆ یێ نیشتیمانی پێبگەهینیت، واتە ژ لایەکیڤە ڤێ چەندێ نیشان بدەت کو ئەدەبێ وییێ نیشتیمانی تا چ رادە کاریگەری لسەر نەتەوەییێن دی هەبوویە و ژ لایەکێ دیڤە دڤێت ڤێ چەندێ بسەلمینیت کو ئەدەبێ وییێ نیشتیمانی باشتر ژ ئەدەبێن دی شیایە سەرەدەرییێ لگەل بەرهەمێ نڤیسەرەکێ ناڤدارێ بیانی بکەت، یانکو باشتر ژ نەتەوەییێن دی شیایە ل وی بەرهەمی بگەهیت.[١٢٢] ئەڤە بخۆ دژی ئامانجا ئەدەبێ بەراوردە کو هەولددەت ئەدەبێ نەتەوایەتی ژ گۆشەگیرییێ رزگار بکەت یانکو وەکو (رینییە ایتامبل) دبێژیت (( ئەو ئەدگارێ کو پێدڤیە بەراوردکار پێ رابیت خۆ رزگارکرنە ژ هەمی جۆرێن شۆفینیەت و هەرێمگەرایی و دانپێنانە ب هەبوونا بهایێن دوولایەنێن بەری ملیونها سالان...)).[١٢٣]

پێدڤیە ڤەکۆلینا دیاردەیێن وەکو کاریگەریێ یان لاساییکرنێ ژێر کاریگەرییا ئایدۆلۆژییێن دیارکری نەبن، ب ئاوایەکێ وەسا نەبن کو هەول بۆ

سەپاندنا بهایێ ڤرێکەری لسەر کیستێ وەرگری بهێتە دان.واتە ئامانج ب تنێ ڤەکۆلین لسەر چەوانیا ڤەگۆهاستنا دیاردەکا ئەدەبی بۆ دەرڤەی سنوورێن نەتەوەیی و چەوانیا سەرەدەریکرن لگەل ڤێ دیاردەیێ د سەقایێ نەتەوەییێ لایەنێ دوویێ بیت، ڤێجا چ ئەڤ سەرەدەریکرنە نێگەتیڤ بیت یان پۆزەتیڤ بیت. هەر وەکو (ڤایسشتاین) مینا ڤەکۆلەرەکێ فەرەنسی کو هەولدایە رێککەفتنەکێ د ناڤبەرا قوتابخانەیا فەرەنسی و ئەمریکیدا بکەت دبێژیت: (( لدەڤ زانایێ بەراوردیێ د پرۆسا کاریگەرییێدا چ جیاوازی د ناڤبەرا بهایێ ڤرێکەر و وەرگری نینە، چ کێماسی بۆ نڤیسەری نینە ئەگەر تشتەکی وەرگریت. هەروەسا ئەو نڤیسەرێ تشتەکی دهنێریت ژی هەژی ستایشکرنێ نینە، ڤرێکەر هایدارانە ب ڤی کاری رانابیت و وەرگر ژی نابیتە دیڤەلانک، ب تنێ دهندەك حالەتێن دەگمەندا نەبیت. یا باش ئەوە ئەم وەسا تەماشای لاساییکرنێ بکەین کو کاریگەریەکا هایدارانەیە و کاریگەری لاساییکرنەکا نەهایدارانەیە.))[١٢٤]

ئەو تشتێ کو ل ڤێرێ دبیتە جهێ پرسیارێ ئەوە کو سەرەرای داکوکیکرنا قوتابخانەیا فەرەنسی و ژمارەکا زۆر ژ بەراوردکاران لسەر بێ لایەنبوونا ڤەکۆلەری و گرنگینەدان ب بهایێ ڤرێکەری یان وەرگری، تا چ رادە ڤەکۆلەرێ بەراوردکار شیایە خۆ ژ ڤێ ئاریشێ رزگاربکەت، چونکە گەلەك جاران ئەڤ ڤەکۆلینە بووینە ئەگەرێ پۆلینکرنا نڤیسەر و بەرهەم و ئەدەبیاتا مللەتان بۆ ئەدەبێن پلە ئێک و پلە دوو. قوتابخانەیا فەرەنسی دهێتە تاوانبارکرن کو ب رێکا ئازراندنا مەسەلا کاریگەریکرن و پێکاریگەربوونێ دخوازیت خزمەتا رێحەزا نەتەوەیا فەرەنسی بکەت. قوتابخانەیا ئەمریکی ژی لسەر بناغەیێ سروشتێ جڤاك و ئەدەبێ ئەمریکی هاتیە ئاڤاکرن و ئاراستەیەکا کۆلۆنیالیزمیە و ئامانجا وێ ئەوە کو جیهانێ وەکو گوندەکێ بچووك لێ بکەت و چ جهان بۆ بابەتێن نەتەوەیی نەهێلیت، ئەڤ بەرێخودانا مرۆڤایەتیا نوی خزمەتا حەزا ئەمریکیا نوی دکەت ژبۆ زالبوون بسەر تەڤایا جیهانێ لژێر درووشمێ مرۆڤایەتیا ئەدەبێ[١٢٥]. پێرەویکرن ژ قوتابخانەیا فەرەنسی سەرەرای ئەو مفایێن کو دگەهینیتە ڤەکۆلینا دیاردەیێن

مينا لاساييكرن و كاريگەريێ د چارچووڤەكێ مێژوويیدا لێ ڕەنگە ژ لايەكيڤە ببيتە ئەگەر كو نێرينا مە بۆ لاساييكرن يان كاريگەريێ گەلەك بهێتە سنووردارکرن، ژ لايەكێ ديڤە ژى چێدبيت ئەم وێ وەكو ئامرازەكێ بۆ چەسپاندنا ئايدۆلۆژيا خۆ يا نەتەوەيی بكاربينين.هەر وەسا قوتابخانەيا ئەمريكی ب ڕێكا گرنگينەدان ب فاكتەرێ مێژوويی و مەسەلا كاريگەريكرن و پێكاريگەربوونێ دبيتە ئەگەر كو ئەم ئێدی گرنگيەكا وەسا نەدەينە دياردەيێن لاساييكرن و كاريگەريێ و ڕۆلێ سەقايێ جڤاكی و نەتەوەييێن دەقان ژی فەرامۆش بكەين و د ئەنجام دا ب گەلەك هەڤبەركرنا ڕابين كو چ مفايەكی ناگەهيننە ئەدەبێ.

## ١.٥. هەلويستێ هەڤتێكستيێ ل هەمبەر لاساييكرنێ:

هەڤتێكستی لسەر بناغەيێ هزرەكا سادە هاتيە ئاڤاكرن، ئەو ژی ئەڤەيە كو ((دەق سيستەمەكێ داخراو، سەربەخۆ، خۆبخۆيی نينە، بەلكو خودان پەيوەنديەكا دوولايەنە و نێزيكە لگەل دەقێن دی)).(١٢٦) ب ڕێكا پشتبەستن ب دەقەكی و بێ گرنگيدان ب پەيوەنديیا وێ ب دەقێن ديڤە تێگەهشتنا مە بۆ دەقی تەمام نابيت، چونكە كەس نەشێت بێ مفاوەرگرتن ژ پەيڤ و دەربڕينێن كو يێن بەری وی بكارئينايين تشتەكی بنڤيسيت، كەواتە هەڤتێكستی ڤێ ڕاستيێ ددەتە خوياكرن كو هەمی ڕويدان ب ڕەنگەكی گرێداينە ب ڕويدانێن بەری خۆڤە و مفای ژ وان وەردگرن. ئەم دشێين دەقەكی ب ئەلەقەكێ د زنجيرەيا هەڤتێكستيێ ل قەلەم بدەين، واتە كۆمەكا دەقان كو د ناڤ واندا هەر دەقەك هندەك ڕەگەزێن دەقەكێ دی يان دەقێن دی بخۆڤەدگريت.(١٢٧)

### ١.٥.١. ئالۆزبوونا چەمكێ هەڤتێكستيێ:

سەرەرای سادەبوونا تێگەهێ دەستپێكيێ هەڤتێكستيێ لێ لگەل گەشەكرنا ڤان ڤەكۆلينان؛ چەمكێ ڤی زاراڤی ڕۆژ ب ڕۆژ زێدەتر و زێدەتر بەرەڤ

بەرفرەهی و ئالۆزییێ ڤە چوویە، هەتا وی ڕادەی کو ئێدی دەستنیشانکرنا چەمک و واتایا ڤی زاراڤی کارەکێ ئەستەمە.

هەتا نهو ئەڤ زاراڤە ب گەلەك ئاوایێن جیاواز هاتیە پێناسەکرن و ئێدی مینا گەلەك زاراڤێن دیێن ئەدەبی و ڕەخنەیی کەس نەشێت ب دروستی واتایا وێ دەستنیشان بکەت. هەڤتێکستی وەکو ئێک ژ هزرێن سەرەکییێن تیۆرا ئەدەبییا هەڤچەرخ، زاراڤەکێ زەلال نینە، هەرچەندە هندەك ڕەخنەگر گەلەك پشتراست ڤی زاراڤی بکاردهینن، لێ ب ڕاستی بکارهینانا ڤی زاراڤی ڤالا نینە ژ ئالۆزییێ، ئەڤ مەترسیە لسەر ڤی زاراڤی هەیە کو ئێدی بریتی نەبیت ژ چ تشتان ژبلی ئەو تشتێ کو ڤەکۆلەری دڤێت ئەو بیت.[١٢٨]

نە ب تنێ شرۆڤەکرنێن جیاواز بۆ زاراڤێ هەڤتێکستیێ هەنە، بەلکو پراکتیزەکرنێن جودا و جیاواز ژی بۆ هەنە. جارنا هند بەرفرەه دبیت کو مینا چەمکێ هەڤتێکستیێ ل دەڤ (جولیاکریستیڤا)یێ گوتارا جڤاکی و مێژوویا دەقی و کاریگەرییا وێ لسەر نڤیسین و تێگەهشتنا دەقی بخۆڤە دگریت، جارنا ژی واتایا وێ هند بەرتەنگ دبیت کو تنێ بۆ هندەك حالەتێن دیارکری دهێتە بکارهینان. هەرچەندە کو گەلەك ژ ڕەخنەگرێن ڕۆژئاڤایی هەولدداینە کو ڤی زاراڤی بۆ کردەوە و چالاکییێن دیارکری بکاربینن لێ دڤی کاریدا سەرکەفتی نەبووینە[١٢٩]، یانکو بکارهینانا زاراڤێ هەڤتێکستیێ توشی ئالۆزیەکا زۆر بوویە هەتا وی ڕادەی کو ئەم دشێین بێژین (هەر تێکستەك ب هەر ڕەنگەکی لگەل تێکستێن دی ژیا بیت دچیتە چارچووڤێ هەڤتێکستیێ، کەواتە ئەڤ پەیڤە یا بوویە ملکێ هەمی کەسان چونکە دەلالەتێ لسەر تشتەکێ دیارکری ناکەت)[١٣٠]، لەوما جارنا بابەتێن لاساییکرن و کاریگەرییێ ب بەشەك ژ هەڤتێکستیێ ناهێنە زانین و جارنا ژی هندەك ڤەکۆلەر گرنگی پێ ددەن و وەکو بەشەك ژ پەیوەندییێن هەڤتێکستیێ وان ژی دئێخنە بەر باس و ڤەکۆلینێن خۆ.

### ١.٥.٢. بەرێخودانا نەومیێ ئێکێ بۆ لاساییکرنێ:

ژ لایێ مێژوویڤە چەمکێ هەڤتێکستییێ بۆ ڤەکۆلینێن بەراوردکاران (ئەدەبێ بەراورد) و تەنانەت بەری هنگی ژی ڤەدگەریت. بەراوردکاران ڤەکۆلین لسەر ڤی چەمکی کریە و وەکو ئامرازەك بۆ شرۆڤەکرنێ بکارئینایە لێ د سیمیۆلۆژیا نوی و تیۆرا ئەدەبییا نویدا هەول بۆ هندێ هاتیەدان کو ئەڤ چەمکە وەك ئامراز یان رێکارەکێ نوی بهێتە بکارهینان[١٣١]، واتە راستە کو هەڤتێکستی ل سالێن شێستان ژ سەدێ بیستێ و لسەر دەستێ (جولیا کریستیڤا)یێ هاتیە د مەیدانا ڤەکۆلینێن ئەدەبیدا و تا وی رادەی گەشەکریە کو ئێدی ناهێتە فەرامۆشکرن لێ لگەل هندێ ژی هەڤتێکستی گەلەك چالاکیێن نڤیسینێ بخۆڤە دگریت کو دبنەرەتدا کەڤنن:چ تێکست ب ئاوایەکێ ڤەقەتیای ژ تێکستێن بەرێ ناهێتە نڤیسین، هەر تێکستەك ئاشکرا یان نەئاشکرا هەلگرێ کاریگەری و بیرەوەرییاکەلەپور و نەریتانە، هەڤتێکستی ئەوە کو هەر نڤیسەرەك بەردەوام دکەڤیتە چارچووڤێ کارێن بەری خۆ و چ جاران نەشێت بەرهەمێن بەری خۆ ژناڤ ببەت.[١٣٢]

هەر ئەڤ چەمکێن سەرەتایی و ئاشکراییێن هەڤتێکستییێ ئاماژەیەکن بۆ هندێ کو هەڤتێکستی دشێت بابەتێن وەکو لاساییکرن و کاریگەری و وەرگرتن و تەنانەت تێهەلکێش و گەلەك پەیوەندییێن دوولایەنییێن دی چارەسەربکەت، لێ ئەگەر ئەم باش تەماشەی پێشەنگێن تیۆرا هەڤتێکستییێ بکەین ب تایبەتی کریستیڤا و نڤیسەرێن دیێن سەر ب گروپا (تیل کیل)ڤە، دێ بینین کو تیۆرا هەڤتێکستییێ لدەڤ وان لسەر بناغەیێ هندەك پەیوەندییێن تایبەت هاتیە ئاڤاکرن. (هەڤتێکستی ل فەرەنسا مینا دروشمێ سەرەکیێ گروپێ (تیل کیل) هاتە بکارهینان، ئەندامێن ڤی گروپی ب رێکا ڤی چەمکی و تەڤلیهەڤکرنا وێ لگەل بۆچوونێن (فردیناند دیسوسێر) و (کارل مارکس) و (سیگموند فروید)ی ب رەخنەگرتن ژ بنیاتگەریێ رابوون، ئێدی ڤەکۆلینا دەقی بریتی نەبوو ژ شرۆڤەکرنا

واتا و پەیوەندییا زمانی د چوارچوڤێ دەقەکیدا، بەلکو بریتی بوو ژ ڤەکۆلینا دەلالەت و پەیوەندییا هەر نیشانە و دەقەکی لگەل نیشانە و دەقێن دی.)[١٣٣]

(زاراڤێ هەڤتێکستی (intertextualiet) بۆ ئێکەمین جار ل سالێن شێستان ژ سەدێ بیستێ ژلایێ (جولیا کریستیڤا)یێ ڤە هاتیە بکارهینان، هەڤتێکستییا وێ زێدەتر بریتیە ژ وەرار دیالۆگیزما (میخائیل باختین)ێ ڕووسی، (باختین)ی بۆ ئێکەمین جار باسێ دیالۆگیزم و فرەدەنگیا ئایدیۆلۆژی د ئەدەبێ و ب تایبەتی د ڕۆمانێدا کریە و مەبەستا وی ژ دیالوگیێ هەبوونا چەندین دەنگان بوو کو دەربڕینێ ژ هەلویست و بۆچوونێن جیاواز دەربارەی جیهانێ یان ڕویدانێن ڕۆمانێ دکەن، لێ لدەڤ (کریستیڤا)یێ هەڤتێکستی زێدەتر بریتیە ژ ئەدگارەکی کو بۆ پەیوەندییا د ناڤبەرا ئاخفتن یان ڕاگەهاندنا (enonec) ناڤ دەقەکی لگەل هندەك ئاخفتن و ڕاگەهاندنێن دی د ناڤ دەقێن دیدا دهێتە بکارهینان.[١٣٤]

(کریستیڤا) د ڤێ باوەرییێدا بوو کو ل جهێ ڤێ چەندێ کو ئەم بتنێ گرنگیێ بدەینە بنیاتێ (structure) دەقی، پێدڤیە ڤەکۆلینێ لسەر دارشتنا شیانێن ئاڤاکرنا (structuration) دەقی بکەین، واتە چەوا ئەڤ بنیاتە چێدبیت و هەبوونا خۆ بدەستڤە دهینیت. ئەڤە ژی پێدڤی ڤێ چەندێیە کو دەقی بێخینە چارچووڤێ تەڤایا دەقێن بەرێ و یێن هەڤدەم کو دبنە ئەگەرێ چێبوونا گۆرانکاریان (transformations) د دەقیدا، کەواتە ب دیتنا کریستیڤایێ دەق بریتیە ژ گۆهرینا دەربڕینێن بەرێ و یێن هەڤدەم.[١٣٥]

ل ڤێرێ هەڤتێکستی د هەمبێزا ڤەکۆلینێن بنیاتگەری و لسەر بناغەیێ گرنگیدان ب دەقی سەرهلدایە لێ ب نێرینەکا نوی کو گرێدایە ب قوناغا پوست بنیاتگەری و پوست مودێرنیزمێڤە. (( هەرچەندە ئەوێن کو ئەڤ زاراڤە بکارئینایین سەر ب بنیاتگەریا گرتی بوون لێ ئەڤ زاراڤە بخۆ ڕەتکرنەکا ئاشکرابوو بۆ ڤێ تیۆرێ، هەر وەکو کریستیڤایێ داکۆکی لسەر ڤێ چەندێ کر کو هەڤتێکستی مێشتن و گوهڕینا دەقێن بەرێیە))[١٣٦]، ژبەرهندێ دشێین بێژین هەڤتێکستی هەولەك بوو بۆ ڕزگارکرنا ڤەکۆلینێن ئەدەبی ژ ئاراستەیا سنکرۆنیکیا ڕەها کو د

ڤەكۆلینێن بونیاتگەریدا دهاتە دیتن. هەڤتێكستی گرنكیا ڤەكۆلینێن دایكرۆنیكی د واریٚ ئەدەبێدا ددەت خویاكرن لیٚ ب نێرینەكا نوی واتە لسەر بناغەییٚ پەیوەندییا دەقان ب هەڤدووڤە، بیٚ گرنگیدان ب نڤیسەری و فاكتەرێن دیێن دەرەكی، كەواتە هەڤتێكستییٚ باوەری ب وەرارا دەقێن ئەدەبی هەیە.

لدەڤ كریستیڤاییٚ (هەڤتێكستی بابەتەكیٚ سەربەخۆیە كو مرۆڤ دشێت گەلەك ب ساناهی هەستیٚ پێبكەت و ویٚ دەستنیشان بكەت.لدەڤ ویٚ هەڤتێكستی دبنەرەتدا بریتیە ژ گۆهرینا دەقان (une permutation de textes). ئەو داكوكییٚ لسەر هندیٚ دكەت كو د سەقاییٚ دەقیدا هندەك تشت هەنە كو ژ دەقێن دی هاتینە وەرگرتن لیٚ ئەڤ چەندە لسەر بناغەییٚ هەڤدووبڕین و ژكارخستنێیە. دەق پێكهاتەیە؛ بیاڤەكە بۆ ئالوگۆركرنا وان پارچەیێن كو ژ دەقێن دی هاتینە وەرگرتن و سەرژنوی هاتینە دابەشكرن ژبۆ بەرهەمهینانا دەقەكیٚ نوی لسەر بناغەییٚ دەقێن بەریٚ كو هاتینە وێرانكرن و خاپوركرن و سەر ژنوی هاتینە بكارهینان، ژبەرهندیٚ مەسەلا گەڕیان لدویڤ دەقیٚ بەریٚ یان ئەو دەقیٚ كو هەڤتێكستی لگەل هاتیەكرن كارەكیٚ بێهودەیە. هەڤتێكستی لدەڤ (كریستیڤا)ییٚ بریتی نینە ژ دووبارە بەرهەمهینانا دەقەكی ب ڕێكا دەستكاریكرنا دەقەكیٚ دی، یانكو پرۆسەیەكیٚ دەستنیشانكری نینە، بەلكو بریتیە ژ چالاكییەكا دەقی(١٣٧). ب دەربڕینەكا دی ((دەق بەرهەمهێنەرە، كۆچكرنا دەقانە و و ناڤهەڤچوونەكا دەقانە، د سەقاییٚ دەقەكیٚ دیاركریدا ئەو دەربڕینێن كو ژ دەقێن دی هاتینە وەرگرتن ب ڕێكا مێشتن و گوهڕینیٚ دگەهنە هەڤدوو).(١٣٨)

هەر لسەر ڤی بناغەی و پشتی ماوەیەك ژ بكارهینانا ڤی زاراڤی، (كریستیڤا) داكوكییٚ ل ڤیٚ چەندیٚ دكەت كو (هەڤتێكستی لاساییكرن یان دووبارە بەرهەمهینان نینە بەلكو ئالوگۆركرنە (transposition). ئەڤە ژی پێشنیارەكە ژبۆ سەرژنوی دەستنیشانكرنا چەمكیٚ هەڤتێكستییٚ. ئەو دبێژیت كو هەڤتێكستی بریتیە ژ ئالوگۆركرنا شێوەیەكیٚ نیشانەیان یان زێدەتر لگەل هندەك شێوەیێن دی)(١٣٩)، كەواتە مەبەستا (كریستیڤا)ییٚ ژ هەڤتێكستی زێدەتر

(پەیوەندیەکە د ناڤبەرا گوتارا دەقەکی و ئەو گوتارێن کو لگەل ڤی دەقینە یان دەوروبەرێ ڤی دەقی گرتینە، تارادەیەکێ زۆر وان پەیوەندییان ب خۆڤە ناگریت کو لسەر بناغەیێ وەرگرتن یان دزی یان لاساییکرنێ و ب رێکا ڤەدیتنا رستەیێن وەکهەڤ یان نێزیک د ناڤبەرا دەقان دا دهێنە باسکرن)[١٤٠]. ل ڤێرێ هەڤتێکستیێ ئەو پەیوەندییێن ئاشکرا ب خۆڤە ناگریت کو بەری (کریستیڤا)یێ د مەیدانا ڤەکۆلینێن ئەدەبیدا باو بووینە، بەلکو کۆمەکا پەیوەندییێن ڤەشارتی ب خۆڤەدگریت کو دەقی ئاڤادکەن، واتە دەقێن بەرێ د ناڤ دەقێ نویدا دحەلن و کەس نەشێت ب ئاشکرایی هەستێ ب دەوسا وان د دەقێ نویدا بکەت، ب دەربڕینەکا دی ئەو تشتێ (کریستیڤا)یێ پێشکێشکری زێدەتر تیۆرەکە دەربارەی دەقی و تشتەکێ گشتیە و بۆ پراکتیکرنێ نەهاتیە پێشکێشکرن.

(رۆلان بارت) ژی هەر درێژەپێدەرێ رێکا کریستیڤاییێیە، ئەو د ڤێ باوەرییێدایە کو (دەق ژ ئەنجامێ ڤەهاندنا کۆمەکا وەرگرتە و ژێدەر و دەنگڤەدان و پەیڤێن کلتورییێن کەڤن و هەڤچەرخ پێکهاتیە. دەق بەردەوام ژ لایەکی دەربازدبیتە لایەکێ دی، ئەو هەڤتێکستییا کو د دەقەکی خۆیادبیت، تەنها بریتیە ژ هەڤتێکستی بۆ دەقەکێ دی و چێنابیت ب رەهـ یان ژێدەر بۆ دەقەکی بهێتە هژمارتن، ب دیتنا (رۆلان بارت)ی گەریان لدویڤ سەرچاوەیێن کارەکی یان ئەو تشێن کاریگەری لسەر هەبووینە دچیتە چارچووڤێ ئەفسانەیا ئەسل و نەسەبێ، ئەو وەرگرتەیێن کو دەقی پێکدهینن، نەدیارن، بێ ئەدگارن... ئەو وەرگرتەیێن بێ کڤانن)[١٤١].

وەسا دیارە کو باوەری نەبوون ب رۆلێ نڤیسەری و گرنگیدان ب پەیوەندییا د ناڤبەرا دەقان بناغەیێ چەمکێ هەڤتێکستیێ لدەڤ (کریستیڤا) و (رۆلان بارت)ی بوویە، لەوما تشتەکێ گەلەك ئاسایە کو ئەو گرنگیێ نەدەنە وان پەیوەندییێن کو نڤیسەر ب ئاگەهی و زانینا خۆ ب سازدانا وان رادبیت و داکوکیێ لسەر وان پەیوەندییێن ڤەشارتی بکەن کو دبنە ئەگەرێ دروستبوونا دەقەکێ نوی. ب کورتی

مەبەستا كریستیڤا و بارتی ژ هەڤتێكستیێ كاریگەریكرن و پێكاریگەربوون و گەریان لدویڤ ژێدەرێ دەقان نینە.

نهو ژی پرانیا جاران ئەڤ تێگەهشتنە لسەر چەمكێ هەڤتێكستیێ زالە، واتە هەڤتێكستی تیۆرەكە بۆ شرۆڤەكرنا پێكهاتنا دەقی، ((ڤەكۆلینا هەڤتێكستیێ هەمی دەقان بخۆڤە دگریت ڤێجا ژ هەر جۆرەكی بن، ب تنێ خۆ ب مەسەلا ژێدەر و كاریگەریێ ڤە گرێنادەت. ئەو بیاڤەكێ بەرفرەهە بۆ شێوەیێن نەدیار، ئەوێن كو مرۆڤ زەحمەت بشێت سەرچاوەیا وان بزانیت، ئەو تشتێن كو بێ هەستپێكرنا نڤیسەری دهێنە ناڤ دەقی، واتە ئەو تشتێن كو مرۆڤ نەشێت وان دانیتە د ناڤبەرا دوو كڤاناندا. هەڤتێكستی مۆركەكێ جڤاكی ددەتە تیۆرا دەقی، تەڤایا ئاخفتنا چوویی و ئەڤا هەی دكەڤنە دچارچووڤێ دەقیدا لێ نە ب ئاوایەكێ ئاشكرا و نە ب رێكا وێ لاساییكرنا كو مرۆڤی ب خۆ دڤێت بەلكو ب رەنگەكێ وەسا كو حالەتێ بەرهەمهینانێ بدەتە دەقی و وەلێ نەكەت كو بریتی بیت ژ دووبارەكرنا بەرهەمهینانێ.[١٤٢]كەواتە هەڤتێكستی بریتیە ژ پێكهینانا دەقەكێ نوی ژ دەقێن بەری خۆ و یێن هەڤچەرخ، لێ ب ئاوایەكێ ئەركی، واتە دەقێ نوی بریتی بیت ژ كورتییەك ژ دەقێن دی كو سنوورێن د ناڤبەرا وان ژناڤچووینە، هەر وەكو مرۆڤ بێژیت كو پاشماییێن چەندیین كانزایان هاتینە لێكدان و دارشتن بۆ پێكهینانا كانزایەكێ نوی. ئێدی د ناڤبەرا ڤی دەقێ نوی و دەقێن بەرێ چ نامینیت ژ بلی هندەك كەرستە و نیشانە كو بەرێ مە ددەنە ئەو ژێدەرێن كو ژێ هاتین، ل ڤێرێ تشتێن نەشعری ژی تەڤلی شعرێ دبن و دچنە د ناڤ شعرێدا و كارلێكێ لگەل دكەن و پێكڤە دهێنە گرێدان، ب رەنگەكێ وەسا كو بەرزە دبن و ژبلی هندەك بسپۆران كەس نەشێت هەستێ ب هەبوونا وان بكەت.[١٤٣]

ل ڤێرێ رێككەفتنەك د ناڤبەرا چەمكێ هەڤتێكستیێ و چەمكێ داهێنەرانەیا كاریگەریێ هەیە، لێ هەڤتێكستی جیاوازە ژ وێ كاریگەرییا كو دچیتە چارچووڤێ لاساییكرنێ، ئەو تشتێ كو هەڤتێكستی و كاریگەریێ پێكڤە گرێ ددەت پرەنسیپێ (پێش بوون) و (پاش بوون)یێیە، واتە دەقێ نوی (ئەو دەقێ ل پێشیێ)

ئەنجامێ بەرهەمهینانا دەقێن بەرێیە، ڤێجا بەرنیاس بن یان نەبن. (ئەو دەقێن دکەڤنە پاش دەقێ ل پێشیێ)، یان بریتینە ژ کورتیا ژمارەکا زۆر ژ وان دەقێن کو دبیردانکا نڤیسەریدانە یان د بێ ئاگەهیا ویدا هاتینە پاراستن. ئەگەر دەقێ نوی لاساییا بنیاتەکێ سەرەکیێ شعرێ بکەت ئەڤ کاریگەرییە دێ ژ هەڤتێکستیێ دویرکەڤیت، لێ ئەگەر دەقێ نوی ب مێشتن و گوهرینا دەقێ بەری خۆ رابیت ب رەنگەکێ وەسا کو ئەو بخۆ ژی لگەل بهێتە گوهرین، واتە هەر دوو پێکڤە بحەلیێن ژبۆ چێکرنا دەقەکێ سەربەخۆ کو ئەدگارێن نوی هەبیت؛ کاریگەری دێ بیتە بەشەك ژهەڤبەرکرن و هەڤتێکستیێ، چونکە مرۆڤ هەست ب هەبوونا ئەدگارێن نوی دکەت. هەر وەسا دەستەلاتا دەقێ کەڤن بەرەڤ لاوازیێڤە دچیت و دەلیڤێ ددەتە ژدایکبوونا دەقەکێ جیاواز، ئێدی هەر دەقەك دێ لسەر پاشماییێن دەقێن دی ژیت.[١٤٤] (فیلیپ سولێرس) دەربارەی ڤێ چەندێ دبێژیت ((هەر دەقەك بکەڤیتە سەر رێکا چەندین دەقێن دی، دێ د دەمەکیدا بریتی بیت ژ خواندنەڤەیا وان و سنووردارکرن وان و چرکرنا وان و ڤەگۆهاستنا وان و کویربوون د واندا))[١٤٥].

ب شێوەیەکێ گشتی هەڤتێکستی وەکو تیۆرەك بۆ شرۆڤەکرنا سروشتێ دەقی د چارچووڤێ سیمیۆلۆژیایێ و ل قوناغا گەشەکرنا پۆست بونیاتگەری و پۆست مۆدێرنیزمێدا، چ رێکارێن وەسا بۆ چارەسەرکرنا بابەتێن لاساییکرنێ و کاریگەری و پێکاریگەربوونێ پێشکێش ناکەت. ل ڤێرێ ڤەکۆلەران باوەری ب شیانێن داهێنەرانەیێن نڤیسەران نینە و زێدەتر بەرێ وان یێ پەیوەندییا د ناڤبەرا دەقاندا و کارلێککرنا وان لگەل هەڤدوو و رۆلێ خواندەڤانی.

## ١.٥.٣. بەرێخۆدانا نەومیێ دوویێ بۆ لاساییکرنێ:

ئەگەر ئەم (کریستیڤا) و (رۆلان بارت) و هەڤالێن وان ب نەوەیێ ئێکێ ژ ڤەکۆلەرێن هەڤتێکستیێ ل قەلەم بدەین کو ڤەکۆلینێن وان زێدەتر تیۆرینە، پێدڤیە ئەو ڤەکۆلەرێن کو پشتی وان هاتین و ئەڤ چەمکە برینە د بوارێ

پراكتيكيدا و رێكارێن پراكتيكى بۆ دەستنيشانكرين ژى مينا نەوەيێ دوويێ بدەينە نياسين، چونكە هەڤتێكستيێ ل سەر دەستێ ڤان ڤەكۆلەران بەرفرەهى و جۆراوجۆرييەكا مەزن بخۆڤە ديت و ئێدى پەيوەندييێن ئاشكرا و لاساييكرنێن نەهونەرى و تێهەلكێش و هندەك دياردەيێن دى كو بەرى هنگى د چارچووڤێ هەڤتێكستيێدا نەبوون ب كەرستەيێ ڤەكۆلينا هەڤتێكستيێ هاتنە هژمارتن.بۆ نموونە (لوران جينى) (پۆلينكرنەكا نوى بۆ هەڤتێكستيێ پێشكێشكر و باس ژ هەڤتێكستييا بهێز و لاواز كر، ب ديتنا وى هەڤتێكستى دشێت ئاستێن جياوازێن زمانى، زاراڤ و ڕوخسار و ناڤەرۆكێ بخۆڤە بگريت. هەڤتێكستييا لاواز ئەوە كو مفا ژ ناڤەروكا دەقەكێ دى وەرنەگرتبيت و ب تنێ وەرگرتنەكا فۆرميا وى دەقى بيت.ئەڤ نێرينە بۆ ئەگەر كو هەڤتێكستى بكەڤيتە د ڕێرەوەكێ نويدا. ئێك ژ ڤەكۆلەرێن كو بەردەواميدا ڤى كارى (ميشێل ڕيڤاتير) بوو، ب ديتنا وى دەقێن ئەدەبى زێدەتر ب ڕێكا پەيوەنديكرن ب دەقێن دييێن ئەدەبى دهێنە ئاڤاكرن تاكو ب ڕێكا پەيوەنديكرن ب جيهانا ڕاستەقينەڤە، هەڤتێكستييا وى پەيوەنديەكا موكوم لگەل شێوازگەرى و ڕەوانبێژيێ هەيە.وى ژى ژ لايێ خۆڤە هندەك پۆلينكرنێن نوى بۆ پەيوەندييێن هەڤتێكستيێ پێشكێشكرن.[١٤٦]

ڤەكۆلەرەكێ دى كو د ڤى واريدا ڕۆلەكێ مەزن هەبوويە (جيرارجينت)ە، ئەو د ڤێ باوەرييێدا بوو كو هەر دەقەكى پەيوەندييێن ئاشكرا و ڤەشارتى لگەل دەقێن دى هەنە. وى بۆ ڤان پەيوەنديان زاراڤێ دەربازبوونا دەقى (Transtextualité) بكارئينا و داخوازكر كو ل جهێ هەڤتێكستيێ (Intertextualité) بهێتە بكارهينان. وى ئەڤ پەيوەندييێن دەربازبوونێ بسەر پێنج جۆران دابەشكرن. جۆرێ ئێكێ ب هەڤتێكستى ناڤكر كو گەلەك جۆرێن پەيوەنديان بخۆڤە دگريت هەر ژ ڤەگۆهاستنا دەقاودەڤا تێكستەكى د چارچووڤێ تێكستەكێ دى و دزيێ، واتە ڤەگوهاستنا دەقاودەڤا بێ ئاماژەدان ب ژێدەرى بگرە، هەتا دگەهيتە تێلنيشان (Allusion) واتە ڤەگۆهاستنا دەقەكى د چارچووڤێ دەقەكێ دى، لێ ب ئاشكراييەكا كێمتر[١٤٧].(*)واتە هەرچەندە كو هەڤتێكستى ل دەستپێكێ ب واتا

کارلێکیٚ (تفاعل) هاتیه و ژ دیالوگیزما (باختین)ی هاتیه وەرگرتن، لیٚ نهو گەلەك ژ شێوەیێن هەڤتێکستییٚ ژ چارچووڤیٚ کارلێککرنیٚ دەردکەڤن و تەنانەت دزییٚ ژی ب خوٚڤەدگرن کو بلندترین ئاستیٚ لاساییکرن و ڤەگوٚهاستن و ڤەشارتنێیه، یانکو هەڤتێکستییٚ ئاستەکیٚ بلند هەیه کو کارلێکییه و ئاستەکیٚ نزم هەیه کو بریتیه ژ دزی و هندەك شێوەیێن سادە و ئاشکرا.[١٤٨]ئێدی هەمی پێناسەیێن هەڤتێکستییٚ داکوکییٚ لسەر پەیوەندییێن ڤەشارتی ناکەن، بەلکو گرنگییٚ ب پەیوەندییێن ئاشکرا ژی ددەن، بوٚ نموونە (لیون سومڤیل) کو د پێناسەیا هەڤتێکستییێدا دبێژیت ((...ڤەکوٚلینێن هەڤتێکستی دیٚ تەرخانکری بن بوٚ ئاڤاکرنا پەیوەندییان د ناڤبەرا کارەکی و کارەکیٚ دیدا یان د ناڤبەرا جوٚرەکی و جوٚرەکیٚ دیدا لدویڤ پیڤەریٚ گوهرین و لاساییکرنیٚ))[١٤٩].

ئەو چەمکیٚ کو کریستیڤاییٚ ب ئاوایەکیٚ تیوٚری پێشکێشکربوو، رێکارەکیٚ پراکتیکی نەبوو، ژبەرهندیٚ پشتی هەولێن ویٚ و (روٚلان بارت)ی مینا ئامرازەکی بوٚ سەلماندنا بیروبوٚچوونێن کوٚمەکا ڤەکوٚلەران کو خودان هزر و تێگەهشتنێن جیاوازبوون هاتە بکارئینان. هەڤتێکستی ب تنیٚ د چارچووڤیٚ ئەو پەیوەندییێن ڤەشارتییێن دەستپێکی نەما و بەرەڤ ڤەکوٚلینا پەیوەندییێن ئاشکرا و هەستپێکریڤە ژی چوو.ئەڤ گەشەکرنا هەڤتێکستییٚ تا رادەیەکی خزمەتا ڤەکوٚلینا دیاردەیا لاساییکرنیٚ دکەت، ژ لایەکیڤە ئەم دکارین باسیٚ لاساییکرنیٚ وەکو پەیوەندیەکا ئاشکرا بکەین و جوٚرێن ویٚ دەستنیشان بکەین و ژ لایەکیٚ دیڤە ژی دشێین گرنگییٚ بدەینە وان پەیوەندییێن کارلێکی کو ئاڤاکەرن و دەقی بەرەڤ پێش دبەن. لگەل هندیٚ ژی گرنگینەدانا هەڤتێکستییٚ ب مەسەلا کاریگەرییٚ و فەراموٚشکرنا روٚلیٚ نڤیسەری ویٚ دەلیڤیٚ نادەتە مە کو گەلەك لسەر بابەتیٚ لاساییکرنیٚ راوەستین ئەڤە ل وی دەمی کو شیانێن داهێنەرانەیێن نڤیسەران ژی دڤێت بهیتە بەرچاڤگرتن، ب تایبەت کو لاساییکرن و کاریگەرییٚ روٚلەکیٚ مەزن د مێژوویا ئەدەبیٚ گەلەك نەتەوەیان دا هەیه.

## ١.٦.١. فاكتەرێن بهێزكەفتنا لاساییكرنا ئەدەبی:

### ١.٦.١.١. زێدەرۆیكرن د پاراستنا كەلەپوریدا:

كەلەپور دەستكەفت و بەرهەمێن ڕابردوویا هەر مللەتەكییە. بەرفرەهبوونا دەمێ ڕابردوویێ و بەرتەنگییا دەمێ نهو و نەدیاربوونا ئایندەی د ئەزموونا مرۆڤیدا ئەگەرەكێ سەرەكیە بۆ گرنگیدانا مرۆڤی ب كەلەپوری، لەوما (تشتەكێ، سروشتیە كو هەر نەتەوەیەك گرێدای بیت ب كەلەپوریڤە. ئەڤە تشتەكێ پێدڤی و جەوهەرییە. كەلەپور كۆمەكا شارەزایانە كو مللەتی ب درێژییا دیرۆكێ د واریّ سیاسەت و ئەدەب و ئابوری و زانستێن دیدا بدەستڤە ئینانە، لەوما ب كەسایەتییا مللەتی و هەبوونا وییا مێژوویی دهێتە زانین)[١٥٠].كەلەپور میراتا مللەتی بخۆڤە دگریت لێ (( ب تنێ ئامرازەك نینە بۆ پیشاندانا دەستكەفتێن ڕابردوویێ، بەلكو ئامرازەكە بۆ نیشاندانا ئەو تشتێن ڕابردوویێ پێشكیشكرینە بۆ خزمەتكرنا نهۆ و هەر وەسا ئەو تشتێ كو نهو دشێت پێشكێشی ئایندەی بكەت))[١٥١]، یانكو كەلەپور دشێت وەكو فاكتەرەكێ هاریكار خزمەتا دەمێ نهو و ئایندەی بكەت، (داهێنان ڕەگەزەكێ سەرەكیە د كەلەپورریدا، چ داهێنان بێ مفا وەرگرتن ژ كەلەپوری چێنابن)[١٥٢].

(ئەدونیس)ی باوەری ب ڤێ چەندێ نینە كو كەلەپور ب تنێ هندەك داتایێن دیاركرینە بەلكو ئەون یێن كو كاریگەرییێ لسەر ژیانا مە یا هەڤچەرخ دكەن. كەلەپور لدەڤ وی ب تنێ ئەو پەرتووك و تشتێن پاراستی و دەستكەفتێن بەرێ نینن، بەلكو هێزەكا زیندیە كو مە بەرەڤ ئایندەیێ دبەت. ئەو كەرەستەكێ دیاركرییێ ڤەقەتیای ژ مرۆڤی نینە بەلكو پەیوەستە ب گیانێ مرۆڤیڤە، لەوما كەلەپور لدەڤ وی ئەو ڕەگەزێن زیندینە كو كارتێكرنێ لسەر دەمێ نهو و ئایندەیێ دكەن، ب دیتنا وی كەلەپور چەسپاو و نەگۆر نینە، بەلكو د بزاڤێدایە و دهێتە گۆهرین و ڤەگۆهاستن.[١٥٣]چەسپاونەبوونا كەلەپوری ل دەمێ ڕابردوو و باوەری هەبوون ب ڤەگۆهاستنا وێ بۆ دەمێ نهویە كو كەلەپوری دكەتە

بابەتەكێ هەستیار. كەلەپور چەوا بۆ ڤی دەمی دهێتە ڤەگۆهاستن و نەوەیێ نوی چەوا سەرەدەرییێ لگەل دكەت؛ ئەڤەیە كو نرخ و بها و جهێ كەلەپوری دەستنیشان دكەت. هەر لسەر ڤی بناغەی ئەم دشێین باسێ سێ هەلویستێن جیاواز ل هەمبەر كەلەپوری بكەین:

١. پاراستنا كەلەپوری؛پاراستنەكا هشك و كەڤنەشوپانە.
٢. رەتكرنا تەڤایا كەلەپوری ب نێرینەكا كۆزموٚبوٚلێتی و بەرێخودانەكا رەشبینانە.
٣. هەلبژاردن، دێ وی تشتی ژ كەلەپوری وەرگریت كو خزمەتا ئایدۆلۆژی و بۆچوونا وی دكەت و دێ پشتا خۆ دەتە تشتێن دی ب بیانۆیا ڤێ یەكێ كو سەردەمانە نینن...).[١٥٤]

باشترین هەلویست ل هەمبەر كەلەپوری هەلبژاردنە و هەر ئەڤ هەلویستەیە كو دبیتە ژێدەرێ داهێنانێ. (داهێنان بریتیە ژ پێكڤەگرێدان د ناڤبەرا بەردەوامبوونا كەلەپوری و ڤەقەتیان ژ كەلەپوریدا، واتە سازكرنا پەیوەندییێ لگەل كەلەپوری و شورەش ل دژی گەندەلیێن وێ، داكو نەبیتە كۆپی یانكو لاساییكرنا كەلەپوری)[١٥٥]. كەواتە (ڤەژاندنا كەلەپوری و داخوازا دووبارە نڤیسینا مێژوویێ و بایەخپێدانا ڤەكۆلەر و بەراوردكاران بۆ پاراستنا كەلەپور نینە بەلكو بۆ تێگەهشتنا وێیە، مەبەست لاساییكرن نینە بەلكو بۆ ئیلهام وەرگرتن و وەرگرتنا شارەزاییێیە)[١٥٦].ئەڤ هەلویستە ل هەمبەر كەلەپورێ ئەدەبی ژی سوودبەخشە واتە (مەرج نینە هەر تشتێ كەڤن باش بیت و هەمی شعرێن بەرێ ژی بێ كێماسی نینن، ئەدەبێ باش ئەوە كو خودان شێوازەكی تایبەت بیت و ب تنێ كەسێن ساویلكەنە كو بێ گەنگەشە لدویڤ كەلەپورێ ئەدەبی دچن)[١٥٧].

پاراستنا بێ سوود و ئەنجامێ دابونەریتان و پەرژانكرنا وان ئێكە ژ وان ئاریشەیان كو لدەڤ نەوەیێن بهێت ژی دێ سەرهەلدەت. هەر نەوەیەك د ناڤ كۆمەكا داب و نەریتان گەشەدكەت و هی دبیتە وان، ئەڤ دابونەریتە بەشدارییێ د ئاڤاكرنا كەسایەتییا ڤی نەوەیدا دكەن، ئەڤ نەوەیە ب تنێ هەولا پاراستن و

پێگیریکرن ب دابونەریتان نادەت، بەلکو هەولددەت ب رێکا ئامرازێن جیاواز وان بۆ نەوەیێ پشتی خۆ ژی ڤەگوهێزیت. ئەگەر ژی ئێکی ڤیا ژ بەر هندەك کاودانێن بابەتی ژ بازنەیا ڤان دابونەریتان دەرکەڤیت؛ ب تاوانا ڤێ چەندێ کو چ خێر د وی کەسیدا نینە کو ژ رێبازا بابچاکان دەرکەڤیت دێ ب کوفر و یاخیبوونێ ل هەمبەر کەلەپورێ بابوباپیران هێتە تاوانبارکرن.[١٥٨] ل ڤی دەمی کەلەپور وەکو یاسایەکا ڤەبڕ دهێتە تەماشاکرن، ژ چارچووڤێ خۆ یێ ئاسایی کو ئەرێنی و نەرێنیبوونێ بخۆڤەدگریت دەردکەڤیت و مینا تشتەکێ پیرۆز کو بۆ هەمی سەردەمان گونجاوە دهێتە نیاسین.

رەنگە ئەو ئاریشەیا کو هەتا نهو ژی د ناڤ هندەك مللەتاندا بەردەوامە، بەرێخودانا پۆزەتیڤانەیا ژ ڕادەبەدەرە بۆ کەلەپوری و ب تایبەت کەلەپورێ ئەدەبی بیت. د ناڤ ڤان مللەتان دا نەوەیێن نوی وەسا دهێنە تێگەهاندن کو وان تشتەکێ گەلەك مەزن د ڕابردوویا خۆدا هەبوویە و ژ بەر هندەك ئەگەران ئەو تشت ژناڤچوویە و پێدڤیە جارەکا دی بهێتە ڤەژاندن. ئەڤ مللەتە بەردەوام نموونەیا خۆ د ڕابردوویێدا دبینن، ئەڤە ل وی دەمیدا کو (ئەو مللەتێ کو نموونەیا خۆ یا بلند د ڕابردوویێدا ببینیت نە د نهو دا مللەتەکێ پاشکەفتییە. ئەو مللەتێ کێماسیێن ڕابردوویا خۆ نەبینیت و ڕەخنەگرتن ژ وان کێماسیان نەکەتە بناغەیەك بۆ ئاڤاکرنا پاشەرۆژێ، پێش ناکەڤیت. ئەدەب ژی بوارەکە کو گرنگیا وێ ژ بوارێن دیێن زانستی و جڤاکی کێمتر نینە لێ لگەل هندێ سەیرە کو گەلەك کەس ڕەخنەگرتن ژ کەلەپورێ ئەدەبی ب کێماسی دزانن)[١٥٩] و کەلەپورێ ئەدەبی ژی مینا تابۆیەکێ د ڕۆشنبیرییا جڤاکیدا جێگیر دکەن.

پرانیا جاران ئایدۆلۆژییا فاکتەرەکێ سەرەکیە بۆ چێبوونا نێرینەکا دەمارگیرانە ل هەمبەر کەلەپوری. گەلەك جاران ب مەبەستا خۆپاراستن ژ ژناڤچوون و حەلیانێ، کەلەپور د بەرژەوەندییا ناسنامە و ئورجینالێتیا مرۆڤی دهێتە شرۆڤەکرن. ئەو تشتێ کو ڕەوشەنبیرییا عەرەبی ژ یێن دی جیاواز دکەت، ئەڤەیە کو هەر ژ سەردەمێ نڤیسینێ بگرە و هەتا نهۆ، بزاڤا ناڤخۆییا ڤێ

ڕەوشەنبیریێ بەرهەمهینانا تشتێ نوی ب خۆڤە ناگریت. ئەڤ ڕەوشەنبیریە زێدەتر بریتیە ژ دووبارەکرنا بەرهەمێن بەرێ. ئەڤ پرۆسەیا بەرهەمهینانەڤەیا تشتێن کەڤن وەسا بەردەوام بوویە کو ئەم دشێین بێژین ل سەدێ هەفتێ ئێدی بەرەڤ هشکبوون و راوەستیانێڤە چوویە و بوویە ئەگەر کو گەندەلی بکەڤیتە تێگەهشتنا تێگەهێ کەلەپوری، ئەو تێگەهشتنا کو هەتا نوکە ژی بەردەوامە. ب کورتی ئەم دشێین بێژین چەمکێ کەلەپوری لدەڤ عەرەبان بریتی نینە ژ بەرهەمهینانا تشتێ نوی و خۆ ڕزگارکرن ژ کوت و بەندێن ڕابردوویێ بەلکو بریتیە ژ دووبارەکرنا ڤی کەلەپوری لسەر بناغەیێ لاساییکرن و تێگەهشتنەکا ساویلکانە، شرۆڤەکرنا وان بۆ کەلەپوری ژی د بەرژەوەندییا پاراستنا ناسنامە و ڕەسەنایەتییێدایە. [١٦٠]دیارە هەر ئەڤ نێرین و تێگەهشتنا سنووردارا رۆشنبیرییا عەرەبی بۆ کەلەپوری و ب تایبەت کەلەپورێ شعری بناغەیەکێ سەرەکییێ دەرکەڤتن و گەشەکرنا لاساییکرنا شعری د ئەدەبیاتا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا بوویە.

## ١.٦.٢. کلۆنیالیزم و داگیرکرن:

پرانیا جاران لاساییکرنا دەرەکی یانکو پێکاریگەربوون و مفاوەرگرتن ژ ئەدەبیاتا مللەتێن دی وەکو جۆرەکێ پۆزەتیڤێ لاساییکرنێ هاتیە تەماشەکرن و ل هەمبەر ڤێ چەندێ لاساییکرنا ناڤخویی واتە لاساییکرن د سنوورێ ئەدەبیاتا نەتەوەیدا هاتیە سەرکۆنەکرن. هەرچەندە کو گرنگییا ڤێ جۆرە لاساییکرن یانکو کاریگەریێ خویایە، لێ مرۆڤ هەست ب ڤێ چەندێ دکەت کو کۆمەکا فاکتەران بووینە ئەگەر کو زێدەرۆیی د بایەخدان ب ڤی جۆری بهێتەکرن. ئێک ژ ڤان فاکتەران ئەو لاساییکرنا دەرەکییا مەزنە کو ئەدەبیاتا لاتینی و پاشی کلاسیزما نوییا ئورووپی لسەر ئاڤا بوویە و یا دوویێ ئەو ئایدۆلۆژیاییێن فەلسەفی و سیاسییێن سەدێ بیستێنە کو دژی هەستا نەتەوەیی و هەبوونا سنوورێن نەتەوەینە، مینا دژایەتییا مارکسیزمان بۆ نەتەوەگەرایێ و هەولا سەرمایەداران بۆ بەلاڤکرنا هزرا جیهانگیریێ. بۆ نموونە (کارل مارکس) دبێژیت ((بەرهەمێن ئەدەبیێن

مللەتەكی دیٚ بنە ملكیٚ هەڤپشكیٚ مللەتیٚن دی. لگەل دەربازبوونا دەمی ئیٚدی سنووورداربوونا هزریٚ و سنووورداربوونا نیشتیمانی دیٚ ئەستەم بیت. ئەدەبیٚ جیهانی دیٚ ب رێكا ئەدەبیٚن نیشتیمانی و هەریٚمی چیٚبیت))[١٦١].هەر ئەڤ ئاخفتنا ماركسی ب خوٚ پالدەرەكیٚ مەزن بوویە بوٚ سەرهلدانا ئەدەبیٚ بەراورد و بهیٚزكەفتنا هزرا ئەدەبیٚ جیهانی.

ئەم دكارین ژ دوو ڕوانگەهیٚن جیاواز بەریٚخوٚبدەینە لاساییكرنا دەرەكی، ژ ڕوانگەهیٚ دەركەفتن ژ سنووریٚن نەتەوەیی و جیهانیبوونا ئەدەبیٚ و ژ ڕوانگەهیٚ كلوٚنیالیزم و داگیركارییا ئەدەبی لیٚ پرانیا جاران ئەڤ ڕوانگەهە ژ هەڤ ناهیٚنە جوداكرن و هەر ئیٚك ژ وان مە بەرەڤ ییٚ دی دبەن. ئەگەر ( لسەر بناغەییٚ جیهانیبوونا ئەدەبیٚ بەریٚخوٚبدەینە لاساییكرنیٚ واتە داكوكییٚ لسەر ڤیٚ چەندیٚ بكەین كو دەركەفتنا ئەدەبیٚ ژ سنووریٚن بەرتەنگیٚن نەتەوەیی و ڤەكرنا دەروازەییٚن نوییٚن ئەدەبی ل هەمبەر ئەدەبیاتا مللەتیٚن دی بوٚ وەرگرتنا تشیٚن مفادارە و دبیتە ئەگەریٚ پیٚشكەفتنا ئەدەبیٚ مللەتەكی؛ ئەم دشیٚین ڕەوابوونەكیٚ بدەینە لاساییكرنیٚ و بیٚژین ئەدەبیٚ پیٚكاریگەر لدویڤ پیٚدڤیاتییٚن خوٚ دیٚ تشتان ژ ئەدەبیٚ بیانی هەلبژیٚریت و لسەر ڤی بناغەی پالدەریٚن ڕابوون و پیٚشكەفتنا خوٚ ئاڤاكەت و دیٚ كەلەپوریٚ خوٚ ییٚ نەتەوەیی دەولەمەند كەت.ئامانج ژی ئەڤەیە كو ئەدەب د چارچووڤەكیٚ سنووردار دا نەمینیت و نەبیتە ئەدەبەكیٚ پاشكەفتی لیٚ لگەل هندیٚ ژی ڕەسەنایەتییا زمانی و نەریتیٚن میراتگری و شیانیٚن هزری و جڤاكییٚن نڤیسەران و شیانیٚن وان د بواریٚ دەربڕین و داڕشتنیٚ مینا ئاستەنگیٚن بهیٚزن د ڕیٚكا ڤیٚ چەندیٚدا و ناهیٚلن ئەڤ هەلبژارتنە ژ مەبەستا خوٚ یا سەرەكی دویربكەڤیت و ببیتە ئەگەریٚ ژناڤچوونا سنووریٚن ئەدەبیٚ نەتەوەیی و تایبەتمەندییٚن داهیٚنەرانەییٚن ئەدەبیٚ لایەنیٚ پیٚكاریگەر كو دخوازیت ب ڕیٚكا ڤیٚ هەلبژارتنیٚ بەرەڤ پیٚگەهشتن و دەولەمەندییٚ ڤە بچیت).[١٦٢]هەمی دەمان ئەڤ لاساییكرن یان كاریگەرییە سەرەرای پوٚزەتیڤبوونا خوٚ ترسا پیٚرەویكرن و داگیركرنیٚ ژی دئیٚخیتە د دلیٚ ڤەكوٚلەراندا.

(هندەك ژ فاكتەرێن گشتیێن جیهانیبوونا ئەدەبێ بریتینە ژ هەستكرنا نڤیسەرێن خودان شیان ب لاوازبوونا ئەدەبێ نەتەوەیی و كۆچكرن و جەنگ و داگیركرنێ[١٦٣] .ئەڤ فاكتەرە هەمیشە نیشانا ڤێ چەندێ نینن كو پەیوەندییا د ناڤبەرا دوو ئەدەبان پەیوەندیەكا دۆستانەیە. بەلكو دشێین گەلەك جاران ل جهێ ڤێ چەندێ باسێ كلۆنیالیزما ئەدەبی و داگیركرنێ بكەین، واتە دشێین باس ژ (ئەدەبیاتا بلند و ئەدەبیاتا پێرەو بكەین. چەمكێ (پێرەویكرن)ێ بەری هەر تشتەكی خودان سروشتەكێ سیاسی و ئابورییە. كلۆنیالیزم د بوارێ ئەدەبێدا ب رێكا سەپاندنا یاسا و نموونەیان دیاردبیت...هەر ئەدەبەك وەكو كێلگەهەكێیە بۆ بەلاڤبوونا نموونەیێن هاوردەكری، ئەڤ نموونەیە دبنە ئەگەرێ دروستبوون و پێكهاتنا دەقان و دروستبوونا ئەدەبەكێ لاساییكریێ راستەقینە (پێرەو) كو د رواڵەت دا مینا پەیوەندیەكا رۆشنبیری دەردكەڤیت)[١٦٤] .گەلەك جاران ئەو رێك و و شێوەیێن كو د ئەدەبێ بەراورددا دهێنە بكارهینان ڤێ هزرێ ل دەڤ مە بهێزتر دئێخن، بۆ نموونە دەمێ دبێژن كو (خالا دەستپێكێ ئەوە كو نڤیسەرەك یان كۆمەكا نڤیسەران یان تەڤایا ئەدەبێ مللەتەكی وەكو سەنتەرێ بەلاڤبوونا كاریگەریێ دهێنە ل قەلەمدان، پاشی ڤەكۆلین لسەر پەیوەندییا وان لگەل نڤیسەرەكی یان رێبازەكا ئەدەبی یان تەڤایا ئەدەبێ مللەتەكی وەكو سەنتەرێ رەنگڤەدانا كاریگەریێ دهێتەكرن)[١٦٥] . دەستنیشانكرنا تەڤایا ئەدەبیاتا مللەتەكی وەكو سەنتەرێ بەلاڤبوونێ و دەستنیشانكرنا تەڤایا ئەدەبیاتا مللەتەكێ دی وەكو سەنتەرێ رەنگڤەدانێ ب خۆ ئاماژەكە بۆ ڤێ راستیێ كو ئەڤ پەیوەندیە هەمی دەمان پەیوەندیەكا پۆزەتیڤ نینە بەلكو ب ئاشكرایی دچیتە د چارچووڤێ داگیركرن و كلۆنیالیزمێدا كو رەنگە ببیتە ئەگەرێ سەرهلدانا نڤیسەرێن لاسایكەر و پێرەو كو گرنگیەكا وەسا نادەنە ئەدەبیاتا نەتەوەیی.

كەسەكێ وەكو (جوزیبی بیرونیو) د ڤێ باوەریێدایە كو ( بەلاڤبوونا هزران د وەلاتێن جیاوازدا ب تنێ ئەنجامێ لاساییكرنەكا سادەیە و هەتا وی دەمی دێ بەردەوام بیت كو كاودانێن ناڤخوییێن پێویست لدەڤ وەرگری پێبگەهن)[١٦٦] ،

یانکو (د لاساییکرنا نڤیسەرەکێ بیانی یان وەرگێرانا کارێن وی، نڤیسەر ڕاستەوخۆ هەولددەت لدویڤ پێدڤیاتیێن زمان و نەریتێن ئەدەبیێن سەردەمی، خۆ لگەل زمان و شێوازێ نڤیسەرێ بیانی بگونجینیت. دڤێ خۆ گونجاندنێدا وەرگر یان لاسایکەر تشتەکێ نوی پێشکێشی نەریتێن خۆ یێن ئەدەبی دکەن[١٦٧].

ئەڤە ڕوویێ پۆزەتیڤێ ڤێ پەیوەندییێیە و پێدڤیە باس ل ڕوویێ نێگەتیڤێ ڤێ پەیوەندییێ ژی بهێتە کرن. هەرچەندە ئەدەبێ بەراورد نێرینەکا پۆزەتیڤ بۆ پرانیا جۆرێن کاریگەرییێ هەیە و ب تنێ پشتەڤانییا دەرکەفتنا ئەدەبیاتێ ژ سنوورێن نەتەوەیی دکەت لێ ب ڕاستی ئەو کاریگەرییا کو بەرهەمێ داگیرکرنا مللەتەکی بۆ مللەتەکێ دیە ناهێتە ڕێزا جۆرێن دیێن کاریگەرییێ ب تایبەت ئەگەر ئەڤ داگیرکرنە، داگیرکرنەکا ئایدۆلۆژی ژی بیت. لۆژیکی نینە ئەگەر ئەم بێژین شەر و داگیرکرن ژ لایێ جڤاکی و سیاسی و دەروونی و ئایدۆلۆژیڤە زیانێن خۆ هەنە لێ ژ لایێ ئەدەبیڤە هەمیشە سوودبەخشە. ڕەنگە هندەك کەس سەبارەت ب کاریگەرییا ئەدەبی بێژن کو ( د جیهانا ئەڤروکە دا ئێدی داگیرکرن نەشێت وەکو فاکتەرەکێ کاریگەر ڕۆلێ خۆ ببینیت)[١٦٨]، لێ ئەم نەشێین بێژین کو کاریگەرییا داگیرکرنێن بەرێ بەردەوام نینە. هەتا نهو ژی ئەو داگیرکرن یانکو ئەو کۆلۆنیاییێن کو بەرهەمێن داگیرکرنا لەشکەری یان ئایدۆلۆژی بووینە ڕۆلەکێ کاریگەر دگێڕن. (ئەلکساندر دیما) سەبارەت ب ڕۆلێ کاریگەرییێ دبێژیت: (هندەك جاران کاریگەری وەکو فاکتەرەکێ ئێکلاکەرێ ئێکانە دهێتە نیاسین، تەنانەت جارنا ئەڤ هەلوێستە دبیتە جۆرەك ژ بەندایەتیێ یان جۆرە پەیوەندیەکا کۆلۆنیایی، بۆ نموونە چێدبیت سەرهلدانا ئەدەبێ مللەتەکی و پێکهاتنا زمانێ ویێ ئەدەبی و تەنانەت تومارکرنا مێژوویا وی یا ئەدەبی وەکو بەرئەنجامێ کاریگەرییا ئەدەبێ نەتەوەیەکێ دی بهێتە ل قەلەمدان. گەلەك ڤەکۆلەر هەنە کو دخوازن ب هەر ئاوایەکی تەڤایا بەرهەمێن نەتەوەیی ب نموونەیێن بیانیڤە گرێ بدەن.[١٦٩]

لاساییکرن د بەرگێ کلۆنیالیزمێدا ب سەردەمەکێ دیارکریڤە ناهێتە گرێدان، بەلکو هندەك جاران نەوە بۆ نەوە دهێتە ڤەگوهاستن و دبیتە فاکتەرەکێ سەرەکی د مێژوویا ئەدەبی و ئاراستەکرنا هزرا رەخنەییدا. ڤەکۆلەر بێ کو راستەوخۆ هەستێ پێ بکەن پرانیا جاران هەولددەن رەهـ و ریشالێن ئەدەبێ خۆ د ئەدەبێ لایەنێ زال یان داگیرکەر دا ببینەڤە و گەلەك جاران توشی زیادەرۆی و هەلەیان ژی دبن. (ململانە لدور رۆشنبیریێ ل وەلاتێن کو کەفتینە ژێر کاریگەرییا داگیرکرن و کلۆنیالیزمێ پتر خویایە. ئێک ژ ئامرازێن هێزێن داگیرکەر بۆ مان و ئاکنجیبوونێ گوهرینا شێوەیێ ژیانا رەوشەنبیرییا مللەتێن داگیرکرییە، داکو واقعێ خۆ یێ رەوشەنبیری ژبیربکەن و ل جهێ وێ رۆشنبیرییا داگیرکەران جێگیربکەن و ئێدی هەستێ ب ژدەستدانا ناسنامەیا خۆ نەکەن. ب ڤی رەنگی رۆژ ب رۆژ بەربەستا هەستکرن ب نامۆیێ دێ ژناڤچیت، هەتا وی رادەی کو مللەتێن بندەست دبنە بەشەك ژ رەوشەنبیرییا مللەتێ داگیرکەر)[١٧٠].

ب دیتنا مێژوونڤیسێ ئنگلیزی (ئارنولد توینبی) ئەو مللەتێن کو دکەڤنە بن هەرەشەیا مەترسیێن دەرەکی ب سەر دوو ئاراستەیان دهێنە دابەشکرن یا ئێکێ ئەون کو هەولددەن د چارچووڤێ میراتا خۆ یا رەوشەنبیری بمینن و خۆ بپارێزن و یا دوویێ ئەون کو هەولددەن ب رێکا تێکەلکرنێ، رۆشنبیرییا خۆ لگەل رۆشنبیرییا نوی بگونجینن لێ تشتێ بالکێش ئەڤەیە کو هەر دوو بەرسڤدان ب خۆهەلاڤێتن ژ دەمێ نهو دهێنە هژمارتن، چونکە ئاراستەیا ئێکێ بەرێ پێرەوێن خۆ ددەتە رابردوویێ و رابردوویێ ب رێکا رزگاربوونێ ل قەلەم ددەت و یا دوویێ ژی ژ ترسا ژناڤچوون و پەراوێزخستنێ بەرێ پێرەوێن خۆ ددەتە رەوشەنبیرییا جڤاکەکێ دی.[١٧١]

### ١.٠٦.٣. نموونەخوازی:

دەمێ باس ژ لاساییکرنێ دهێتەکرن دوو جۆر لاساییکرن دکەڤنە بەرچاڤێن مە، لاساییکرنەکا رێکخستی کو تێدا نڤیسەر بۆ کارێ خۆ نموونەیەکێ هەلدبژێریت و لاساییا وێ نموونێ دکەت، لدویف هندەك یاسایێن دیارکری دچیت کو لسەر بناغەیێ هندەك بەرهەمێن کەڤن هاتینە دانان. لاساییکرنا نە رێکخستی ژی ئەوە کو نەژگاڤ چێدبیت و نڤیسەر بێ هەبوونا چ پلانێن دیارکری بەرێ خۆ ددەتە بەرهەمەکی یان کۆمەکا بەرهەمێن بەری خۆ. گەلەك د ڤێ باوەریێدانە کو جۆرێ دوویێ لاساییکرن نینە و ب تنێ جۆرێ ئێکێ ب لاساییکرن دزانن، ئەڤە ژی لسەر ڤی بناغەی کو (د لاساییکرنێدا پێدڤیە دان ب هەبوونا نموونەیان بهێتە دان، ئەو نموونەیێن کو بۆ نڤیسینێ دهێنە بکارهینان، ئەڤە ژی جیاوازە ژ وێ لاساییکرنا کو نەژگاڤ چێدبیت و دهەمی نڤیسیناندا دهێتە دیتن.چ تێکست نینن کو پەیوەندییا خۆ لگەل تێکستێن بەرێ پچاندبیت و چ نڤیسەر ژی نەشێن بێژن کو ب ئافراندنەکێ رابووینە کو بێ وێنەیە و نموونە یێن وێ د دیرۆکا ئەدەبێدا نینن و ل دەمێ خواندنێ هزرا خواندەڤانان بۆ چ تێکستێن دی ناچیت...)[١٧٢]

دەمێ (رابردوو ب بەرفرەهییا خۆ کۆمەکا نڤیسەرێن مەزن و سەرکەفتی ب خۆڤە دگریت کو شیاینە ناڤودەنگەکێ زۆر بدەستڤە بینن؛ هەمی دەمان ئەڤ شیمانەیە د ئارادایە کو نڤیسەرێن نوی بکەڤنە داڤێن پێرەویکرن و لاساییکرنا ڤان نڤیسەران و وان مینا نموونەیان هەلبژێرن. پێشکێشکرنا نموونەیێن باش و عەقلانی و گشتگر ژ لایێ نڤیسەرێن بەریڤە دبیتە ئەگەر کو نڤیسەرێن نوی هەولا فێربوونا وان بنەمایان بدەن کو بەرهەمێن کەڤن لسەر هاتینە ئاڤاکرن دا کو بەرهەمێن وان ژی بگەهنە ئاستێ یێن بەرێ؛ب ڤی رەنگی راستەوخۆ ئافراندن ب لاساییکرنێڤە دهێتەگرێدان چونکە ئێدی ئامانج زێدەتر خۆ نێزیککرن ژ نموونەیێن بەرێیە تاکو نویکرن بیت)[١٧٣].

رەنگە داخباربوون ب نڤیسەرەکی یان بەرهەمەکی یان ئەدەبیاتا مللەتەکێ دی هاندەرەك بیت بۆ لاساییکرنێ، چونکە (داخباربوون ئێکە ژ فاکتەرێن لاساییکرنێ )[١٧٤].نڤیسەرەکێ وەکو (ڤیکتور هوگو)ی ژی هەست ب ڤێ مەترسیێ کریە و گوتییە: ((بلا ئەم داخبار بین ب نڤیسەرێن مەزن لێ لاساییا وان نەکەین))[١٧٥]، یانکو وی ڤیایە سنوورەکی د ناڤبەرا لاساییکرن و داخباربوونێ دانیت، ئەو سنوورێ کو ناهێلیت نڤیسەر ببیتە دیڤەلانک و ب کۆپیکرنێ رابیت. (ڤیکتور هوگو) د ڤێ باوەرییێدایە کو لاساییکرن ب هەبوون و نەبوونا یاسایانڤە دهێتە گرێدان، (لاساییکرن ل دەڤ (هوگو)ی بریتی نینە ژ نەبوونا سیستەمی بەلکو بریتیە ژ رەتکرنا بنەمایان.لاساییکرن وەکو دووبارە بەرهەمهینانا بنەمایان هاتیە نیاسین، ئەو بنەمایێن کو د نموونەیاندا هاتینە بکارهینان، لێ داهێنانا رەسەن بریتیە ژ بەرهەمهینانا سیستەمی؛ هەر بەرهەمەك ب بەرهەمهینانا دووبارەیا بنەمایان رادبیت کلاسیکی یانکو لاسایکەرە ڤێجا هەر جۆرە نموونە یان هەر سەردەمەك بیت، ب تنێ عەقلێ بێ هاوتا و دەگمەنە کو دشێت ب رێکخستنا نڤیسینەکێ رابیت. ئەو ئافەرینەرێ کو ژ سەری بەرێ خۆ دکەتە بەرهەمەکێ دی دشێت سیستەمی ئاراستە بکەت لێ لاسایکەر ژ نێزیکڤە تەماشە دکەت و یاسایان دپارێزیت.یێ ئێکێ سەردای یاسایێن سروشتێ خۆ کاردکەت و یێ دوویێ بنەمایێن رێبازا خۆ دپارێزیت. بۆ یێ ئێکێ هونەر مینا ئیلهامێیە و یێ دوویێ وەکو زانست بەرێ خۆ ددەتێ.[١٧٦] ب ڤی رەنگی ئەم دشێین بێژین داخباربوون ب بەرهەم و نڤیسەرێن بەرێ ئێکەمین قوناغا نموونەسازییێیە و ئەگەر نەهێتە کونترولکرن دێ بەرەڤ لاساییکرنێڤە چیت. لاساییکرنا نموونەیان ژی دبیتە ئەگەرێ پیرۆزییا زێدەترا وان و د ئەنجامدا هزرا هەلهێنجانا یاسایان ژ نموونەیێن بەرێ خۆیادبیت و هەول دهێتە دان بۆ پەیرەویکرنا وان و سەپاندنا وان بسەر نڤیسەرێن دی.

رەخنەگرەکێ وەکو (ئەدوارد یونگ) گەلەك رەشبینانە تەماشەی لاساییکرنا نموونەیێن بەرێ دکەت. ب دیتنا وی ((دەمێ ئەو نموونە مە دئێخنە داڤێن لاساییکرنا خۆ دبنە ئاستەنگ د ناڤبەرا مە و تێگەهشتنا مە بۆ مە بخۆ، ئەو

ب رێكا هێزا خۆ هزرا مە دئێخن و دەستەسەردكەن، ئەو دبنە ئەگەر كو هەستكرنا مە ب مە بخۆ لاواز ببیت)).[١٧٧] چێدبیت لاساییكرنا نموونەدار گەلەك ب هێز بیت واتە هەمی ئالییێن مەیدانا ئەدەبی بخۆڤە بگریت و مینا یاساییێن بێ گومان د مێشك و دەروونێ نڤیسەر و خواندەڤانان دا جێگیر ببیت و ژ چارچووڤێ لاساییكرنەكا سادە دەركەڤیت و ببیتە ڕێباز یانكو نەریت، ئێدی تشتەكێ وەسا نینە كو ب تنێ نڤیسەر و دەقان ب خۆڤە بگریت بەلكو خواندەڤان و ڕەخنەگر ژی دبنە بەشەك ژ ڤێ چەندێ، ئەڤە ژی ب ئاشكرایی د كلاسیزما ئوروپی و ئەدەبیاتا كەڤنا گەلەك مللەتاندا خویایە.

### ٤.٦.١. بیردانك و ژبەركرن:

ڕەنگە بهێتە گوتن كو بیردانك جهەكە بۆ پاراستنا زانیاری و ئەزموونێن ژیانا مرۆڤی لێ كاریگەری و ڕۆلێ بیردانكێ گەلەك ژ ڤێ چەندێ بەرفرەهترە. بیردانك مینا پرەكێ دناڤبەرا دەمێ ڕابردوو و نهو ڕۆلێ خۆ دبینیت و هەر ئەو تشتێن پاراستی د بیردانكێدانە كو ژیانا مە ئاراستە دكەن. (ئەو ڕەگەزێ كو كەلەپور و داهێنانێ دگەهینیتە ئێك ئاگەهییا بەردەواما مرۆڤانە كو دبیتە ئەگەرێ تەڤلیهەڤبوونا بیرەوەری و شارەزاییێن بەرێ، هزر و هەستێن كەڤن لگەل دەستكەفتێن نوییێن مرۆڤی، لەوما بیردانك ڕەگەزێ سەرەكیێ بهەڤگەهشتنا مرۆڤێن كەڤن و نوییە)[١٧٨]. لسەر ڤێ بناغەی بیردانك ڕەگەزەكێ سەرەكیە بۆ پاراستن و ڤەگۆهاستنا داب و نەریتان و گونجاندنا وان لگەل كاودانێن نوییێن سەردەمێن جودا جودا، هەر وەكو (منسكی) د تیۆرا چارچووڤەیدا (frame theory) ڤێ چەندێ ددەتە ديارکرن. ب دیتنا وی (زانین و زانیارییێن مە مینا هندەك بنیاتان د بیردانكێدا پاراستینە و دهێنە دووبارەكرن، دەمێ مە پێویستی ب وان هەبیت وان دووبارە دكەینەڤە، لێ ب ئاوایەكێ وەسا كو لگەل كاودانێن نوی بگونجن. ئەڤ پرۆسەیا گونجاندنێ بریتیە ژ پێشكێشكرنا گوتنەكا نوی كو پشتبەستنێ لسەر چارچووڤەی دكەت. چارچووڤە ژی ڕەنگڤەدانا زانینا مە یا چەسپاوە بۆ جیهانێ.

لدویف ڤێ چەندێ بۆ گەلەك جۆرێن ئاخفتنێ دستپێکەکا هەی یانکو بۆ هەر ئێک ژوان جۆرە چاڤەرێبوونەك هەیە... بۆ نموونە ئەم دشێین بێژین چارچووڤێ غەزەلێ وەسفا خوشەویستێیە)[179]، یانکو دەمێ باسێ غەزەلێ دهێتەکرن ئێکسەر ئەو زانیارییێن پاراستی د بیردانکێدا بابەتێ خۆشەویستی و حەژێکرنا ڕەگەزێ مێ د مێشکێ مەدا دئازرینن و وەکو چارچووڤەکێ بۆ ڤێ جۆرە شعرێ ڕۆلێ خۆ دبینن.

سەرەرای ڤێ چەندێ کو بیردانک کارتێکرنەکا مەزن لسەر دروستبوونا نەریتێن ئەدەبی هەیە، پەیوەندیەکا موکوم ژی لگەل خەیالا ئەدەبی هەیە، لێ (ڕەنگە هەلە نەبیت ئەگەر ئەم بێژین بیردانک بەهرەیا شعرا سروشتیە.چونکە خەیال ب خۆ بریتیە ژ بکارهینانا بیردانکێ.کەس نەشێت چ تشتان بێخیتە د خەیالا خۆ دا ب تنێ ل وی دەمی نەبیت کو د بیردانکا ویدا ئاماژەیەك بۆ هەبیت. شیانا مە بۆ خەیال و ئاشوپسازیێ بریتیە ژ بیرهینانەڤەیا ئەو تشتێن کو مە بەری نهو تاقیکرینە...)[180].خەیال بریتیە ژ بکارهینانا بیردانکێ، لێ خەیال بیردانک نینە یانکو ((داهێنان بیرهینانەڤە نینە، بەلکو هەستیارییەکا تایبەتە د وارێ سەرەدەریکرن لگەل بیردانکێ لژێر سیبەرا کاودانێن نوییێن مرۆڤایەتیێ. ب ڕاستی ئەو تشتێن کو هزرا شاعری وان وەردگریت هەلاویستی دمینن هەتاکو تەڤایا ئەو ڕەگەزێن کو دشێن کارلێکێ لگەل ئێک بکەن بگەهنە ئێک و ئێک بگرن و لێکدانەکا شعرییا نوی دروست بکەن))[181].

ڕەنگە ب هەڤواتا زانینا بیردانک و خەیالێ پێنگاڤەك بیت بۆ دانپێدان ب لاسایبوونا ئەدەبێ و نەمازە شعرێ چونکە ئێدی کارێ شاعری دێ بیتە دووبارەکرنا ئەو تشتێن کو د بیردانکێدا هاتینە پارستن. ئەڤ چەندە ژی گەلەك جاران بوویە ژێدەرێ ترس و خۆپاراستنا گەلەك نڤیسەر و ڤەکۆلەران، بۆ نموونە (کولردج) سەبارەت (ب ڤێ باوەرییا بەریەلاڤ کو خەیال بریتیە ژ ئەو وێنەیێن بیردانکێ کو ب ڕێکا پەیوەندیەکێ پێکڤە دهێنە گرێدان دبێژیت کو ئەڤ بۆچوونە جۆرەکێ تایبەت ژ شعرێ ب خۆڤە دگریت لێ نەشێتن ئەو شعرێن کو د بلندترین ئاستدانە شرۆڤە بکەت، ئەو جیاوازیێ دئێخیتە د ناڤبەرا شعرا بەهرەیێ و

شعرا نبوغیٚ؛ ئەڤە ژی لسەر بناغەییٚ جوداکرنا لیٚکدانا ویٚنەیان (تصور) و خەیالیٚ. لیٚکدانا ویٚنەیان پرۆسەیا پیٚکڤەگریٚدانا ویٚنەیانە و خەیال پرۆسەیا ئافراندنیٚیە)[182]، یانکو پشتبەستن ب بیردانکیٚ و پیٚکڤە گریٚدانا ئەو ویٚنەییٚن تیٚدا هاتینە پاراستن جۆرە شعرەکا نزمتر ژ ویٚ شعرا کو سنووریٚن بیردانکیٚ دەرباز دکەت پیٚک دهینیت. هەر لسەر ڤی بناغەی هندەك د ڤیٚ باوەرییٚدانە کو ئەم دشیٚین باسیٚ ( دوو جۆریٚن شعریٚ بکەین شعرا ئەزموونکی و شعرا بیردانکی، شعرا ئەزموونکی ئەو شعرە کو ل هەر ساتەکی چریسکیٚن نوی ڤەددەت، لیٚ شعرا بیردانکی بریتیە ژ بیرهینانەڤەیا ئەو دیمەنیٚن کو هندەك کەسیٚن دی بەری هنگی ئەو ڤەدیتینە. شعرا ئەزمونکی جیهانەکیٚ د ئافرینیت کو بەری هنگی نەهاتیە ئافراندن، لیٚ شعرا بیردانکی ب وەسفکرنا جیهانەکا ئافراندی ڕادبیت...)[183]، کەواتە مەترسییا ڤیٚ چەندیٚ هەیە کو هیٚز و دەستەلاتا بیردانکیٚ ببیتە ئەگەریٚ سەرهلدانا جۆرە لاساییکرنەکیٚ، ڤیٚجا چ ب ڕیٚکا سەپاندنا نەریت و چارچووڤیٚن بەریٚ بیت یان ب ڕیٚکا مفا وەرگرتن ژ ئەزموون و ویٚنەییٚن کو د بیردانکیٚدا هاتینە پاراستن.

خەیال و داهیٚنان بیٚ کارتیٚکرنا بیردانکیٚ خۆیا نابن، لیٚ لگەل هندیٚ گەلەك جاران بیردانک شاعری دەستەسەر دکەت و ناهیٚلیت کو ئەو کارلیٚکیٚ لگەل زانیارییٚن خۆ بکەت یان ژ وان دەبازببیت. هەر دەربارەی ڤیٚ یەکیٚ ڕەنگە گەلەك جاران چەوانیا هاتنا زانیاریان بۆ ناڤ بیردانکیٚ و چەوانیا پاراستنا وان ببیتە ئەگەریٚ زیٚدەبوونا دەستەلاتا بیردانکیٚ و بهیٚزبوونا دیاردەیا لاساییکرنیٚ. شاعر چەوا سەرەدەرییٚ لگەل بەرهەمیٚن بەریٚ دکەت ئایا ب تنیٚ ب خواندنا وان ڕادبیت یان گرنگییٚ ددەتە ژبەرکرنا وان، چیٚدبیت ژبەرکرن مەترسییا زالبوونا بیردانکیٚ لسەر خەیالا ئەدەبی زیٚدەتر لیٚبکەت.

## ١. ٧. كاريگەرييێن لاساييكرنا ئەدەبی:

### ١. ٧. ١. لاوازبوونا داهێنان و نويكرنێ:

پرانيا ڤەكۆلينێن ئەدەبی داكۆكيێ لسەر ڤێ چەندێ دكەن كو چ دەقەك نەشێت پەيوەنديا خۆ ب ئێكجاری لگەل دەقێن بەری خۆ بپچينيت، يانكو چ تشتێ نوی بێ پەيوەنديكرن ب تشتێن بەری خۆ ژدايک نابيت، لەوما باسكرن ژ داهێنان يان ئافراندنا ڕەها د وارێ ئەدەبێدا گوتنەكا بێ بناغە و نەلۆژيكييە، لێ ئەڤە نابيتە بەلگە بۆ فەرامۆشكرنا ڕۆل و گرنگييا داهێنان و ئافراندنێ.

ئافراندن ئێكە ژ وان زاراڤان كو دانوستاندنەكا زۆر لدور بكارهينانا وێ هەيە وەكو خويايە هندەك حەز ناكەن زاراڤێ ئافەرێنەری (creator) بكاربينن، چونكە ب ديتنا وان ڤی زاراڤی مەدلوولەكێ لاهوتی هەيە. هندەك ژی د ڤێ باوەرييێدانە كو د ڤی زاراڤيدا بياڤەك بۆ بەرزخوازيێ هەيە و يا باش ئەوە كو د وارێ ڤەكۆلينێن ئەدەبيدا نەهێتە بكارهينان[١٨٤]. مل ب ملێ زاراڤێ ئافراندنێ زاراڤێ داهێنانێ (creatnity) ژی ب بەردەوامی دهێتە بكارهينان كو مينا ئافراندنێ زاراڤەكێ ڤەبڕ نينە.

زانا لسەر پێناسەكرنا داهێنانێ (creatnity) ڕێككەفتی نينن. ئەڤ پەيڤە بۆ ئێكەمين جار لسەردەمێ ڕێنێسانسێ ل ئوورۆپا ژ بۆ ئاماژەدان بۆ تشتێ نوی و ڕەسەن و تارادەيەك بەرهەمدار هاتيە بكارهينان. هەرچەندە ل وی دەمی بۆ ئاماژەدان ب هندەك كار و چالاكيێن دياركری وەكو نڤيسينا داهێنەرانە يان هونەرێن داهێنەرانە دهاتەكرن.[١٨٥]داهێنان ب گەلەك ئاواييێن جياواز دهێتە پێناسەكرن لێ گەلەك ژ ڤان پێناسەيان جەختێ لسەر ڤێ چەندێ دكەن كو داهێنان ئافراندنەكا ڕەها نينە بۆ نموونە هندەك دبێژن كو (بريتيە ژ ديتنا تشتێن ئاسايی ب ڕەنگەكێ نەئاسايی يان بريتيە ژ ڕێكخستنا هزران و دياربوونا وان لسەر بنەمايێ ڕەگەزێن هەيی و د پێكهاتەكا نويدا، يان داهێنان بريتيە ژ هينانا تشتەكێ نوی يان پێشكێشكرنا يێ كەڤن ب شێوەيەكێ نوی يان نامۆ، يان داهێنان بريتيە ژ

هزرکرن د چارچووڤەکێ ڤەکریدا، بریتیە ژ دووبارە دارێشتنا ڕەگەزێن زانیاری و شارەزاییێ د شێوەیێن نویدا.[١٨٦] ب ڤی ئاوایی داهێنان پرانیا جاران بریتیە ژ ئاڤاکرنا تشتەکێ نوی لسەر بناغەیێ تشتێن کەڤن لەوما پێدڤیە پەیوەندییا وێ لگەل لاساییکرنێ بهێتە دیارکرن چونکە پرانیا جۆرێن لاساییکرنێ بریتینە ژ بکارهینانا ڕەگەزێن بەرێ، ئەڤ چەندە خۆ ژ سەردەمێ ڕۆمانیان و سەردەمێ ڕێنسانسێ و لجەم کلاسیکیێن سەدێ هەڤدێ ل فەرەنسا هاتیە باسکرن.

گەلەك داکوکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەن کو پێدڤیە وەرگێران و لاساییکرنێ ژهەڤ جودا بکەین، وەرگێران خیانەتێ ل عەبقەریەتا تاکەکەسی دکەت، ئەڤە ژی بەروڤاژی لاساییکرنێیە کو تێدا عەبقەریەتا تاکەکەسی ڕۆلێ خۆ دبینیت. لسەر بناغەیێ ڤێ جیاوازیێ ئەم دشێین بێژین کو لاساییکرن کۆپیکرن نینە. زەحمەتییا لاساییکرنێ ئەڤەیە کو دکەڤیتە د ناڤبەرا وەکهەڤی و لادانێدا، د ناڤبەرا دووبارەکرن و جیاوازییێدا. لاساییکرن ب تنێ ملکەچبوون نینە، بەلکو بەروڤاژی هەر وەکو (دوبلای) دبێژیت پێدڤی ب خۆراك وەرگرتنێیە (innutrition)، واتە فەرە نڤیسەر بچیتە د ناڤ نموونەیێن خۆدا و وان بکەتە ملکێ خۆ و خۆ وەکو وان لێ بکەت، د ناڤ وان دا بحەلیت و وان داعویریت، و پشتی وان هەرس دکەت وان بگوهریت بۆ خوین و خوارنێ.[١٨٧] کەواتە داهێنان نێزیکی چەمکێ داهێنەرانەیا لاساییکرنێ یان لاساییکرنا هونەرییە. ب دەربڕینەکا دی ئەو لاساییکرنا کو لسەر بناغەیێ گوهڕینێ و هەرفاندنا تشتێن کەڤن بۆ ئاڤاکرنا تشتەکێ نوی بیت یان بریتی بیت ژ پەیوەندییێن ڤەشارتی و نەدیار هەر وەکو د هەڤتێکستییێدا جەخت لسەر دهێتە کرن؛ دێ ب داهێنان هێتە هژمارتن.

لگەل ڤێ چەندێ ژی لاساییکرن نەشێتن هەمی دەمان هەڤسوییێ داهێنانێ بیت. هەر وەکو دبینین کو هندەك کەس گەلەك ب ئاشکرایی جەختێ لسەر ڤێ چەندێ دکەن کو (( داهێنان ناهێتە لاساییکرن))[١٨٨] یانکو لاساییکرنا بەرهەمەکێ داهێنەرانە نابیتە هۆکارێ ژدایکبوونا داهێنانەکا نوی. ڕاستە کو ئەم نەشێین ب ئێکجاری نکۆلیێ ل پەیوەندییا د ناڤبەرا داهێنان و لاساییکرنێ

بکەین چونکە ڕەنگە ب تنێ داهێنان کۆپیکرنێ بخۆڤە نەگریت، لێ لگەل هندێ ژی لاساییکرن د گەل چەمکێ ئەکتیڤ و کاریگەرێ داهێنان و ئافراندنێ ناگونجیت و یا باش ئەوە کو ناڤەکێ دی بۆ وێ لاساییکرنا هونەری بهێتە دانان کو داهێنان رۆلەکێ سەرەکی تێدا دبینیت.

هندەك نڤیسەر یان هونەرمەندان دکەنە دوو جۆر، ئافەرێنەر و وەرگر. جۆرێ ئێکێ لسەر بناغەیێ ژیانا خۆ و ب بشتبەستن ب زەحمەتی و کەدا زێدە، رێکەکا نوی ڤەدکەن. جۆرێ دوویێ ژی ئەون یێن مفای ژ ڤەدیتنێن کەسێن دی وەردگرن نە ب تنێ ب رێکا دزیێ بەلکو پرانیا جاران ب رێکا شوپاندنا رێکا وان وەك خواستن و لاساییکرنا پاکژ. هەر چەندە کو چێدبیت بەرهەمێن گروپێ دوویێ سەرکەفتنەکا مەزن بدەستڤە بینن و ببنە جهێ سەرنجێ لێ لگەل هندێ ژی هەر دێ ب دووبارەکی هێنە هژمارتن. هەر چەوا بیت ناچێبیت داهێنان تشتەکێ دووبارەکری بیت، داهێنان و لاساییکرن دوو جەمسەرێن هەڤدژن، ئەگەر لاسایکەرەك ل جەمسەرەکی بیت چێدبیت ل جەمسەرێ دی ئەم داهێنەرەکی ببینین[١٨٩]. ئەو پەیوەندییا داهێنەرانە کو د ناڤبەرا دەقێن ئەدەبیدا دهێتە دیتن جیاوازە ژ وێ لاساییکرنا کو پەیوەندییێن ئاشکرا و سادە و دەقاودەق بخۆڤە دگریت. ب دەربڕینەکا دی نابیت لاساییکرن ببیتە ئامرازەك بۆ داهێنانێ بەلکو داهێنان لسەر بناغەیێ کارلێککرنا دەقان خۆیادبیت.

هندەك نڤیسەر پەنایێ بۆ رێکەکا کاریگەر و بلەز دبەن، ئەو دبێژن چونکە بەرهەمەکێ دیارکری شیایە سەرکەفتنێ بدەستڤە بینیت، ئەم ژی دشێین ب رێکا لاساییکرنا وی بەرهەمی سەرکەفتنێ بدەستخۆڤە بینین.لاسایکەر ئافەرێنەر نینن، ئەڤە ل هەمی کاودانان دروستە، مە چ پروگرام ژبۆ دروستکرن یان کۆپیکرنا چ شاکاران نینە.[١٩٠] (هونەرمەندێ ئافەرێنەر ئەو کەسە کو ژ وی جهی دەست پێبکەت کو ئەو بخۆ لێ، نە ل وی جهێ کو یێن دی ل وێرێ دەست پێکرین.ئەو کەسە کو ژ وی تشتێ کو وی بخۆ هەی دەستپێبکەت نە ژ وی تشتێ کو یێ کەسێن دیە، ئەو نابێژیت کو ئەڤ مۆرکە یان ئەڤ پارچە بۆ من بالکێشە لەوما دێ

وێ وەرگرم و ئێخمە د ناڤ بەرهەمێ خۆدا و دەستهاڤێژمە نڤیسینێ، ئەو دێ ژ خۆ دەست پێكەت، ئەو كارێ خۆ لسەر بنەمایێ خواستن ژ بەرهەمێن دی ئاڤا ناكەت، وێ ناكەتە بەرهەمەك كو ژ هندەك پرتێن بچویكێن بەرهەمێن دی پێكهاتیە).[191] چەند تایبەتەندی د داهێنان و ئافراندنێدا هەنە كو د لاساییكرنێدا ناهێنە دیتن یانكو ڕۆلێ وان د لاساییكرنێدا لاوازە و ئەم دشێین ب ڕێكا دەستنیشانكرنا وان زێدەتر جیاوازییا داهێنان و لاساییكرنێ بدەینە دیاركرن:

## ١.٧.١.١. گرنگیدان ب ڕەسەنایەتیێ (ئورجینال بوون):

ئێك ژ كەڤنترین گازندێن نڤیسەران كو تەنانەت نموونەیێن وێ بەری زایینێ و لسەردەمێ یونانیان ژی دهێنە دیتن ئەڤەیە كو گەلەك زەحمەتە گوتنەك هەبیت كو بەری نهو نەهاتبیتە گوتن. ئەگەر ئەڤ باوەرییە كو هەمی تشت بەری نهو هاتینە گوتن جێگیر ببیت ئێدی پێدڤیە نڤیسەر خۆ ڕادەست بكەت و ئەركێ وی ب تنێ دێ بیتە دووبارەكرنا وان هزران كو هندەك كەسێن دی بەری وی ئەو هزرە بكارئینانینە و ئەو نەشێت ژ وان هزران دەربازببیت.[192] كەواتە ل سەردەمێن كەڤن تشتەك ب ناڤێ ڕەسەنایەتی یان ئورجینالێتی نەبوویە و نڤیسەران بخۆ باوەری ب هەبوونا وێ نەبوویە، هەر ئەڤ چەندە ژی پالدەرەك بوویە بۆ بهێزكەفتنا دیاردەیا لاساییكرنێ لدەڤ پرانیا نڤیسەران.

هەتا دویماهیكا سەدێ هەژدێ ژی لاساییكرنا یێن بەرێ شیرەتەك بوو كو ژبۆ نڤیسەرێن گەنج دهاتە ئاراستەكرن، واتە هەتا وی دەمێ كو تیۆرا ئورجینالٚتیێ وەك هەڤڕكا تیۆرا لاساییكرنێ خویابووی[193]. ل ڤێرێ گەلەك ڕەخنەگر لسەر ڤێ چەندێ ڕێككەفتن كو چەند لاساییكرن داهێنەرانە بیت هەر دێ ژكارەكێ ئۆرجینال نزمتر بیت. (ئەدوارد یونگ)ی سەبارەت ب ڤێ چەندێ گوت: چ جاران یێن كۆپیكری بسەر یێن ئورجینال سەرناكەڤن، هەر وەكو كانیێ كو چ جارا بسەر سەروكانیێ ناكەڤیت[194]. ئێدی مەسەلە ژ لاساییكرنا هونەری و نەهونەری دەربازبوو و باس ژ ڕەسەنایەتیێ هاتەكرن، واتە پێشكێشكرنا تشتێن نوی

کو بەری نهو کەسێ ئەو بکارنەئینابن لێ چەوا باسکرن ژ داهێنان و ئافراندنا ڕەها د ئەدەبێدا تشتەکێ ئەستەمە هەر ب ڤی ڕەنگی بابەتێ ڕەسەنایەتیێ ژی ڕێژەییە و د بوارێ ئەدەبیاتێدا خودان تایبەتمەندییێن خۆیە.

ئورجینالیێتی یانکو رەسەنایەتی بریتیە ژ بەرهەمهینانا تشتێ نەباو کو کەس بەری هنگی نەگەهشتبیتێ، هزرا ئورجینالبوونێ ژی ئەو هزرە کو ملکەچی هزرێن بەربەلاڤ نەبیت واتە جیاواز بیت. کەسێ خودان هزرا ئورجینال ئەو کەسە کو پشتا خۆ دەدەت بکارهینانا هزرێن دووبارەکری و چارەسەرییێن زارڤەکری بۆ ئاریشەیان[١٩٥]. ئەگەر ئەم لدویف ڤێ یەکێ بچین پێدڤیە بێژین کو نە ئورجینالبوون و نە کەسێن ئورجینال و نە هزرێن ئورجینال د بوارێ ئەدەبێدا نینن و جارەکا دی بزڤرینە وێ خالا دەستپێکییا کەڤن کو دبێژیت هەمی تشت بەری نهو هاتینە باسکرن و چ تشتێن نوی د ڤێ جیهانێدا نەماینە.ئەگەر (سەنگا بەرهەمی د جیهانا بەرهەمێن ئەدەبیدا ژ لایێ نوییوون و ئۆرجینالبوون و ڤەکرنا ئاسۆیێن نوی ببیتە پیڤەرێ داهێنانێ و کەسایەتییا داهێنەرانە و لسەر ڤی بناغەی بهێتە هەلسەنگاندن. بڕیاردان لسەر کارێ داهێنەرانە دێ گەلەك توند و دژوار بیت و ژمارا کارێن داهێنەرانە د جیهانا ئەدەبیدا ژ دەهـ بەرهەمان دەربازنابیت.) [١٩٦]

ڤەکۆلەرەکێ وەکو (محمد مندور) وەسا هزردکەت کو دەستنیشانکرنا ڕەگەزێن ئورجینال لدەڤ شاعرەکی کارەکێ ب ساناهی نینە بەلکو ب ڕێکا جوداکرنا کاریگەرییا نڤیسەرێن بەری وی و یێن هەڤچەرخێن وی دێ خۆیابیت چونکە ل ڤی دەمی دێ زانین کو ئەو تشتێن وی بخۆ زێدەکرین چنە[١٩٧]. لێ گەلەك جاران ئەڤ پیڤەرە ڕەسەنایەتیێ دئێخیتە ژێر نیشانا پرسیارێ چونکە ڕەنگە تەڤایا پێکهاتەیێن دەقەکێ ئەدەبی ب ڕەنگەکی بریتی بن ژ دووبارەکرن یا ڕەنگڤەدان یا گوهڕینا دەقێن بەرێ، هەر وەکو د پرانیا ئاراستەیێن نوییێن مێژوویا ئەدەبی و گەلەك ژ ڤەکۆلینێن بەراوردکاری و پرانیا ئاراستەیێن هەڤتێکستییێدا هاتیە باسکرن. ڕەسەنایەتی د بوارێ ئەدەبێدا پەیوەستە ب وەرارا ئەدەبی واتە پێشکێشکرنا هزر یان تەکنیکەکا نوی بۆ قوناغەکا دیارکری چونکە ڕەنگە هەر

وەكو (شكلوڤێسكی) ئاماژەپێدای نویكرن زێدەتر لسەر بناغەیێ ڤەژاندنا وان شێوەیان بیت كو ژ مێژە هاتینە ژبیركرن یان د مەیدانا ئەدەبێدا ئامادەنە لێ نەبووینە جهێ گرنگیپێدانێ. ڕەسەنایەتی یان ئورجینالێتی د واریێ ئەدەبێدا هەیە، لێ ب ئاوایەكێ وەسا كو ژ لایەكیڤە لگەل سروشتێ وەرارا ئەدەبی و ژ لایەكێ دیڤە لگەل چەمكێ داهێنانا ئەدەبی دگونجیت كو زێدەتر بریتیە ژ داڕشتنا ڕەگەزێن هەیی و بەردەست ب ئاوایەكێ نوی.

كەسێ داهێنەر خودان هزرەكا ئورجینالە واتە هزرێن كەسێن دەوروبەرێن خۆ دووبارەناكەت. پێدڤیە ئەو هزرێن ئەو پێشكێش دكەت ب بەراوردكرن لگەل هزرێن كەسێن دی نوی بیت: ئەم دشێین لسەر بناغەیێ ملكەچ نەبوون ل هەمبەر هزرێن بەربەلاڤ و لاسایی نەبوون و جیاوازبوونێ بڕیارێ لسەر ئورجینالیبوونێ بدەین. كەسێ ئورجینال ئەو كەسە كو خۆ ژ دووبارەكرنا هزرێن كەسێن دی و چارەسەرییێن وان بۆ ئاریشەیان بدەتە پاش.[١٩٨] نڤیسەرێ ڕەسەن لدویف وان پلانا ناچیت ئەوێن كو بەری هنگی بۆ وی هاتینە دانان بەلكو ئەو كەسە كو پلانێن تایبەت بۆ خۆ دادنیت. ئەو دەستورەكێ كلتورییێ تایبەت بۆ خۆ چێدكەت و ب ڕێكا وێ زانیارییێن خۆ وەردگریت و شارەزایێن خۆ ب ڕێكا وێ ددەتە دیاركرن.[١٩٩]

دەمێ باس ژ ڕەسەنایەتییێ دهێتەكرن گۆهرین و جیاوازییێن مەزن و ڕیشەیی بەرجستە دبن واتە ڕەسەنایەتییا بەرهەمەكی بەندە ب هەبوونا هزر و ڕەگەزێن نوی و جیاواز كو دبنە بەلگە بۆ هەبوونا داهێنانەكا ڕاستەقینە.ل سەردەمەكی داهێنان بریتی بوو ژ شیانا فەرامۆشكرن و پشتگوهـ هاڤێتنا بنەماییێن شێوازییێن كو ڕێكەفتن لسەر وان هەبوویە، ڤێجا خۆ ئەگەر دەربڕینێن نڤیسەری ڕاستییێن سادە و هزرێن ئاسایی بن، تشتێ گرنگ ب تنێ نڤیسینا جیاواز بوو، لێ ئەڤروكە داهێنان بێ هەبوونا هزرەكا ئورجینال و كویر و بێ بوێرییا ڕاستەقینە و تاقیكرنا جەوهەرێ تشتان ب تنێ ئاخفتنەكا بێ مفایە.[٢٠٠]

## ٢٠١٠٧٠١. ڕەتکرنا خۆ نێزیککرن و ملکەچەبوونێ:

چەمکێ خۆنیزیککرن (conformity) د ڤەکۆلینێن سایکۆلۆژیدا بریتیە ژ گوهرینا بڕیارا تاکی ب ڕەنگەکێ وەسا کو مینا بڕیارا کۆمێ (بڕیارا پرانیێ) بیت بێ گرنگیدان ب ڕاستبوون یان هەلەبوونا بڕیارا کۆمێ.[٢٠١] چێدبیت (داخوازی و پێدڤیاتیێن کەسایەتییا داهێنەرانە جیاواز و نەگونجاو بن ژ داخوازییێن واقعێ جڤاکی، پێدڤیە داهێنەر داکوکیێ ل سەربەخۆبوونا خۆ بکەت و خۆ ژ پیڤەرێن بەربەلاڤ ڕزگاربکەت. جڤاك ژی بەروڤاژی هەولددەت ب ڕێکێن جیاواز پیڤەرێن خۆ بسەپینیت و دخوازیت کو هەمی ملکەچی ڤان پیڤەران بن ڤێجا پیڤەرێن جڤاکی ژبۆ ڕێکخستنا ڕەفتارێ جڤاکی بن یان پیڤەرێن عەقلی یان هونەری بن. هەر ئەڤ پیڤەرەنە کو عەقلێ مرۆڤێ داهێنەر بۆ وان دهێتە ئاراستەکرن داکو گۆهرین و وەرارێ بێخیتە وان).[٢٠٢]

ب دیتنا کینلێر (kneller)ی خۆنێزیککرن زەمینەیا پێدڤی بۆ داهێنانێ لاواز دکەت، حەزا خۆنێزیککرنێ ژ لایێ عەقلیڤە هەڤدەمە لگەل نزمبوونا هۆش و لاوازبوونا فاکتەرێن دیێن پێدڤی بۆ داهێنانێ، ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرێ تەپەسەرکرنا هەست و سۆزان و نزمبوونا ئاستێ باوەری بخۆ هەبوونێ. لاوازییا باوەری هەبوون ب هزرێن تایبەت و بشتبەستن ب هزرێن کۆمێ، یەکسانە لگەل وەکهەڤکرنا بۆچووێن کەسی لگەل بۆچوونێن یێن دی[٢٠٣]، کەواتە ڕەتکرنا خۆ نێزیککرن ژ شێوە و بڕیارا کۆمێیە کو داهێنانانێ بەرەڤ نویکرنێ ئاراستە دکەت.ڤێجا رەنگە ئەو بەرهەمێن کو ژ ئەنجامێ خۆگونجاندن لگەل بڕیارا کۆمێ و خۆ نێزیککرن ژ پرانیا پیڤەرێن سەردەمی هاتینە نڤیسین ب داهێنانەکا ڕاستەقینە نەهێنە هژمارتن.

## ١.٧.٢.٠ لاوازبوونا رۆلێ ئەزمونێ:

رۆلێ ئەزموونێ بابەتەکە کو د ڤەکۆلینێن ئەدەبیدا گەنگەشەیەکا زۆر ل دور هاتیەکرن، لێ لگەل بهیزکەفتنا ڕەخنەیا دەقی و ئاراستەیێن زمانڤانیێ و هەولێن بەردەوامێن گەلەك ڤەکۆلەران بۆ گرنگینەدان و فەرامۆشکرنا فاکتەرێن دەرەکی و ڕەهەندێن جڤاکیێن دەقی؛ ئەڤ بابەتە گەلەك جاران هاتیە پەراوێزخستن یان ڕەهەندێ وێیێ جڤاکی هاتیە ژبیرکرن و ب تنێ د چارچووڤەکێ ئستاتیکیدا هاتیە باسکرن. سەرەرای ڤێ چەندێ، ئەو خالا کۆ هەمیشە خۆ دسەپینیت و نکۆلی لێ ناهێتەکرن ئەڤەیە کو کەسایەتییا کەسێ ب تەمامەتی وەکو کەسەکێ دی نینە، لگەل هەبوونا وەکهەڤیان لێ هەر ئێکی ئەزموونا خۆ یا تایبەت هەیە و هەر ئەڤ جیاوازیە دبیتە بناغە بۆ جیاوازبوونا بەرهەمان.

گەلەك ڤەکۆلەر دیاربوونا مۆرکێ کەسی د بەرهەماندا و هەستکرنا خواندەڤانان ب هەبوونا وێ ب مەرجەکێ سەرەکیێ بەرهەمێ ئەدەبی دزانن، ئەڤە ژی ب تنێ ب ڕێکا دەربڕینێن نڤیسەری دەستەبەر نابیت بەلکو فەرە هەست و سۆزێن وی ژی بەشداریێ د ڤێ یەکێدا بکەن(٢٠٤). هەبوونا (مۆرکێ کەسی د بەرهەمیدا ئێکەمین ئەدگارێ نڤیسەرێ ڕەسەنە.ئەڤ چەندە ب تنێ نێرین و هەستکرنا وی بۆ گەردوون و ژیانێ ب خۆڤە ناگریت بەلکو ژ ڤێ چەندێ دەرباز دبیت و چەوانیا پێشکێشکرنا بابەتی واتە دەربڕین و هەلبژاردنا پەیڤان یانکو شێوازی ژی ب خۆڤە دگریت)(٢٠٥).

بەرجستەبوونا ئەزموونێ د بەرهەمێ ئەدەبیدا بۆ تەڤایا ژانرێن ئەدەبی گرنگە، لێ ئەڤ چەندە د شعرێ و نەخاسمە شعرا لیریکیدا بەرجستەترە و خودان ئەدگارێن خۆ یێن تایبەتە، ل ڤێرێ (مەبەست ژ ئەزموونێ وێنەکێ تەواوێ دەروونی و گەردوونییە کو شاعر ل دەمێ هزرکرنەکا کویر د بابەتەکیدا - کو ژێدەرێ وێ هەست و سۆزێن وی بخۆنە - وێ پێشکێش دکەت. دڤێ چەندێدا شاعر

ڕاستگۆییا هونەری دپارێزیت، کارێ وی ل ڤێرێ ب تنێ نیشاندانا شارەزایی د دارشتنێدا و بن پێڤەدانا راستییا ن و خۆگونجاندن لگەل هەست و سۆزێن کەسێن دی پێخەمەت رازیکرنا وان نینە..) [٢٠٦] بەلکو شاعر هەولددەت کەسایەتییا خۆ و هەبوونا خۆ و شێوازێ خۆ ب ڕێکا تێگەهشتن و شارەزایی و ئەزموونا خۆ پێشکێش بکەت.

شاعر د شعرێدا (دەربڕینێ ژ ململانا خۆ یا دەروونی دکەت، ڤێجا چ ئەڤ چەندە بریتی بیت ژ حالەتێن دەروونییێن وی ب خۆ یان بریتی بیت ژ هەلویستەکێ مرۆڤایەتیێ گشتی...)[٢٠٧]. چێدبیت کەسایەتییا تایبەتی و داهێنەرانەیا نڤیسەری پتر بەرهەمێ ئەزموونا ژیانا وی یا تاکەکەسی و تایبەتی بیت لێ گەلەك فاکتەرێن دی ژی ڕۆلێ خۆ د ئاڤاکرنا بنیاتێ ناڤخۆیێ بەرهەمی و جیهانبینییا هونەرمەندیدا دبینن و ئەم نەشێین ب تنێ پەیوەستبوونا نڤیسەری ب ژیانا تاکەکەسییا ڕۆژانە بکەینە پیڤەر، ئەزموونا هونەرمەندی پەیوەستە ب گەلەك پەیوەندییێن جڤاکی و ڕویدانێن گرنگێن سەردەمی و سایکۆلۆژییا و تایبەتمەندییێن وی جڤاکێ کو نڤیسەر سەرەدەرییێ لگەل دکەت.[٢٠٨]

شعر ل وی دەمی دێ ب ئەزموونا شاعریڤە هێتەگرێدان کو ژێدەرێ وێ هەستێن شاعری ب خۆ بیت و دەربڕینێ ژ تاکێتییا وی بکەت. ل ڤێرێیە کو مەترسییا لاساییکرنێ دیاردبیت، چونکە ((هەر مرۆڤەکی مۆرکێ خۆ یێ تایبەتی هەیە، لێ لاساییکرن دبیتە ئەگەر کو ئەڤ تاکێتیە ژناڤ بچیت یان تشتەکێ کێم ژێ بمینیت و د ناڤ مۆرك و ئەدگارێن گشتیدا بەرزە ببیت؛ ئەڤە ژی هۆکارەکە بۆ ڤێ یەکێ کو بەرهەمێ ئەدەبی بهایێ خۆیێ هەستی ژدەست بدەت)[٢٠٩]. رەنگە لاساییکرن ببیتە ئەگەر کو شاعر ل جهێ هندێ کو پتر پشتبەستنێ لسەر ئەزموونا خۆ بکەت، زێدەتر مفای ژ ئەزموونا شاعرێن دی وەربگریت، ئەو ئەزموونێن کو ڕەنگە وی ب خۆ چ تاقیکرن یان کارلێکەك لگەل وان نەبیت، ب واتایەکا دی لاساییکرن ڕاستگۆییا ئەزموونا شعری دئێخیتە د مەترسییێدا.

مەبەست ژ ڕاستگۆییا ئەزموونا شعری ئەڤەیە کو (( د شعرێدا ڕاستگۆییا ویژدانی هەبیت و شاعر دەربڕینێ ژ وی تشتی بکەت کو د دەروونێ ویدا هەیە، واتە ئەو تشتێ کو وی باوەری پێ هەبیت. ڤێجا چێدبیت ئەڤ ئەزموونە تشتەکێ مەزن و جوان بخۆڤە بگریت و چێدبیت ژی دەربڕینێ ژ تشتەکێ ئاسایی و بێ نرخ بکەت....))[٢١٠] . ئەڤ ڕاستگۆیە جیاوازە ژ چەمکێ وێ ڕاستگۆییا کو د ئاخفتنا ڕۆژانە دا باوە، ل ڤێرێ ( مەبەست ڕاستگۆییا ڕاستەقینە نینە، چونکە ئەڤە بابەتەکێ ڕەوشتییە، مەبەست ڕاستگۆییا هەستکرن ب ژیانێ و ڕاستگۆییا داخباربوون ب هەست و سۆزانە، واتە هەبوونا ڕاستگۆییا هونەری)[٢١١].لاساییکرن ڕاستگۆییا هونەری لاواز دکەت و دبیتە ئەگەر یان شاعر ب ڕێکا دووبارەکرنا ئەزموونێن شاعرێن بەرێ کەلواشەکێ مری و بێ جان پێشکێش بکەت یان ب ڕێکا کۆمکرنا پارچەیێن جوداجودا ژ ئەزموونا شاعرێن بەری خۆ کۆکتێلەکێ پێکبینیت، ئەڤە ژی ژیانێ دگەهینیتە گیانێ شعرێ چونکە، (( ئەو ئەزموونێن مرۆڤی کو شعر دشێت دەربڕینێ ژ وان بکەت ب بەردەوامی د گوهرینێدانە و ب بەردەوامی بەرەڤ زێدەبوونێڤە دچن. پێدڤیە زمانێ شعری لگەل گۆهرین و زێدەبوونا ئەزموونێن مرۆڤی برێڤەبچیت، داکو ڕاستگۆ بیت.

## ١.٧.٣.٠ لاوازبوونا شێوازی:

نکۆلی ل هندێ ناهێتەکرن کو هندەك لایەنێن پۆزەتیڤ د لاساییکرنێدا هەنە، تەنانەت خرابترین جۆرێن لاساییکرنێ ژی هندەك خالێن پۆزەتیڤ بخۆڤەدگریت. د لاساییکرنێدا ( نڤیسەر دەستان ژ کەسایەتییا خۆ بەرددەت، کەسایەتییا وی د ناڤ کەسایەتییا نڤیسەرەکێ دیدا دحەلیت، لێ د هەمان دەمدا خۆ ژ مەسەلا ئەمانەتداری و بەرچاڤگرتنا وردەکارییێن وەرگێرانێ ڕزگاردکەت. پرانیا جاران لاساییکرن وەکو ئامرازەکێ پەروەردەیی بۆ وەرارا هونەرمەندان هاتیە بکارهینان و ڕەخنەگر و ڤەکۆلەران ب چاڤێ شەرم و کێماسییێ بەرێخۆنەدایە ڤێ چەندێ. لاساییکرن خودان تایبەتمەندییێن خۆ یێن هونەرییە، هەر وەکو ( پۆشکین)

داکوکیێ ل ڤێ چەندێ دکەت کو مەرج نینە لاساییکرن بەلگەیەك بیت بۆ هەژارییا عەقلی، بەلکو ڕەنگە بریتی بیت ژ باوەری هەبوونەکا پاك ب شیانێن کەسەکی یان هیڤییەك بیت بۆ ڤەدیتنا جیهانەکا نوی ب ڕێکا شوپاندنا دەوسێن کەسەکێ عەبقەری، ڕەنگە ژی ژ ئەنجامێ هەستکرن ب لاوازی یان هەژارییا بەرهەمەکی بیت؛ ژبۆ ئافراندنا بەرهەمەکێ بەرزتر. هەر وەسا چێدبیت مەبەستا لاساییکرنێ بکارهینانا شێوەیێ کەسەکی بیت؛ داکو ئەو شێوەیە بهێتە ڤەژاندن و ژیانەکا نوی بخۆڤە ببینیت)[٢١٢]، کەواتە گەلەك ڤەکۆلەران ب چاڤەکێ هونەری بەرێخۆدایە لاساییکرنێ و ئەو ژ فۆتۆکۆپیکرن و وەرگێرانێ جوداکرینە. ب دیتنا وان لاساییکرن ب تنێ ملکەچبوون نینە بەلکو پرۆسەیەکە کو تێدا نڤیسەر دچیتە ناڤ ناخێ نموونەیێن خۆ و وان دکەتە ملکێ خۆ[٢١٣]. تەنانەت ب دیتنا هندەك کەسان (لاساییکرن ژ ئیلهامێ کێمتر نینە و پرۆسەیا شعرێ ناهەرفینیت، چێدبیت شاعر ب کویری هزرا خۆ د دەقێ وەرگرتیدا بکەت و وێ بێخیتە بەر پێداچوون و بژارکرنێ، ب ڤی ئاوایی دێ ژ دەقێ وەرگرتی لادەت و لاساییکرن دێ رۆلێ ئیلهامێ بینیت).[٢١٤] جوداکرنا لاساییکرنێ ژ فۆتۆکۆپیکرنێ و وەرگێرانا دەقاودەق واتە باوەری هەبوون ب ڤێ چەندێ کو د لاساییکرنێدا وەکهەڤی و لادان هەیە و ب ڕێکا لادانێ بەرهەم و نڤیسەر کەسایەتییا خۆ یا سەربەخۆ بدەستڤە دهینن؛ ئەڤە ژی لاساییکرنێ دبەتە د سەقایەکێ پۆزەتیڤدا و هیڤیەکێ بۆ هەبوونا شێوازێ نڤیسەری د چوارچوڤێ لاساییکرنێدا دروست دکەت.

سەرەرای هەبوونا هەلویستێن پۆزەتیڤ ل هەمبەر لاساییکرنێ و پشتەڤانیکرن ژ لاساییکرنا باش، لێ ئەڤروکە ئەڤ زاراڤە پتر واتایەکا نێگەتیڤ دبەخشیت هەمیشە نڤیسەرێ لاسایکەر ل ژێر سیبەرا گومانا لاوەکی بوون و پلە دوو بوون و لاوازییا کەسایەتی و شێوازیە، نەمازە دەمێ لاساییکرن دبیتە خودان بنەما و یاسا و لسەر نڤیسەران دهێتە سەپاندن یان دەمێ د لاساییکرنێدا نموونەکێ دیارکری دبیتە سەرمەشقێ کارێ نڤیسەری. ((لاساییکرن دبیتە ئەگەرێ بەرجستەبوونا هزرا ڕێکبوون و وەکهەڤییا ئەزموونا مرۆڤایەتیێ و خەلکی هان ددەت کو د چارچووڤێ تەڤنەکێ ئالۆز کو ب لاساییکرن دهێتە نیاسین

داكوكيێ ل بەردەوامبوونا مێژوویی بکەن...))[٢١٥]، یانکو ب دەربڕینەکا دی لاساییکرن تاکەکەسی دئێخیتە د مەترسییێدا و کۆمێ بسەر تاکی زال دکەت و د ئەنجامدا تشتەك ب ناڤێ کەسایەتییا نڤیسەری یانکو شێوازێ نڤیسەری نامینیت.(ڤیکتور هۆگو) سەبارەت ب ڤێ چەندێ دبێژیت: ((... ئەگەر ئەز دەنگڤەدانا (راسین)ی بم یان ڕەنگڤەدانا (شکسپیر)ی بم چ جارا نابمە چ، ژبلی دەنگڤەدان و ڕەنگڤەدانێ. ئەگەر ئەم بگەهینە بلندترین پلەیێن لاساییکرنا کەسەکێ عەبقەری ب بەردەوامی دێ ژ وێ عەبقەریەتێ بێ بەهر بین. بلا ئەم داخبارێین ب نڤیسەرێن مەزن لێ لاساییا وان نەکەین، ئەگەر د ڤێ پێشاژۆییێدا سەرکەفتین گەلەك باشە لێ سەرنەکەفتنا مە ژی چ گرنگیەکا وەسا نابیت))[٢١٦]. (ڤیکتور هۆگۆ) ڕەخنەیێ ژ لاساییکرنێ دگریت و ڤێ چەندێ ددەتە دیارکرن کو لاساییکرن کەسایەتییا مرۆڤی بەرزە دکەت و دبیتە ئەگەر کو هەمیشە مرۆڤ دەنگڤەدانا کەسەکێ دی بیت. بلا مرۆڤ هەولبدەت کو بێ لاساییکرن بەرهەمێ خۆ پێشکێش بکەت ئەگەر د ڤێ چەندێدا سەرکەفتی نەبیت ژی، گەلەك گرنگ نینە، چونکە پێشکێشکرنا کارەکێ لاساییکریێ سەرکەفتی گەلەك جیاواز نینە ژ پێشکێشکرنا کارەکێ ئۆرجینالێ سەرنەکەفتی.

کاریگەرییا لاساییکرنێ لسەر شێوازی بوویە ئەگەر کو د ڤەکۆلینێن ئەدەبییێن هەڤچەرخدا گرنگیەکا زۆر ب لاساییکرنا شێوازی بهێتەدان و گەلەك ڤەکۆلەران باسێ ڤێ جۆرە لاساییکرنێ بکەن، بۆ نموونە (ڤان تیگم) د ڤێ باوەرییێدایە کو (شێواز زویتر ژ هەمی ڕەگەزێن دی دهێتە ڤەگۆهاستن و لاساییکرنا شێوازی ژ هەمی ڕەگەزێن دی ئاشکراترە)[٢١٧]. هەر وەسا (ڤایسشتاین) ئاماژەیێ ددەتە لاساییکرنەکا شێوازی، ئەڤە ژی حالەتەکە کو تێدا نڤیسەر هەولددەت ژبۆ گەهشتن ب ئامانجەکا هونەری، نڤیسەرەکی یان بەرهەمەکێ ئەدەبی یان شێوازێ سەردەمەکی هەلبژێریت...))[٢١٨].د بوارێ هەڤتێکستییێدا ژی (جیرار جینت)ی (زاراڤێ لاساییکرنێ بۆ ڤێ چەندێ بکارئینایە، ل ڤێرێ نڤیسەر شێوازێ کەسەکێ دی بکاردهینیت واتە تێکستێ خۆ لسەر شێوازێ وی ئاڤادکەت بێ کو دەربڕینێن وی بکاربینیت، .. ئەم دشێین ڤێ جۆرە لاساییکرنێ یانکو دزیێ ب (هەڤتێکستییا شێوازی) ناڤبکەین) [٢١٩]

## پەراویزێن پشکا ئێکێ

(١) شکری عزیز الماضي، في نظرية الادب، دار النهضة، بيروت، ١٩٨٥، ص١٧.

(٢) ورنن هال، تاريخچه نقد ادبى، ترجمه:هادى آقاجانى و ديگران، انتشارت رهنما، تهران ١٣٧٩ هـ.ش، ص٥- ٦.

(٣) ريچارد هارلند، درآمدى تاريخى بر نظريەى ادبى از افلاتونى تا بارت، ترجمه:على معصومى و شاپور جوركش، چاپ سوم، نشر چشمه، تهران، ١٣٨٨ه.ش، ص٢٢.

(٤) سيما داد، فرهنگ اصطلاحات ادبى، انتشارات مرواريد، چاپ پنجم، تهران، ١٣٩٠هـ. ش، ص١٥٥

(٥) خليل الموسى، وحدة القصيدة بين ارسطو و نقاد العرب القدماء، منشورات وزراة الثقافة، دمشق، ٢٠٠٧، ص١١

(٦) خليل الموسى، وحدة القصيدة بين ارسطو و نقاد العرب القدماء،...،ص١٥.

(٧) عبدالحسين زرين كوب، ارسطو و فن شعر، انتشارات امير كبير، چاپ ششم، تهران، ١٣٨٧ه.ش، ص١١٧.

(٨) هەمان ژێدەر، ص١٢٨.

(٩) قصي الحسين، سوسيولوجية الادب، دار البحار، بيروت، ٢٠١٠، ص١٤٧.

(١٠) ك.ك.روثفن، قضايا في النقد الادبي، ترجمة:د.عبدالجبار المطلبى، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٩، ص٢١٧.

(١١) - ك.ك.روثفن، قضايا في النقد الادبي،...،ص٢١٧.

(١٢) ورنن هال، تاريخچه نقد ادبى،...، ص ١٧.

(١٣) ريچارد هارلند، درآمدى تاريخى بر نظريەى ادبى از افلاتون تا بارت،...، ص٨٠.

(١٤) رضا سيد حسينى، مكتبهاى ادبى، جلد اول، انتشارات نگاه، چاپ پانزهم، تهران، ١٣٨٧ هـ.ش، ص١٠٠.

(*) هەر وەکو ئەم دبینین عەرەبان ژی هەولدایە دوو زاراڤێن جیاواز واتە (محاكات) و (تقليد)ێ بۆ جوداکرنا ڤان دوو چەمکان بکاربینن.

(١٥) ام.اچ.ابرامز، فرهنگ توصيفى اصطلاحات ادبى، ترجمه:سعيد سبزيان، تهران، ١٣٨٤هـ. ش، ص١٥٧- ١٥٨.

(١٦) ميمنت ميرصادقى، واژنامه هنر شاعرى، انتشارات كتاب مهناز، چاپ چهارم، تهران، ١٣٨٨، ص٢٧٢.

(١٧) ايرنا ريما مكاريك، دانش نامەى نظريەهاى ادبى معاصر، ترجمه:مهران مهاجر و محمد نبوى، انتشارات آگاه، چاپ سوم، تهران، ١٣٨٨ه.ش، ص٢٧٩.

(١٨) سيما داد، فرهنگ توصيفى اصطلاحات ادبى،...، ص١٥٤- ١٥٥.

(١٩) محمد غنيمي هلال، قضايا معاصرة في الادب و النقد، قاهرة، بدون سنة، ص٤٣.

(٢٠) ورنن هال، تاريخچه نقد ادبى،...، ص١٦- ١٧.

(٢١) هەمان ژێدەر ٤٧.

(٢٢) سوزان روبين سليمان و انجى كروسمان، القارىء في النص (مقالات في الجمهور و التاويل، ترجمة: د.حسن ناظم وعلى حاكم صالح، دارالجديدة المتحدة، بيروت، ٢٠٠٧، ص٣١١.

(٢٣) ورنن هال، تاريخچه نقد ادبى،...، ص٨٠- ٨١.

(٢٤) هەمان ژێدەر،... ص٨٢.

(*) مەبەستا يونانى و رۆمانيێن كەڤن ژ لاساييكرنا سروشتى، لاسايكرنا سروشتىٚ مرۆڤانه.

(٢٥) رضا سيد حسينى، مكتبهاى ادبى، جلد اول،...، ص١٠٠.

(٢٦) هەمان ژێدەر، ص١٠٠.

(٢٧) ريچارد هارلند، درآمدى تاريخى بر نظريەى ادبى از افلاتون تا بارت،...، ص٨٠.

(٢٨) هەمان ژێدەر،... ص٣٥.

(٢٩) هەمان ژێدەر، ص٣٥- ٣٦.

(٣٠) عبدالحكيم راضي، دراسات في النقد العربي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، قاهرة، ٢٠٠٧، ص٢١٨.

(٣١) محمد غنيمي هلال، قضايا معاصرة في الادب و النقد،...، ص٤٣. ٣١

(٣٢) ك. ك. روثفن، قضايا في النقد الادبي، ترجمة،...، ص٢١٩.

(٣٣) محمد غنيمي هلال، قضايا معاصرة في الادب و النقد، ...، ص٤٥.

(٣٤) سوزان روبين سليمان و انجى كروسمان، القارىء في النص (مقالات في الجمهور و التاويل،...، ص٣١١.

(٣٥) هەمان ژێدەر، ص٣١٢.

(٣٦) رضا سيد حسينى، مكتبهاى ادبى، جلد اول،...، ص١٠٠.

(٣٧) ام. اچ. ابرامز، فرهنگ توصيفى اصطلاحات ادبى،...، ص٦٤.

(٣٨) زولكوف ئەرگون، نەریتا نەتەوەیی د هەلبەستا نوويا كورديدە (١٨٨٠-١٩٧٠)، نامەیا دكتۆرایێ، زانكۆیا زاخۆ، پشكا زمانێ كوردی، ٢٠١٧، ل١٣٣.

(٣٩) هەمان ژێدەر، ل١٣٣.

(*) بنێرە بابەتێ: لاساییكرن د چارچووڤێ مێژوویا ئەدەبێدا

(٤٠) ام.اچ.ابرامز، فرهنگ توصيفى اصطلاحات ادبى،...، ص١٣٩.

(٤١) هەمان ژێدەر، ص١٤٠.

(٤٢) محمد حسين الاعرجى، الصراع بين القديم و الجديد في الشعر العربى، المركز العربى للثقافة و العلوم، بيروت، بدون سنه، ص٧٧.

(٤٣) هەمان ژێدەر، ص٧٨.

(٤٤) محمد صابر عبيد، مرايا التخييل الشعرى، عالم الكتب الحديثة، عمان، ٢٠٠٦، ص١٠.

(٤٥) بهمن نامور مطلق، درآمدى بر بينامتنيت، انتشارت سخن، تهران، ١٣٩٠ه.ش، ص٣٣.

(٤٦) هەمان ژێدەر، ص٣٥- ٣٦.

(٤٧) الكساندر ديما، مبادىء علم الادب المقارن، ترجمة: محمد يونس، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٨٧، ص١٢٢.

(٤٨) عزالدين المناصرة، النقد الثقافي المقارن (منظور جدلي تفكيكى)، دار المجدلاوي، عمان، ٢٠٠٥، ص١٦٣.

(٤٩) هەمان ژێدەر، ص١٦٣.

(٥٠) هەمان ژێدەر، ص١٦٣.

(٥١) خليل موسى، مبادلات شعرية (مفهوم التاثير أنموذجا)، اتحاد كتاب العرب، دمشق، ٢٠٠٩، ص٢٧.

(٥٢) هەمان ژێدەر، ص٢٧.

(٥٣) هەمان ژێدەر، ص٣٤.

(٥٤) ك. ك. روثفن، قضايا في النقد الادبي،...، ص٢٥٩- ٢٦٠.

(٥٥) عزالدين المناصرة، النقد الثقافي المقارن (منظور جدلي تفكيكى)،...، ص١٦٢.

(٥٦) ك.ك.روثفن، قضايا في النقد الادبي،...، ص٢٥٦- ٢٥٧.

(٥٧) نيوتن ستالكنخت و هورست فرنز، الادب المقارن المنهج و المنظور، ترجمة:فؤاد عبدالمطلب، دار التوحيد، حمص، ٢٠٠٧، ص٩٢.

(٥٨) ك.ك.روثفن، قضايا في النقد الادبي،...، ص٢٦٣

(٥٩) هەمان ژێدەر،...، ص٢٦١.

(٦٠) هەمان ژێدەر، ص٢٦٠- ٢٦١.

(٦١) هەمان ژێدەر، ص٢٦٨.

(٦٢) هەمان ژێدەر، ص٢٦٩.

(٦٣) هەمان ژێدەر،ص٢٧٠.

(٦٤) مصطفى السعدني، في التناص الشعري، منشأة المعارف، الاسكندرية، بدون سنة، ص١٤.

(٦٥) عبدالعزيز عتيق، في النقد الادبي، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٩١، ص٣١٠.

(٦٦) طراد الكبيسي، التراث العربي، دار الحرية، بغداد، بدون سنة، ص٤.

(٦٧) کەمال مەعرووف، ئەدەبیاتی کلاسیکی نوێخوازی کوردی، سلیمانی، ٢٠٠٣، ص٤٩.

(٦٨) ناتالى بييقى غروس، مدخل الى تناص، ترجمة: عبدالحميد بورايو، دار نينوى، دمشق، ٢٠١٢، ص١٩١- ١٩٢.

(٦٩) سيما داد، فرهنگ اصطلاحات ادبى،...، ص٢٩٠

(٧٠) محمد مصطفى هدارة، مشكلة السرقات في النقد الادبي، المكتبة الاسلامية، بيروت، ١٣٠٩ه، ص٣١٠.

(٧١) محمد مندور، النقد المنهجي عند العرب، دار النهضة، قاهرة، بدون سنة، ص٢١٣.

(٧٢) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى ، انتشارات آگاه، چاپ نهم، تهران، ١٣٨٣ه.ش، ص٢١٦.

(٧٣) عزالدين المناصرة، النقد الثقافي المقارن (منظور جدلي تفكيكى)،...، ص١٦٣.

(٧٤) عزالدين المناصرة، علم التناص المقارن (نحو منهج عنكبوتي تفاعلي)، دار المجدلاوي، عمان، ٢٠٠٦، ص٢١٤

(٧٥) ك.ك.روثفن، قضايا في النقد الادبي،...، ص٢٢٣.

(٧٦) رامان سلدن، راهنماى نظرية ادبى معاصر، ترجمة:عباس مخبر، انتشارات طرح نو، ١٣٧٢ه.ش، ص٢١٠.

(٧٧) محمد الولي، مدخل الى تاريخ الادب، www.odabasham.net.

(٧٨) ايرنا ريما مكاريك، دانش نامهى نظريههاى ادبى معاصر،...، ص٨٤.

(٧٩) محمود فتوحى، نظرية تاريخ ادبيات، انتشارات سخن، تهران، ١٣٨٧ه.ش، ص٣٣.

(٨٠) شكرى عزيز الماضي، في نظرية الادب،...، ص١١٩.

(٨١) محمود فتوحى، نظرية تاريخ ادبيات،...، ص٣٤.

(٨٢) ههمان ژێدهر، ص٣٤.

(٨٣) شكرى عزيز الماضي، في نظرية الادب،...، ص١١٤.

(٨٤) ههمان ژێدهر، ص١١٧- ١١٨.

(٨٥) ههمان ژێدهر، ص١١٩.

(٨٦) ام. اچ. ابرامز، فرهنگ توصيفى اصطلاحات ادبى،...، ص١٧٧

(٨٧) فردينان دوسوسور، دورهء زبان شناسى عمومى، ترجمه: كورش صفوى، چاپ دوم، انتشارات هرمس، تهران، ١٣٨٢ه.ش، ص٣- ٤.

(٨٨) محمد الولي، مدخل الى تاريخ الادب، ...

(٨٩) ههمان ژێدهر.

(٩٠) آر. اچ. روبينز، تاريخ مختصر زبانشناسى، ترجمه:على محمد حق شناس، چاپ پنجم، انتشارت مركز، تهران، ١٣٨٢، ص٣٦٨.

(٩١) ههمان ژێدهر، ص٣٦٩.

(٩٢) شوقي ضيف، البحث الادبي طبيعته و منهجه و اصوله، دار المعارف، قاهرة، ١٩٨٣، ص٢٦.

(٩٣) محمود فتوحى، نظرية تاريخ ادبيات،...، ص٩٤.

(٩٤) ج. لانسون و أ. ماييه، منهج البحث في الادب و اللغة، ترجمة: محمد مندور، دار الملايين، بيروت، بدون سنة، ص٢٠.

(٩٥) ههمان ژێدهر، ص٣٢.

(٩٦) ههمان ژێدهر، ص٣٦.

(٩٧) محمود فتوحی، نظرية تاريخ ادبيات،...، ص٤٤.

(٩٨) هەمان ژێدەر ،ص٤٨- ٤٩.

(٩٩) هەمان ژێدەر،ص٤٩- ٥٠.

(١٠٠) عبدالجبار المطلبی، مواقف في الادب و النقد، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨٠، ص١٠٠.

(١٠١) هانس برنتس، مبانى نظرية ادبى، ترجمه:محمد رضا ابوالقاسمى، چاپ دوم، نشر ماهى، تهران، ١٣٨٣ه.ش، ص٤٦.

(١٠٢) هانس برنتس، مبانى نظرية ادبى،...، ص٥٣.

(١٠٣) هەمان ژێدەر، ص٥٦.

(١٠٤) ريچارد هارلند، درآمدى تاريخى بر نظريەى ادبى از افلاتون تا بارت،...، ص٢٤١.

(١٠٥) هەمان ژێدەر، ص٢٤٣.

(١٠٦) ايرنا ريما مكاريک، دانش نامەى نظريەهاى ادبى معاصر،...، ص٢٠٤.

(١٠٧) احمد شوقي رضوان، مدخل الى الدرس الادبي المقارن، دار العلوم العربية، بيروت، ١٩٩٠، ص٨

(١٠٨) هەمان ژێدەر، ص٩- ١١.

(١٠٩) سعيد علوش، مدارس الادب المقارن، المركز الثقافي العربي، بدون مكان، ١٩٨٧، ص٢١- ٢٢.

(١١٠) احمد شوقي رضوان، مدخل الى الدرس الادبي المقارن،...، ١٢- ١٣.

(١١١) هەمان ژێدەر، ١٤.

(١١٢) خليل موسى، مبادلات شعرية (مفهوم التاثير أنموذجا،...، ص٩.

(١١٣) هەمان ژێدەر، ص١٣- ١٤.

(١١٤) محمد غنيمي هلال، الادب المقارن، دار العودة، بيروت، ١٩٩٩، ص٣٣١

(١١٥) احمد شوقي رضوان، مدخل الى الدرس الادبي المقارن،...، ص١٩- ٢٠.

(١١٦) هەمان ژێدەر،...، ص١٢.

(١١٧) هەمان ژێدەر ، ص١٢.

(١١٨) خليل موسى، مبادلات شعرية (مفهوم التاثير أنموذجا)،...، ص١٤.

(١١٩) محمد غنيمى هلال، الادب المقارن،...، ص٣٣٧.

(١٢٠) عزالدين المناصرة، النقد الثقافي المقارن (منظور جدلي تفكيكى)،...، ص١١.

(١٢١) رينية ويلك، مفاهيم نقدية، ترجمة:محمد عصفور، مطابع رِسالة، كويت، بدون سنة، ص٣٦٣.

(١٢٢) رينية ويلك، مفاهيم نقدية،...، ص٣٦٨.

(١٢٣) عزالدين المناصرة، النقد الثقافي المقارن (منظور جدلي تفكيكى)، ...، ص١٢١.

(١٢٤) هەمان ژێدەر، ص١٦٢.

(١٢٥) احمد شوقي رضوان، مدخل الى الدرس الادبي المقارن،...، ص٢٣.

(١٢٦) ايرنا رِيما مكاريك، دانش نامەى نظريەهاى ادبى معاصر،...، ص٧٢.

(١٢٧) سيد على اصغر سلطانى، قدرت گفتمان زبان، نشر نى، تهران، ١٣٩٢ه.ش، ص٦٧.

(١٢٨) جراهام الان، نظرية التناص، ترجمة:باسل المسالمة، دار التكوين، دمشق، ٢٠١١، ص١٠.

(١٢٩) وليد الخشاب، دراسات في تعدى النص، هيئة العامة لشؤون مطابع الاميرية، بيروت، ١٩٩٤، ص١٣.

(١٣٠) محمد خير البقاعي، دراسات في النص و التناصية، مركز الانماء الحضاري، حلب، ١٩٩٨، ص٥٨

(١٣١) حسين الخمرى، نظرية النص من بنية المعنى الى سيميائية الدال، الدار العربية للعلوم ناشرون، بيروت، ٢٠٠٧، ص٢٥٣.

(١٣٢) ناتالى بييقى غروس، مدخل الى تناص،...، ص١١.

(١٣٣) ايرنا رِيما مكاريك، دانش نامەى نظريەهاى ادبى معاصر، ..ص ٧٣- ٧٤

(١٣٤) وليد الخشاب، دراسات في تعدى النص،...، ص٨

(١٣٥) مهى جرجور، مابين الادب المقارن و التناص، مجلة اوراق جامعية، السنة السادسة عشر، عدد٣٠، ٢٠٠٨، ص٥

(١٣٦) ..... (مجموعة من المؤلفين)، افاق تناصية، ترجمة:محمد خير البقاعي، الهيئة المصرية العامة للكتاب، قاهرة، ١٩٩٨، ص٣٢١

(١٣٧) ناتالى بييقى . غروس، مدخل الى تناص،...، ص١٤

(١٣٨) عزالدين المناصرة، علم التناص المقارن (نحو منهج عنكبوتي تفاعلي)،...، ص١٥٣

(١٣٩) ناتالى بييقى . غروس، مدخل الى تناص،...، ص١٤

(١٤٠) وليد الخشاب، دراسات في تعدى النص،...، ص١١

(١٤١) عزالدين المناصرة، علم التناص المقارن (نحو منهج عنكبوتي تفاعلي)،...، ص١٤٢

(١٤٢) محمد خير البقاعي، دراسات في النص و التناصية،...، ص٣٧- ٣٨

(١٤٣) خليل موسى، مبادلات شعرية (مفهوم التاثير أنموذجا،...، ص٣٥

(١٤٤) هەمان ژێدەر، ص٣٥

(١٤٥) هەمان ژێدەر، ص١٤٦

(١٤٦) بهمن نامور مطلق، كشف بينامتنيت: چگونگى پيدايش گسترش يک نظرية و نقد، https://azizi.wrdpress.com

(١٤٧) مهى جرجور، مابين الادب المقارن و التناص،...، ص٥

(*) جيرار جينت ژبلى هەڤنێکستيێ باسێ چوار جۆرێن دیێن پەیوەندیان کریە کو پەیوەندیەکا وەسا ب لاساییکرنێڤە نینن، لەوما مە ل ڤێرێ باسێ وان نەکریە.

(١٤٨) عزالدين المناصرة، علم التناص المقارن (نحو منهج عنكبوتي تفاعلي)،...، ص١٣٨

(١٤٩) هەمان ژێدەر، ص١٤٩.

(١٥٠) گراد الكبيسى، التراث العربي، دار الحرية، بغداد، بدون سنة، ص٣.

(١٥١) هەمان ژێدەر، ص٥.

(١٥٢) عادل العامل، الابتكار في الادب و الفنون، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، بدون سنة، ص٣٥.

(١٥٣) فاتح علاق، مفهوم الشعر عند رواد الشعر العربى الحر، اتحاد كتاب العرب، دمشق، ٢٠٠٥، ص١٥.

(١٥٤) گراد الكبيسى، التراث العربي،...، ص٨- ٩.

(١٥٥) فاتح علاق، مفهوم الشعر عند رواد الشعر العربى الحر،...، ص١٨.

(١٥٦) گراد الكبيسى، التراث العربي،...، ص٤.

(١٥٧) عادل العامل، الابتكار في الادب و الفنون،...، ص٣٦.

(١٥٨) ايريك هوبسباوم و تيرنس رينجر، اختراع التراث، ترجمة:شيرين ابو النجا و الاخرون، مركز البحوث و الدراسات الاجتماعية، قاهرة، ٢٠٠٤، ص٥.

(١٥٩) محمد غنيمي هلال، قضايا معاصرة في الادب و النقد،...، ص٥٤.

(١٦٠) فتحي بو خالفة، شعرية القراءة و التاويل في الرواية الحديثة، عالم الكتب الحديثة، اربد، ٢٠١٠، ص٢٨١.

(١٦١) عزالدين المناصرة، النقد الثقافي المقارن (منظور جدلي تفكيكي)،...، ص١٢١.

(١٦٢) محمد غنيمي هلال، الادب المقارن،...، ص١٠٥.

(١٦٣) هەمان ژێدەر، ص١١٢.

(١٦٤) دانييل هنري باجو، الادب العام المقارن، ترجمة:غسان السيد، اتحاد كتاب العرب، دمشق، ١٩٩٧، ص٢٠٩.

(١٦٥) محمد غنيمي هلال، الادب المقارن،...، ص٣٣٠.

(١٦٦) الكساندر ديما، مبادىء علم الادب المقارن،...، ص١٢٧.

(١٦٧) نيوتن ستالكنخت و هورست فرنز، الادب المقارن المنهج و المنظور،...، ص٩٦.

(١٦٨) محمد غنيمي هلال، الادب المقارن،...، ص١١٧.

(١٦٩) الكساندر ديما، مبادىء علم الادب المقارن،...، ص١٢٣.

(١٧٠) ايريك هوبسباوم و تيرنس رينجر، اختراع التراث،...، ص٦.

(١٧١) هەمان ژێدەر، ص٧.

(١٧٢) ناتالی بییقی غروس، مدخل الی تناص،...، ص١٠٥.

(١٧٣) هەمان ژێدەر، ص١٥٩.

(١٧٤) عزالدين المناصرة، النقد الثقافي المقارن (منظور جدلي تفكيكي)،...، ص٢١٢.

(١٧٥) ناتالی بییقی غروس، مدخل الی تناص،...، ص٢٢٣.

(١٧٦) هەمان ژێدە، ص٢٢٤- ٢٢٥.

(١٧٧) عبدالحكيم راضي، دراسات في النقد العربي،...، ص١٩٩.

(١٧٨) عادل العامل، الابتكار في الادب و الفنون،...، ص٦٠.

(١٧٩) محمد مفتاح، التحليل الخطاب الشعري، استرتيجية التناص، دار التنوير، بيروت، ١٩٨٥، ص١٢٣.

(١٨٠) عبدالجبار المطلبي.مواقف في الادب و النقد، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨٠، ص٢٠٨.

(١٨١) مصطفى السعدني، في التناص الشعري،...، ص٨٣.

(١٨٢) ل. ر. بريت، التصور و الخيال، ترجمة: عبدالواحد لؤلؤة، دارالحرية، ١٩٧٩، ص٥٠- ٥١.

(١٨٣) محمد احمد الغرب، عن اللغة و الادب و النقد، المركز العربي للثقافة و العلوم، بيروت، بدون سنة، ص٣٦٨- ٣٦٩.

(١٨٤) عادل العامل، الابتكار في الادب و الفنون،...، ص٧.

(١٨٥) قصي الحسين، سوسيولوجية الادب،...، ص١٤١.

(١٨٦) عبدالستار ابراهيم، افاق جديدة في دراسة الابداع، وكالة المطبوعات، كويت، بدون سنة، ص٣٥.

(١٨٧) ناتالى بييقى . غروس، مدخل الى تناص،...، ص١٥٧- ١٥٨.

(١٨٨) عادل العامل، الابتكار في الادب و الفنون،...، ص١٥.

(١٨٩) هەمان ژێدەر، ص٢٩.

(١٩٠) هەمان ژێدەر، ص١٢.

(١٩١) يوسف ميخائيل اسعد، سيكولوجية الابداع في الفن و الادب، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، بدون سنة، ص٦٢.

(١٩٢) ك.ك. روثفن، قضايا في النقد الادبي،...، ص٢١٦.

(١٩٣) هەمان ژێدەر، ص٢٣٠.

(١٩٤) ك.ك. روثفن، قضايا في النقد الادبي،...، ص٢٤٥.

(١٩٥) فاخر عاقل، الابداع و تربيته، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٧٩، ص١٨.

(١٩٦) عبدالستار ابراهيم، افاق جديدة في دراسة الابداع،...، ص١٦- ١٧.

(١٩٧) عزالدين المناصرة، علم التناص المقارن (نحو منهج عنكبوتي تفاعلي)،...، ص٤١٤.

(١٩٨) عبدالستار ابراهيم، افاق جديدة في دراسة الابداع،...، ص٢٤.

(١٩٩) يوسف ميخائيل اسعد، سيكولوجية الابداع في الفن و الادب،...، ص٧٧.

(٢٠٠) عادل العامل، الابتكار في الادب و الفنون،...، ص٣٥.

(٢٠١) عبدالستار ابراهيم، افاق جديدة في دراسة الابداع،...، ص١٢٢.

(٢٠٢) هەمان ژێدەر، ص١٠٩.

(٢٠٣) هەمان ژێدەر، ص٨٣- ٨٤.

(٢٠٤) سيد قطب، النقد الادبي اصولة و مناهجه، الطبعة الثامنة، دار الشروق، قاهرة، ٢٠٠٣، ص٢٦.

(٢٠٥) هەمان ژێدەر، ص٣١.

(٢٠٦) محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث،...، ص٣٨٣.

(٢٠٧) هەمان ژێدەر، ص٣٨٣.

(٢٠٨) ....، الادب و القضايا العصر (مجموعة مقالات نقدية)، ترجمة: عادل العامل، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨١، ص٨٤.

(٢٠٩) سيد قطب، النقد الادبي اصولة و مناهجه،...، ص٣١.

(٢١٠) محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث،...، ص٣٨٧.

(٢١١) سيد قطب، النقد الادبي اصولة و مناهجه،...، ص٣٨.

(٢١٢) نيوتن ستالكنخت و هورست فرنز، الادب المقارن المنهج و المنظور، ...، ص٩٠.

(٢١٣) ناتالى بييقى غروس، مدخل الى تناص،...، ص١٥٦- ١٥٧.

(٢١٤) هەمان ژێدەر، ص١٥٨.

(٢١٥) ك.ك. روثفن، قضايا في النقد الادبي،...، ص٢٣٣.

(٢١٦) ناتالى بييقى غروس، مدخل الى تناص،...، ص٢٢٥- ٢٢٦.

(٢١٧) عزالدين المناصرة، النقد الثقافي المقارن (منظور جدلي تفكيكى)،...، ص١٠٩- ١١٠.

(٢١٨) هەمان ژێدەر، ص١٦٣.

(٢١٩) احمد طعمة حلبي، التناص بين النظرية و التطبيق، الهيئة العامة السورية للكتاب، دمشق، ٢٠٠٧، ص٥٤.

# پشكا دوویێ

# لاساییكرن د شعر و رەخنەیا شعرییا رۆژهەلاتا ئیسلامی دا

- دەروازە:
- ڕێرەوێ لاساییكرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی
  - قەسیدەیا عەرەبی بنگەهێ لاساییكرنا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی
  - شعرا كلاسیكییا فارسی
  - رۆلێ فاكتەرێن نوی د گۆهرینا ڕێرەوێ لاساییكرنا شعرییا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا
  - جهێ شعرا كلاسیكییا كوردی د ڕێرەوێ لاساییكرنا شعرییا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا
- ڕۆلێ ڕەخنەیا عەرەبی ـ ئیسلامی د لاساییكرنا شعریدا
  - ئەگەرێن پشتەڤانیكرنا لاساییكرنا شعری د ڤەكۆلینێن ئیسلامیدا
  - ڕێكارێن رەخنەیا عەرەبی۔ ئیسلامی بۆ بهێزخستنا لاساییكرنا شعرا كەڤن
  - دانانا مەرج و زاراڤان د بەرژەوەندیا بەردەوامبوونا ئەدگارێن وێنەیێن قەسیدەیا عەرەبیدا

# دەروازە

د ئەدەبیاتا کلاسیکییا ئوروپیدا، لاساییکرنێ ریرەوەکێ مێژوویی دیارکری هەیە و ژ چارچووڤێ پەیوەندییا د ناڤبەرا دوو کەسان یان دوو بەرهەمان دەردکەڤیت و یاسا و نەریت و ژانر و قوناغێن ئەدەبی بخۆڤەدگریت. ئەڤ لاساییکرنە پتر بریتیە ژ هەولدانا نڤیسەرێن سەردەمەکی بۆ پاراستن و بەردەوامیدان ب ئەدگار و تایبەتمەندییێن ئەدەبییێن قوناغەکا کەڤن. نڤیسەر سەرەرای داخباربوون ب نڤیسەرەکێ بەری خۆ، پتر لاساییا ئەدگار و تەکنیک و چارچووڤەیێن گشتییێن قوناغەکا دیارکری دکەت. لاساییکرنا سەرەکی ئەڤ لاساییکرنەیە چونکە نە بتنێ نڤیسەر بەشداریێ تێدا دکەن بەلکو ڤەکۆلینێن ئەدەبییێن تیۆری و پراکتیکی شان ب شانێ نڤیسەران ب رێکا دانانا یاسا و مەرجان بۆ ژانرێن ئەدەبی، رەوابوونێ دبەخشنە ڤێ لاساییکرنێ. لسەر ڤی بناغەی ئەم باسێ پەیوەستبوونا ئەدەبیاتا لاتینی ب ئەدەبیاتا یونانی و پەیوەستبوونا کلاسیزما نوی ب ئەدەبیاتا یونان و رۆمایا کەڤن دکەین.

هەر ب ڤی رەنگی لاساییکرن د ئەدەبیاتا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا ژی رێرەوەکێ مێژوویێ دیارکری هەیە و پێویستە لسەر بناغەیەکێ مێژوویی بهێتە شرۆڤەکرن. ل ڤێرێ ژی لاساییکرن ژ سنوورێن نەتەوەیی دەربازدبیت و قوناغێن خۆ یێن دیارکری هەیە، واتە ئەو لاساییکرنا کو شاعرەك پێ رادبیت زێدەتر لاساییکرنا یاسا و نەریت و قالب و تەکنیکێن قوناغێن بەرێیە تاکو لاساییکرنا شاعرەکێ دیارکری بیت.دیارە کۆمەکا فاکتەرێن ئەدەبی و رەخنەیی و ئایدیۆلۆژی بووینە بەربەست د رێکا باسکرن و ڤەکۆلینا ئەو قوناغێن لاساییکرنێ کو شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی تێدا دەرباز بوویە، چێدبیت گرنگترین فاکتەر ژی ئازراندنا بابەتێ دزییێن ئەدەبی د رەخنە و ڤەکۆلینێن رۆژهەلاتا ئیسلامیدا بیت کو

بوويه ئەگەرێ سنووردارکرنا لاساییکرن و کاریگەرییێ د چارچووڤێ پەیوەندیەکا دوو لایەنەیا د ناڤبەرا دوو دیرێن شعرێدا. گەلەك جاران گرنگیدان ب وەکهەڤییا ووشەیی و جارنا واتایا د ناڤبەرا دوو دیرێن شعرێ یان دوو شاعران د ڤەکۆلینێن شعرییێن ڕۆژهەلاتا ئسلامیدا بوویه بناغه بۆ دیارکرنا لاساییکرن یان کاریگەرییا ئەدەبی. ب دیتنا مه پرانیا جاران ئەڤ جۆره ڤەکۆلینه ب تنێ دشێن بابەتێ وەکهەڤی یان وەرگرتنێ چارەسەر بکەن و نەشێن ڕاستی و سروشتێ ڕاستەقینەیێ لاساییکرنێ د شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا پێشان بدەن.

لاساییکرنا ڕاستەقینه د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا پەیوەسته ب بەلاڤبوونا ئیسلامەتیێ و بالادەستبوونا دەستەلاتا عەرەبی و پیرۆزکرنا زمان و ئەدەبیاتا عەرەبی ل ژێر سیبەرا ئایینێ ئیسلامێ. شعرا عەرەبییا جاهلی سەروکانییا لاساییکرنێیه. ئەڤ شعره ل قوناغێن دەستەلاتدارییا ئەمەویاندا زۆربەی ئەدگارێن شعرا جاهلی دپارێزیت و ل سەردەمێ عەباسیان دگەهیته کوپیتکا خۆ. هەر ل سەردەمێ عەباسیان ژبەر ئەو تێکەلییا کو دناڤبەرا فارس و عەرەباندا چێبووی؛ شعرا کلاسیکییا فارسی لسەر بناغەیێ لاساییکرنا شعرا عەرەبی سەرهلددەت. د شعرا کلاسیکییا فارسیدا ژی گەلەك ژ ئەدگارێن شعرێ ب رێکا لاساییکرنێ دهێنەپاراستن و بەردەوامییێ ددەنه هەبوونا خۆ.شعرا کلاسیکییا کوردی ژی دبیته ئەلقەیەك د ڤی رێرەوێ لاساییکرنێدا، نکۆلی ل لاساییکرنا شعرا کلاسیکییا فارسی و کاریگەرییا وێ لسەر شعرا کلاسیکییا کوردی ناهێتەکرن. ئەم دشێین ڤێ وەکو رێرەوەکێ لاساییکرنا شعرێ د ئەدەبیاتا رۆژهەلاتا ئیسلامی بدەینه نیاسین، لاساییکرنەك کو ژ لایەکیڤه شاعر ب رێکا لاساییکرنا شاعرێن بەری خۆ بەردەوامییێ پێددەن و ژلایەکێ دیڤه رەخنه و ڤەکۆلینێن ئیسلامی ب رێکا دانانا پێناسه و یاسا و چارچووڤەیان هەولا چەسپاندن و سەپاندنا وێ ددەن. هەر لسەر ڤی بناغەی پێویسته باسێ رێرەوێ لاساییکرنا شعرێ د ئەدبیاتا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی هەتا دگەهیته شعرا کلاسیکییا کوردی و رۆلێ رەخنه و ڤەکۆلینێن ئیسلامی د بهێزکەفتنا لاساییکرنا شعریدا بهێتەکرن:

## ١.٠٢. ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی:

## ٠٢. ١. ١. قەسیدەیا عەرەبی بنکەهێ لاساییکرنا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی:

### ٠٢.١.١.١. قەسیدەیا جاهلی:

شعر تاکە ئامرازێ دەربڕینا عەرەبان بوویە و مینا مللەتێن دی چ بەرهەمێن چیرۆکامێز[*] شانبشانێ شعرێ ناهێنە دیتن[١]، (شعر کوپیتکا ڕۆشنبیرییا ئەوان عەرەبان بوو کو لژێر کاریگەرییا سەقایێ بیابانێ بوون، تاکە داهێنانا وان شعر بوو و چ بەهرە د هونەرێن دیدا نەبوون).[٢]ئەڤ شعرە ( د بنەرەت دا شعرەکا بەدەویە.رەنگە هندەك کاریگەرییێن شارستانیەتێن دەوروبەر لسەر هەبیت، لێ گەلەك گرنگ و ڕیشەیی نینن، قەسیدەیا کەڤنا عەرەبی داهێنانەکا ڕەسەنا عەرەبێن بەدەوییە)[٣]، ( شعرەکا پارێزەرە و خزمەتا میراتا سیستەمێ قەبەلی و پیڤەرێن وییێن ئەرستوکراتی و سەروەرییا وێ دکەت)[٤].

هەمی مەرج و پێدڤیاتییێن لیریکی بوونێ د شعرا عەرەبیدا ناهێنە دیتن، چونکە د شعرا عەرەبیدا گرنگی ب خودێ شاعری ناهێتە دان. کارێ شاعری ب تنێ لاساییکرنا دوو تشتانە: لاساییکرنا تشتێن دیار یان بەرجستە د سروشتیدا و سازکرنا پەیوەندییێن لێکچواندنێ[٥]. شاعر نەشێت (هەست و سۆزێن خۆ یێن تاکەکەسی دەرببڕیت بەلکو ب تنێ گرنگیێ ددەتە پەیوەندییا سەرڤەسەرڤە یا د ناڤبەرا تشتاندا، ئەو پەیوەندییێن کو ب چاڤ دهێنە دیتن...)[٦]، سەرەرای ڤێ چەندێ وەکو نەریتەك زاراڤێ لیریکی بۆ ڤێ شعرێ دهێتە بکارئینا.

ئێک ژ تایبەتمەندییێن دیێن ڤێ شعرێ زارەکیبوونا وێیە. شعرا جاهلی (شعرەکا زارەکییە کو تێدا ب تنێ ڕێکا دەربڕینێ گرنگە و ناڤەرۆکا گوتنێ چ گرنگییا خۆ نینە، یانکو چ گوتن گرنگ نینە بەلکو چەوانیا گوتنێ گرنگە.د ڤێ شعرێدا شاعر دەربڕینێ ژ خۆ ناکەت بەلکو دەربڕینێ ژ کۆمێ دکەت)[٧].

هندەك ڤەكۆلەر د ڤێ باوەرییێدانە كو ( ئەدەبێ عەرەبی ئەدەبەكێ زارەكییە بەری كو ئەدەبەكێ نڤیسكی بیت، گرنگییێ ددەتە هەبوونا خۆشی و چێژێ د زمان و گوهداریكرنێدا، هەولددەت كو ئەڤ چێژە بهێتە ڤەگۆهاستن بۆ گوهداران و كاریگەریێ ل دەروونێ وان بكەت)[٨]. دیارە هەر ئەڤ زارەكیبوونا شعرا جاهلی و گرنگیدان ب جەماوەری بوویە ئەگەر كو مەبەست یانكو (غەرەز) لسەر ڤێ شعرێ زالببیت. مەبەست ئێك ژ گرنگترین تایبەتمەندییێن قەسیدەیا زارەكییا عەرەبییا كەڤنە. ئەڤ قەسیدەیە ب رێكا هندەك مەبەستان بۆ جەماوەری دهێتە ئاراستەكرن،گرنگترین مەبەستا شعرا جاهلی ژی ستایشكرنە.

ئەڤ شعرا عەرەبییا جاهلییا لیریكییا زارەكی ب تنێ قالبەك هەیە، كو ئەو ژی قەسیدەیە. قەسیدە ئەو قالبێ شعریە كو عەرەبان بۆ ماوەیەكێ دویر و درێژ پشتبەستن لسەر كریە. (قەسیدە وینێ ژیانا جاهلیە، لەوما شعرەكا هەستپێكری و ماتریالی و پڕ ژ لێكچواندن و وێنەیێن ماددیە، ئەنجامێ گەشەكرن یان نەشونمایێ نینە بەلكو پەڤین و لپەیهەڤهاتنە، پڕە ژ ژیان و بزاڤ و ڕیتمێ.مینا ژیانا مرۆڤێ بیابانشینێ ل بن خیڤەتان، نێزیكە ژ دەنگ و ڕەنگێ ژیانا بیابانێ. ژ لایێ هونەریڤە ژی بریتیە ژ كۆمەكا دێران كو بنەرەتێ ئێكگرتنا وان یا هونەری تاكەدێرا سەربەخۆیە، بریتیە ژ كۆمەكا یەكەیێن سەربەخۆ كو چ سیستەمێن ناڤخۆیی وان پێكڤە گرێنادەت و تەنها پەیوەندییا د ناڤبەرا وان سەروایە. ئەڤ شعرە لسەر كێشەكا دیاركری هاتیە ڤەهاندن و كورتكرن مۆركێ گشتیێ وێیە. ژ لایێ ناڤەرۆكێڤە ژی چەندین مەبەستان ب خۆڤە دگریت. شاعرێ جاهلی شعرا خۆ ب پێشەكییا (طللي) و پاشی غەزەل یان نەسیب یان تەشبیبێ دەست پێدكەت)[٩]، كەواتە پرانیا جاران قەسیدەیا جاهلی شعرەكا دوور و درێژە و ژ چەند بەشان پێكدهێت.

### ٢.١.١.٢. قەسیدەیا عەرەبییا دەستپێکا ئیسلامەتییێ:

شعرا عەرەبییا دەستپێکا ئیسلامەتییێ هندەك ئەدگارێن تایبەت ب خۆ هەنە، لێ لگەل هندێ ژی گەلەك ڤەکۆلەر ڤان گۆهرینان ب گوهڕینێن ڕیشەیی ناهژمێرن. ب دیتنا وان ( جیاوازیەکا کێم د ناڤبەرا ڕوخسار و ناڤەرۆکا ڤێ شعرێ و شعرا سەردەمێ جاهلیدا هەیە. بابەت پرانیا جاران هەر ستایش و داشۆرینە، لێ جیاوازی ئەڤەیە کو کەسایەتییا پێغەمبەرێ ئیسلامێ تەوەرێ ڤان ستایشکرن و داشۆرینان بوویە، لەوما ب نەچاری هندەك ئاماژەیێن ئاینی یانکو پەیڤێن ئیسلامی د ڤێ شعرێدا هاتینە بکارئینان. ب شێوەیەکێ گشتی گۆهرینەکا وەسا د ڤێ شعرێدا ناهێتە دیتن) [١٠]

هاتنا ئیسلامەتییێ بوو ئەگەر کو گوهڕینێن مەزن د جڤاکیدا ڕوودەن، لێ وەسا دیارە کو ( ئەڤە بۆ شاعرێن عەرەب گەلەك گونجاو نەبوویە، ئەڤ کەشوهەوایە بۆ وان ناهەموار بوو، دژی چێژا شاعرێن جاهلی بوو، ستایشا شەراب و ژنێ ل وان هاتبوو قەدەغەکرن و ب مەرەما ڕەتکرنا تاوانا شعربوونا قورئانێ و شاعربوونا پێغەمبەرێ ئیسلامێ، هەول بۆ کێمکرنا پلە و پایەیا شعرێ دهاتەدان)[١١]، لەوما شاعرێن عەرەب هەول نەدانە ئەوێ زەمینەیا کو ئیسلامەتییێ بۆ ڤەهاندنا شعرێ سازکربوو، بکەنە ڕێچکە و لسەر بناغەیێ وێ شعرەکا نوی دامەزرینن. پشتبەستن ب شعرا سەردەمێ جاهلی و کێمکرنا بهایێ شعرا سەردەمێ ئیسلامی هەتا وی رادەی بهێز کەفتیە کو (ڕەخنەگرەکێ وەکو (اصمعی) ڕێبازا شعرێ ب ڕێبازا شاعرێن ناڤدارێن سەردەمێ جاهلی، واتە یێن کەنکەنە (فەحول) زانییە. ب دیتنا وی ئەگەر شعر ژ بابەت و مەبەستێن ڤان شاعران دەرکەڤیت و گرنگییێ بدەتە بابەتێن خێرێ وەکو بابەتێن ڕەوشتی و ئایینی، دێ بەرەڤ لاوازییێڤە چیت)[١٢]. ئەڤە ب خۆ ژی ڕەتکرنەکە بۆ ئەو شعرا ڕەوشتی- ئایینیا کو ل دەستپێکا ئیسلامەتییێ سەرهلدای، د هەمان دەمدا پێنگاڤەکا گرنگە بۆ ب

نموونەییکرنا شعرییەتا قەسیدەیا جاهلی و سەپاندنا وێ لسەر شاعران و بهێزخستنا لاساییکرنێ د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا.

کەواتە (سەرەرای کاریگەرییا مەزنا قورئانێ لسەر جڤاکێ عەرەبی، شعرێ چ مفایەکێ وەسا ژ قورئانێ نەدیتیە و پشتی دەربازبوونا چەند سەدەیان ژ بلی هندەك کارتێکرنێن سادە، قورئانێ کاریگەریەکا وەسا نەکریە سەر شعرا عەرەبی.یانکو عەرەب داخبار بوون ب لایەنێ دینیێ قورئانێ، لێ ژ لایێ ئەدەبیڤە چ مفا ژێ وەرنەگرتن، بۆ نموونە کەفتنە ژێر کاریگەرییا چیرۆکێن قورئانێ لێ ئەڤێ چەندێ ڕەنگڤەدانا خۆ د ئەدەب و ڕەخنەیا عەرەبیدا نەبوویە. مرۆڤ هەستێ ب چ جیاوازیەکا وەسا د ناڤبەرا شعرا عەرەبییا ئیسلامی و شعرا عەرەبییا جاهلیدا ناکەت.[١٣]یانکو ب کورتی (سەرەرای هەبوونا هندەك جیاوازیان د ناڤبەرا ڕێچکەیا شعرا جاهلی و شعرا ئیسلامیدا، لێ دشێین بێژین کو هەر دوو ژ سەروکانییەکێ دەردکەڤن و خودان هزر و ڕوانینەکا نێزیک ژهەڤن[١٤]، یانکو ئەو قەسیدەیا کو پشتی هاتنا ئیسلامەتیێ دهێتە دیتن هەر بەردەوامیا شعریەتا قەسیدەیا جاهلیە.

## ٢. ١. ١. ٣. سەردەمێ ئەمەویان و ڤەکەریان بۆ ئەدکارێن قەسیدەیا جاهلی:

لگەل دامەزراندنا دەولەتا ئەمەوی حەزا پاراستنا شعرا جاهلی و شێوازێ وێ وەکو بەشەك ژ کەلەپورێ بیاباننشینیا بەری ئیسلامەتیێ بهێزکەفت. ئەمەویان ب ئێکجاری ئۆمید و هیڤیێن گۆهرینا شعرا عەرەبی ژێنبرن و جارەکا دی شعر زڤریاڤە سەر ڕێچکەیا قەسیدەیا جاهلی. (دەستەلاتا ئەمەویان دەستەلاتەکا قەبەلی بوو. وان حەز و ئارەزۆیا ژیانا بیابانێ و کلتورێ کەڤنێ عەرەبان هەبوو و حەز دکرن گوهداریا شعرێ ب مۆرکێ خۆ یێ جاهلی بکەن. عەرەبیبوونا ڤێ دەولەتێ و لاوازبوونا ڕۆلێ یێن نە عەرەب د ڤێ دەولەتێدا ژی پالدەرەکێ مەزن بوو بۆ بهێزکەفتنا ڤێ چەندێ. ژ لایەکێ دیڤە شعرا عەرەبییا دەستپێکا ئیسلامەتیێ ژی

نەشیابوو جهێ خۆ ڤەکەت و مینا قوتابخانەکا هونەری خۆ بسەلمینیت و وەکو پێویست مفای ژ گیانێ ئایینی و زمان و شێوازێ قورئانێ وەربگریت، لەوما بۆ شاعرێن ئەمەوی چ رێکێن دی ژبلی پەنابرن بۆ شعرا جاهلی نەما).[١٥]

شعرا ئەمەوی ب پرانیا (چارچووڤە و ئەزموونێن خۆڤە پەیوەستە ب نەریتێن شعرا جاهلی و ب ڕاستی چ ڤەکۆلینەك ل دور شعرا ڤی سەردەمی سەرکەفتنێ بدەستڤە نائینیت، ب تنێ ل وی دەمی نەبیت کو پەیوەندییا شعرا ئەمەوی ب کەلەپورێ جاهلی بەرچاڤ بگریت؛ داکو بشێت ڕەگەزێن لاساییکری و یێن نوی دەستنیشان بکەت)[١٦]. لگەل هندێ ژی بشێوەیەکێ گشتی ڕەگەزێن نوی د شعرا ئەمەویدا گەلەك کێمن تەنانەت (نموونەییێن داهێنان و ڕەسەنایەتیێ د لێکچواندن و خواستن و فەرهەنگا شعری و تشتێن دی کو شاعر بۆ ئاڤاکرنا وێنەیێن خۆ مفای ژێ وەردگریت لدەڤ شاعرێن ئەمەوی گەلەك کێمن..)[١٧] . شعرا عەرەبییا ئەمەوی نە بتنێ بەردەوامی دانە ب شعریەتا قەسیدەیا جاهلی، بەلکو بریتیە ژ نەهێلانا هیڤیا دروستبوونا شعریەتا ئیسلامی ل هەمبەر شعریەتا جاهلی.

## ٤.١.١.٢. شعرا سەردەمێ عەباسیان دناڤبەرا گۆهرین و لاساییکرنێدا:

ل سەردەمێ عەباسیان تێکەلی د ناڤبەرا عەرەب و نەتەوەییێن دیدا پەیدا بوو، جۆرە ئازادیەك د بوارێ ئایین و بیروباوەراندا سەرهلدا، گەنگەشە و گفتگو دەربارەی گەلەك بابەتان هاتنەکرن، ئازادیا جڤاکی گەشەکر و مەیڤەخوارن و خۆشگۆزەرانیەکا بێ وێنە خویابوو.ئەڤ گوهرینا وەسا مەزن و بهێز هندەك شاعر هاندان کو هەولا گۆهرینا شعرا عەرەبی بدەن.[١٨]

دەولەتا عەباسی کو ئەنجامێ تەڤلیهەڤبوونا عەرەب و نەتەوەییێن دی ب تایبەت فارسان بوو؛ هەلگرا هەمان دەمارگیریا عەرەبییا سەردەمێ ئەمەویان نەبوو، ل ڤی سەردەمی ژیان ب تەمامەتی بۆ قوناغا شارنشینیێ هاتە ڤەگۆهاستن، خەلکی چ ئەزموونەکا وەسا لگەل ژیانا بیابانشینیێ نەما، لێ لگەل هندێ ژی پیرۆزراگرتنا شعرا جاهلی و لاساییکرنا وێ وەکو نەریتەك هێشتا بەردەوام بوو.

سەرەرایێ هەبوونا بزاڤێن نویکرنێ کو پێشەنگێ وان (بەشار بن برد) بوو لێ ئەو ئەنجامێن کو بدەستڤەهاتین د ئاستێ ڤان هەولدانان دا نەبوو؛ ئەڤ هەولە لسەر قالبێ تەقلیدیێ قەسیدەیا عەرەبی هاتبوونە ئەنجامدان؛ ئەو قالبێ کو شێوەیێ خۆ یێ جاهلی پاراستبوو و لگەل بورینا دەمی زێدەتر رەهـ و ریشالێن خۆ بهێزدئێخست.[١٩]

(ئەبی نەواس) ئێک ژ وان شاعران بوو کو دڤیا گۆهرینێ بێختە شعرا ڤی سەردەمی، وی دڤیا وەسفا مەیێ ل جهێ پێشەکیا (طللي) بکاربینیت، چەندین قەسیدە ژی لسەر ڤی شێوازی نڤیسین. وەسا دیارە کو پێشەکیا قەسیدەیێ تشتەکێ گەلەك پیرۆز بوویە و دەستبەرداربوون ژ وێ یان گوهرینا وێ بوویە جهێ نەرازیبوون و ململانێ[٢٠]. هەولێن ب ڤی رەنگی زێدەتر دچنە چارچووڤێ شۆرەش ل دژی بابەتێن شعرێ و نویکرنا رۆخسارێ شعرێ ب خۆڤە ناگرن)[٢١]، ل ڤێرێ (ئەبی نەواس) دەستبەرداری پێشەکیا قەسیدەیێ نەبوویە و ب تنێ (جۆرە پێشەکیەکا نوی ل جهێ پێشەکیا کەڤن بکارئینایە و ئەم نەشێین ڤێ چەندێ ب نویکرنەکا راستەقینە ل قەلەم بدەین).[٢٢]

(ئەبی تەمام) ب سەرکێشێ گۆهرینا شعرا عەرەبی ل سەردەمێ عەباسیان دهێتە نیاسین، گەلەك دانوستاندن و گەنگەشە لدور ئەو گۆهرینێن وی کرین هاتینەکرن و هەر ئەڤە ژی بووینە هێڤێنێ سەرهلدانا پرانیا ڤەکۆلینێن رەخنەیی و ئەدەبیێن کو ل دور شعرێ هاتینەکرن، لگەل هندێ ژی ((وەسا دیارە کو خالا جیاوازیا وی لگەل شاعرێن دی بکارهینانا بەدیعێ و هونەرێن جوانکاریێ بوویە کو لدەڤ شاعرێن بەری وی ب ئاوایەکێ کێم و سنووردار هاتینە بکارهینان)[٢٣] یانکو سەرەرای هەبوونا هندەك هونەر و تەکنیکێن نوی، لێ چ گۆهرینێن ریشەیی و لادانێن مەزن ژ شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی د شعرێن (ئەبی تەمام)یدا ژی ناهێنە دیتن.

ب ڤی رەنگی هەولدانا (ئەبی نەواس)ی بۆ گۆهرینا سیستەمێ قەسیدەیا عەرەبی و هەولدانێن (ئەبی تەمام)ی بۆ دەرکەفتن ل بن سیبەرا ستوونا شعرێ

نەشیاینە چ زیدەکرنێن ڕاستەقینە بێخنە سەر شعرا عەرەبی. سەرەرای ئەو تێکەلیا کو ل ڤی سەردەمی د ناڤبەرا عەرەب و نەتەوەییێن دیدا دهێتە دیتن لێ شاعر هێشتا هەولا پاراستنا ڕەسەنایەتی و بەداوەتا قەسیدەیا جاهلی ددەن لێ لگەل هندێ ژی نەشێن وێ ڕەسەنایەتیا کو د شعرا کەڤن دا هەبوویە پێشکێش بکەن و ب ڤی ئاوایی شعر لسەر دەستێ وان بەرەڤ سنعەتکاری و دەستکردبوونێڤە دچیت.بکورتی دشێین بێژین کو ئەدەبێ عەرەبی ل ڤی سەردەمی ژبلی هندەك هەولێن دەمکیێن شاعرێن وەکو (متني) و (معري) ل سەدێ چوارێ کۆچی چ بزاڤەکا وەسا ب خۆڤە نەدیتیە، یانکو ژ ڕۆژا کو ڕۆشنبیریا بیانی د گەل یا عەرەبی تێکەل بووی ژبلی هندەك هەولێن کو بێ بەردەوامیدان ب دویماهیک هاتین چ هەولێن دی بۆ نویکرنا شعرێ نەهاتینە دان.[٢٤] و پرانیا جاران شعرا عەرەبی ئەدگار و تایبەتمەندییێن بنگەهینێن قەسیدەیا جاهلی پاراستییە.

## ٢.١.٢. شعرا کلاسیکییا فارسی :

### ٢.١.٢.١. شعرا فارسی د ناڤبەرا کارلێککرن و لاساییکرنێدا:

خالا بالکێش ل سەردەمێ عەباسیان تێکەلیا د ناڤبەرا فارس و عەرەبانە، هەر دوو لایەنان گەلەك کاریگەری لسەر هەڤدوو هەبوویە. فارس شیاینە د بوارێ پەخشانێدا و ب ڕێکا وەرگێرانا ژمارەکا بەرچاڤ ژ بەرهەمێن خۆ ژ زمانێ پەهلەوی بۆ سەر زمانێ عەرەبی کاریگەریەکا مەزن بکەنە سەر پەخشانا عەرەبییا وی سەردەمی لێ تشتێ گرنگ ئەڤەیە کو پیرۆزراگرتنا شێوازێ شعرا جاهلی و بهێزبوونا شعریەتا قەسیدەیێ بووینە بەربەست ل هەمبەر ڤێ چەندێ کو فارس بشێن گوهرینەکا ڕیشەیی بێخنە د شعرا عەرەبیدا.

دهێتەگوتن کو ( گەشەکرنا ئەدەبێ عەرەبی لسەردەمێ عەباسیان ل ژێر کاریگەرییا ئەدەبێ فارسی و هندی و هزرا یونانی بوویە و گرنگترین فاکتەرێ ڤەگۆهاستنا ڤێ کاریگەریێ ژی هەر ئەدەبیاتا فارسی بوویە)[٢٥]. ئەڤ تەڤلیهەڤبوونا

فارسان دگەل ئەدەبێ عەرەبی بوویە ئەگەر کو نڤیسەرەکێ وەکو (شبلی نعمان) د ڤێ باوەرییێدا بیت کو (دەمێ شعرا فارسی سەرهلدای، تێکەلیا د ناڤبەرا فارس و عەرەبان گەهشتبوو وی ڕادەی کو تەنها تشتێ جیاواز د ناڤبەرا وان زمان بوویە. ئەو گوهڕینا کو ب سەر شعریەتا عەرەبی هاتی بەرهەمێ کاریگەرییا شعریەتا فارسی بوویە، یانکو شعریەتا عەرەبی لگەل ب دویماهیکهاتنا سەردەمێ ئەمەوی ب دویماهیک هاتیە و لاساییکرنا شاعرێن فارس زێدەتر لاساییکرنەکا خودیە تاکو دەرەکی بیت، واتە شعریەتا سەردەمێ عەباسی شعریەتەکا فارسیە ).[٢٦]ب ڕاستی زێدەرۆیی د ڤێ ئاخفتنێدا هەیە، چونکە شعرا عەرەبییا ڤی سەردەمی پتر درێژەپێدانا شعریەتا جاهلیە و ئەو جیاوازی و تایبەتمەندییێن کو ب شعرا ڤی سەردەمیڤە ژی دیارن زێدەتر بەرهەمێ سەقایێ ئەرستوکراتییێ کۆچکا عەباسیان و تێکەلیا فارس و عەرەبانن کو چ گۆهرینەکا ڕادیکالی نەئێخستینە شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی، کەواتە ئەو تشتێ کو پێدڤیە پتر ژ بابەتێ کاریگەرییا چێژا فارسی لسەر شعرا عەرەبی گرنگی پێ بهێتەدان، بابەتێ ڤەگۆهاستنا ئەدگارێن قەسیدەیا عەرەبی بۆ ناڤ ئەدەبێ فارسی و سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا فارسی لژێر کاریگەرییا شعرا سەردەمێ عەباسییە چونکە نکۆلی ل ڤێ چەندێ ناهێتە کرن کو شعرا کلاسیکییا فارسی ب تایبەت قەسیدەیا فارسی ل سەردەمێ عەباسیان و ل ژێر کاریگەرییا شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی سەرهلدایە.

(محمد رِضا شفیعی کدکنی) سەبارەت ب کاریگەری و لاساییکرنا شعرا عەرەبی دبێژیت: ( رەنگە ئەم بشێین هەبوونا گەلەك ژ وێنە و خەیالێن هەڤپشک د ناڤبەرا شاعرێن فارس و عەرەب بۆ کاریگەرییا ژینگەهێ بزڤرینین، واتە بێژین ئەڤ وێنەیە زێدەتر نێزیکی ژینگەهێ ئیرانییە تاکو ژینگەهێ عەرەبی و یا بەرئاقلتر ئەوە کو عەرەبان ئەڤ وێنەیە ژ فارسان وەرگرتبیت، لێ ئاریشە یا د ڤێ چەندێدا کو گەلەك ژ وێنەیێن بکارهاتی د شعرێن فارسییێن سەر ب سەبکێ خوراسانی ژ ژینگەهێ عەرەبی هاتینە وەرگرتن و پەیوەستن ب ژیانا بیابانێ و خیڤەتنشینیا عەرەبان)[٢٧].ئەڤ نڤیسەرە ل جهەکێ دی ژی دبێژیت: ( ئەگەر مینا وان ڕەخنەگران

ڕەخنەگران كو هەتا نهو ژی بۆ وەرگرتن و دزیا ئەدەبی وەكهەڤیا ووشەیی دكەنە پیڤەر، بەرێ خۆبدەینە شعرێ؛ دشێین نیڤەك یان پتر ژ نیڤەكا وێنەیێن شاعرێن ئیرانییێن سەر ب سەبكێ خوراسانی ب وەرگرتن ژ شعرا عەرەبی ل قەلەم بدەین چونكه وەكهەڤی د وی ئاستی دایه كو نكۆلی لێ ناهێته كرن...)[٢٨] ئەڤ ئاخفتنه ب خۆ بەلگەنه بۆ ڤێ ڕاستیێ كو شعرا فارسی د قوناغێن خۆ یێن سەرەتاییدا لاساییا شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی كریه و دانپێنەدان ب ڤێ ڕاستیێ كارەكێ بێ سوودە، لێ لگەل هندێ ژی گشتاندن و زێدەرۆیی ژی د ڤێ مەسەلێدا دهێته دیتن، واته ئاراستەیەكا بەروڤاژی ژی هەیه كو دخوازیت هەمی ئەدگارێن شعرا فارسی تەنانەت هندەك ئەدگارێن وێیێن ڕەسەن ژی ب بابەتێ لاساییكرنا قەسیدەیا عەرەبیڤه گرێبدەت.

## ٢.١.٢.٢. شعووبیەت ل دژی بالادەستبوونا شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی:

دیاره كو ئیرانیان هەر ژ سەردەمێ ئەمەویان سەركێشیا بزاڤەكا نەتەوەیی ل دژی داگیركرنا عەرەبی كریه. ئەڤ بزاڤه ب ناڤێ شعووبیەتێ دهێته نیاسین. بزاڤەكه كو شاعر و ڕۆشنبیر و و نڤیسەرێن ئیرانی پێرابووینه و ل سەدەیێن دوویێ و سێیێ كۆچی گەهشتیه كوپیتكا خۆ و هەر ل سەدێ سێیێ كۆچی ب توندی دژایەتیا وێ هاتیەكرن[٢٩].

ڤێ بزاڤێ كاریگەریەكا مەزن لسەر شعرا عەرەبییا سەردەمێ عەباسی هەبوویه و گەلەك شاعرێن ڤی سەردەمی كو دبنەرەتدا فارسن ب شعووبییەتێ دهێنه تاوانباركرن، ئەو گۆهرینێن كو وان د شعرێدا كرین ب پلان و دژایەتیكرنا چێژا شعرییا عەرەبی دهێنه ل قەلەمدان[٣٠]، هەر ئەڤ هەسته ژی پالدەرەكێ بهێز بوویه كو عەرەب پتر گرنگیێ بدەنه پاراستنا كەلەپورێ خۆیێ كەڤن و لاساییا شعرا جاهلی بكەن.هند كو باسێ كاریگەرییا ڤێ بزاڤێ لسەر ئەدەب و ڕۆشنبیریا عەرەبییا سەردەمێ عەباسی دهێتەكرن، هند باسێ ڕەنگڤەدان و كاریگەرییا وێ لسەر ئەدەبێ فارسی ناهێتەكرن. ب دیتنا مه زۆربەی بەرهەم و ئەدگارێن گرێدای

ب بزاڤا ئەدەبییا شعووبی کو دژی شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی بووینە، لسەر دەستێ وێ ئاراستەیا کو لاسایکەر و پشتەڤانا ڕۆشنبیری و شعرا عەرەبی بووینە هاتینەگۆهرین و ژناڤبرن.

ل دەستپێکێ گەلەك هەول ل دژی زالبوونا ئەدگارێن شعرا عەرەبی لسەر ئەدەبێ فارسی هەبووینە و شعرێن وەها هاتینە ڤەهاندن کو ناکەڤنە ژێر سیبەرا شعریەتا عەرەبی، بۆ نموونە (خواجە نصیرالدین طوسی) (مرن:٦٧٢ ك) د پەرتووکا (معیار و الاشعار) دا دبێژیت: کەسەك ب ناڤێ ((حەشوبی پەرتووکەك ب زمانێ فارسی بەرهەڤ کریە، کو شعرێن بێ سەروا ب خۆڤە دگریت و ناڤێ وێ کریە (یوبەنامە))[٣١]. هەبوونا شعرێن بێ سەروا ب خۆ نیشانەیەکە بۆ هەبوونا شعرێن جیاواز ژ شعریەتا عەرەبی، لێ نەمانا ڤان شعران و ژناڤچوونا ڤێ کتێبێ ب خۆ نیشانا ڤێ چەندێیە کو لگەل دەربازبوونا دەمی چێژ و شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی بسەر شعر و ڕەخنەیا فارسیدا زالبوویە.

(فردەوسی) ب ئێک ژ ناڤدارترین شاعرێن شعووبی دهێتە نیاسین.هەر چەندە کو لسەردەمێ وی شعووبیەت بەرەڤ لاوازییێڤە چووبوو، لێ وی هەستێ نەتەوەیێ ئیرانی ساخکرەڤە و گرنگیدا کەلەپور دەستکەفتێن ئیرانا بەری ئیسلامەتیێ[٣٢]. شاهنامەیا فردەوسی ژ گەلەك لایانڤە بریتیە ژ لادان ژ شعریەتا عەرەبی و پشتبەستن لسەر ئەدگارێن ڕەسەنێن ئەدەبێ فارسی. ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو گەلەك شاعر و نڤیسەرێن پەیوەست ب لاساییکرنا شعرا عەرەبی پشتا خۆ بدەنە شێوازێ وی یان ڕەخنەیێ ژ وی بگرن، هەر وەکو هەلویستێ (امیر معزی) کو ئێک ژ شاعرێن ناڤدارێن سەردەمێ سەلجوقیانە و شعرێن وی دگەهنە کوپیتکا لاساییکرنێ، ئەو ب توندی هێرشێ دبەتە سەر شاهنامەیا فردەوسی و ڕەخنەیێ ژ ئەفسانە و چیڤانوکێن شاهنامەیێ دگریت و فردەوسی مینا کەسەکێ درەوین ددەتە نیاسین.[٣٣]

ئەم دکارین بێژین کو ئەو بزاڤا شعووبیا خورت کو لدەڤ فردەوسی هەبوو ل سەردەمێن پشتی هنگی بەرەڤ لاوازییێڤە چوویە و دئەنجام دا زمان و شعریەتا

عەرەبی بەشەکێ مەزن ژ ئەدەب و ڕۆشنبیریا فارسی داگیرکریە، هەتا وی ڕادەی کو (ل سەدێ شەشێ کۆچی ئەڤ هزرە د ناڤ ئەدیب و نڤیسەرێن فارسدا بەلاڤبوویە کو عەرەبی ژ هەمی لایانڤە بسەر فارسییێدا زالە، تەنانەت هندەك نڤیسەران داخوازا لێبوورینێ کریە کو بەرهەمێ وان ب زمانێ فارسی هاتیە نڤیسین.ئەو د ڤێ باوەرییێدا بوون کو هەر کەسێ عەرەبیێ بزانیت دێ فارسییێ ژی زانیت، لێ بەروڤاژی ڤێ چەندێ ئەستەمە. وەسا دیارە کو ئەڤ هزرا هەلە هەتا ڤێ داوییێ ژی د ناڤ زانایێن ئیرانیدا بەلاڤ بوویە).[٣٤]

ڕەنگە بەرهەمێ (شمس قیس ڕازی) مەزنترین و گرنگترین بەرهەمێ ڕەخنەیێ فارسی بیت کو دکەڤیتە د ناڤبەرا هەر دوو سەبکێن خوراسانی و عەراقیدا، ئەو ژبلی هندێ کو وەرگێرانا پەرتووکا خۆ بۆ سەر زمانێ فارسی ب نەچاری دزانیت، ل گەلەك جهان ژی زمانێ فارسی ب زمانەکێ ناتەواو ل هەمبەر زمانێ عەرەبی ددەتە نیاسین. ل جهەکی دبێژیت ئەگەر لاوازیا بیاڤێ ڕەوانبێژیێ و بەرتەنگیا زمانپاراویا زمانێ فارسی نەبا، بەهرەدارێن فارسان بەرێ خۆ نەددانە عەرەبیێ و د بوارێ شعر و پەخشانێدا مفا ژ پەیڤێن عەرەبی وەرنەدگرتن)[٣٥]. ل جهەکێ دی ژی دبێژیت ( سیناعەتا شعرێ ئافراندنا تەبعێ عەرەبانە، داهێنانا هزرا وانە و فارس (عجم) د هەمی لایەنێن شعرێدا پێرەوێن عەرەبانن و وان ب خۆ چ ئاڤا نەکریە و بۆ ناڤکرنا بەش و بنەما و دەریا و کێش و دەربڕینێن کو چێدبن و ییێن چێنابن بەرێ خۆ داینە عەرەبان...)[٣٦].تەنانەت ئەو لسەر بناغەیێ چیڤانوکەکا بێ بناغە باسێ هندێ دکەت کو چەوا شاهێ ئیرانێ واتە (یەزدگرد)ی ب پشتبەستن ب پێشبینیا ئەستێرەناسان، کوڕێ خۆ ( بەهرامێ گور) فرێکریە ناڤ عەرەبێن (حیرە)یێ و ئەڤ چەندە بوویە ئەگەر کو ئەو ژبلی پەروەردەبوون وەکو کەسەکێ مێرخاس و وێرەك ببیتە ئێکەمین شاعرێ فارس.[٣٧]ئەڤە بەلگەنە بۆ سەلماندنا ڤێ چەندێ کو ژمارەکا بەرچاڤ ژ ڕۆشنبیرێن فارسان ب تایبەت یێن کو خودان ڕۆشنبیرییەکا ئیسلامی- عەرەبی بووینە، هەلگرێن بارێ بەشەکێ مەزن ژ لاساییکرنێنە، وان نموونەیا شعرا عەرەبی لسەر شعرا فارسی سەپاندیە و هەولدایە

هندی دشیاندا بیت جیاوازیێن شعرا فارسی لگەل شعرا عەرەبی کێم بکەن و هندەك نموونەییێن گەلەك جیاواز ژی ژناڤببەن.

ڕاستە کو ئاراستەیەکا بهێز دژی لاساییکرنا شعریەت و ڕۆشنبیریا عەرەبان د ناڤ ڕۆشنبیریێن ئیرانیدا هەبوویە و (پەسەندکرنا زمان و ئەدەبیاتا عەرەبی و ملکەچبوون بۆ ڕۆشنبیریا عەرەبی لدەڤ ئیرانیان گەلەك سادە نەبوویە، ئیرانیان ب ئاوایێن جۆراوجۆر کاریگەرییا زمان و ئەدەبیاتا عەرەبی لسەر زمان و ئەدەبیاتا خۆ ڕەتکریە و پەیوەندییا خۆ ب ئێکجاری لگەل کلتوریٚ خۆ یێ کەڤن نەقەتاندینە و ب ئاوایێن جۆراوجۆر هەولداینە زمان وکلتوریٚ خۆ بپارێزن و ئەڤ چەندە ل جەم پێشەنگێن شعرا فارسی یا سەبکیٚ خوراسانی گەلەك خویایە)[٣٨]، لیٚ دیارە کو ئەڤ ئاراستەیە ڕۆژ ب ڕۆژ بەرەڤ لاوازییێڤە چوویە و ئاراستەیا لاسایکەر و داخبار ب شعریەتا عەرەبی شیایە پتر کارتێکرنیٚ لسەر شعرا فارسی بکەت، بۆ نموونە ل دەستپێکا سەرهلدانا شعرا فارسی هندەك دێرێن عەرەبی دهێنە دیتن کو پتر دچنە چارچووڤیٚ تێهەلکێشیٚ، واتە ل سەدەییێن سێییٚ و چواریٚ کۆچی ب دەگمەن دێرێن عەرەبی دشعرا فارسیدا دهێنە دیتن، لیٚ لگەل سەرهلدانا سەبکیٚ عەراقی ل سەدیٚ شەشیٚ و حەفتیٚ کۆچی ئەڤ دیاردە ب ئاوایەکیٚ ژ ڕادەبدەر دهێتە دیتن، تەنانەت جۆرە هەڤرکییەك ژی خۆیادبیت؛ شاعر نە بتنیٚ دێر و دەربڕین و هونەرێن ڕەوانبێژییا عەرەبی بکاردهینن بەلکو جارنا هەولددەن ڕێزمانا عەرەبی لسەر دەقێن فارسی پراکتیزەبکەن.[٣٩]

ب کورتی د شعرا فارسییا کەڤندا دوو ئاراستە هەبووینە، ئاراستەیەکیٚ هەولدایە کو پتر مفای ژ ئەدگار و ڕەگەزێن ڕەسەن و خۆمالییێن ئەدەبیاتا فارسی وەرگریت و ئاراستەیەکیٚ ژی هەولدایە ب لاساییکرن و چەسپاندنا ئەدگارێن شعرا عەرەبی کو پتر ئەدگارێن قەسیدەییێنە رابیت، دیارە کو سەقاییٚ کۆچکان و گەرمبوونا بازاریٚ ستایشکرنیٚ و لاوازبوونا بەردەواما شعووبیەتیٚ و بالادەستبوونا عەرەبان د بەرژەوەندیا ئاراستەیا دوویێدا بوویە.

### ٢. ١. ٢. ٣. سەرهلدانا قەسیدەیا فارسی و ڕۆلێ شاعرێن سەردەمێ سامانیان:

سەبارەت ب سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا فارسی گەلەك بۆچوونێن جودا جودا هەنە کو بۆ گەلەك ژ وان چ بناغەیێن زانستی نینن، لێ تشتێ کو پتر د ژێدەران دا دهێتە باسکرن ئەڤەیە کو ل ڕۆژهەلاتا ئیرانێ یانکو ل دەڤەرا خوراسان کو ناڤەندا سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا فارسیە بۆ ماوەیەکێ درێژ پشتی بەلاڤبوونا ئیسلامەتیێ ڤەهاندنا شعرێ ب زمانێ عەرەبی باو بوویە، (ژمارەیا وان شاعرێن ئیرانی کو ل سەدەیێن ئێکێ و دوویێ و سێیێ کۆچی شعرێن خۆ ب زمانێ عەرەبی د ڤەهاندن و د ڤی زمانیدا شارەزا بوون گەلەك بوویە. (ثعالبي) د پەرتووکا (یتیمه الدهر)دا ئاماژەیێ ددەتە (١١٩) شاعرێن عەرەبیزمان کو ل خوراسان و (ماوراء النهر)ێ دژیان. هەر ئەڤ نڤیسەرە د (تتمه الیتیمه)یا خۆدا ئاماژەیێ ددەتە کۆمەکا دیا شاعران.[٤٠]کەواتە ل ڤی ماوەی چینا زانا و ڕۆشنبیران ب توندی کەفتینە ژێرکاریگەرییا زمان و ئەدەبێ عەرەبی، دەستەلاتدارێن دەڤەرێ ژی کو سەر ب دەولەتا ئەمەوی و عەباسی بووینە، پشتەڤانیا ڤێ سیاسەتێ کرینە. پێویستە ئەم وێ سانسۆرێ ژبیربکەین کو لژێر ناڤ و تاوانا شعووبیەتێ ل هەمبەر بەرهەمێن خۆمالی دهاتە پێرەوکرن.

زۆربەیا ژێدەرێن کو باسێ سەرهلدانا شعرا فارسی دکەن، ئاماژەیێ ددەنە ناڤێ (محمد بن وسیف سگزی) و ڤەهاندنا ئێکەمین قەسیدەیا فارسی کو د پەسنا (یەعقوب لیث سەفاری)دایە ددەنە بال ڤی شاعری. د ڤێ شعرێدا پەیڤێن عەرەبی هاتینە بکارهینان و کاریگەرییا شیواز و نەریتێن شعرا عەرەبی لسەر ڤێ شعرێ ئاشکرایە. پشتی ڤێ یەکێ هێدی هێدی شاعرێن فارس قالبێن نوی و کێشێن تازە داهێنانینە و ژ لایێ ناڤەرۆکێڤە ژی مفا ژ بابەتێن ڕەسەنێن ئیرانی وەرگرتینە[٤١]، ئەڤ گۆهرینە ژی پتر ل سەردەمێ دەستەلاتدارێ سامانیان خویابووینە.

سامانی ئیرانییێن ڕەسەن بوون و گەلەك حەژ کلتورێ ئیرانا کەڤن دکرن، لەوما (( دەستپێکا ئاشکرا و بهێزا سەرهلدانا شعرا فارسی بۆ سەردەمێ سامانیان ڤەدگەریت و (رودەکی) ژی ئێکەمین شاعرێ ڤی سەردەمیە کو

کۆمەکا بەرچاڤ ژ شعرێن وی گەهشتینە مە))[٤٢]. دەمێ حکومەتا سامانیان ل خوراسان و (ماوراء النهر) هاتیە دامەزراندن، دەولەتا عەباسی گەهشتبوو کوپیتکا هێز و دەستەلاتا خۆ. د شعرا عەرەبیدا ژمارەکا بەرچاڤ ژ شاعرێن نوی شیابوون بابەت و هونەرێن نوی بیننە ناڤ شعرا عەرەبی. هەر ل ڤی سەردەمی ( ابن معتز)ی ژی ئێکەمین پەرتووك دەربارەی بەدیعێ نڤیسیبوو، ئەڤە ژی بوو ئەگەر کو شاعرێن فارس گەلەك بکەڤنە ژێر کاریگەرییا ئەدەبیاتا سەردەمێ عەباسی و ب ڕێکا پێرەویکرن ژ شێوەیێ شاعرێن عەرەب شعرا فارسی ژ چارچووڤێ سادەیێ سەردەمێ سەفاریان دەربێخن[٤٣]، کەواتە قەسیدەیا فارسی ل سەردەمێ سامانیان لسەر بناغەیێ نموونەیا قەسیدەیا عەرەبی هاتیە ڤەهاندن، ئەدگارێن هونەری و سەقایێ شعرا عەرەبییا سەردەمێ عەباسی ژی ڕۆلەکێ مەزن د ڤێ یەکێدا هەبوویە.

سەرەرای ئیرانی بوونا سامانیان و حەژێکرنا وان بۆ کلتورێ ئیرانیێ کەڤن و دەگمەن بوونا پەیڤێن عەرەبی د بەرهەمێن واندا، لێ وەسا دیارە کو قەسیدەیا سەردەمێ سامانی ژ لایێ شێوازیڤە داخبارە ب قەسیدەیا عەرەبیڤە، یانکو (شعرا ستایشکرنا فارسی د قالبێ قەسیدەییێدا و لسەر بناغەیێ لاساییکرنا شعرا عەرەبی سەرهلدایە. ل سەردەمێ عەباسیان، ب پشتبەستن لسەر نەریتێن شعرا سەردەمێ جاهلی و ئەمەوی، قەسیدەیا ستایشیا عەرەبی گەهشتبوو کوپیتکا خۆ، شاعرێن عەرەب شیابوون قەسیدەیێن ستایشییێن بهێز ڤەهینن، قەسیدەیێن دویر و درێژ و پڕ ژ بابەتێن نوی ژ لایێ شاعرێن وەکو (بوحتوری) و (ابن ڕومی) و (ابن معتز) و شاعرێن دیڤە هاتبوونە ڤەهاندن. هەر ئەڤ شعرە بوونە باشترین نموونەیێن چاڤلێکرنێ بۆ شاعرێن تازەکارێن ئیرانی. هەر چەندە کو پشتی ماوەیەکی شاعرێن ئیرانی هەست ب ڤێ چەندێ کرن کو تەڤایا کێشێن عەروزی و یاساییێن ڕەوانبێژیێ لگەل ساخلەتێن زمانێ فارسی ناگونجن و ب گۆهرینا کێشێن شعرێ ڕابوون و قالبێن نوییێن وەکو مەسنەوی و چوارین و دووبەیتی بۆ شعرێ بکارهینان.[٤٤]

ب شێوەیەکێ گشتی سەرهلدانا قەسیدەیێ ل سەردەمێ سامانیان و گەشەکرنا وێ بناغەیەکە بۆ تەشەنەکرنا شعریەتا قەسیدەیێ د شعرا فارسیدا،

سەرەرای هەبوونا ئەدگارێن خۆمالی د شعرێن ڤێ قوناغێدا و سەرهلدانا کێش و قالبێن جیاواز، لێ شعرا ڤێ قوناغێ ب ئێکەمین وێستگەهێ گرنگێ لاساییکرنا ئەدگارێن قەسیدەیا عەرەبی و ڤەگوهاستنا وێ بۆ قۆناغێن دیێن شعرا فارسی و پاشان بۆ مللەتێن دیێن دەڤەرێ دهێتە هژمارتن.

## ٤.٢.١.٢. گەشەکرنا قەسیدەیێ ل سەردەمێ غەزنەویان:

سەرهلدانا ڕاستەقینەیا شعرا کلاسیکییا فارسی لسەر بناغەیێ قەسیدەیا عەرەبی بۆ سەردەمێ سامانیان ڤەدگەریت، لێ سەردەمێ دەستەلاتداریا تورکێن غەزنەوی و ب تایبەت (سولتان مەحموود غەزنەوی )، سەردەمێ گەشەکرن قەسیدەیا فارسیە. ( شکۆمەندی و مەزناهیا کۆچکا سولتان مەحمودێ غەزنەوی ب ناڤودەنگە. ئەو زێر و گەوهەر و سەرمایەیا کو وی ژ ئەنجامێ هێرشێن خۆ یێن بەردەوام بۆ سەر هندستانێ بدەستڤە ئینابوون، بوونە ئەگەر کو بەرێ ژمارەکا زۆر ژ شاعر و زانایێن وی سەردەمی بکەڤیتە کۆچکا وی. (سولتان مەحمود)ی کۆچکا خۆ لسەر بناغەیێ لاساییکرنا کۆچکا خەلیفەیێن عەباسی برێڤەدبر، لەوما نێزیکی چوارسەد شاعر ل کۆچکا وی کۆم بووبوون)[٤٥]، ڕەنگە هەر ئەڤ حەزا وی بۆ لاساییکرنا کۆچکا عەباسیان و هەبوونا دەستەلاتەکا وەکهەڤ بناغەیەك بیت بۆ گەشەکرنا قەسیدە و مەبەستا ستایشکرنێ د شعرا فارسیدا.

هندەك د ڤێ باوەریێدانە کو (ل سەردەمێ غەزنەویان شعرا فارسی لگەلەك بواران دا گەهشتیە کوپیتکا پێشکەفتنێ، شاعران پتر خۆ ژ کێماسیێن دەستپێکا سەرهلدانا شعرا فارسی ڕزگارکریە.شاکارێن مەزن ل ڤی سەردەمی هاتینە ئافراندن و شاعر نە بتنێ خۆ ژ لاساییکرن و پێرەویکرنا شعرا عەرەبی ڕزگارکریە بەلکو شیاینە شعرا فارسی بکەنە نموونەیەك بۆ شعرا عەرەبی و ب ڕێکا پشتبەستن ب ئەدەبیاتا فارسییا بەری ئیسلامێ وەرار و پێشکەفتنەکا مەزن و بەرچاڤ بێخنە د شعرا فارسییا دەری دا)[٤٦]. زێدەرۆییەك دڤێ چەندێدا هەیە، ڕاستە کو ل ڤی سەردەمی داهێنان و گۆهرینێن مەزن د شعرا فارسیدا دهێتە دیتن، شاکارێن مەزن

د بواریٚ ئەدەبیٚ داستانیدا سەرهلددەن و قالبێن نوی بۆ شعریٚ دهێنە دانان، لیٚ لگەل هندیٚ ژی ئاراستەیەکا بهێز هەیە کو لاساییا ئەدگار و تایبەتمەندییێن قەسیدەیا عەرەبی دکەت، لەوما (ئاماژەدان و مفاوەرگرتن ژ ئەدەبیٚ عەرەبی و ناڤەرۆکا شعرا عەرەبی و ناڤیٚ قەهرەمانێن عەرەبان و شاعرێن مەزن و پەرتووکێن عەرەبیێن بناڤودەنگ و قەبیلەییێن عەرەبان. هەروەسا بکارهینانا پەیڤێن زەحمەت و دەگمەنێن عەرەبی د شعرا فارسییا سەردەمیٚ غەزنەویدا دهێتە دیتن)[٤٧]. خواندنا ئەدەبیاتا ڤی سەردەمی ڤیٚ ڕاستییٚ بۆ مە ددەتە دیارکرن کو لگەل هەبوونا بەرهەمێن وەکو شاهنامەیا فردەوسی و هندەك بەرهەمێن دیێن داستانی کو نوینەراتیا چیٚژا ئیرانی دکەن، لیٚ شعرا باو و پەسەند د کۆچکا غەزنەویاندا شعرا ستایشکرنیٚ بوویە کو د چارچووڤیٚ قەسیدەییٚدا دهاتە پیٚشکیٚشکرن.

## ٥.٢.١.٢. بەردەوامبوونا دەستەلاتا قەسیدەییٚ ل سەردەمیٚ سەلجوقیان:

جۆرە گۆهرینەك د شعرا فارسییا سەردەمیٚ سەلجوقیدا ژی دهێتە دیتن، (بەرفرەهیا دەستەلاتا سەلجوقیان بوویە ئەگەریٚ دروستبوونا تیٚکەلیەکیٚ د ناڤبەرا خەلکیٚ خوراسان و عیٚراقا عەجەمدا، ئەڤە ژی بوویە هیٚڤیٚنیٚ سەرهلدانا سەبکەکیٚ نوی ب ناڤیٚ سەبکیٚ عەراقی، لیٚ دگەل هندیٚ ژی ب شیٚوەکیٚ گشتی ئەڤ شعرە هەر دریٚژەپیٚدانا شعرا شاعرێن بەری ڤیٚ قوناغیٚیە)[٤٨]، واتە پرانیا ئەدگارێن ویٚ هەر ئەدگارێن شعرا فارسییا سەردەمێن سامانی و غەزنەوییە.دیارە هەر ژبەر هەبوونا کۆمەك ژ تایبەتمەندییێن هەڤپشک وەکو زالبوونا قالبیٚ قەسیدەییٚ و مەبەستا ستایشکرنیٚ و وەکهەڤیا زمانیٚ شعریٚ، شعرا سەردەمیٚ سامانی و غەزنەوی و سەلجوقی کو بنگەهیٚ وان ڕۆژهەلاتا ئیرانیٚیە، ب سەبکیٚ خوراسانی هاتینە نیاسین.

داخباربوونا قەسیدەنڤیسێن سەبکیٚ خوراسانی ب گشتی و یێن سەردەمیٚ غەزنەوی ب تایبەتی، ب قەسیدەیا عەرەبی تشتەکیٚ ئاشکرایە. ( وان ب خۆ گەلەك جاران ئاماژەدایە ڤیٚ چەندیٚ کو شاعرێن عەرەب مامۆستاییێن وانن.بۆ نموونە (انوری) د دیٚرەکا شعریٚدا ئاماژەییٚ ددەتە ڤیٚ چەندیٚ کو شعر داهیٚنانا عەرەبانە و

(منوچهری) دەمێ دڤێت بالادەستبوونا خۆ ل هەمبەر شاعرەکێ دی بدەتە دیارکرن دبێژیت کو من گەلەك دیوانێن شاعرێن عەرەبان ژبەرکرینە و ئەڤ شارەزاییە ل دەڤ تە نینە، واتە ژبەرکرنا شعرێن عەرەبان وەك خالەکا بهێزبوونا شاعران هاتیەزانین. تەنانەت شاعرێن سەبکێ خوراسانی لسەر بناغەیێ پێشوازیکرن ژ شعرێن عەرەبی شعرێن خۆ ڤەهاندینە واتە هەمان کێش و سەروایا شاعرێن عەرەبی بکارئینانینە و جارنا وان ب خۆ ئاماژە دایە وێ شعرا کو لاساییا وێ کرینە و گوتینە کو مە ئەڤ شعرە لدویڤ شوپا فلان شعر یان شاعرێ عەرەب ڤەهاندیە و کێشا فلان شعرێ بکارئینایە. ئەڤە و چەندین نموونەیێن دیتر دبنە بەلگە بۆ سەلماندنا ڤێ کاریگەریێ وەکو بەرفرەهیا بکارهینانا ڕستە و دەربڕینێن عەرەبی یان بکارهینانا زاراڤ و تێلنیشانێن گرێدای ب کلتور و ڕۆشنبیریا عەرەبی.تەنانەت ل دەستپێکێ هندەك شاعرێن فارس لاساییا پێشەکیا (طللی) یا شعرا عەرەبی کرینە و هەولداینە هەمان شێوازی د شعرا فارسیدا ژی بکاربینن.ژبلی ڤێ چەندێ دیاردەیێن وەکو وەرگێرانا شعرێن عەرەبی یان کۆپیکرنا وان یان دزی ژ شعرا عەرەبی د دەستپێکا شعرا فارسیدا دهێتە دیتن.(٤٩)

## ٦.٢.١.٢. نموونەییکرنا قەسیدەیا خوراسانی:

ل سەردەمێ سەلجوقیان شعر ب دیالێکتێن دیێن بەریەلاڤ ل ئیرانێ هاتیە ڤەهاندن. (سیروس شمیسا) گەلەك بەلگەیان بۆ سەلماندنا ڤێ ڕاستیێ دهینیت، لێ تشتێ بالکێش ئەڤەیە کو پرانیا نموونەیێن وی ئاماژەنە بۆ هندێ کو یان شاعرێن سەبکێ خوراسانی باسێ فارسی نەزانینا وان شاعران و ئاشنا نەبوونا وان لگەل سەبکێ خوراسانی کرینە و یان هەولداینە ب ڕێکا دەستکاریکرنێ وان بێخنە سەر زمانێ شعرێن سەبکێ خوراسانی. ئەو (باباتاهر)ی دکەتە نموونە و دبێژیت کو سەرەرای هندێ کو شعرێن وی سەر ب دیالێکتا لورینە، لێ هاتینە دەستکاریکرن و نێزیکبووینە ژ لەهجا خوراسانی. دیارە کو ئەو شعرێن ب لەهجا خوراسانی یانکو لەهجا دەری نەهاتینە ڤەهاندن ب فەهلەویات هاتینە ناڤکرن)(٥٠)، کەواتە کەڤن

بوونا سەبکێ خوراسانی و پێشەنگبوونا وێ نیشانا ڤێ چەندێ نینە کو ل دەڤەرێن دیێن ئیرانێ شعر ب دیالێکتێن دی نەهاتینە نڤیسین، بەلکو لگەل هاتنا سەلجوقیان و کۆچکرنا هندەك شاعر و نڤیسەران ژ خوراسانێ بۆ دەڤەرێن دی ئەڤ ڕاستییە خۆیا دبیت کو ل وان دەڤەران ژی شعر ب دیالێکتێن دی هاتینە نڤیسین و ئەڤ نڤیسەرە ب ئاوایەکێ ڕاستەوخۆ یان نەراستەوخۆ شعرا وان ب شعرەکا پلە دوو ل قەلەم ددەن و داخوازا لاساییکرنا شعرا دەڤەرا خوراسانێ ژ وان دکەن، ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرێ بهێزکەفتنا لاساییکرنا ناڤخۆیی د ئەدەبیاتا فارسیدا. چەوا شاعرێن عەرەب هەولا پاراستنا ئەدگارێن قەسیدەیاجاهلی ددەن و وێ دکەنە نموونە، ئەڤ نڤیسەرە ژی شعرا دەڤەرا خوراسانێ دکەنە نموونەیەك بۆ لاساییکرنێ. پەیوەستبوونا سەبکێ خوراسانی بۆ ماوەیەکێ دویر و درێژ ب مەزنترین دەستەلاتدارییێن وی سەردەمی هێزەکا وەسا دا بوو ڤان نڤیسەران کو بشێن ب ڤی کاری ئەنجامبدەن.

بزاڤا نموونەیکرن و سەپاندنا سەبکێ خوراسانی لسەر دەڤەرێن دیێن ئیرانێ، پشتی هێرشا مەغولان دگەهیتە کوپیتکا خۆ. پێدڤیە باسێ وان نڤیسەران بهێتە کرن کو لگەل ژناڤچوونا دەولەتا خوارەزمشاهی لسەردەستێ مەغولان ئاوارەی دەڤەرێن دی بوون. ئێک ژ ناڤدارترین نڤیسەرێن ب ڤی رەنگی (شمس قیس ڕازی)یە.رەنگە ئەو ئێک ژ بەرپرسێن سەرەکییێن نەهێلانا ئەدگارێن ڕەسەن و ناوچەییێن شعرێ ل دەڤەرێن دیێن ئیرانێ و سەپاندنا ساخلەتێن قەسیدەیا خوراسانی کو پارێزەرا ئەدگارێن قەسیدەیا عەرەبیە بیت. هەلویستێن وی ب ئاشکرایی ڤێ چەندێ پیشان ددەن، بۆ نموونە دەمێ (ئەو باسێ وان فەهلەویاتان دکەت کو ل ڕۆژهەلاتا ئیرانێ باو بووینە، بەری هەر تشتەکی باسێ وێ هەست و سۆزا ژ ڕادەبدەر دکەت کو د ڤان شعراندا دهێتە دیتن. ئەو دبێژیت کو ئەڤان شعران گەلەك گەنج سەردابرینە و گەلەك کچ خستینە داڤێن حەژێکرنێ، پاشی ڕەخنەیێ ژ کێشا وان شعران دگریت و ب دیتنا وی ژ لایێ عەروزێ ڤە خەلەتن)[٥١]، واتە ئەو ب چاڤەکێ کێم بەرێ خۆ ددەت ڤان شعران، چونکە ژ لایەکیڤە ئەو

عەقلانییەتا کو ڕەخنەیا عەرەبی بۆ قەسیدەیێ داناى تێدا ناهێتە دیتن و ژ لایەکێ دیڤە سەر ب کێشا عەروزیڤە نینن.

بۆ ماوەیەکێ درێژ شعرا سەبکێ خوراسانی ب شعرەکا نموونەیی هاتیە تەماشاکرن و لادان و دوورکەفتن ژ شێوازێ ڤی سەبکی ب گەندەلی و دوورکەفتن ژ ڕەسەنایەتیێ هاتیە زانین، تەنانەت ل سەردەمێ نوی ژی کەسەکێ وەکو (محمد تقی سپهری) د پەرتووکا (براهین العجم في قوانین المعجم) د ڤێ باوەرییێدایە کو بەری هێرشا مەغولان هەمی شاعرێن ئیرانی خودان تەبع بووینە و هەمیان یاسا و بنەماییێن کێش و عەروزێ زانیە، لەوما پێدڤی نەبوویە کو چ پەرتووکەك دەربارەی ڤێ چەندێ بهێتە نڤیسین، لێ دەمێ مەغولان هێرشکریە سەر ئیرانێ، هەمی زانا و نڤیسەرێن ناڤدار کوشتینە و کەسێن شارەزا نەهێلاینە، یاساییێن شعرێ و سەروایێ ژناڤچووینە و هاتینە ژبیرکرن.پشتی ماوەیەکی دەمێ جارەکا دی بارودۆخ ئارام بوویەڤە نڤیسەران هەولدایە وێ بەلاغەت و فەساحەتا بەرێ ساخکەنەڤە، لێ زمانێ وان بێسەروبەر بوویە و ئاگەهداری یاساییێن شعرێ نەبووینە، ژبەر هندێ ئەڤە پتر ژ پێنج سەد سالانە کو کەس نەشیایە ب دروستی شعرێ ب زمانێ فارسی بنڤیسیت و هەر کەسەکی تشتەك ژی ڤەهاندبیت، بریتیە ژ شعرەکا پەککەفتی و لاواز، یانکو ب دیتنا ڤی نڤیسەری پلە پایەیێ شاعرێن سەردەمێ نوی نزمترە ژ یێن بەرێ)[٥٢]. ب کورتی پشتی هێرشا مەغولان هەولەکا مەزن دهێتە دان بۆ لاساییکرنا شعرا سەبکێ خوراسانی و ب ڤی ئاوایی لاساییکرن و نەریتگەرایا ئەدەبییا ناڤخۆیی د ئەدەبێ فارسیدا بهێزدکەڤیت.

## ٧.٢.١.٢. بهێزکەفتنا غەزەلا سەربەخۆ و لاوازبوونا قەسیدەیێ:

هەرچەندە کو هاتنا سەلجوقیان و شێوازێ دەستەلاتداریا وان و ڤەگۆهاستنا پایتەختی ژ خوراسان بۆ ئەسفەهان و تێکەلیا ڕۆشنبیریا ڕۆژئاڤا و ڕۆژهەلاتا ئیرانێ ب فاکتەرێن ڕێخۆشکەر بۆ گۆهرینا سەبکێ خوراسانی بۆ سەبکێ عەراقی دهێنە هژمارتن، لێ وەسا دیارە کو (هێرشا مەغولان و وەرچەرخانا تەواوا بارودۆخێ جڤاکی بوویە ئەگەر کو ب ئێکجاری سەبکێ خوراسانی ژناڤ بچیت و سەبکێ عەراقی جهێ وێ بگریت)[٥٣]. سەبکێ عەراقی ( ژ لایێ مێژووییڤە سەردەمێ مەغولان و ئیلخانیان و تیموریان ب خۆڤە دگریت، واتە ژ سەدێ حەفتێ هەتا سەدێ نەهێ کۆچی بەردەوام بوویە.ئەڤ ناڤلێنانە ژی پتر ژ بەر هندێ بوویە کو پشتی مەغولان ناڤەندێن ڕۆشنبیری ژ خوراسان بۆ عراقێ هاتینە ڤەگۆهاستن- هەرچەندە ئەڤ بزاڤە ژ سەردەمێ سەلجوقیان دەستپێکربوو، لێ هێشتا خوراسان نەهاتبوو خاپورکرن- وشاعر و نڤیسەرێن مەزنێن ڤی سەبکی ژی خەلکێ باژێرێن سەر ب عراقا عەجەمن)[٥٤].

دوو فاکتەرێن سەرەکی هەنە کو ڤێ شعرێ ژ شعرا سەبکێ خوراسانی جودا دکەن ئەو ژی بەلاڤبوونا عرفان و سۆفیگەریێ د شعرا ڤی سەبکی و زالبوونا قالبێ غەزەلێ و لاوازبوونا قەسیدەیێنە[٥٥]، لەوما ڤەکۆلەرێن ئیرانی گەلەك جاران هەولددەن ب ئاوایێن جۆراوجۆر سەربەخۆبوون و جودابوونا غەزەلێ ژ قەسیدەیێ بسەلمینن و وێ ب داهێنانەکا شاعرێن فارس بدەنە نیاسین، ئەو جەختەکا زێدە لسەر جیاوازبوونا تایبەتمەندیێن غەزەل و قەسیدەیێ دکەن. دانەنیاسینا غەزەلێ وەکو داهێنانەکا شعرا فارسییا سەبکێ عەراقی و پێناسەکرنا وێ وەکو قالبەکێ سەربەخۆ، بابەتەکە کو پێویستە ڤەکۆلین و دویڤچوونەکا زۆرە و پرانیا جاران دویڤچوونا ڤی بابەتی مە دگەهینیتە ڤی ئەنجامی کو غەزەل قالبەکێ سەربەخۆ نینە و ئەو گۆهرینا کو ڤەکۆلەرێن فارس باس ژێ دکەن پتر بریتیە ژ سەرەدەریکرنەکا جیاواز لگەل مەبەستێن قەسیدەیێ و ئاوێتەکرنا وان لگەل سۆفیگەریێ. بۆ پێشاندانا ڤێ چەندێ ژی پێویستە ئەم بەرێخۆبدەینە غەزەلێ د ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا.

## ٢.١.٢.٧.١. پەیوەستبوونا تەغەزولا شعرا فارسی ب پێشەکیا قەسیدەیا عەرەبیڤە:

قەسیدەیێن عەرەبی پرانیا جاران پێشەکیدارن، دیارەکو پێشەکیا قەسیدەیا عەرەبی ژ چەند بابەتان پێکهاتیە، هەر وەسا هەمی دەمان ژی ب ئاوایەکی نەبوویە، واتە ئەم دشێین باسێ چەندین جۆرێن پێشەکیان بکەین، زۆربەی جاران شاعرێن جاهلی شعرێن خۆ یان ب پێشەکیەکا (طللي) یان غەزەلی دەست پێدکەن، لێ جارنا ژی هندەك پێشەکیێن دی دهێنە دیتن، واتە ئەم دشێین باسێ پێشەکیێن (طللي)، غەزەلی، گەنجاتی و پیری، وەسفا مەیێ بکەین(٥٦)، لگەل هندێ ژی ((عەرەبان پتر هەولدایە کو قەسیدەیێن خۆ ب پێشەکیێن غەزەلی دەست پێبکەن))(٥٧). غەزەل ل دەستپێکێ ئێک ژ بابەتێن پێشەکیا قەسیدەیا عەرەبی بوویە، د قەسیدەیا فارسییا سەبکێ خوراسانیدا ژی پێشەکیەك ل دەستپێکا قەسیدەیێ هاتیە بکارهینان، ئەڤ پێشەکیە ب تەغەزول هاتیە نیاسین(*)، ل ((هندەك قوناغان زاراڤێ غەزەلێ ژی بۆ تەغەزولێن دەستپێکا قەسیدەیان هاتیە بکارهینان))(٥٨)، کەواتە دەمێ ئەم باسێ تەغەزولا قەسیدەیا فارسی دکەین پێویستە وێ لگەل پێشەکیا قەسیدەیا عەرەبی بەراورد بکەین، نە لگەل مەبەستا غەزەلێ کو ب تنێ مەبەستەکا قەسیدەیا عەرەبییە، ب دەربڕینەکا دی د شعرا عەرەبییا جاهلیدا غەزەل یان تەغەزول بابەت یانکو مەبەستەکا شعرێ بوویە کو ل پێشەکیا قەسیدەیان هاتیە بکارهینان، لێ فارس ب شێوەیەکێ گشتی زاراڤێ تەغەزولێ بۆ پێشەکیا قەسیدەیێ کاردهینن.

دیارە جیاوازیەك ژی د ناڤبەرا پێشەکیا شاعرێن عەرەبێن بیابانشین و یێن شارنشیندا هەبوویە و ئەو بابەتێن کو وان د پێشەکیاندا باسکرین ب تەمامەتی وەکو هەڤ نەبووینە، لێ ب شێوەیەکێ گشتی پێشەکیا قەسیدەیا فارسی (تغزل) ل ژێر کاریگەرییا ڤان پێشەکیان، بابەتێن وەکو عەشق و وەسفا سروشتی و وەسفا پیریێ و بیرهینانەڤەیا گەنجاتیێ و وەسفا شەرابێ ب خۆڤەدگریت.(٥٩)

وەکهەڤیەکا زۆر د ناڤبەرا پێشەکیا قەسیدەیا فارسی (تەغەزول) و پێشەکیا قەسیدەیا عەرەبیدا هەیە. ب شێوەیەکێ گشتی تەقلیدیبوونا پێشەکیا قەسیدەیا فارسی ئاشکرایە، لێ ئەڤ لاساییکرنە هەمی دەمان ب ڕەنگەکی نینە.جارنا نموونەیێن لاساییکرنا ڕاستەوخۆیا پێشەکیا (طللي)یا عەرەبی دهێتە دیتن و جارنا ژی لاساییکرن لاساییکرنەکا پۆزەتیف و داهێنەرانەیە، بۆ نموونە شاعرێن فارس د پێشەکییێن تایبەت ب وەسفا مەیێ و وەسفا سروشتی و وەسفا گیانەوەران و عەشق و خۆشەویستییێدا ژبلی چاڤلێکرنا قەسیدەیا عەرەبی، شیاینە هندەك گۆهرین و داهێنانان ژی بکەن، واتە لاساییکرنا وان لاساییکرنەکا پۆزەتیڤانەیە.ب شێوەیەکێ گشتی ئەو پێشەکیا غەزەلا فارسی کو ب (تغزل) دهێنە نیاسین بەرهەمێ لاساییکرنا پێشەکیا قەسیدەیا عەرەبیە.[٦٠]

ژبلی هندێ وەسفا دیاردەیێن سروشتییێن وەکو (بهار و پاییز و بالندە و ڕووەك و شەڤ و بەیانی) و هەر وەسا تشتێن گرێدای ب مەیڤەخارنێ وەکو (مێو و شەراب)ێ ژی دهێتە کرن. ب شێوەیەکێ گشتی پرانیا جاران بابەتێ سەرەکی هەر وەسفا مەعشوقانە، لێ مەعشوقەك کو هێدی هێدی ئەدگارێن خۆ یێن تایبەت وەردگریت و تا ڕادەیەك د قوناغێن دیێن شعرا فارسیدا ژی جێگیر دبیت[٦١] .

## ٢.١.٢.٧.٢. پەیوەستبوونا غەزەلا سەربەخۆ ب تەغەزول یان پێشەکیا قەسیدێڤە:

پەیوەستبوونا پێشەکیا قەسیدەیا فارسی (تغزل) ب پێشەکیا قەسیدەیا عەرەبی، مە بەرەڤ بابەتەکێ دی دبەت کو ئەو ژی جیاوازبوونا قالبێ غەزەلێ ژ قالبێ قەسیدەییێە. گەلەك ڤەکۆلەر د ڤێ باوەرییێدانە کو ( غەزەل وەکو قالبەکێ سەربەخۆیێ شعرێ داهێنانەکە ژ داهێنانێن شاعرێن فارس. دەستپێکا سەرهلدانا وێ وەکو قالبەکێ سەربەخۆ بۆ دەستپێکا سەدێ شەشێ کۆچی ڤەدگەریت. هەتا دیماهیکا سەدێ پێنجێ کۆچی ژی غەزەل وەکو قالبەکێ سەربەخۆ ناهێتە دیتن، چونکە سەردەم سەردەمێ باوبوونا ستایشکرنێ و زالبوونا

قەسیدەیێ بوویە. ئەو غەزەلێن کو د دیوانێن شاعرێن بەری سەدێ شەشێ دهێنە دیتن ژی ڕەنگە هەر ئەو نەسیب بن کو ل دەستپێکا قەسیدەیان دهاتنە بکارهینان)[٦٢]، کەواتە شاعرێن دەستپێکا سەدێ شەشێ ب پێشەنگێن غەزەلا فارسی دهێنە نیاسین ب تایبەت (سنائیێ غەزنەوی) کو ژمارەیا غەزەلێن وی ژ پێنج سەد غەزەلان دەربازدبن و گیانێ سۆفیگەریێ زالە بسەر پرانیا ڤان غەزەلان[٦٣]. ل نیڤا دوویێ ژ سەدێ شەشێ ژمارەیا غەزەلان زێدە دبیت و بەشەکێ بەرچاڤ ژ دیوانا شاعران ب خۆڤە دگریت [٦٤]

ئەگەر ئەم تەماشەی بیروبۆچوونێن ڤەکۆلەرێن کەڤنێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دەربارەی چەندایەتی و قالبێن شعرا عەرەبی بکەین، چ قالبان ب ناڤێ غەزەلێ نابینین.د ناڤ زانایاندا بۆچوونێن جیاواز سەبارەت ب دێرێن قەسیدەیێ هەنە، هندەك دبێژن کو دێرەکا ب تنێ (یتیم)ە و ئەو شعرا دگەهیتە سێ دێران (نتفە)یە و ئەوا ژ سێ دێران هەتا دەه دێران پێکدهێت دبیتە قتعە (قطعة)یە، پێدڤیە قەسیدە ژی ژ بیست دێران کێمتر نەبیت. هندەك ژی د ڤێ باوەرییێدانە کو قەسیدە ژ پازدەدێران دەرباز دبیت، هندەکێن دی ژی دبێژن کو قەسیدە ئەو شعرە کو پتر بیت ژ حەفت دێران. لگەل هەبوونا ڤان بۆچوونا زانایەکێ وەکو ئەخفەشی دەربازبوونا شعرێ ژ سێ دێران کریە پیڤەرەك بۆ قەسیدەیێ[٦٥]، یانکو (زاراڤێ قەسیدەیێ د زمانێ عەرەبیدا ب شێوەیەکێ گشتی بۆ شعرێ دهێتە بکارهینان، وان شعرا خۆ ب قەسیدە ناڤکریە...)[٦٦]. ئەڤە ب خۆ ژی نیشانا ڤێ چەندێیە کو قالبێ سەرەکیێ شعرا عەرەبی قەسیدەیە و گۆهرینا بابەت و ناڤەرۆکا قەسیدەیێ نابیتە ئەگەر کو قەسیدە ناسنامەیا خۆ ژدەست بدەت.

د شعرا عەرەبیدا غەزەل مەبەستەکا شعریە[٦٧] و (ب هەستێ سکسیێ مرۆڤیڤە هاتیەگرێدان. شاعر غەزەلێ بۆ دەربڕینا حەژێکرنا خۆ بەرامبەر ئافرەتەکێ بکاردهینیت، ژمێژە کو ئەڤ زاراڤە د بوارێ ئەدەبێدا دهێتە بکارهینان.لگەل زاراڤێ غەزەلێ گەلەك جاران زاراڤێن (نسیب) و (تشبیب) ژی وەکو هەڤواتایێن وێ هاتینە بکارهینان، هەرچەندە کو هندەك داکۆکیێ لسەر

جیاوازبوونا وان دکەن، لێ ئەگەر بەرێخۆبدەینە واتایا هەر سێ پەیڤان د فەرهەنگا (لسان العرب المحیط)دا، دێ بینین کو هەر سێ پەیڤ هەڤواتاییێن هەڤن و بۆ حەژێکرن و تێکەلاهی و گفتگۆکرن لگەل ئافرەتێ هاتینە بکارهینان. د بوارێ شعرێدا ژی بکارهینان و کاریگەرییا هەر سێ زاراڤان وەکو هەڤە یانکو هەر چەندە هندەك نڤیسەران جیاوازی خستییە د ناڤبەرا غەزەل و تەشبیب و نەسیبیێدا، لێ ب راستی ئەو سنوورێن وان دەستنیشانکرین گەلەك رۆهن و ئاشکرا نینن، ئەڤە ژی نیشانا هەڤواتا بوون و تەڤلیهەڤبوونا وانە.)[٦٨]

ل سەردەمێ ئەمەویان دوو گۆهرینێن مەزن د غەزەلێدا دروستبووینە کو هەژی گرنگیپێدانێنە، یا ئێکێ ب مەبەستکرنا غەزەلێیە واتە ڤەهاندنا شعرەکا غەزەلیا سەربەخۆ و یا دی سەرهلدانا دوو ئاراستەییێن جودا د غەزەلێدا؛ واتە غەزەلا سکسی و غەزەلا عوزری (غەزەلا پاك). ئەو کەسێ کو بۆ ئێکەمین جار ب ڤەهاندنا شعرێن غەزەلییێن سەربەخۆ رابووی، (عمر بن ابی ربیعە)یە، وی غەزەل ژ قەسیدەیا جاهلی جوداکریە و غەزەلێن سەربەخۆ نڤیسینە...)[٦٩]. دیارە بزاڤێن ب ڤی رەنگی بووینە ئەگەر کو نڤیسەرەکێ وەکو (طە حسین) جیاوازیێ بێخیتە د ناڤبەرا (غەزەلا شاعرێن جاهلی و ئیسلامیدا، ب دیتنا وی لدەڤ شاعرێن جاهلی غەزەل ب تنێ ئامرازەکە و شاعر وەکو ئامانج بەرێ خۆ نادەتێ، ئەڤە ل وی دەمی کو د شعرا ئیسلامیدا بویە ئامانجەك، واتە غەزەل هاتیە ڤەهاندن بێ کو شاعری کربیتە ئامرازەك بۆ مەبەستا ستایشکرن یان شانازیکرنێ[٧٠]، لسەر ڤی بناغەی دشێین بێژین د شعرا عەرەبیدا چ قالبێن سەربەخۆ بناڤێ غەزەلێ نینن.قەسیدە گەلەك مەبەستان ب خۆڤەدگریت کو ئێک ژ وان غەزەلە. ل سەردەمێ جاهلی غەزەل بەشەك بوویە ژ پێشەکیا قەسیدەیێ و پاشی ل سەردەمێ ئەمەویان قەسیدەیێن سەربەخۆ و تایبەت ب غەزەلێ هاتینە ڤەهاندن، لێ لگەل هندێ ژی سەربەخۆ بوونا ڤێ مەبەستێ نەبوویە ئەگەر کو ب قالبەکێ جودا ژ قەسیدەیێ بهێتە نیاسین.

پەیوەستبوونا بهێزا غەزەلا عەرەبی وەکو مەبەستەکا شعری ب قەسیدێڤە، واتە دەگمەن بوونا غەزەلێن سەربەخۆ و بەرفرەهیا بکارهینانا غەزەلێ د

شعرا فارسیدا، نەمازە پشتی سەرهلدانا سەبکێ عراقی بوویە ئەگەر کو ڤەکۆلەرێن ئیرانی ب ئاوایێن جۆراوجۆر هەولا سەلماندنا جیاوازیا تەغەزولا دەستپێکا قەسیدەیێ ژ غەزەلێن سەربەخۆییێن فارسی بدەن. مرۆڤ هەست ب هندێ دکەت کو ئەو گەلەك هەستیارانە سەرەدەرییێ لگەل ڤی بابەتی دکەن و دخوازن سەرهلدانا غەزەلا فارسی ب وەرچەرخانەکا مەزن د زمان و شێوازێ شعرا فارسی ل قەلەم بدەن. ئەو تشتێ ئەو باس دکەن نابنە بەلگە بۆ هەبوونا جیاوازیەکا مەزن و ریشەیی د ناڤبەرا تەغەزولا دەستپێکا قەسیدەیێ و غەزەلێ وەکو قالبەکێ شعریێ سەربەخۆ، بۆ نموونە (سیروسێ شەمیسا) وەکو ئێک ژ ناڤدارترین ڤەکۆلەرێن شعرا کلاسیکییا فارسی هەولدایە ب رێکا دەستنیشانکرنا هندەك جیاوازیان ڤێ چەندێ بسەلمینیت کو غەزەل جیاوازە ژ تەغەزولێ، گرنگترین بەلگەییێن وی ئەڤەنە:

١. ئەو جیاوازییێ دئێخیتە د ناڤبەرا مەعشوق د تەغەزول و غەزەلێدا، ب دیتنا وی چونکە مەعشوق د شعرا تەغەزولیا دەستپێکێ غولام و جاریە بوویە، لەوما بریتیە ژ مەعشوقەکا بێ نرخ و کێم بها، د غەزەلێدا مەعشوق خودان نرخ و بهایە و تەنانەت شاعر ئامادەیە جانێ خۆ بکەتە گوری وێ[٧١]، لێ ژ لایەکیڤە ئەڤە ئەدگارەکێ هونەرییێ جوداکەر نینە و ژ لایەکێ دیڤە چێدبیت هەر ئەڤ چەندە ئێک ژ جیاوازییێن غەزەلا سەردەمێ عەباسی و غەزەلا سەردەمێ جاهلی و ئەمەوی ژی بیت. ئەگەر بەلگەییێ نڤیسەری بۆ سەلماندنا ڤێ ڕاستییێ ئەڤە بیت کو مەعشوقێن شاعران د سەبکێ خوراسانی غولام و جاریە بووینە، وەسا دیارە کو هەمان بارەدۆخ لسەردەمێ عەباسیان ژی هەبوویە، خۆ کێمکرن بۆ مەعشوقێ و بەرزراگرتنا وێ و خۆ قوربانیکرن بۆ وێ ژی تشتەکێ نوی نینە، بەلکو ساخلەتەکێ کەڤنێ غەزەلا عەرەبییە.ئەگەر وە نەبیت ڕەخنەگرەکێ وەکو (قدامە بن جعفر)ی نابێژیت کو ( پێدڤیە د نەسیبێدا خۆ شکاندن و خۆکێمکرن و نازکی و سستی هەبیت یانکو پێدڤیە شاعر خۆ وەسا نیشان بدەت کو ل هەمبەر خۆشتڤیا خۆ گەلەك لاوازە و چ بڕیار د لەپێن ویدا نینن،

واتە چێنابیت شاعر باسێ مەزناهی و شکۆمەندیا خۆ بکەت یان خۆ ب کەسەکی خودان بڕیار و ئەکتیڤ نیشان بدەت. د رەخنەیا عەرەبیدا نموونەیێن وەسا هەنە کو رەخنە ژ شاعری هاتیە گرتن، چونکە د شعرێدا باسێ جوانیا خۆ کریە، ب کورتی پێدڤیە د تەشبیبێدا شاعر مری و ئخسیرێ ئافرەتێ بیت و باسێ مەزناتیا خۆ نەکەت خۆ ئەگەر ڕاست ژی بیت...)[٧٢]. ب دەربڕینەکا دی، ئەڤ ئەدگارێ کو نڤیسەر دەستنیشان دکەت دبیتە ئەگەر کو غەزەلا فارسی پتر نێزیکی غەزەلا عەرەبییا جاهلی ببیت، ئەڤە ئێکە ژ تایبەتمەندییێن مەبەستا غەزەلێیە و نابیتە بەلگەیەك بۆ جوداکرنا غەزەلێ وەکو قالبەکێ سەربەخۆ.

٢. ب دیتنا نڤیسەری ( د تەغەزولێدا ئێکەتیا بابەتی هەیە، لێ د غەزەلێدا هەر دێرەك سەربەخۆیە و چ پەیوەندی ب دێرێن دیڤە نینە، ئەڤ چەندە د غەزەلا سەبکێ هندیدا دگەهیتە کوپیتکا خۆ...)[٧٣]. سەیرە کو نەبوونا ئێکەتیا بابەتی کو ئێک ژ مەزنترین و بەرچاڤترین ئەدگارێن قەسیدەیا عەرەبیە، ببیتە بەلگە بۆ جوداکرنا غەزەلێ ژ پێشەکیا قەسیدەیێ، ئەگەر ئەڤ چەندە ڕاستبیت نیشانا ڤێ چەندێیە کو غەزەلا فارسی پتر نێزیکی غەزەلا عەرەبییە تاکو پێشەکیا قەسیدێن فارسییێن سەبکێ خوراسانی.

٣. (شەمیسا) دبێژیت: (د تەغەزولێدا مەعشوق زەمینی و مادیە لێ د غەزەلێدا پرانیا جاران مەعشوق ئاسمانی و مەعنەوی و پیرۆزە)[٧٤]. ژلایەکیڤە جارەکا دی ئەڤ چەندە نابیتە فاکتەرەکێ سەرەکی بۆ جوداکرنا دوو قالبێن شعری ژ هەڤدوو، ژ لایەکێ دیڤە گەلەك جاران ئەڤ جیاوازیە ڕێژەییە و پەیوەستە ب راڤەکرنا شعرێڤە، چونکە هەر ئەڤ نڤیسەرە ب خۆ ل جهەکێ دی دبێژیت: (پرانیا جاران مەعشوق د تەغەزولاندا نێرە و ئەڤ چەندە ب گۆهرینەکا کێم د تەڤایا غەزەلا فارسیدا ژی دهێتە دیتن)[٧٥]، واتە گەلەك جاران چ جیاوازیەکا وەسا د ناڤبەرا مەعشوق د غەزەل و تەغەزولێدا نینە. ئەڤ تایبەتمەندیا کو دهێتە دان بال غەزەلا فارسی وەکو قالبەکێ شعری، د شعرا عەرەبیدا ژی

هەیە.گۆهرینا ئاراستەیا ماتریالیا غەزەلێ بەرەڤ ئاراستەیا سۆفیگەریێ د غەزەلا عەرەبیدا ژی دهێتە دیتن، سەرکێشێ ڤی کاری ژی (ابن فارض)ێ مسریە[٧٦]، یانکو د شعرا سۆفیگەریا عەرەبیدا ژی مەشوق دبیتە هێمایەکێ سۆفیگەریێ.

٤. جوداهییەکا دی کو نڤیسەر ئاماژەیێ پێ ددەت ئەڤەیە کو ( د تەغەزولێدا پتر باسێ بهەڤگەهشتن و شادی و بەختەوەریێ دهێتە کرن لێ د غەزەلێدا باسێ ڤەقەتیان و دووربوون و خەمێ دهێتەکرن)[٧٧]، ئەڤە ژی نە تشتەکێ تازەیە، ئەڤ دوو ئاراستەیە د غەزەلا عەرەبیدا ژی هەبووینە و باشترین بەلگە ژی جیاوازیا غەزەلا عوزری و سکسییە ل سەردەمێ ئەمەویان.

٥. سەبارەت ب جیاوازیا واتایا غەزەل و قەسیدەیێ ژی دبێژیت (د غەزەلێدا ژبلی واتا ڕوالەتی واتایەکا ڤەشارتی ژی هەیە، لێ د تەغەزولێدا ب تنێ واتایا ڕوالەتی زالە)[٧٨]، ئەڤ چەندە ژی گرێدایە ب بابەتێ خواندن و شرۆڤەکرنا شعرێ و تارادەیەکێ زۆر دچیتە چارچووڤێ سەرهلدان و گەشەکرنا مەبەستا سۆفیگەریێ کو د قەسیدەیا عەرەبیدا ژی دهێتە دیتن.

نڤیسەر باسێ هندەك جیاوازیێن دی ژی دکەت کو ب دیتنا مە نە د وی ئاستیدانە کو مینا جیاوازیا د ناڤبەرا غەزەل و تەغەزولێدا بهێنە باسکرن. دیارە ڤەکۆلەر پرانیا جاران باسێ غەزەلێ وەکو مەبەستەکا شعری دکەت یانکو ئەو تشتێ ئەو دبێژیت پەیوەستە ب مەبەستا غەزەلێ و نابیتە پیڤەر بۆ جیاوازبوونا غەزەلا فارسی ژ تەغەزولا فارسی و قالبێ قەسیدەیێ.

نهۆ غەزەل د ئەدەبێ فارسیدا ئێکە ژ قالبێن شعرا کلاسیکییا فارسی، ژبەر هندێ کو هەر ژ دەستپێکێ هاتیە تەرخانکرن بۆ بابەتێ دلداریێ و باسکرنا جودابوون و بهەڤگەهشتنێ و جوانیا یارێ، یانکو پتر بابەتێن تەغەزولی ب خۆڤەگرتیە، ژبەرهندێ ب غەزەل هاتیە نیاسین، واتە بۆ ناڤکرنا ڤی قالبی مفا ژ پەیڤا عەرەبییا غەزەلێ هاتیە وەرگرتن[٧٩]. ناڤێ غەزەلێ ب خۆ بەلگەیەکە بۆ هندێ کو سەروکانیا غەزەلا فارسی هەر غەزەلا عەرەبیە، نەخاسمە کو پرانیا جاران

ناڤەرۆکا غەزەلێ ژی مینا تەغەزولا دەستپێکا قەسیدەیان لدور ئەڤینییێیە[٨٠]. ئەم دشێین بێژین کو غەزەلا فارسی بریتیە ژ جودابوونا تەغەزولا دەستپێکا قەسیدەیان و ڤەهاندنا وێ ب ئاوایەکێ سەربەخۆ، لگەل سەربەخۆبوونا غەزەلێ د سەبکێ عەراقیدا؛ بۆ جوداکرنا تەشبیب یانکو نەسیب و غەزەلا دەستپێکا قەسیدەیان ژ غەزەلا سەربەخۆ، زاراڤێن تەغەزول و غەزەلێ هاتینەبکارئینان، تەغەزول بۆ غەزەلا دەستپێکا قەسیدەیان و غەزەل ژی بۆ غەزەلا سەربەخۆ.[٨١] غەزەل تەڤلی بابەتێن بەرزێن عرفانی و ڕەوشتی بوویە و شاعران د غەزەلێن خۆدا هەمان پەیڤێن تەغەزولێ بۆ دەربڕینا واتایێن بەرز بکارئینانینە[٨٢]، کەواتە تەنها خالا سەرەکیا کو جیاوازیێ دئێخیتە د ناڤبەرا غەزەلا فارسی و پێشەکیا قەسیدەیا فارسی (تغزل)، بریتیە ژ کاریگەرییا سۆفیگەریێ و لاوازبوونا مەبەستا ستایشکرنێ، کو ب ڕاستی ئەڤە ژی نابنە بەلگە بۆ جوداکرنا غەزەلێ ژ قەسیدەیێ، چونکە ئەگەر ئەڤە ببنە پیڤەر پێدڤیە باسێ جودابوونا غەزەل و قەسیدەیێ دشعرا عەرەبیدا ژی بکەین. کەواتە چ جیاوازیەکا گرنگ و سەرەکی د گورێدا نینە، داکو ئەم بشێین لسەر بناغەیێ وێ باسێ سەربەخۆبوونا غەزەلێ و جودا بوونا وێ ژ قالبێ قەسیدەیێ بکەین، پرانیا ئەدگارێن قالبێ قەسیدەیێ د غەزەلا فارسیدا دهێنە دیتن:

١. غەزەلا فارسی و قەسیدە ژ لایێ کێش و سەروا و موسەرەع (مصرع) بوونا دێرا ئێکێ - هەڤسەروا بوونا هەر دو نیڤەدێرێن دەستپێکا شعرێ - وەکو هەڤن. ئەڤە ب خۆ بەلگەیەکە بۆ ڤێ ڕاستیێ کو غەزەل ژ تەغەزولێن دەستپێکا قەسیدەیێن عەرەبی پەیدا بوویە.[٨٣]

٢. تەخەلوس (تخلص) زاراڤەکێ تایبەت ب قەسیدەیێ و بریتیە ژ دێرەکا شعرێ کو شاعر ب ڕێکا وێ ژ مەبەستەکا شعری دچیتە مەبەستەکا دی، ب تایبەتی ل وی دەمی دهێتە بکارهینان کو شاعر ژ پێشەکیێ بەرەڤ مەبەستا قەسیدێڤە دچیت.[٨٤]بکارهینانا زاراڤێ (تخلص) بۆ دێرا داوییا غەزەلێ ژی نیشانا ڤێ چەندێیە کو قەسیدە دایکا غەزەلێیە. چونکە پەیڤا (تخلص) واتایا ب دویماهیکهاتنێ نادەت.[٨٥]سەیر ئەڤەیە کو ئەو (حسن التخلص)ا کو د

قەسیدێدا هەیە، د غەزەلێدا ژی دهێتە دیتن، ل ڤێرێ ژی شاعر ب رێکا دێرەکێ بابەتێ غەزەلێ دگۆهریت و ئێک دوو دێرێن داوییا غەزەلێ بۆ ستایشکرنێ تەرخان دکەت، ئەڤ چەندە د غەزەلێن سەعدیێ شیرازیدا هاتیە بکارهینان.(٨٦)

٣. بەیتا غەزەلێ (بیت غەزەل) یان (شاهـ بەیت) بریتیە ژ بەیتا بژارە یانکو ئەو بەیتە کو ژ بەیتێن دی بهێزتر بیت. (بیت القصیده) ژی پرانیا جاران بریتیە ژ بهێزترین بەیتا قەسیدەیێ...هەر وەسا (بیت المطلع) و (بیت المقطع) ژی د قەسیدە و غەزەلێدا دهێنە دیتن.(٨٧)

٤. هەر وەکو غەزەلێ ژمارەیا دێرێن پێشەکیا قەسیدەیا عەرەبی یانکو تەغەزولا دەستپێکا قەسیدەیێن عەرەبی و تەغەزولێن دەستپێکا قەسیدەیێن فارسی د ناڤبەرا پێنج هەتا پازدە دێران بوویە.(٨٨)

وەکهەڤی د ناڤبەرا غەزەل و قەسیدەیێ و ب تایبەت پێشەکیا قەسیدەیا فارسی بوویە ئەگەر کو گەلەك ڤەکۆلەرێن شعرا فارسی بۆ جوداکرنا غەزەل و قەسیدەیێ پەنایێ بۆ ژمارەیا دێرا ببەن. سەبارەت ب وێ ژمارەیا کو غەزەل و قەسیدەیێ ژهەڤ جودا دکەت ژی بیروبۆچوونێن جودا هەنە. هندەك دبێژن کو غەزەل شعرەکە کو ((دێرێن وێ د ناڤبەرا پێنج هەتا دوازدە دێران بیت، لێ گەلەك ڤێ ژمارێ دگەهیننە نوزدە دێران ژی))(٨٩) هندەکێن دی دبێژن کو (غەزەل شعرەکە کە ژمارا دێرێن وێ د ناڤبەرا حەفت هەتا پازدە دێرانە و چێدبیت پیچەك کێمتر یان زێدەتر بیت.)(٩٠) هندەکێن دی ژی دبێژن (غەزەل پرانیا جاران ژ چوار هەتا چواردە دێران پێک دهێت لێ قەسیدە ژ بیست هەتا هەفتێ دێران پێک دهێت و لگەل هندێ ژی دڤێ باوەرییێدانە کو ئەڤ پیڤەرە تارادەیەکی جهێ گومانێیە)(٩١)، جارنا ژی باسێ بێ سنووربوونا دێرێن غەزەلێ دهێتەکرن هەروەکو غەزەلێن سەبکێ هندی، ل ڤێرێ( چ سنوور بۆ ژمارا دێرێن غەزەلێ نینە و جارنا دگەهنە نێزیکی چل دێران ژی)(٩٢). ئەڤە ب تنێ نیشانا هندێیە کو چ جیاوازییێن ریشەیی د ناڤبەرا غەزەل و قەسیدەییێدا نینن.ئەگەر جیاوازی ژی د ناڤبەرا غەزەل و قەسیدەییێدا هەبیت لایەنێن وەکهەڤ د ناڤبەرا وان گەلەك پترن.

هندەك جاران ڤەكۆلەرێن شعرا فارسی ژی ڤێ پرسێ ژ خۆ دكەن كو ئایا غەزەل قالبەكێ شعریە یان زێدەتر ئاماژەدانەكە ب ناڤەرۆكا شعرێ.(منصور رستگار فرسایی) پشتی ورووژاندنا ڤێ پرسیارێ، دگەهیتە ڤی ئەنجامی كو بكارهینانا زاراڤێ غەزەلێ بۆ شعرێ پتر پەیوەستە ب ناڤەرۆكا شعرێڤە یانكو ئەو شعرێن كو تێدا شاعر گرنگیێ ددەتە عەشق و هەست و سۆزێن خۆ، واتە هەر شعرەك ب ڤێ چەندێڤە پەیوەست نەبیت نابیتە غەزەل، واتە چێدبیت قالبێن دیێن شعری ژی ب غەزەل بهێنە هژمارتن.[٩٣]

نهۆ ئەم دشێین بێژین كو غەزەل وەكو قالبەكێ شعرا فارسی ب دابڕان ژ قەسیدەیێ ناهێتە هژمارتن بەلكو بەروڤاژی ڤێ چەندێ بەردەوامیدانەكە ب لاساییكرنا قالبێ قەسیدەیێ ب تایبەتی پێشەكیا قەسیدەیێ. ئەڤ زاراڤە پتر بۆ جوداكرنا شعرا فارسییا بەری هێرشا مەغولان و پشتی هێرشا مەغولان دهێتە بكارهینان، واتە بۆ وی دەمی كو ناڤەندێن ئەدەبی ژ ڕۆژهەلاتا ئیرانێ بەرەڤ ڕۆژئاڤا و ناڤەندا ئیرانێ چووینە و ژ بەر نەمانا كۆچكێن مەزن مەبەستا ستایشكرنێ بەرەڤ لاوازییێڤە چوویە و شاعران پتر گرنگی ب سۆفیگەری و وان بابەتان دایە كو بەشەك بوینە ژ پێشەكیا قەسیدەیا عەرەبی و فارسی.

ئەم دشێین بێژین كو د شعرا فارسیدا چ جاران قەسیدە و شعریەتا قەسیدەیێ ژناڤ نەچوویە. باشترین بەلگە ژی شعرا قوناغا ڤەگەریانا ئەدەبی (بازگشت ادبی)ە. ئەڤە ( قوناغەكە ژ مێژوویا ئەدەبێ فارسی، ژ دوماهیا دەستەلاتا ئەفشاریان دەست پێ دكەت و هەتا دەستپێكا بزاڤا مەشرووتیەتێ بەردەوامە. واتە ژ نیڤا سەدێ دوازدەیێ كۆچی هەتا دەستپێكا سەدەیێ چواردەیێ كۆچی، بۆ ماوەیێ ١٥٠سالان بەردەوام بوویە. شاعران ل ڤێ قوناغێ گرنگیدایە پێرەویكرنا سەبكێ عەراقی و خوراسانی و پشتا خۆ داینە سەبكێ هندی)[٩٤]، لەوما ل سەردەمێ قاجاریان (سەرەرای هەبوونا هندەك غەزەلسنڤیسێن باش لێ پتر گرنگی ب قەسیدەیێ هاتیە دان تاكو غەزەلێ... )[٩٥]یانكو مینا سەبكێ خوراسانی جارەكا دی قەسیدە بوویە جهێ گرنگیپێدانێ.

## ٢. ١. ٣. رۆلێ فاکتەرێن نوی د گۆهرینا ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرییا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا :

### أ. رۆلێ قالبێن نوی:

هەرچەندە کو قەسیدە قالبێ سەرەکیێ شعرا عەرەبی و سەبکێ خوراسانیێ شعرا فارسیە و غەزەلا سەبکێ عەراقی ژی هەر درێژەپێدانا ڤی قالبیە، لێ د شعرا فارسییا سەبکێ خوراسانیدا، هندەك قالبێن دیێن شعری ژ لایێ شاعرێن ڤی سەبکیڤە هاتینە بکارهینان، کو پێدڤیە باسێ پەیوەندییا وان ب رێرەوێ لاساییکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی بهێتەکرن. ئەم دشێین ڤان قالبان لسەر دوو جۆران دابەش بکەین، یێن کو ژ قەسیدەیێ جودا بووینە، واتە (تەرکیببەند و تەرجیع بەند و موسەمەت و قیتعە و موستەزاد) و یێن کو ناسنامەیا خۆ یا سەربەخۆ هەنە وەکو مەسنەوی و ڕوباعی.

بەری هەر تشتەکی یا باش ئەوە باسێ وان قالبان بکەین کو ژ کۆپلە یان بەندان پێک دهێن ب تایبەتی (تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و موسەمەت ) و ل سەدێ شەشێ کۆچیڤە گرنگی ب ڤەهاندنا وان هاتیەدان. دیارە کو (فەروخی سیستانی) ژی ئێکەم کەس بوویە کو شعرەکا ب ڤی ڕەنگی ڤەهاندیە[٩٦]، کەواتە ئەڤ جۆرە شعرە بەری جودابوونا غەزەلێ ژ قەسیدەیێ هاتینە ڤەهاندن و قەسیدەنڤیسەکێ ناڤدارێ وەکو (فەروخیێ سیستانی) ب ڤی کاری ڕابوویە. ئەگەر ئەم بەرێخۆبدەینە تەرکیب بەند و تەرجیع بەندێن سەر ب سەبکێ خوراسانی دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو ژ لایێ هونەری و ئەدگارێن زمانیڤە گەلەك ژ قەسیدە و غەزەلێ جیاواز نینن و گەلەك جاران هەر بەندەکا تەرجیعبەند یان تەرکیب بەندەکێ مینا غەزەلەکا سەربەخۆ خۆیا دبیت یانکو (تەرجیع بەند و تەرکیب بەند بریتینە ژ لێکدانا هندەك غەزەلان کو لسەر کێشەکا دیارکری لێ ب سەروایێن جۆراوجۆر هاتینە ڤەهاندن، هەر دەمێ ئەڤ غەزەلە ب ڕێکا دێرەکا دیارکری بهەڤدووڤە بهێنە گرێدان، دێ بیتە تەرجیع بەند

و هەر دەمیٚ کو ئەڤ دێرا داوییا غەزەلان بهێتەگوهڕین دیٚ بیتە تەرکیب بەند)[97].

(قالبیٚ موسەمەت ژی کو ژ سەردەمیٚ (مەنوچهری) د شعرا فارسیدا هاتیە بکارهینان هەلگریٚ تەڤایا ئەدگارێن هونەری و ووشەییٚن قەسیدەیا کەڤنە و بابەتیٚ ویٚ ژی هەر بابەتیٚ قەسیدەییٚ واتە ستایشکرنە)[98]. ب ڤی رەنگی جیاوازیەکا ریشەیی د ناڤبەرا ڤان قالبان و قالبیٚ قەسیدەییٚدا نینە.

ژبلی ڤان قالبان دوو قالبێن دی هەنە کو ژ گەلەك ئالیانڤە ژ غەزەل و قەسیدەییٚ ناهیٚنە جوداکرن ئەو ژی موستەزاد و قیتعەنە. دیارەکو ( موستەزاد بۆ ئێکەمین جار ل سەردەمیٚ سەلجوقیان هاتیە بکارهینان).[99] ئەڤ قالبە ژ لاییٚ ریتمیٚڤە هەژی گرنگیپیٚدانیٚیە چونکە هەم ژ لاییٚ کیٚشیٚڤە و هەم ژ لاییٚ سەروایێڤە ب داهیٚنانەکا نوی دهیٚتە هژمارتن، لیٚ ژ لاییٚ ناڤەرۆك و زمان و ویٚنەیڤە چ جیاوازیەکا وەسا لگەل غەزەلیٚ نینە، چونکە ((موستەزاد ب خۆ واتە زیٚدەکرن، بریتیە ژ زیٚدەکرنا پارچەیەکا موسەجەع یانکو هەڤسەروا ل داوییا نیڤەدیٚرێن رۆباعی یان غەزەل یان قتعە یان قالبێن دییٚن شعریٚ...))[100]، ب واتایەکا دی موستەزادیٚ ب خۆ چ ئەدگارێن زمانی و ویٚنەییٚن جودا نینن و ب تنیٚ بریتیە ژ بهیٚزخستانا ریتما قالبێن دییٚن شعری ب تایبەت غەزەلیٚ.

((قتعە ژی هەر وەکو ژ ناڤیٚ ویٚ دیارە پارچەکە کو ژ قەسیدەییٚ جودابوویە یان بەشەکە ژ قەسیدەکا نیڤەرۆ، یان یەکەیەکا سەربەخۆیە... و تەنها جیاوازیا ویٚ لگەل غەزەل و قەسیدەییٚ ئەڤەیە کو دیٚرا ئێکیٚ ژ ڤیٚ شعریٚ موسەرەع نینە)).[101] ژ لاییٚ ژمارا دیٚران ژی پرانیا جاران دوو هەتا پازدە دیٚران ب خۆڤە دگریت[102]، واتە هەر نیٚزیکی ژمارەیا باوا دیٚرێن غەزەلیٚیە.

نهۆ پیٚدڤیە باسیٚ وان قالبێن شعریٚ بکەین کو بەرهەمیٚ وەرارا قەسیدە و غەزەلیٚ نینن. مەبەستا مە ژی قالبێن (مەسنەوی) و (رۆباعی)نە، ڤان قالبان رەهـ و ریشالێن رەسەن د ئەدەبیاتا ئیرانیدا هەیە و خودان ئەدگارێن خۆ یێن تایبەتن. (محمد رضا شفیعی کدکنی) سەبارەت ب ئەدگارێن رۆباعی و مەسنەوییٚ دبێژیت (ئەگەر هەلسەنگاندنەکیٚ بۆ هەر دوو تەوەرێن ئاسۆیی و ستوونییٚ خەیالا شعری د

شعرا فارسیدا بکەین؛ پێدڤیە چوارین ژ جۆرێن دیێن شعرا فارسی بهێتە جودا کرن، چونکە ئێکگرتنەك د ناڤبەرا هەر دوو تەوەرێن ئاسۆیی و ستوونییێن خەیالا شعریدا هەیە و شعر مینا ئەزموونەکا ئێکگرتی خۆیا دبیت. ئەو پێکڤەگرێدانا کو د تەوەرێ ئاسۆیدا هەیە، د تەوەرێ ستوونیدا ژی دهێتە دیتن یانکو هەر چوار نیڤە دێر پێکڤەگرێداینە.باشترین نموونە ژی چوارینێن (خەیام)ینە. پشتی ڕوباعیێ پێدڤیە ئاماژەیێ بدەینە مەسنەویێ کو ژبەر نەبوونا سەروایا ئێکگرتی تەوەرێن ئاسۆیی و ستوونیا خەیالا شعری بهێزتر و ئێکگرتی ترن)[١٠٣]. ب ڤی ڕەنگی ئەو ڤان قالبان ژ قالبێن دیێن شعرێ جودا دکەت.

مەسنەوی (قالبەکێ ئیرانییە و د شعرا عەرەبیدا باو نینە. د شعرا عەرەبیدا چ شاکارێن مەزن ب ڤی قالبی نەهاتینە پێشکێشکرن)[١٠٤]، لەوما بکارهینانا ڤی قالبی ب خۆ دبیتە ئەگەر کو شاعر تا ڕادەیەکێ زۆر ژ ئەدگارێن لاساییکرییێن قەسیدەیا عەرەبی و فارسی دویربکەڤیت، لێ تشتێ بالکێش سەبارەت ب ڤی قالبی ئەڤەیە کو (دشعرا فارسیدا ئەڤ قالبە پتر بۆ نڤیسینا مێژوو، چیرۆك و ئەفسانەیێن دویر و درێژ هاتیە بکارهینان)[١٠٥]، واتە ب دەگمەن بوویە قالبەك بۆ شعرا لیریکی. ئەڤە ژی نیشانا ڤێ چەندێیە کو ئەڤ قالبە تارادەیەکێ زۆر ژ لایێ بابەت و ناڤەرۆکێڤە هاتیە سنووردارکرن.

ڕوباعی ژی هونەرەکێ ڕەسەنێ ئیرانییە. شاعرێن ئیرانی د ڤی بواریدا پێشەنگن و گرنگیەکا زۆر داینە ڤی قالبی، چەند نموونەیەك ژ ڕوباعیێ د شعرا عەرەبیدا هەنە کو ئەو ژی ل ژێر کاریگەرییا شعرا فارسی هاتینە ڤەهاندن[١٠٦]، کێشا ڕوباعیێ جیاوازە ژ هەمی کێشێن دیێن شعرا عەرەبی، فارسان داهێنان د کێشا ڕوباعییێدا کریە و بیست و چوار کێش لسەر بناغەیێ کێشا هەزەج بۆ ڕوباعیێ بکارئینانینە. ڕوباعی ب (تەرانە) ژی هاتیە ناڤکرن. ل ڤێرێ دووبەیتی ژی هەیە کو جیاوازیا وێ لگەل ڕوباعیێ ب تنێ د کێشێدایە، یانکو ئەگەر لسەر ئێک ژ بیست و چوار کێشێن سەر ب کێشا هەزەجێ بیت، دێ بیتە ڕوباعی و ئەگەر ژ وان دەرکەڤیت دێ بیتە دووبەیتی[١٠٧]. ب دیتنا مە جیاوازیا سەرەکیا ڕوباعیێ لگەل

دووبەیتییێ ئەڤەیە کو دووبەیتی قالبەك نینە ژ قالبێن سەبکێ خوراسانی و بەشەکە ژ کەلەپورێ شعریێ ڕۆژئاڤا ئیرانێ ب تایبەت کوردێن ڤێ دەڤەرێ و ئەگەرێ جوداکرنا وێ ژ ڕوباعیێ پتر هەبوونا جیاوازییێن زمانی و وێنەییێن ڤان دوو قالبانە.

سەرەرای ئیرانی بوونا هەر دوو قالبێن ڕوباعی و دووبەیتییێ و جیاوازبوونا ئەدگارێن وان یێن زمانی و وێنەیی ژ قەسیدە و قالبێن شعرییێن کو لسەر بناغەیێ لاساییکرنا قەسیدەیێ دروستبووینە، لێ جیاوازی پتر د دووبەیتیاندا دهێتە دیتن. دووبەیتی ب قالبەکێ جودا ژ ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا عەرەبی و شعرا کلاسیکییا سەبکێ خوراسانی دهێتە ل قەلەم دان. (دیارە کو کێشا دوو بەیتییێ هەر ژ سەردەمێن کەڤن باو بوویە و گەلەك شعرێن پەهلەوی ب ڤێ کێشێ هاتینە ڤەهاندن، هەر وەسا ل ناڤەندا ئیرانێ ژی دووبەیتی گەلەك بەربەلاڤ بوویە و خەلکی ئەڤ قالبە بۆ ڤەهاندنا شعرێ ب دیالێکتێن خۆ یێن ناوچەیی بکارئینایە).[108] (شمس قیس ڕازی) ب ئاشکرایی باسێ جیاوازبوونا کێش و زمان و ئەدگارێن دووبەیتییێ ژ شعرا عەرەبی- خوراسانیا باو ل ڕۆژهەلاتا ئیرانێ دکەت. ئەو زاراڤێ (فەهلەویات)ێ بۆ ڤێ جۆرە شعرێ بکاردهینیت.ئەو ڤێ چەندێ ددەتە خویاکرن کو ئەڤ قالبە ل ناڤەند و ڕۆژئاڤایا ئیرانێ باو بوویە و هەمی چین و تەخێن جڤاکی لایەنگر و حەژێکەرێن ڤێ جۆرە شعرێ بووینە هەتا وی ڕادەی کو چ شعرێن بەرزێن عەرەبی و غەزەلێن دەری نەشیانە وەسا کاریگەرییێ لسەر وان بکەن، پرانیا ڤان فەهلەویاتان واتاییێن نامۆ بخۆڤەدگرن و ب کێشەکا بێ سەروبەر و شکەستی دهێنە ڤەهاندن)[109]

نوکە ئەم دشێین بێژین هندی قالبەکێ شعری پتر نێزیکی قەسیدەیێ بیت، پتر دکەڤیتە بەر مەترسیا لاساییکرنێ، چونکە ژ لایەکیڤە شاعر دهێتە گرێدان ب کۆمەکا یاسا و نەریتێن بجهمایی ژ قەسیدەیا عەرەبی و خوراسانیا کەڤن و ژ لایەکێ دیڤە رەخنەیا ئەدەبی و ب تایبەت یاسا و ئامۆژگارییێن زانایێن ڕەوانبێژیێ دێ بنە ئەگەر کو شاعر پتر بکەڤیتە داڤێن لاساییکرنێ، چونکە ئەڤ

یاسا و ئامۆژگاریه لسەر بناغەیێ قەسیدە یێ هاتینە دانان، هەر چەند نکۆلی ل ڤێ چەندێ ناهێتە کرن کو تەڤایا قالبێن شعری ب ڕێژەیەکا کێم یان زێدە ل ژێر کاریگەرییا دەستەلاتا قەسیدەیێ و وێ رەخنەیا ئەدەبینە کو خزمەتا قەسیدەیێ دکەت.

## ب. رۆلێ بەرهەمێن داستانی:

ئێک ژ مەزنترین کاریگەرییێن ئەدەبێ عەرەبی لسەر ئەدەبیاتا مللەتێن دیێن ئیسلامی زالبوونا شعرێ بسەر ژانرێن دیێن پەخشانکی بوویە. ئەڤ چەندە د ئەدەبێ فارسیدا خویایە و نکۆلی لێ ناهێتەکرن، ئیرانیان ل سەردەمێن کەڤن (گرنگیدایە کۆمکرن و نڤیسینا ئەفسانە و چیرۆکێن سەر زارێن گیانەوەران، ئیرانییێن سەردەمێ هەخامەنشی و ئەشکانی و ساسانیان شیاینە گەلەك بەرهەمان د ڤی بواریدا کۆم بکەن، بەرهەمێن وەکو: هزار ئەفسانە، سندبادنامە، کلیلە و دمنە(*)، اسکندرنامە....هتد)[١١٠] لسەر دەستێ وان هاتینە پاراستن. لگەل هاتنا ئیسلامەتیێ و زالبوونا شعرا عەرەبی و شعریەتا قەسیدەیێ و لاسایکرنا شعرا عەرەبی وەسا دیارە کو گەلەك ژ ڤان بەرهەمان ژ چارچووڤێ پەخشانێ هاتینە ڤەگۆهاستن بۆ چارچووڤێ شعرێ یانکو ل قوناغا دەستپێکیا سەرهلدانا شعرا فارسی واتە ( د سەبکێ خوراسانیدا شاعرێن فارس ب فەر زانینە کو ڤان بەرهەمان ب ئاوایەکێ کێشدار پێشکێش بکەن، لەوما وان قالبێ مەسنەوییێ بۆ ڤێ چەندێ هەلبژاردیە، چونکە قالبێن قەسیدە و غەزەل و تەرجیع بەند و تەرکیبەند و یێن دی بۆ ڤێ چەندێ گونجاو نەبووینە..).[١١١]

ئەم دشێین بێژین زالبوونا قەسیدەیێ تا ڕادەیەکێ بوویە ئەگەر کو ژانرێن چیرۆکامێز ب ئەدەبەکێ پلە دوو بهێنە هژمارتن و جارنا ژی بوویە ئەگەرێ فەرامۆشکرن و ڕەتکرنا ڤان بەرهەمان، بۆ نموونە هندەك ڤەکۆلینێن نوی ئەڤ ڕاستییە داینە دیارکرن کو شاهنامەیا فردەوسی دبنەرەتدا بریتیە ژ ب شعرکرنا بەرهەمەکێ پەخشانکیێ ئیرانیێ کەڤن و فردەوسی بۆ پاراستنا وێ

شعر بكارئينايه[١١٢]. ئەگەر ئەڤ چەندە ژی ڕاست نەبیت، فردەوسی بۆ پاراستنا كۆمەكا مەزن ژ ئەفسانە و داستانێن ئیرانی كو مەترسیا ژناڤچوونێ ل سەر وان بوویە ب ڤی كاری ڕابوویە.

شعرا فارسی ل دەستپێكا سەرهلدانا خۆ دا شیایە هندەك بەرهەمێن شعرییێن چیرۆكامێز كو پتر ب مەسنەوی دهێنە نیاسین پێشكێش بكەت، هەر ژ سەردەمێ سامانیان (رودكی) و (ابو شكور بلخی) ب ڕێكا كۆمەكا بەرهەمان بناغەیەك بۆ مەسنەوییێن كورت و درێژ دانان. ل سەردەمێ غەزنەویان ژی شاعرێن وەكو (فردوسی، اسدی، عنصری، یزدانی، لبیبی، عیوقی...)بەرهەمێن گرنگ و بەرچاڤ دڤی بواریدا پێشكێش كرینە. نڤیسینا ڤان جۆرە بەرهەمان ب هەر دوو تایێن دلداری و قارەمانی ل سەردەمێ سەلجوقیان ژی بەردەوامبوویە[١١٣]، لێ ل سەدێ سەدێ شەشێ كۆچی بەرهەمێن مەسنەوییێن (نڤامی گنجوی) ب ناڤێ (خمسە) كو كۆمەكا مەسنەوییێن ڕەوشتی و دلداری و قارەمانی ب خۆڤەدگرن خۆیادبن و ئێدی مەسنەوینڤیسێن پشتی ڤی بەرهەمی ب ئاواییێن جۆراوجۆر دكەڤنە داڤا لاساییكرنا خەمسەیا (نظامی)[١١٤]و ب ڤی ڕەنگی مەسنەوی ژی دبیتە قوربانیا لاساییكرنا شعری.

ژبلی ئەڤ لاساییكرنا كو تووشی بەرهەمێن داستانی بوویە، لاساییكرنا ئەدگارێن قەسیدەیێ ژی بوویە ئەگەرێ زالبوونا شعرا لیریكی لسەر بەرهەمێن داستانی، تەڤلیهەڤبوونا ڤان بەرهەمان لگەل شعرا لیریكی و تایبەت غەزەلێ، بابەتەكە كو نكۆلی لێ ناهێتەكرن.گەشەكرنا داستانێن دلداری و لاوازبوونا داستانێن قارەمانی ب تایبەت د سەبكێ عەراقیدا بەلگەیەكە بۆ سەلماندنا ڤێ ڕاستیێ كو بەرهەمێن چیرۆكامێز ملكەچی لیریكبوونا قەسیدەیێ بووینە. دیارە كو كەسەكێ وەكو (شبلی نعمان) هەست ب ڤێ چەندێ كریە، ئەو (د ڤێ باوەرییێدایە كو زالبوونا غەزەلێ بوویە ئەگەر كو شاعرێن نوی شیانا نڤیسینا مەسنەوییێ نەبیت چونكە زمانێ مەسنەوی و غەزەلێ ژهەڤ جودایە لێ ئەو مەسنەوییێن دلداری و ئەڤینییێ ژ ڤێ چەندێ جودا دكەت چونكە ب دیتنا وی زمانێ

وان هەر زمانێ غەزەلێیە..)[١١٥]. هەر ژ سەدێ پێنجێ كۆچی واتە لسەردەمێ غەزنەویان نیشانەیێن كاریگەرییا شعرا لیریكی لسەر شعرا داستانی دهێتە دیتن، بۆ نموونە (عیوقی) د داستانا (ورقە و گلشاه)ا خۆدا كو دبنەرەت دا بریتیە ژ داستانەكا عەرەبی، جارنا ژ شێوازێ باوێ ڤان داستانان لاددەت و هندەك غەزەلان بكاردهینیت. هەر وەسا ل سەدێ حەفتێ كۆچی ژی (امیر خسرو دهلوی) نە ب تنێ غەزەل بەلكو هندەك قەسیدەیان ژی د ناڤ مەسنەوییێدا بكاردهینیت[١١٦].

جیاوازیا داستانێن دلدارییێن سەبكێ خوراسانی و یێن پشتی هنگی ڤێ ڕاستیێ بۆ مە ددەنە دیاركرن كو تا چ ڕادە زمان و شێوازێ شعرا لیریكی لسەر ڤان داستانان زالبوویە. ئێدی شاعر ل جهێ گرنگیدان ب ڕەگەزێن سەرەكیێن داستان و چیرۆكێ خۆ ب هونەرێن ڕەوانبێژیێ و سنعەتكاریا ووشەیڤە مژویل دكەن. د ڤان داستاناندا پتر گرنگی ب لایەنێ زمانی و ڕەوانبێژیێ هاتیەدان و تا رادەیەكێ زۆر گرێ و دیالۆگ و كەسایەتی و ناڤەرۆكا وان هاتینە فەرامۆشكرن، بۆ نموونە (دبینین كو د هەستیارترین دیمەنێن هندەك داستانان ژی ب تنێ مفا ژ هندەك خواستن و لێكچواندنێن بێ گیان دهێتە وەرگرتن...)[١١٧]، واتە ل جهێ هندێ كو هەول بۆ بهێزكرنا ئەدگار و ڕەگەزێن تایبەت ب داستانێ بهێتە دان، پتر لاساییا ئەدگارێن زمانی و وێنەیێن قەسیدە و غەزەلێ دهێتەكرن.

## ج. رۆلێ سۆفیگەریێ:

سۆفیگەری د مێژوویا ئیسلامیدا ((ب جۆرە شۆرەشەكێ دهێتە هژمارتن، ئەڤ بزاڤە ژبەر هەبوونا نێرین و فەلسەفەكا تایبەتی بۆ ئایین و سیاسەتێ و هەبوونا تێگەهشتنەكا جیاواز بۆ جوانی... شیایە تشتەكێ نوی پێشكێش بكەت))[١١٨]، كەواتە لگەل هاتنا سۆفیگەریێ بۆ ناڤ مەیدانا شعرێدا پێدڤیە باسێ جیاواز بوونا شعرا كاریگەر ب سۆفیگەریێ و شعرا بەری ڤێ چەندێ بهێتەكرن.

لادان ژ نموونەێن باو ژ تایبەتمەندییێن شعرا سۆفیانە ؛ نە بتنێ نموونەیێن شعری بەلكو ئەگەر ئەم وێ لگەل نەریتێن ڕۆشنبیرییێن باو و لاساییكری بەراورد

بکەین؛ دێ بینین کو ئەڤ لادانە، لادانەکا مەعرفییە، ئەڤە ژی جیاوازیا وێ شعریەتا کو ڕەخنەیا ئەدەبییا عەرەبی پێشکێش دکەت لگەل شعریەتا سۆفیگەریێ کو نێزیکی گیانێ شعرێیە بۆ مە ددەتە خویاکرن[١١٩]، یانکو سەرهلدانا سۆفیگەریێ بەربەستەك بوویە ل هەمبەر بەردەوامبوونا لاساییکرنا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی کو ب پالپشتیا ئەدگارێن قەسیدەیێ بەردەوامی ددا هەبوونا خۆ.

سۆفیان ب هەمی چینێن خۆ یێن جیاوازڤە و ب درێژییا هەمی سەردەمان ئەدەبەکێ ئیسلامیێ بەرز هەیە. وان ڕۆلەکێ مەزن د نویکرنا واتا و خەیال و شێوازێن ئەدەبیدا هەیە. ئەدەبێ سۆفیان سۆزەکا ڕاستگۆییانە و ئەزموونەکا کویر ب خۆڤە دگریت. ئەو د شعرێن خۆ دا ئێکەتیا ئۆرگانیا شعرێ و هزرێ و ناڤەرۆکێ دپارێزن و گرنگیێ ددەنە ڕوخسار و ناڤەرۆکێ[١٢٠]. خەیالێ ڕۆلەکێ مەزن د کەشف یانکو ئەزموونا سۆفیاندا هەیە، لەوما ڤەکۆلینێن سۆفیان پتر نێزیکێ گیانێ شعرێنە تاکو ئەو ڤەکۆلینێن ڕەوانبێژییێن کو بیاڤێ خەیالێ بەرتەنگ دکەن و وێ د چارچووڤێ هندەك یاساییێن هشك سنووردار دکەن، ئەو یاساییێن کو شاعر گەلەك مفای ژ وان وەرناگریت...)[١٢١]. ب ڤی ڕەنگی سۆفیگەری ژ لایەکیڤە هەولددەت شعرەکا جیاواز پێشکێش کەت و ژ لایەکێ دیڤە ڕێکا شرۆڤەکرن و خواندنا وان بۆ شعرێ ژی جیاوازە و ژ سنوورێ ڕوونبێژیا کەڤن دەربازدبیت.

سەرەرای پێکۆلا سۆفیگەریێ بۆ گۆهرینا ئاراستەیا شعرێ، لێ ڤەکۆلینا شعرا کاریگەر ب سۆفیگەریێ ڤێ چەندێ بۆ مە ئاشکرا دکەت کو ئەڤ شعرە ب ئاوایێن جۆراوجۆر بوویە قوربانیا بالادەستبوونا لاساییکرنا شعریەتا قەسیدەیا کەڤن و نەشیایە ب تەمامەتی خۆ ژ ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی و شعریەتا قەسیدەیێ ڕزگاربکەت. بەری هەر تشتەکی (د ئەدەبێ عەرەبیدا وەکو پێدڤی گرنگی ب شعرا سۆفیگەریێ نەهاتیە دان و چ جاران وەکو بەشەك ژ شعرا عەرەبییا بەرز سەرەدەری لگەل نەهاتیەکرن. دیارە هندەك ڤەکۆلەرێن عەرەبان هەولددەن گرنگینەدان ب ئەدەبێ سۆفیان د ڕەخنە و مێژوویا ئەدەبییا عەرەبی

بێخنە ئەستۆییێ ڕۆژهەلاتناسان. ئەو د ڤێ باوەرییێدانە کو ڕۆژهەلاتناسان نەڤیایە کو عەرەبان ئەدەبەکێ ئیسلامیێ پەیامدار هەبیت و ب ڤی ئاوایی عەرەبان ژی لاسایيا ڕۆژهەلاتناسان کریە و دەستبەرداریێ ئەدەبێ سۆفیگەرییێ بووینە..)[١٢٢]، لێ ئەگەر ئەم چاڤخشاندنەکێ لسەر بەرهەمێن ڕەخنەییێن عەرەبان بکەین دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو دژایەتیا عەرەبان بۆ سۆفیگەرییێ درێژەپێدانا هەمان پیرۆزراگرتنا قەسیدەیا جاهلی و بێزاریا وان ل هەمبەر شعرا پەیامدارا دەستپێکا سەرهلدانا ئیسلامەتییێیە.

ئەگەر شعرا سۆفیگەری بەشەکێ کێم ژ ئەدەبیاتا عەرەبی بخۆڤەگرتبیت و وەکو پێدڤیە گرنگی پێ نەهاتبیتە دان، ئەو شعرا کو ب شعرا عرفانی یان سۆفیگەری دهێتە نیاسین، مەودایەکا ئێکجار بەرفرەهـ ژ ئەدەبێ فارسی ب خۆڤە دگریت، هەتا وی ڕادەی کو ئێدی هەست ب زالبوونا وێ لسەر شعر و ڕەخنەیا شعرییا فارسی دهێتە کرن. هندەك ڤەکۆلەر د ڤێ باوەرییێدانە کو (دەمێ عرفان دهێتە ناڤ شعرا فارسیدا تەوەرێ ستوونییێ خەیالا شعرێ[*] ژ بنیاتڤە دهێتە گۆهرین و ئازادیەکا بێ سنوور د ڤی تەوەریدا دهێتە دیتن. ئێدی تەوەرێ ئاسۆییێ خەیالێ هێدی هێدی لاواز دبیت چونکە تەوەرێ ستوونییێ خەیالێ د شعرێن وان دا هند بهێز دکەڤیت کو کێمتر هەست ب پێدڤی بوونا وێنە و ڕەگەزێن ڕوونبێژییێ دکەن...)[١٢٣]. ب دیتنا هندە ڤەکۆلەرێن دی ژی سەرهلدانا عرفان و سۆفیگەرییێ بوویە ئەگەرێ بدویماهیک هاتنا بکارهینانا ژ ڕادەبدەرا هونەرێن جوانکارییێ کو پرانیا ڕووبەرێ شعرێ داگیرکربوون و بووبوونە ئەگەرێ سنووورداکرنا داهێنانا وێنەییێن شعری[١٢٤].

ب راستی نکۆلی ل رۆلێ سۆفیگەرییێ د نویکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا ناهێتەکرن، لێ ب دیتنا مە زێدەرۆییەك د ڤێ چەندێدا هەیە، چونکە بەشەکێ مەزن ژ ئەو شعرا کو ب عرفانی یان سۆفیگەری دهێتە نیاسین نەشیایە خۆ ژ لاساییکرنا ئەدگارێن شعرا قوناغێن بەرێ ڕزگار بکەت، ژ لایەکیڤە (پرانیا وێنەییێن کو سۆفی یان عارف بکاردهینن هەر میراتا شعرییا شاعرێن قوناغێن

بەرێیە)[١٢٥] و ژ لایەکێ دیڤە ژی ئێک ژ جیاوازیێن سەبکێ خوراسانی لگەل سەبکێ عەراقی کو هێلینا شعرا عرفانی و سۆفیگەرییێیە، ئەڤەیە کو د شعرا سەبکێ عەراقیدا هونەرێن جوانکاریێ ب ئاوایەکێ بەرفرەهتر دهێنەبکارهینان[١٢٦]، ئەڤە ژی مەسەلا لاوازبوونا هەژموونێ جوانکاریێ ل بن سیبەرا سۆفیگەریێ دئێخیتە بەر گومانێ.

ئەگەر مە باوەری ب ڤێ چەندێ هەبیت کو شعرا سۆفیگەری بەرهەمێ وەرارا شعرا ئایینیا ئیسلامی و غەزەل و شعرا مەیڤەخوارنێ و هونەرێ وەسف و ستایشکرنا شعرا کەڤنە[١٢٧]؛ پێویستە مە باوەری ب بەردەوامبوونا لاساییکرنا ئەدگارێن شعرا قوناغێن بەرێ د شعرا سۆفیگەریدا ژی هەبیت. ئەم نکۆلیێ ل وان گۆڕانکاریان ناکەین کو ل ژێر کاریگەرییا سۆفیگەریێ د شعرێدا خویابووینە، لێ ب دیتنا مە پێدڤیە ئەم لدویڤ وان ئەدگاران بگەرین کو تایبەتمەندیێ ددەنە شعرا سۆفیگەریێ چونکە گەلەك جاران ئەو ئەدگارێن کو ئەم ددەینە بال کاریگەرییا سۆفیگەریێ بریتینە ژ هندەك ئەدگارێن لاساییکرییێن شعرا قوناغێن بەری خویابوونا سۆفیگەریێ. هەر وەسا پشتبەستنا مە ب ئالاڤێن ڕەخنەییێن بەری ڤێ قوناغێ ژی دبیتە ئەگەرێ بەرجستەکرنا شعرەکا وەها کو چ جیاوازی لگەل شعرا بەری هنگی نینە، بۆ ڤەکۆلینا شعرا کاریگەر ب سۆفیگەریێ فەرە ب تنێ پشتبەستن لسەر ئامرازێن رەخنەییێن باو د ڤەکۆلینێن رۆژهەلاتا ئیسلامیدا نەهێتەکرن.

## ٢. ١. ٤. جهێ شعرا کلاسیکییا کوردی د رێرەوێ لاساییکرنا شعرییا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا:

ئەم نەشێین تەڤایا بەرهەمێن شعریێن کلاسیکییێن کوردی د زنجیرەیەکا مێژوویی‌دا بێخینە بەر ڤەکۆلینێ چونکە دابڕان د ناڤبەرا شعرا کلاسیکییا دیالێکێن کوردیدا هەبوویە و کۆمەکا فاکتەران بووینە ئەگەر کو شعرا کلاسیکییا هەر دیالێکتەکێ ب شێوەیەکێ جودا و بێ کو پەیوەندی ب دیالێکتێن دیڤە هەبیت سەرهلبدەت، لێ لگەل هندێ ژی ب دیتنا مە زێدەرۆیە ئەگەر ئەم بێژین کو (( تاکە خالێک کە ئەدەبی کلاسیکی هەموو دیالێکتە کوردیەکان کۆدەکاتەوە، کاریگەریی ئەدەبی فارسیە لەسەریان، واتە کانیاوی هاوبەشی هەموویان کلاسیکی فارسیە. ئەوەش ڕەت ناکرێت کە لە دیالێکتەکانی گۆرانی و کرمانجی سەروو، ڕەگەزی میللی و فۆلکلۆر لە شیعرەکانیاندا بەرجستەیە، بەلام هەمدیسان کاریگەری فارسی زاڵترە لە ئەدەبی میللی)[١٢٨].

ئەگەر مە باوەری ب هەبوونا هێلەکا لاساییکرنێ ب ناڤێ لاساییکرنا ئەدگارێن قەسیدەیێ یان لاساییکرنا شعریەتا قەسیدەیێ هەبیت، واتە ئەو هێلا کو ژ قەسیدەیا جاهلییا عەرەبی دەست پێدکەت و ل سەردەمێ ئەمەوی و عەباسی بەردەوام دبیت و پاشی ب پشتەڤانیا ڕەخنەیا عەرەبی ئیسلامی کو هەولا سەپاندنا شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی ددا دچیتە ناڤ ئەدەبێ فارسی و دبیتە هێڤێنێ قەسیدەیا سەبکێ خوراسانی و پاشی ب ئاوایێن جۆراوجۆر د تانوپۆیا غەزەلا فارسییا سەبکێن دیێن زمانێ فارسی بەردەوامیێ ددەتە هەبوونا خۆ؛ دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو د شعرا کلاسیکییا کوردیدا دوو ئاراستە بۆ شعرێ دهێنە دیتن، ئاراستەیەك کو سەروکانییا وێ لاساییکرنا قەسیدەیێ نینە و ئاراستەیەك کو ڕاستەوخۆ بەرهەمێ لاساییکرنا ئەدگارێن قەسیدەیێ و درێژەپێدەرا سەبکێن شعرا فارسیە:

## ١.٢.١.٤.١. ئاراستەیا خۆمالی:

وەکی بەری نهۆ مە ئاماژەپێدای سەنتەرێ گەشەکرن و وەرارا شعریەتا قەسیدەیێ رۆژهەلاتا ئیرانێ یانکو دەڤەرا خوراسانێ بوویە. بۆ یەکەمین جار ل سەردەمێ سەلجوقیان تێکەلیەك د ناڤبەرا ئەدەبیاتا رۆژهەلات و رۆئاڤا ئیرانێ چێبوویە، ئەڤ تێکەلیە پشتی هێرشا مەغولان گەهشتیە کوپیتکا خۆ. گەلەك بەلگەیێن مێژوویی ئاماژەیێ ددەنە هەولا بەردەواما شاعر و رەخنەگرێن رۆژهەلاتا ئیرانێ بۆ ملکەچکرنا شعر و ئەدەبیاتا دەڤەرێن دیێن ئیرانێ و سەپاندنا ئەدگارێن سەبکێ خوراسانی لسەر وان. دیارە شاعر و رەخنەگران سەرکەفتنەکا باش ژێ بدەستڤەئینایە، چونکە سەبکێ عەراقی کو ب دروستی ل باژێرێ شیرازێ گەشەکریە، سەرەرای پاراستنا هندەك ئەدگارێن شعرییێن رۆژئاڤایا ئیرانێ لێ پتر درێژەپێدەرێ شعرا سەبکێ خوراسانیە، کەواتە بەری هەر تشتەکی دەڤەرا کوردستانێ ژ هێلا لاساییکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی دویربوویە و هەر ئەڤە ژێ ئێکە ژ ئەگەرێن درەنگ سەرهلدانا وێ شعرا کلاسیکییا کوردی کو لسەر بناغەیێ لاساییکرنا نموونە یان شعریەتا قەسیدەیێ ئاڤابوویە.

بەری هاتنا هەوا شعریەتا قەسیدەیێ، ل دەڤەرێن جودا جودایێن کوردستانێ کێش و سەروا و قالب و شێوازێن شعرییێن تایبەت و خۆمالی و جیاواز ژ شعریەتا قەسیدەیێ هەبووینە و هاتینە بکارهینان، لێ دیارە پرانیا وان بووینە قوربانییێن بالادەستبوون و سەپاندنا شعریەتا قەسیدەیێ، باشترین بەلگە بۆ سەلماندنا ڤێ راستییێ سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا کوردی ل ناڤ کوردێن لوڕ و کوردێن گۆرانە. ( شەمسێ قەیسێ رازی) کو ب رێکا کتێبا خۆ هەولدایە هەمی ئەدگارێن نموونەیا قەسیدەیێ بدەتە خویاکرن؛ چەند ئاماژەیێن گرنگ دایە جیاوازبوونا شعرا رۆژئاڤایا ئیرانێ. ئەم دشێین ڤان ئاماژەیان بکەینە بەلگەیەك بۆ هەبوونا جۆرە شعرییەتەکا تایبەت و جیاواز د شعرا کوردییا دیالێکتا لۆڕی و گۆرانییا وی سەردەمی:

أ- وی ڕەخنە ژ كێشا دووبەیتیان یانكو فەهلەویان گرتیە، ب دیتنا وی كێشێن ڤان شعران ژلایێ عەروزیڤە دروست نینن. ئەو ڤان هەلەیان ددەتە بال خەلكێ زەنجان و هەمەدانا ڕۆژئاڤایا ئیرانێ[(١٢٩)]، هەرچەندە كو گەلەك ڤەكۆلەرێن ئیرانی د ڤێ باوەرییێدانە كو (شمس قیس ڕازی) شارەزای د دیالێكتێن ڕۆژئاڤایا ئیرانێدا نەبوویە؛ لەوما توشی هەلەیێ بوویە[(١٣٠)]، لێ تشتێ گرنگ نامۆبوونا كێشا دووبەیتی و تایبەت بوونا وێ ب ڕۆژهەلاتا ئیرانێیە، یانكو دەمێ دووبەیتییێن خەلكێ هەمەدانێ كەفتینە بەر چاڤێن (شمس قیس ڕازی)، كێشا وان دووبەیتیان بۆ وی تشتەكێ تازە بوویە.

٢- مللی بوونا ڤان شعران: شمس قیس ڕازی ل جهەكی دبێژیت (( من هەمی خەلكێ عراقێ[(*)] ژ زانا و عەوامان، بەرێز و ئاست نزمان، پەرۆشێ دانان و ڤەهاندنا فەهلەویان دیت، ئەو گرنگیەكا زۆر ددەنە گوهداریكرنا سترانێن ڤان فەهلەویان، ب ڕەنگەكێ وەسا كو چ ئاوازێن نازك و نڤیسینێن بەرزێن عەرەبان و غەزەلێن دەری[(**)] و داستانێن ب جۆش و خرۆش وەكو ڤان فەهلەویان كاریگەرییێ ناكەتە سەر وان و هەستێ وان نائازرینیت:

لحن اورامین و بیت پەهلەوی زخمە رود و سماع خسروی))[(١٣١*)]

بەربەلاڤبوونا دووبەیتی یان فەهلەویان ل ڕۆژئاڤایا ئیرانێ بوویە جهێ سەرسۆرمانا نڤیسەری، چونكە وی ب درێژیا تەمەنێ خۆ ب تنێ سەرەدەری لگەل شعرێن سەبكێ خوراسانی كریە كو ژ چارچووڤێ كۆچكا دەستەلاتداران و ژمارەكا دیاركری ژ خواندەڤانێن دەستبژێر دەرنەكەفتییە. ئەڤە ب خۆ نیشانا جیاوازبوونا شعرا مللییا ڕۆژئاڤا ئیرانێ ب تایبەت شعرا كوردییا دیالێكتا لوری و گۆرانی ژ شعرا ئەرستوكراتییا ڕۆژهەلاتا ئیرانێیە.

٣- پەیرەوینەكرن ژ عەقلییەتا قەسیدەیێ: (شەمس قیس ڕازی) باسێ وێ هەست و سۆزا ژ ڕادەبدەر كو د ڤان شعراندا دهێتە دیتن دكەت. ئەو دبێژیت كو ئەڤان شعران گەلەك گەنج سەردابرینە و گەلەك كچ خستینە داڤێن حەژێكرنێ...)[(١٣٢)]

ئەڤە ژی نیشانا ڤێ چەندێیە کو ئەڤ شعرە مللی بوونە و ئەو عەقلگەرایی و رەوانبێژییا کو شعریەتا قەسیدەیێ پشتەڤانییا وێ دکەت د ڤان دووبەیتی یان فەهلەویاندا نەبوویە و پتر لسەر بناغەیێ هەست و سۆزەکا خودی هاتینە ڤەهاندن.

ڤەکۆلەرەکێ وەکو (سید علی میر افضلی) کو ب کەسەکێ شارەزا د بوارێ دووبەیتی و روباعیان دهێتە نیاسین، سەبارەت ب وەکهەڤی و جیاوازییا د ناڤبەرا دووبەیتی و روباعیێ دبێژیت کو چ جیاوازیەکا وەسا د ناڤبەرا روخسارێ ڤان دوو قالباندا نینە. هەر دوو قالب ژلایێ ژمارا دێران و سیستەمێ سەرواسازیێ وەکو هەڤن و جوداکرنا وان ژ هەڤ ب تنێ لسەر بناغەیێ کێش و ناڤەرۆکێیە. روباعی لدەڤ شاعرێن فەرمی پەسەند بوویە و دووبەیتی زمانحالێ خەلکێ ئاسایی بوویە[١٣٣]. ب دەربرینەکا دی ئەگەرێ سەرەکیێ جوداکرنا روباعیێ ژ دووبەیتیێ نەگونجانا ئەدگار و ناڤەرۆکا دووبەیتیێ لگەل چێژا لاسایکەرێن قەسیدەیا ئەرەستوکراتییا خوراسانییە.

ئەم باباتاهرێ هەمەدانی و دووبەتیێن وی ب دەستپێکا شعرا کلاسیکییا خۆ ل قەلەم ددەین، ڤەکۆلەرێن کوردێن وەکو عەلائەدین سجادی[١٣٤] و مارف خەزنەدار[١٣٥]داکۆکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەن، کەواتە ئەم دشێین بێژین سەرەتایا سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا کوردی درێژەپێدانا ئەدگار یان شعریەتا قەسیدەیێ نینە، بەلکو بریتیە ژ شعرەکێ کو تا رادەیەکێ زۆر خۆمالییە.

گەلەك ڤەکۆلەرێن ئیرانی ژی ب شێوەیەکێ راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ سەرهلدان و وەرارا دوبەیتیان ل رۆژئاڤایا ئیرانێ ب ئەدەبیاتا مللییا کوردانڤە گرێ ددەن. (پەرویز اذکیایی) د ڤێ باوەرییێدایە کو سەروکانییا روباعیێ رۆژهەلاتا ئیرانێ (خراسان) و سەروکانییا دووبەیتیان رۆژئاڤایا ئیرانێ (مادستان)ە[١٣٦]. (سید علی میرافضلی) ژی سەبارەت ب ڤێ چەندێ دبێژیت: (( ئێکەمین دووبەیتیێن کو ب زمانێ فەرمیێ فارسی هاتینە ڤەهاندن بۆ سەدێ دەهێ و یازدێ کۆچی دزڤرن و ئەو تشتێ بەری هنگی بەردەستە ئەو فەهلەویاتن کو ب ئێک ژ دیالێکتێن کەڤنێن

دەڤەرێن ناڤەندی و ڕۆژئاڤا ئیرانێ وەکو ڕازی و آزەری و کوردی و لوڕی هاتینە ڤەهاندن)[137]

دەمێ ئەم وەکو قالبەکێ شعریێ ڕەسەن باسێ فەهلوی یان دووبەیتی یان (تەرانە)یان دکەین و سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا کوردی لسەر دەستێ (باباتاهر)ی ژ ڕێرەوێ لاساییکرنا ئەدگار یان شعریەتا قەسیدەیێ جودادکەین، فەرە پەیوەستبوونا شعر و ئەدەبیاتا کوردێن گۆران ب ڤێ ڕەسەنایەتی و خۆمالیبوونا شعرا کوردی ژی ژبیرنەکەین، چونکە کۆمەکا پەیوەندییێن دیرۆکی و ئایینی وان پێکڤە گرێددەن.

فاکتەرێ ئایینی ڕۆلەکێ مەزن هەبوویە د پێکڤەگرێدانا دیالێکتا لوری و گۆرانیدا. (پەرویز اذکیایی) دەمێ باسێ (باباتاهر)ی دکەت ئاماژەیێ ددەتە پەیوەندییێن بهێزێن (باباتاهر)ی ل گەل کوردێن گۆران. ئەو دڤێ باوەرییێدایە کو (باباتاهر) خودان هندەك بیرو باوەرێن ئایینی بوویە کو ڕەهـ و ڕیشالێن وان بۆ بەری ئیسلامێ دزڤریت. ئەڤ بیروباوەرە ژی باباتاهری ب وان نەتەوەیانڤە گرێددەت کو ل چیایێن ڕۆژئاڤا ئیرانێ دژیان. ئەو دەمێ باسێ ئایینێ (ئەهلێ حەق) دکەت ڤی ئایینی ب لوڕی- گۆرانی ناڤدکەت. هەر وەسا داکۆکیێ لسەر هندێ دکەت کو دووبەیتی و کورتەپەیڤێن باباتاهری ب زمانێ مللیێ خەلکێ ڤێ دەڤەرا چیایی هاتیە ڤەهاندن کو بریتیە ژ دیالێکتێن گۆرانی، هەورامی، هەمەدانی.[138]

ئایینێ ئەهلێ حەق و سروودێن ئایینییێن یارسان بەلگەیەکێ بهێزن بۆ پەیوەندییا دیرۆکییا د ناڤبەرا دیالێکتا لوڕی و گۆرانیدا. بابا تاهرێ هەمەدانی بتنێ ئێک ژ پێرەوێن ڤی ئایینی نەبوویە، بەلکو د ڤی ئایینیدا خودان پلە و پایەیە و د کتێبا (سەرەنجام)دا ناڤێ وی هاتیە و مینا کەسەکێ پیرۆز سەرەدەری لگەل دهێتە کرن[139].کەواتە سروودێن ئایینییێن یارسانان ژی کو ب دیالێکتا گۆرانی هاتینە ڤەهاندن، بەشەکن ژ شعرا ڤێ دەڤەرێ. ئەو شعرێن کە د کتێبا ئەهلی حەق واتە سەرەنجام یانکو سروودێن ئایینییێن یارساندا هەنە نیشانا ڤێ چەندێنە کو ئەڤ دیالێکتە هەشت سەد سالان بەری نهو ل کوردستانا ناڤەراست و ژێری

زمانێ ئایینی بوویه[١٤٠]، هەر د ڤان سروودانداا ژی دووبەیتی هەنە لێ ب ئەدگار و تایبەتمەندیێن جیاواز، (مارف خەزنەدار) سەبارەت ڤێ چەندێ دبێژیت (( دوو بەیت بۆ هونەرێکی شیعری تر لە کوردیدا بەکار دەهێنرێ، ئەم هونەرە لە ئەدەبی دیالێکتی گۆرانیدا ئاشکرا و دیارە، بە تایبەتی لە شیعری ئایینی یارسان، دوو بەیت لە سەر کێشی دە سیلابی و وەستان لە ناوەراست دەبێ و هەر چوار دێرە شیعرەکە لە سەر یەك قافیە دەبێ. شیعری باباسەرهەنگی دەودانی و پیر شالیار و شاخۆشێن و باباناووس و هی تر بەم شێوەیە دەنوێنن))[١٤١]. هەر ئەڤە ب خۆ نیشانا کەڤناربوونا قالبێ دووبەیتی و یێن نێزیک ژ دووبەیتییێنە و دبنە بەلگە بۆ هەبوونا جۆر شعرەکا هەڤپشک ب ناڤێ لوڕی- گۆرانی ل ڤێ دەڤەرێ. سەبارەت ب (باباتاهر)ی ژی پێویستە بێژین ((دووبەیتییەکانی باباتاهیر بە سەرەتای شیعری کوردی دادەنرێن بە شێوەیەکی گشتی بلیمەتیەتی باباتاهر لەگەل بیر و باوەڕی ئایینی یارسان و سۆفیزمی کۆزمۆسی و گۆرانیی میللی ناوچەیی دوو بەیتەکانیان دروست کردووە))[١٤٢].

هەرچەندە کو مە باوەری ب هندێ هەیە کو ((شیعری ئایینی و لیریکی لە دیالێکتی گۆرانیدا کۆنترین شیعری زمانی کوردیە، لە سەدەکانی ناوەراستەوە پەیدا بووە و لە بەرزی و نزمیدا بووە تا سەرەتای سەدەی بیستەم، ئینجا کەوتۆتە کزییەوە تا دووای جەنگی گێتی دووەمیش هەر لە ناوەوە بوو))[١٤٣]، لێ مەبەستا مە ئەڤە نینە کو مینا (صدیق صفی زادە بۆرەکەیی) و ب پشتبەستن ب سروودێن یارسان و هەبوونا شعرێن هندەك شاعرێن لوڕستانی د ڤان سروودان دا؛ دەستپێکا سەرهلدانا کلاسیزما کوردی بۆ سەدێ دوویێ وسێیێ کۆچی بزڤرینین[١٤٤]. ئەو تشتێ مە دڤێت بێژین ئەڤەیە کو دووبەیتیێن (باباتاهر)ی بەرهەمێ شعرا ئایینی و مللییا لوڕ و گۆرانانە و لسەر بناغەیێ لاساییکرنا شعریەتا قەسیدەیێ نەهاتیە ڤەهاندن.

نهۆ ئەم دشێین ئەو شعرا کلاسیکییا کوردی کو ب دیالێکتا گۆرانی (هەورامی) هاتیە نڤیسین ب بەردەوامییا شعرا لوڕی- گۆرانییا ڤێ دەڤەرێ بزانین.

ئەڤ شعرە سەرەرای پێکاریگەربوون ب رێرەوێ لاساییکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی، شیایە گەلەك ژ سیماییێن تایبەتییێن شعرا ڤێ دەڤەرێ بپارێزیت. (هەڤدەم لگەل سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا کوردییا کرمانجییا ژووری، ل قەلەمرۆیا میرنشینا ئەردەلان و هندەك دەڤەرێن کوردستانا ژێری ژی ئەدەب ب دیالێکتا گۆرانی د گەشەکرن و پێشڤەچوونێدا بوویە.. شاعرەکێ وەکو (مەلای پەریشان) ل سەدەیێ چواردێ و شاعرێن وەکو بێسارانی (١٦٤١- ١٧٢٠)، میرزا شەفیعی جامەرێزی (١٧٨٥- ١٨٣٥)، خانای قوبادی (١٧٠٠- ١٧٥٩)، سەیدی هەورامی (١٧٨٤- ١٨٤٨)، مەولەوی (١٨٠٦- ١٨٨٢) و گەلەکێن دی بەرهەمێن خۆ یێن شعری پێشکێشی ڤێ دیالێکتێ کرینە[١٤٥]، لێ شعرا وان (( بە کێش و سەروا و گەلێ سیمای هونەریی تر و زمانی رەوان و ساکار لە فۆلکلۆر و ئەدەبی میللی و خەلکەوە نزیک بووەوە نزیکە...))[١٤٦]. هەر ئەڤ بنگەهێ بهێزێ شعرا گۆرانی بوویە ئەگەر کو شاعرێن وەکو (بێسارانی) و (مەولەوی) سەرەرای شارەزابوون د شعرا کلاسیکییا عەرەبی و فارسی ب تەمامەتی نەکەڤنە داڤێن لاساییکرنا شعریەتا قەسیدەیێ و گەلەك جاران شعرێن وان ببنە نموونەیێن راستەقینەیێن کارلێکا ئەدەبێ خۆمالی و ئەدەبی بیانی.

دامەزراندنا باژێرێ سلیمانی و بهێزکەفتنا دەستەلاتا میرێن بابان بوویە ئەگەر کو دیالێکتا کرمانجییا خوارێ ببیتە زمانێ ئەدەبیێ دەڤەرێ و هێدی هێدی شعرا دیالێکتا گۆرانی بەرەڤ لاوازیێڤە بچیت، لێ دیارە ژ بلی هندێ جۆرە پشتگوهخستنەك ژی ل هەمبەر شعرا ڤێ دیالێکتێ دهێتە دیتن، چونکە ((مێژووی ئەدەبی گۆرانی تەنانەت بە شێوەیەکی گشتی و راگوزاریش نەنوسراوەتەوە، بەرهەمی شاعیرە بەرزەکانی ئەم دیالێکتە هێشتا نەتوێژاونەتەوە و لێکۆلینەوەی زانستییان دەربارە نەنووسراوە...))[١٤٧]. یانکو ب دروستی کار لسەر هندێ نەهاتیە کرن کو شعرا لوری ـ گۆرانی ب رەه و ریشالێن خۆ یێن کەڤن و بەرهەمێن خۆ یێن کلاسیکی وەکو رێچکەیەکا شعرییا جودا ژ رێچکەیا لاسایکەرا شعرا

کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی بهێته نیاسین. ب دیتنا مە چەند ئەگەرەك بۆ ڤێ چەندێ هەنە:

١. جێگیربوونا دیالێکتا سلێمانییێ وەکو زمانێ فەرمییێ ئەدەبیاتا دەڤەرێ بوویە ئەگەر کو پتر گرنگی ب شعرا شاعرێن دیالێکتا کرمانجییا خوارێ ب تایبەت سالم و نالی و کوردی بهێته دان.

٢. شعرا کلاسیکییا گۆرانی خودان ڕەهـ و ڕیشالێن خۆمالییە و شێوازێ وێ جیاوازە ژ شعرا کرمانجییا سەری و خوارێ کو پتر لاساییا تایبەتمەندیێن شعرا لاساییکرییا رۆژهەلاتا ئیسلامی دکەن و شعرێن وان پڕن ژ نموونەیێن وەسا کو داخوازی و پێدڤیاتییێن رەوانبیژییا عەرەبی دابین دکەن. یانکو ئالاڤێن ڕەخنە و رەوانبێژییا ڕۆژهەلاتی پتر د بەرژەوەندییا شعرا تەقلیدینە تاکو شعرەکا وەکو شعرا دیالێکتا گۆرانی.

٣. پێکاریگەربوونا تیۆرا ئەدەبییا کلاسیکی ب شعریەتا قەسیدەیێ بوویە ئەگەر کو ڤەکۆلەرێن کورد وەکو ڤەکۆلەرێن فارس مەرج و ئەدگارێن قەسیدەیێ بکەنە پیڤەر بۆ جوداکرنا شعرا بەرز ژ شعرا نزم، گەلەك جاران ئەو شعرا کو لاساییا ئەدگارێن قەسیدەیێ دکەت ب کلاسیکی و یا کو ژ ڤان یاسا و مەرجان دویر دکەڤن ب مللی دهێنە هژمارتن، کەواتە ئەو شاعرێن کو ملکەچی یاسا و تایبەتمەندیێن قەسیدەیێنە لێ شعرێن وان پڕن ژ وێنەیێن لاساییکری و سواوە ب پلە ئێك و کلاسیکی دهێنە نیاسین و یێن کو ب ملکەچی ڤێ لاساییکرنێ نینن ب پلە دوو و مللی دهێنە نیاسین.

## ٢. ١. ٤. ئاراستەیا پەیوەست ب ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی:

### ١.٤.١.٢. شعرا کلاسیکییا کرمانجییا سەری:

(مارف خەزنەدار) سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا کوردییا دیالێکتا کرمانجییا سەری بۆ پشتی شەرێ جالدیران (١٥١٤) دزڤرینیت.ب دیتنا وی ئەڤ شعرە لە دەستپێکێ ب شێوەیێ میللی و پاشی شیعرا تایبەت ب خواندەڤانێن بەرز خویابوویە[١٤٨]، کەواتە ( ئەدەبی کوردستانی سەروو لە سەدەی شازدەمدا دەستی پێکرد، سەدەی حەڤدە و هەژدە دەوری زێڕینی بوو، سێ کوچکەی لووتکەی شیعر فەقێ تەیران و مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی هەموو بابەتەکانی شیعری کوردییا ن خولقاند، ئەوەی خۆمالی کە سەر بە ئەدەبی نەنووسراوی میللی بوو و ئەوەی سەر بە شیعری ئیسلامەوی بوو کە لە ئەنجامی لێکدانی مەدەنییەتی عەرەب و فارس و تورکی عوسمانی و کورد پەیدا بوو).[١٤٩]

سەرەرای ئەو تێگەهشتنا خەلەت و هەستیارییا زێدە کو ل دەڤ ڤەکۆلەر و نڤیسەرێن کرمانجییا سەری ل هەمبەر زاراڤێ شعرا مللی دهێتە دیتن ئەم دشێین بێژین سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا کوردی ل کرمانجییا ژووری دوو ئاراستەیان بخۆڤە دگریت: شعرێن فەقییێ تەیران کو سەرەرای هەبوونا هندەك ڕەگەزێن لاساییکرییێن شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی لێ نوینەراتییا شعرا مللییا دەڤەرێ دکەت و شعرا مەلاییێ جزیری کو تا ڕادەیەکێ زۆر پەیوەستە ب ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی. هەر ئەڤ چەندە مە هان ددەت کو جارەکا دی پێداچوونێ لسەر زاراوەسازی و دابەشکرنێن خۆ بۆ شعرا کەڤنا کوردی بکەین. پێویستە ئەم زاراڤێ کلاسیکێ بۆ هەمی شاعرێن خۆیێن کەڤن بکاربینین و لسەر بناغەیێ پێرەوییا شعریەتا قەسیدەیێ و مفاوەرگرتن ژ شعرا خۆمالی و ڕەسەن سەرەدەرییێ لگەل وان بکەین، واتە نابیت مللی بوون ببیتە ئەگەر کو بەرهەمەکێ شعری ژ چارچووڤێ کلاسیزمێ بهێتە دەرخستن.

سەرەرای هەڤچەرخبوونا (جزیری) و (فەقییێ تەیران) لێ (جزیری) سەرکێشێ لاساییکرنا شعریەتا قەسیدێیە د شعرا کلاسیزمییا کوردیدا. نە ب تنێ ژبەر هندێ کو (( داهێنەری غەزەل و کێشی عەرووزی و یەکێتی قافییە لە ئەدەبی کوردی جزیرییە))[150] بەلکو ژبەر ڤێ چەندێ کو ژ لایێ واتا و وشەیڤە گرنگیەکا زۆر دایە رەوانبیژییێ[151]، یانکو شعرا مەلایێ جزیری پرانیا جاران دریژەپێدانا شعرا لاسیکرییا رۆژهەلاتا ئیسلامییە.

(مەلایێ جزیری) ئێکە ژ وان شاعرێن کورد کو بوویە قوربانیێ هزرا دزییا شعرییا باو د رەخنەیا ئەدەبییا رۆژهەلاتا ئیسلامی و برِیارێن سەرڤەسەرڤەیێن هندەك ڤەکۆلەران، ئەو تشتێ کو د ڤەکۆلینێن ئەدەبیێن کوردیدا گەلەك باو بوویە مەسەلا پێکاریگەربوونا جزیری ب (حافظ شیرازی) و هندەك شاعرێن دیێن فارسە وەکو (سەعدی شیرازی) و (جامی) و (فرخی سیستانی). پیڤەرێ ڤان ڤەکۆلەران ژی پرانیا جاران ڤەدیتنا دوو دێرێن وەکهەڤە د ناڤبەرا هەر دوو شاعران یان ئاماژەدان ب ناڤێ شاعرەکێ فارسە. ب دیتنا مە مەسەلا هەبوونا دێرێن وەکهەڤ پتر دچیتە چارچووڤێ وەرگرتن و تێهەلکێشێ چونکە هەر وەرگرتنەك نابیتە بەلگە بۆ سەلماندنا هەبوونا کاریگەری و لاساییکرنێ و مەسەلا ئاماژەدان ب ناڤێ شاعران ژی نەریتەکێ باوبوویە د ناڤ شاعرێن فارسدا. ب دەربرِینەکا دی (جزیری) لاساییا چ شاعرێن دیارکری ناکەت بەلکو لاساییا ئەدگارێن قەسیدەیێ یانکو شعریەتا قەسیدەیێ دکەت کو بناغەیێ لاساییکرنا شعرییا رۆژهەلاتا ئیسلامییە.

پێویستە مەسەلا لاساییکرنێ د شعرێن مەلایێ جزیری ژ چارچووڤێ پەیوەندییێن کەسۆکی دەرکەڤیت و باسێ پەیوەندییا شعرێن وی ب سەبکێن شعرییێن فارسی واتە سەبکێ خوراسانی و عەراقی و هندی بهێتەکرن. ئەم ل ڤێرێ بۆ پتر رۆهنڤەکرنا ڤێ راستییێ دێ کێماسی و ئاریشێن شرۆڤەکرنا لاساییکرنێ ل سەر بناغەیێ پەیوەندییا د ناڤبەرا (حافظ) و (جزیری) دەینە خویاکرن:

١. شعرا كلاسيكييا فارسی ب خۆ پره ژ وێنه و دەربڕینێن لاساییکری کو گەلەك ژ وان گەهشتینه ئاستێ سواوەبوونێ. چەوا ئەم دشێین د ناڤ ڤان وێنەییێن کەڤن و سواوە دا ب تنێ وان وێنەیان بکەینە پیڤەر کو داهێنانا (حافظ)ینە و جزیری ئەو وێنەیە ژ (حافظ)ی وەرگرتینە. ل ڤێرێ ئەم کۆمەکا لێکچواندن و خواستنێن دووبارە و سواوە فەرامۆش دکەین چونکە ب دیتنا مە ئەو بەشەکن ژ نەریتێ شعرا کلاسیکی و هەمی شاعران ئەو بکارئینایینە و گرنگیێ ددەینە وان وەرگرتنا کو دشێن ببنە دەستپێکەك بۆ نویکرنا شعرێ یانکو بکورتی ئەم ڤەکۆلینێ لسەر لاساییکرن و کاریگەرییێ ناکەین بەلکو پتر هزرا مە ل دور دزیێ دزڤریت.

٢. گەلەك ژ وێنە و دەربڕین و ئەدگارێن هەڤپشک د ناڤبەرا (جزیری) و (حافظ)ی ئەو ئەدگارن کو د تەغەزول و قەسیدەییێن سەبکێ خوراسانیدا و تەنانەت قەسیدە و غەزەلا عەرەبی ژی هەبووینە و ب میرات گەهشتینە (حافظ)ی، هەبوونا وان د شعرێن هەر دوو شاعران دا ب چ ئاوایەکی نابیتە بەلگە بۆ کاریگەرییا (حافظ)ی لسەر (جزیری) و گەلەك جاران ئەڤ چەندە ڕاستییا ڤێ گوتنێ ژی کو ((کاریگەری ئەدەبی فارسی لەسەر ئەدەبی کوردی دەچێتی خانەی ئەدەبی بەراوردکاری))[١٥٢]، دئێخیتە بەرگومانێ چونکە گەلەك ژ ڤان ئەدگار و تایبەتمەندیان سنوورێ پەیوەندییا دوولایەنەیا ڤەکۆلینێن بەراوردکارییێن قوتابخانەیا فەرەنسی دەربازدکەن و ب تنێ ب ڕێکا خواندنەکا مێژوویی بۆ ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دهێنە شرۆڤەکرن.

٣. د سەبکێ عەراقیدا پتر گرنگی ب غەزەلێ هاتیە دان، د پرانیا دانەیێن چاپکرییێن دیوانا (حافظ)یدا یان چ تەرجیعبەند یان تەرکیب بەند نینن یان ب تنێ ئێک یان دوو نموونە دهێنە دیتن(*). بەروڤاژی ڤێ چەندێ گەلەك شعرێن جزیری ژ بەندان پێک دهێن و چێدبیت پتر بەرهەمێ خواندن و گرنگیدانا وی ب بەرهەمێن شاعرێن سەبکێ خوراسانی بیت. زێدەباری ڤێ

چەندێ ئەو ووشەبازییا کو د شعرێن جزیریدا دهێتە دیتن ب تایبەت تەشتیرێن وی د شعرێن (حافظ)یدا ناهێنە دیتن.

٤. چێدبیت هندەك کەس د ڤێ باوەرییێدا بن کو (مەلایێ جزیری) چ پەیوەندی ب سەبکێ هندیڤە نەبوویە چونکە ئەڤ سەبکە ل سەردەمێ صەفەویان سەرهلدایە، واتە هەڤدەم بوویە لگەل سەردەمێ (جزیری)، لەوما زەحمەتە کو دەم و کاودانێن سیاسییێن وی سەردەمی دەلیڤە دابیتە (جزیری) کو پەیوەندیێ ب ڤی سەبکی بکەت[١٥٣]، لێ دەمێ تەماشەی شعرێن جزیری دکەین هندەك نیشانەیێن کاریگەرییا سەبکێ هندی لسەر شعرێن وی خۆیا دبن. بۆ نموونە (حافظ شیرازی) ڕەدیف یان پاش سەروایێن زەحمەت بکار نەئینایە یانکو ب شێوەیەکێ گشتی ڕەدیفێن وی کارن و کێم جاران وی ناڤ وەکو ڕەدیف بکارئینایە، ئەڤە ل وی دەمی کو شاعرەکێ وەکو (نظیری نیشابوری) کو سەر ب سەبکێ هندیە ئەڤ جۆرە ڕەدیفە بکارئینانە (بحث، رقص، غرض، غلط، ضەحظ).[١٥٤] دیارە کو مەلایێ جزیری ژی وەکو هەڤسەردەمەکێ (نظیری) گرنگیدایە ڤان جۆرە ڕەدیفان (عبث، فرض، غرض، بحث، رِقص، غرض، ض حظ، غلط)[١٥٥].

ب ڤی ڕەنگی چێدبیت گرێدانا مەلایێ جزیری ب لاساییکرنا شاعرەکیڤە کارەکێ بێ ئەنجام بیت، (مەلایێ جزیری) خواندەڤانەکێ باشێ شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بوویە و مەسەلا کاریگەری و لاساییکرن د شعرێن ویدا ب تنێ لسەر بناغەیێ سەبکێن شعرا فارسی و ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی کو بناغەیێ وێ نموونەیا قەسیدەییێیە دهێتە شرۆڤەکرن، جزیری ئێکەمین شاعرێ کوردە کو نەریت و یاساییێن شعریەتا قەسیدەیا ڕۆژهەلاتی ڤەگوهاستییە ناڤ شعرا کوردیدا، شعرێن وی درێژەپێدانا شعریەتا قەسیدێیە و ب تنێ لسەر ڤی بناغەی ئەم دکارین بابەتێ لاساییکرن و کاریگەریێ د شعرێن ویدا شرۆڤە بکەین.

ژبلی جزیری و (فەقیێ تەیران) پێدڤیە ئەم باسێ ڕۆلێ (ئەحمەدێ خانی) ژی بکەین چونکە (مەم و زین)ا خانی یەکەمین بەرهەمێ داستانیێ کوردیە کو

لدویڤ نەریتێن داستانییێن باو د شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی ب تایبەت شعرا فارسی هاتیە ڤەهاندن. هەر چەندە خانی د نڤیسینا ڤێ داستانێدا گەلەك مفا ژ داستاننڤیسێن ئیرانی ب تایبەت (نزامیێ گەنجەوی) وەرگرتیە لێ بەرهەمێ وی ب تەواوەتی سەر ب رێرەوێ لاسایيکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی نینە، چونکە ژ لایەکیڤە ئەڤە بەرهەمەکێ داستانیە و لسەر قالبێ مەسنەویێ هاتییە ڤەهاندن؛ ئەڤ چەندە ژی دەلیڤا نویکرن و داهێنانەکا پتر دایە شاعری و ژلایەکێ دیڤە ئەو کەرەستەیێ کو خانی پشتبەستن لسەر کرییە کەرەستەیەکێ نوییە.

(خانی) د مەم و زینا خۆ دا چەندین جاران ئاماژەدایە ڤێ چەندێ کو وی گەلەك گوهداریا چیرۆکبێژ و کەسێن زانا و شارەزا و خودان سەربۆر کرییە، ئەڤە ژی نیشانا ڤێ چەندێیە کو ب جۆرە ڤەکۆلین و دویڤچوونەکێ رابوویە و بەرهەمێ ڤێ دویڤچوون و ڤەکۆلینێ خستیە چارچووڤێ شعرێدا[١٥٦]. ئەڤە ژی بەروڤاژی بەرهەمێن دیێن داستانییە د ئەدەبیاتا کوردیدا، چونکە داستاننڤیسێن دیێن کورد بەرێ خۆ داینە داستانێن وەکو (شیرین و خوسرەو) و (لەیلا و مەجنوون) و (یوسف و زولەیخا)یێ کو بەری وان گەلەك شاعرێن فارس ئەڤ داستانە کرینە شعر و گرنگی پێداینە. دیارە کو (خانی) ب خۆ ژی ل دەمێ نڤیسینا (مەم و زین)ا خۆ، بابەتێ لاسایيکرن و دزیێ بەرچاڤگرتییە و ل هەمبەر ڤێ چەندێ خودان هەلویست بوویە. ئەو ب خۆ دەربارەی بەرهەمێ خۆ دبێژیت:

(نوباوەیە طیفلە نۆرسیدە     هەرچەندە نەن قەوی گوزیدە
لێ من ژ رەزان نەکر تەمەتتوع     مانەندێ دزان ب کەس تەتەببوع)[١٥٧]

ژ ڤان دێران ئەڤ راستیە زەلال دبیت کو (خانی) باوەری ب نویبوونا بەرهەمێ خۆ هەبوویە و هەولدایە ب تەمامەتی نەکەڤیتە داڤا لاسایيکرنا شاعرێن فارس. پشتبەستن ب داستانەکا نوی زەمینەیێ بۆ بەرجستەبوونا رویدان و دەم و جهێن نوی سازدکەت، ئەڤ چەندە ژی فاکتەرەکە بۆ خویابوونا دەربرین و وێنەیێن نوی، لەوما سەرەرای هەبوونا کۆمەکا ئەدگارێن لاسایيکری د (مەم و زین) خانی

دا، ژمارەکا بەرچاڤ ژ وێنە و دەربرین و هەلویستێن نوی و جیاواز ژێ دهێنە دیتن. چێدبیت هەر ئەڤ تایبەتمەندییا مەم و زینێ بوویتە ئەگەر کو (ڤەکۆلەرەکێ ئەکادێمیێ سۆڤیەتی، واتە (ئوربیللی)، مەم و زینا (ئەحمەدێ خانی) ببەتە ڕێزا بەرهەمێن هەر دوو شاعرێن مەزنێن ڕۆژهەلاتێ، واتە فردەوسیێ ئیرانی و (روستاڤیللی)ێ جۆرجی).[١٥٨]

ب شێوەیەکێ گشتی د شعرا کلاسیکییا کرمانجییا سەری (مەلای جزیری) نوینەراتییا ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی دکەت، ئەوە کو بۆ ئێکەمین جار بنەمایێن لاساییکرییێن قەسیدە و غەزەلا رۆژهەلاتا ئیسلامی یانکو ئەدگارێن شعرییەتا قەسیدەیێ ئینایە ناڤ شعرا کوردیدا و شعرا کلاسیکییا کوردی ب ڤی ڕێرەویڤە گرێدای.

## ٢.١.٤.٢. شعرا کلاسیکییا کرمانجییا خوارێ:

سەرەرای هەبوونا بیروبۆچوونێن جودا سەبارەت ب سەرهلدانا شعرا کلاسیکییا کرمانجییا خوارێ، دشێین بێژین کو ((لە سەدەی تۆزدەیەمدا بە هۆی دەستەلات پەیداکردن و بەهێزبوونی ئەمارەتی بابانەوە کە وەك قەوارەیەکی سیاسی نیمچە سەربەخۆ و بەرەو پێشەوەچوو، پێویستی بە زمانێکی ڕەسمی ئەدەبیی ناوچەیی خۆی هەبووە، ئەدەبی کوردی بە دیالێکتی کرمانجی خواروو پەیدابووە. دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە نالی (١٨٠٠- ١٨٥٦)(*) و هاورێکانی: سالم (١٨٠٠- ١٨٦٦) و کوردی (١٨٠٩- ١٨٤٩)ن...))[١٥٩]. دیارە کو ئەڤ سێ شاعرە ب تنێ دگۆرەپانا ئەدەبییا وی سەردەمی نەبووینە بەلکو ((ئەدەبی کوردی ئەو سەردەمە ناوی چەند شاعیرێکی کوردمان بۆ دەور دەکاتەوە بەلام لەبەر ئەوەی ئەو شیعرانەی لەبەر دەستمان زۆر کەمن و نەگەیشتوونەتە پلەی شاعیریەتی سێ شاعیرە بەناوبانگەکە نالی و سالم و کوردی بۆیە تەنیا بەرهەمی ئەم سێ شاعیرە دەبێتە بناغە بۆ نووسینەوەی مێژووی شیعری کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا لە ناوچەی سلیمانی. لە ڕاستیشدا ئەم سێ مامۆستایە دامەزرێنەری ئەم

قوتابخانەیەن و بە شێوەیەکی گشتی بزووتنەوەکە بە هۆی بەرهەمی سێ شاعیرەکە دروست بووە ))[١٦٠]

شعرا کلاسیکییا کرمانجییا خوارێ لسەر بناغەیێ لاساییکرنا ئەدگارێن قەسیدەیێ سەرهلدایە و درێژەپێدەرا شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامییە. (مارف خەزنەدار) سەبارەت ب شعرا ڤێ دەڤەرێ دبێژیت: ((شیعری لیریکی (غەزەل و قەسیدە) لە دیالێکتی کرمانجیی خوارووداا لە پاش دروستکردنی پایتەخت (سلیمانی) پەیدا بوو. ئەم بزووتنەوە ئەدەبییە کارێکی گەورەی کردە سەر پەرەسەندن و گۆڕانی ئەدەبی کوردی لە دووا ڕۆژ دا ))[١٦١]. ڤەکۆلینا شعرا ڤێ دەڤەرێ ژی ڤێ ڕاستیێ ددەتە دیارکرن کو ئەڤ شعرە ب توندی ب رێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیڤە هاتیە گرێدان.

گەلەك ڤەکۆلەر و مێژوونڤیسێن بوارێ ئەدەبێ د نڤیسینێن خۆدا ب ئاوایێن جۆراوجۆر باسێ پەیوەندییا شعرا قوتابخانەیا بابان ب ئەدەبێ بیانی و ئەدەبێ فلکلۆریڤە کرینە، لێ لدویڤ خواندن و دویڤچوونا مە پرانیا وان سەرهلدانا ڤێ شعرێ ب کاریگەرییا شعرا کلاسیکییا فارسیڤە گرێددەن و نکۆلیێ ل هندێ ناکەن کو ڕۆشنبیرییا ئەدەبییا مزگەفتان و کاریگەرییا شاعرێن فارس بوویە بناغەیێ سەرهلدانا ڤێ شعرێ و وەسا دیارە کو پەیوەندییا شاعرێن کلاسیکیێن کرمانجییا خوارێ لگەل ئەدەب و شیعرا مللی وەکو شعرا کلاسیکییا دیالێکتێن دی بهێز نینە. ئەم ب پێویست نزانین کو جارەکا دی وان خالێن کو ئاماژەیێ ددەنە کاریگەرییا شعر و شاعرێن فارس دووبارەبکەینەڤە، لێ ب دیتنا مە دوو خالێن سەرەکی سەبارەت ب پەیوەندییا شعرا کلاسیکییا ڤێ دەڤەرێ ب ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی یانکو رێرەوێ لاساییکرنا شعریەتا قەسیدەیێ هەنە کو وەکو پێدڤی گرنگی ب وان نەهاتیە دان و فەرە بهێنە بەرچاڤگرتن:

## أ. كاريگەرييا شعرا قوناغا (بازگشت)ا فارسی:

وەکو بەری نهۆ مە ئاماژەپێدای قوناغا (بازگشت) یانکو قوناغا ڤەگەریانێ، قوناغەکە ژ مێژوویا ئەدەبێ فارسی کو ل دوماهییا دەستەلاتا ئەفشاریان دەست پێ دکەت و هەتا دەستپێکا بزاڤا مەشرووتیەتێ بەردەوامە واتە ژ نیڤا سەدێ دوازدەیێ کۆچی هەتا دەستپێکا سەدەیێ چواردەیێ کۆچی یانکو بۆ ماوەیێ ١٥٠سالان بەردەوام بوویە. شاعران ل ڤێ قوناغێ گرنگی دایە پێرەویکرنا شاعرێن سەبکێ عراقی و خوراسانی و پشتا خۆ داینە سەبکێ هندی، لەوما لاساییا غەزەلا سەبکێ عەراقی و قەسیدەیا سەبکێ خوراسانی هاتیەکرن، لگەل هندێ ژی قەسیدە پتر بوویە جهێ گرنگیپێدانێ. ب شێوەیەکێ گشتی ((ئەڤ سەرهلدانا ئەدەبی ب داهێنان و نویکرن ناهێتە هژمارتن چونکە لسەر بناغەیێ لاساییکرنێ هاتیە ئاڤاکرن و بەرهەمێ تێکۆشانا وان ب تنێ ئافراندنا سەقایەکێ ئەدەبی بوو کو پێنج سەد یان حەفت سەد سالان بەری هنگی هەبوویە...))[١٦٢]. تشتێ سەرنجراکێش ئەڤەیە کو ژ لایەکیڤە شعرا کلاسیکییا کرمانجییا خوارێ ل ڤێ قوناغێ ژ دایک بوویە (نالی (١٨٠٠- ١٨٥٦) سالم (١٨٠٠- ١٨٦٦) و کوردی (١٨٠٩- ١٨٤٩)، و ژ لایەکێ دیڤە ئەڤ شاعرە واتە دامەزرێنەرێن قوتابخانەیا بابان خودان پەیوەندیەکا بهێزبووینە لگەل شعرا فارسییا ڤێ قوناغێ.

بەری هەر تشتەکی (کوردی) کو ب دیتنا هندەك کەسان پێشەوایێ شیعرا کلاسیکییا قوتابخانەی بابانە گەلەك هاتن و چوونا ئیرانێ کریە[١٦٣]. تەنانەت هندەك د ڤێ باوەرییێدانە کو کوردی شاعر و ڕۆشنبیرەکێ ناڤدارێ کۆچکا قاجاریان و ئێك ژ ئەندامێن بەرجستەییێن ئەنجومەنێ ئەدیبێن ئیرانێ بوویە[١٦٤]. چێدبیت زێدەرۆییەك یان پێڤەنانەك دەربارەی ڤێ قوناغا ژیانا کوردی هەبیت چونکە وەکو مارف خەزنەدار دبێژین (ئەفسانە تێکەلٚ بە ژیانی بووە))[١٦٥]، لێ لگەل هندێ ژی ئەڤ زانیاریە نیشانا ڤێ چەندێنە کو (کوردی) پەیوەندیەکا بهێز لگەل شاعرێن قوناغا ڤەگەریانا شعرا فارسی هەبوویە و کەفتییە ژێر کاریگەرییا وان.

(سالم)ى ژى گەلەك هاتن و چوونا ئیرانێ کریە و بۆ ماوەیەکی ژى ل ئیرانێ ژیایە، وى ب خۆ د شعرێن خۆدا ئاماژە دایە ڤێ چەندێ[١٦٦]، کەواتە ژبلى داخباربوون ب ڕۆشنبیرییا ئەدەبییا فارسییا باو ل دەڤەرێ و نێزیکبوونا باژێرێ سلیمانییێ ل ئیرانێ، شاعرى پەیوەندیەکا ڕاستەوخۆ ژى ب شعر و ئەدەبیاتا فارسى هەبوویە و کەفتییە ژێر کاریگەرییا سەقایێ شعریێ قوناغا ڤەگەریانا شعرا فارسى. (نالى) ژى وەکو شاعرەکێ ڤى سەردەمى کو تێکەلى لگەل (کوردى) و (سالم)ى و ئەدەبیاتا فارسى هەبوویە، ژ ڤێ کارتێکرنێ دوور نینە.

تێکەلى و نێزیکییا شاعرێن قوتابخانەیا بابان لگەل قوناغا بازگەشتا فارسى کو ل سەر بناغەیێ لاساییکرنا شعرا فارسییا سەبکێ خوراسانى و عەراقى و ب تایبەت قالبێ قەسیدە و غەزەلێ هاتیەئاڤاکرن؛ فاکتەرەکە بۆ پتر بهێزبوون و خویابوونا ئەدگارێن شعریەتا قەسیدەیێ د بەرهەمێن شاعرێن کوردێن ڤێ قوناغێدا، واتە پەیوەندییا بهێزا شعرا ڤێ دەڤەرێ شعرا فارسییا وى سەردەمى دبیتە ئەگەر کو شعرا کلاسیکییا کرمانجییا خوارێ پتر ب لاساییکرنا شعرا فارسییا سەبکێ خوراسانى و عەراقیڤە بهێتەگرێدان. ب ڤى رەنگى شرۆڤەکرنا لاساییکرنێ د شعرا ڤان شاعراندا لسەر بناغەیێ پەیوەندییا دوو لایەنییا د ناڤبەرا دوو شاعراندا سەرکەفتنێ بدەستڤە ناهینیت، ئەڤ شاعرە لاسایکەرێن چ شاعرێن فارس نین بەلکو ئەو ژى وەکو شاعرێن فارسێن قوناغا بازگەشتا فارسى لاسایکەرێن شعریەت یانکو ئەدگارێن قەسیدەییێنە. شعرا وان ئەلقەیەکە ل داوییا زنجیرەیەکا لاساییکرنێ کو ژ قەسیدەییێن عەرەبى و یێن فارسییێن سەبکێ خوراسانى و غەزەلێن سەبکێ عەراقى و شعرا فارسییا پشتى سەبکێ عەراقى پێک دهێت.

## ب. زەمینەیا ڕەخنەیا شعرا قوتابخانەیا بابان:

سەرهلدانا شعرا کلاسیزمییا کوردییا کرمانجییا خوارێ ب تنێ پەیوەست نەبوویە ب کاریگەرییا شاعرێن فارسڤە، بەلکو ئەگەر ئەم شعرێن شاعرێن قوتابخانەیا بابان بخوینین؛ دێ گەهینە ڤى ئەنجامى کو بەرى سەرهلدانا شعرا کلاسیکى لسەر دەستێ شاعرێن قوتابخانەیا بابانڤە، زەمینەیەکا

ڕەوانبێژی و ڕەخنەیا گونجاو بۆ بەردەوامیدان ب ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی یانکو شعریەتا قەسیدەیێ ل ڤێ دەڤەرێ هەبوویە.

(د. کامل حسن البصیر) د پەرتووکا خۆدا واتە، (وێژەی کوردی و ڕەخنەسازی) ئاماژەیێ ددەتە کۆمەکا زاراڤێن تایبەت ب ڕەخنەیا کەڤنا عەرەبی و ڕۆژهەلاتی کو د شعرێن (نالی)دا ئاماژە ب وان هاتیە دان، ب تایبەت زاراڤێن وەکو (لەفز و مەعنا و طبع)[١٦٧]. ئەڤ دێرێن شیعرییێن ب ڤی ڕەنگی دبنە بەلگە کو تێگەهشتنا شاعرێن ڤێ دەڤەرێ بۆ شعرێ پتر ل ژێر کاریگەرییا ئەدگارێن قەسیدەیێ یانکو پیڤەرێن لاساییکرییێن شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بوویە:

کەس بە ئەلفازم نەلێ خۆ کردییە خۆ کوردییە
هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالبیی مەعنا دەکا...(نالی (دیوان)، ل١٠٣)

نالی عەجەب ب قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا
مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفزی کەم و بچووك...(نالی (دیوان)، ل٢٦٩)

زابیتەی تەبعم سوارە، ئیدیعای شاهی هەیە
موحتەشەم دیوانە، داوای تەختی خاقانی دەکا...(نالی (دیوان)، ل١٠٩)

لایقی مەخزەنی تەبعە هەموو کەنزی غەزەلم
قابیلی زەربی ڕەواجە زەر و زیوی مەسەلم...(نالی (دیوان)، ل٢٩)

کەواتە ڕەوانبێژی و بنەماییێن ڕەخنەییێن شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی د ناڤ خواندەڤان و ڕۆشنبیرێن دەڤەرێ هەبووینە و جۆرە فشارەك خستینە سەر شاعرێن کورد کو لاساییا شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بکەن؛ ئەوا کو لسەر بناغەیێ نموونەیا قەسیدەیێ دروستبوویە، ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو ڕۆلێ شعرا مللی و فۆلکلۆری د سەرهلدانا ڤێ شعرێدا گەلەك بهێز نەبیت، هەر وەکو ( عبدالرزاق بیمار ) سەبارەت ب شعرا کلاسیکییا ڤێ دەڤەرێ دبێژیت ((هەندێک

شاعیری هاوچەرخ و دوای (کوردی) لەو باوەڕەدابوون کە زۆر وشە و گوزارشت و قسەی دەماودەمی کۆڕی کوردەواری لەو پلە و پایەدا نین کە بچنە ناو چوارچێوەی غەزەل و قەسیدەکانیان، وە لەوانەیە بە سووکایەتیان زانیبێ ئەگەر لە قەلاتی قایمەوە دابەزنە ناو خەلکەکە.... بۆیە ئەوەندە بەخەم و ڕەوانیی زمان و جوانیی دارشتن نەبوون، .. بۆیە ئەگەر سەیری دیوانی هەلبەستی کوردی سەدەی نۆزدەمین و بکەین چەندین وشەی بیانی دەبینین کە بەرامبەرەکەیان وشەی کوردی و هاوواتایان زۆرە...)[١٦٨].

## ٢.٢. ڕۆلێ ڕەخنەیا عەرەبی ـ ئیسلامی د لاساییکرنا شعریدا:

ڤەکۆلینێن زانایێن موسلمانان د بوارێ زمانێ عەرەبی و شرۆڤەکرنا تێکستێن ئایینی و شعریدا ئێک ژ فاکتەرێن سەرەکیێن لاساییکرنا شعری و بەردەوامبوونا شعریەتا قەسیدەییێیە ل ڕۆژهەلاتا ئیسلامی. دیارە هندەك پالدەر و هۆکار ل پشت ڤێ چەندێ هەبووینە و بووینە ئەگەر کو بنەمایەکێ تیۆری و ڕەخنەیی بۆ شعرێ بهێتە دانان کو دبنەرت دا بریتیە ژ پاراستنا ئەدگار یان شعریەتا قەسیدەیێ ب ڕەنگەکێ وەسا کو د خزمەتا ڤەکۆلینێن ئیسلامیدا بیت.

## ٢. ٢. ١. ئەگەرێن پشتەڤانیکرنا لاساییکرنا شعری د ڤەکۆلینێن ئیسلامیدا:

### ٢.٢.١.١. دەمارگیرییا عەرەبان ل هەمبەر شعرا جاهلی:

عەرەب وەکو دەستەلاتدارێن ڕۆژهەلاتا پشتی سەرهلدانا ئیسلامەتیێ، نەتەوەیەکێ کەڤنەپەرستن یان وەکو (ئەدۆنیس) دبێژیت: (حەزا کەڤناتیێ لدەڤ عەرەبان هەیە و لدەڤ وان هەمیشە تشتێ کەڤن سەرکەفتنێ بدەستڤە دهینیت).[١٦٩] ئەو پرانیا جاران تشتێ کەڤن بسەر تشتێ نوی دئێخن و ڕەسەنایەتیێ

دبەخشنە تشتێن کەڤن، تشتێ نوی ژی ب تنێ ل بن سیبەرا تشتێ کەڤن ڕەوابوونا خۆ بدەستڤە دهینیت.

گەلەك ڤەکۆلەر هەولددەن لاساییکرنا قەسیدەیا جاهلی و پاراستنا ئەدگارێن وێ بۆ حەزا ژیانا بیابانشینییا عەرەبان و بەداوەتێ بزڤرینن. دەمێ عەرەب پشتی ئیسلامەتیێ بووینە خودان شارستانیەت و ژیانا شارنشینیێ جهێ بیابانشینیێ گرتی، هەمیشە هەولدایە داب و نەریت و کلتورێ خۆ یێ بیابانشینیێ بپارێزن و دژی بهایێن شارنشینیێ ڕاوەستن، یانکو((لدەڤ عەرەبان بەداوەت پیڤەرە، هندی شعر پتر نێزیکی بەداوەتێ بیت دێ ب ڕەسەنتر هێتە نیاسین))[170]

شاعر و ڕەخنەگرێن عەرەب ب توندی ب ڕابردوویا ئەدەبی و شعرا جاهلیڤە هاتینە گرێدان. ڕاستە کو شعرا عەرەبی ل قوناغێن جودا جودادا وەرار و گەشەکرن ب خۆڤە دیتیە، لێ ڕەهێن وێ هەر د ئەدەبێ جاهلیدایە. ژیدەرێ ئەدەبێ عەرەبی، ئەدەبێ جاهلیە و هندەك جاران هەر جارەکا دی دزڤریتە سەر ڤێ ئەدەبیڤە...).[171]

ئاریشە ب تنێ د لاساییکرنا شعرا جاهلیدا نینە، بەلکو ئەڤ شعرا جاهلی ب خۆ نموونەکە کو لسەر بناغەیێ لاساییکرنێ ئاڤا بوویە. ل سەردەمێ جاهلی نموونەیەکا هونەرییا بلند ب ناڤێ قەسیدەیا عەرەبییا جاهلی هەبوویە. ئەو نموونەیا کو ب دیتنا عەرەبان گەهشتییە کوپیتکا جوانیێ، جوانییەکا ڤەبر و چەسپاو، یانکو ئێدی قەسیدەیا جاهلی بوویە پیڤەر و بنەما و ب (شعرا نموونەیی) هاتیە نیاسین. شاعرێن جاهلی لسەر بنەمایێ ڤێ نموونەیێ شعرێن خۆ ڤەهاندینە و دەرکەفتن ژ بنەمایێن ڤێ نموونەیێ مینا دەرکەفتن ژ لاساییکرنێ بوویە و بهایێ هەر شعرەکێ ژی لسەر بناغەیێ نێزیکبوونا وێ ژ قەسیدەیا نموونەیی هاتیە دەستنیشانکرن.شاعرێ جاهلی هەمی هەولێن خۆ ددا کو ژ ڤێ بازنەیێ دەرنەکەڤیت و ڕەگەزێن سەرەکیێن ڤێ شعرێ کو سادەیی و ڕاستی و وێنەکرن و موسیقانە، بپارێزیت)[172]

هەر ئەڤ یاسادار بوونا شعرا جاهلی و وەکهەڤییا شعرێن شاعرێن ڤی سەردەمی بوویە ئەگەر کو شێوازێ شعرا ڤی سەردەمی ببیتە جهێ گرنگیپێدانا شاعر و ڤەکۆلەرێن شعرا عەرەبییا جاهلی و ئێدی ((وان ب خۆ شێوازێ جاهلییێ شعرا عەرەبی ب (طريقة العرب) ناڤکریە. ئەڤە ژی ئاماژەیەکە بۆ جودابوونا شعریەتا عەرەبی ژ شعریەتا مللەتێن دی))[١٧٣] یانکو شعرا سەردەمێ جاهلیە کو ناسنامەیا عەرەبییا شعرێ دپارێزیت و یێ کو دڤێت شعرەکا عەرەبی بنڤیسیت پێدڤیە لاساییا شێوازێ شعرا جاهلی بکەت.

هەر وەکو بەری نهۆ ژی مە ئاماژەپێدای ئیسلامەتی و بهایێن وێ ژی نەشیاینە گوهرینەکا ڕیشەیی بێخنە د شعرا عەرەبیدا، شکۆمەندی و پیرۆزییا شعرا ڤی سەردەمی گەهشتییە وی ڕادەی کو ئێدی ((پەسنا وان شاعران هاتیەکرن کو لدویڤ شعرا جاهلی دچن و نەکامییا وان هاتیەکرن یێن کو دڤێن لاساییا نموونەیا قورئانێ بکەن))[١٧٤]، واتە ( سەرەدەریکرن لگەل شعرا جاهلی ژ سنوورێ ڕێزگرتنێ دەربازبوویە و گەهشتییە ئاستێ داخباربوون و سەرسۆرمانێ، بێ کو ئێک هەولبدەت بچیتە ناڤ جیهانا ڤێ شعرێ و ئەگەرێن ڤێ داخباربوون و سەرسۆرمانێ بدەتە دیارکرن و تەنها بیانۆ بۆ پێگەهشتن و مەزناتییا ڤێ شعرێ کەڤناتییا وێ بوویە)[١٧٥]

### ٢.١.٢.٢. گرێدانا قەسیدەیا جاهلی ب زانستێن ئایینیڤە:

د دیرۆکا شارستانیەتا ئیسلامیدا پەیوەندیەکا موکوم د ناڤبەرا قەسیدەیا جاهلی و زانستێن ئیسلامیدا دهێتە دیتن. ئەڤ پەیوەندیە هەتا وی ڕادەی موکومە کو دشێین بێژین، (نڤیسین و گرنگیدان ب شعرێ ب دروستی پشتی دەربازبوونا سەدەیێ ئێکێ کۆچی خویابوویە، چونکە نڤیسین و تومارکرن بخۆ ل ڤی سەدەی دەستپێکریە. فەرموودەیێن پێغەمبەری ژی ژ لایێ کۆمەکا سەحابیانڤە ل ڤی سەدەی هاتینە تومارکرن. ڕاڤەکرن یانکو تەفسیر ژی ل سەردەمێ سەحابیان دەستپێکریە و گەشەکریە، واتە دوور نینە کو تومارکرنا شعرێ ژی هەڤدەم بیت

لگەل تومارکرنا قورئان و فەرموودەیان و ڕاڤەکرنێن وان)[١٧٦].کەواتە ڕاستە کو (ئەدەبێ عەرەبی وەکو هەمی ئەدەبیاتێن دی گرێدایە ب زمانیڤە، لێ ئەو تشتێ کو ئەدەبێ عەرەبی ژ ئەدەبێن دی جودا دکەت، ئەڤەیە کو زمانێ عەرەبی پەیوەستە ب قورئانێڤە، لەوما ڤەقەتیان د ناڤبەرا ڕەگەزێن نوی و یێن کەڤن د ئەدەبێ عەرەبیدا گەلەك ب زەحمەتە...)[١٧٧]، ب دەربڕینەکا دی پەیوەندییا د ناڤبەرا ئایین و شعر و زمانی هێزەکا مەزنە کو بەردەوام بەرێ ئەدەبێ عەرەبی ددەتە ڕابردوویێ و دبیتە ئاستەنگ د ڕێکا گوهرینێدا.

ڕەنگە کەڤنترین گروپ کو بووینە هۆکارێ بهێزخستنا پەیوەندییا د ناڤبەرا شعر و ڤەکولینێن زمانی ـ ئایینیدا، ڤەگێرکارێن شعرا عەرەبی (رواة الشعر) بن. ئەڤە ئەو کەس بوون کو خۆ ب شارەزا د شعرا جاهلی ددانە نیاسین و دگوتن کو ژمارەکا زۆر ژ شعرێن جاهلی ژبەر کرینە و دکارن کەرەستەیێ پێدڤی بۆ کارێ زمانڤانان دابین بکەن. ئەڤ ڕاویە ب خۆ بوونە فاکتەرەك بۆ بهێزکەفتنا لاساییکرنێ، چونکە وان ((شێوازێ شعرا جاهلی ب شێوازێ نموونەیی ل قەلەم ددا و داخواز ژ شاعرێن نوی دکرن کو هەمان شێوازێ شعرا جاهلی پێرەوبکەن و بۆ خوازە و خواستنان ڕێکا وان بکار بینن، ئەگەر ڤێ چەندێ نەکەن دێ ژ ستوونا شعرێ (عەموود الشعر) دەرکەڤن)).[١٧٨]

قەسیدەیا عەرەبی و ئەو ڕەخنە و ڤەکولینێن ئیسلامی- عەرەبییێن کو لدور ڤێ شعرێ سەرهلداینە، ڕۆلەکێ مەزن د ڕۆشنبیرییا ئەدەبییا مللەتێن ئیسلامیدا هەبووینە. ئەڤە لدەڤ مللەتێن موسلمانێن ڕۆژهەلاتێ وەکو بەشەك ژ کەلەپورێ ئایینی هاتینە تەماشەکرن و پاراستنا ئەدگار و بنەماییێن قەسیدەیا کەڤنا عەرەبی وەکو پاراستنا یاسا و بنەماییێن ئایینی هاتیە نیاسین. ڕەنگە داخباربوونا مللەتێن ئیسلامی ب شعرا کەڤنا عەرەبی ژبەر پەیوەستبوونا وێ ب ئیسلامەتییێڤە بیت، لێ گرنگیدانا عەرەبان ژ ڤێ چارچووڤەیێ دەردکەڤیت و هندەك پالدەرێن نەتەوەیی و کەڤنەشۆپی ل پشت گرنگیدانا عەرەبان ب ڤێ شعرێ دهێنە دیتن و دبنە ئەگەر کو قەسیدەیا عەرەبی ببیتە ماکا لاساییکرنا شعری ل

ڕۆژهەلاتا ئیسلامی. ب شێوەیەکێ گشتی بابەتێ لاساییکرنێ لدەڤ عەرەبان ژ هەمی مللەتێن دی کویرتر و بەرفرەهترە یانکو دشێین بێژین ((ئاریشا لاساییکرنێ دشعرا عەرەبیدا هەتا دەستپێکا سەدێ بیستێ ژی بەردەوام بوویە و ئەو کەسێ کو بۆ گوتنا شعرێ لاساییا شێواز و پەیڤ و واتاییێن شاعرێن بەرێ نەکربا ب شاعر نەدهاتە هژمارتن...))[179]

گرێدانا قەسیدەیا جاهلی ب ڤەکۆلینێن زمانی و ئایینی و شرۆڤەکرنا قورئانێ بۆ ئەگەر کو شعریەتا قەسیدەیێ بهێتە هناردەکرن بۆ مللەتێن دیێن ئیسلامی، چونکە خواندن و شرۆڤەکرن و ژبەرکرنا شعرا جاهلی ژی بوو بەشەک ژ کارێ زانایێن ئایینی و ب ڤی ڕەنگی قەسیدەیا عەرەبی جۆرە پیرۆزیەک بدەستڤەئینا و مللەتێن موسلمان ب ئاواییێن جۆراوجۆر کەفتنە ژێر کاریگەرییا شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی.

## ٢.٢.٢. ڕێکارێن ڕەخنەیا عەرەبی ـ ئیسلامی بۆ بهێزخستنا لاساییکرنا شعرا کەڤن:

ڕەخنەیا عەرەبی ـ ئیسلامی بۆ چەسپاندنا نموونەیا قەسیدەیا جاهلی و بەردەوامیدان ب لاساییکرنا وێ، ڕێکار و ئامرازێن جوداجودا بکارئینایینە. گرنگترین ئامراز و ڕێکار ژی هاندانا شاعران بۆ ژبەرکرنا شعرا شاعرێن بەرێ و بکارئینانا پیڤەرێ دەمی بۆ هەلسەنگاندنا شاعران و ڕەتکرنا نویکرنێ و ئازراندنا دزییا شعرینە:

### ١.٢.٢.٢. هاندانا شاعران بۆ ژبەرکرنا شعرا شاعرێن بەرێ:

هەر وەکو بەری نهو مە ئاماژەپێدای لاساییکرن د ئەدەبیاتا پرانیا مللەتاندا هەبوویە و مینا ئامرازەکێ پەروەردەیی هاتیە تەماشەکرن و گەلەک داکۆکی لسەر خواندنا نموونەییێن بەرێ و پێرەویکرن ژ شێوازێ وان هاتیەکرن، لێ ئەو تشتێ کو شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی ژ شعرا مللەتێن دی جودا دکەت، گرنگیدانا ژ

ڕادەبدەرە ب ژبەرکرنا شعریێە، ئەڤە ژی بەشەکە ژ سروشتێ زارەکییێ قەسیدەیا عەرەبی.

ئێکەمین قوناغا خویابوونا شعرا عەرەبی قوناغا ڤەگێرانا زارەکییە، واتە قوناغا ژبەرکرنا شعرا شاعرێن بەرێ. ئەوێن کو ب ڤی کاری ژی ڕادبوون دهێنە دابەشکرن بۆ سەر چەند دەستەیان. یا ئێکێ شاعرێن ڤەگێرکار، ڤێجا یێن کو شعرێن شاعرەکێ دیارکری ژبەر دکرن و دبوونە قوتابیێ وی و ئەو شاعرێن کو شعرا چەند شاعرێن بەری خۆ و یێن هەڤچەرخ ژبەردکرن و یا دوویێ زانایێن ڤەگێرکارن کو گرنگی ددانە شعر و شاعران، مەبەستا وان پاراستنا زمانێ عەرەبی بوویە کو ئەو ژی بسەر دوو نەوەیان دابەش دبن نەوەیێ ئێکێ و نەوەیێ دوویێ کو ئەو ژی د بنەرەتدا قوتابیێن نەوەیێ ئێکێنە[180]، واتە ژبەرکرن ئێک ژ بناغەیێن سەرەکییێن پاراستنا شعریەتا قەسیدەیا عەرەبی بوویە و پشتی خویابوونا قوناغا نڤیسینێ ژی شاعر و ڕەخنەگر نەشیاینە خۆ ژ ڤێ یەکێ ڕزگاربکەن.

سروشتیە کو (باوەری هەبوون ب ڕەوشەنبیرکرنا شاعری ب ڕێکا خواندنا بەرهەمێن شاعرێن بەرێ دبیتە ئەگەرێ جێگیربوونا واتایێن شعرێن بەرێ د مێشکێ شاعریدا و هندەك جاران بێ کو ئەو هەستێ پێ بکەت وان واتایان دووبارەدکەت، واتە وان دگوهڕیت و ب دارشتنەکا نوی وان پێشکێش دکەت. ب ڤی ڕەنگی بیردانک دبیتە ژێدەرێ داهێنانا شعری....)[181]، لێ د ئەدەبیاتا عەرەبیدا ئەڤ چەندە ژ سنوورێ خواندنێ دەرباز دبیت و دچیتە د چارچووڤێ ژبەرکرنێدا. کاریگەرییا ڤێ چەندێ لسەر شعرا عەرەبی هەتا وی ڕادەی بوویە کو ئێک ژ مەرجێن شاعربوونێ (ژبەرکرنا شعرێن شاعرێن بەرێ بوویە. فەر بوویە کو شاعرەکێ عەرەب ل دەستپێکێ گەلەك شعرێن شاعرێن بەرێ ژبەربکەت؛ داکو بابەتێن شعرێ و دەولەمەندییا وێ یا زمانی و پیڤانا وێ بزانیت. شاعر دێ ڤان زانینا بدەستڤە ئینیت نەمازە کو ل دەستپێکێ دێ بیتە ڤەگێرکارێ شاعرەکێ دی)[182]، یانکو بۆ ماوەیەکی کارێ وی دێ ژبەرکرن و ڤەگێرانا شعرێن شاعرێن دی بیت.

ئەڤ چەندە مینا بنەمایەکی د رەخنەیا ئەدەبییا عەرەبیدا جێگیر بوویە، هەتا وی ڕادەی کو ژ لایێ گەلەك ژ ڕەخنەگرێن مەزنڤە داکۆکی لسەر هاتیەکرن و ب دیتنا وان ئەگەر کەسەك ڤی مەرجی جێبەجێنەکەت نابیتە شاعر. (ئەصمەعی) کو ئەو بخۆ ب ڤەگێرکارەکێ ب ناڤودەنگە، ( هندەك مەرجان ژبۆ وان کەسان دەستنیشان دکەت کو دڤێن ببنە شاعرەکێ مەزن، ئێکەمین مەرجێ ژی ڤەگێرانا شعرا شاعرێن عەرەبە..)[١٨٣].رەخنەگر و ڤەکۆلەرەکێ وەکو (ابن ڕشیق) ژی وەکو پرانیا ڤەکۆلەرێن دی ئاماژەیێ ددەتە مەرجێن شاعربوونێ، (ئێکەمین خالا کو داکوکیێ لسەر دکەت ژبەرکرنا شعرا شاعرێن بەرێیە. ب دیتنا وی شاعرێن خودان تەبعێن بەرێ ل دەستپێکێ ب ڤەگێرانا شعرێ ڕابووینە و فێرخوازێن شاعرێن بەری خۆ بووینە و هەر ئێک ڤەگێرکارێ شاعرەکێ بەری خۆ بوویە، ب دیتنا وی ڤەگێرانێ پلە و پایەکا مەزن د ڕۆشنبیرییا عەرەباندا هەیە و ژێدەرێ سەرەکییێ ڕۆشنبیرییا شاعری هەر شعر ب خۆیە)[١٨٤]. (ابن خەلدون) ژی هەر لدویڤ شوپا (ابن ڕەشیق)ی چوویە و دایە دیارکرن کو (... ڤەهاندنا شعرێ و شارەزابوون د ڤی هونەریدا هندەك مەرج هەنە. ئێکەمین مەرج ژی ژبەرکرنا شعرا شاعرێن عەرەبە داکو ب ڕێکا ڤێ چەندێ شیان و بەرهەڤبوونەك د دەروونێ مرۆڤیدا چێبیت، واتە مینا وێ نموونەیا کو ل دەمێ ڤەهاندنێ، ڤەهینەر بەرێ خۆ ددەتە وێ و لدویف وێ دچیت...)[١٨٥]، کەواتە ژبەرکرن کو ئەدگارەکێ زارەکیبوونا شعرا جاهلی بوویە دبیتە مەرج و یاسایەکا شاعربوونێ. ئەڤ چەندە وەسا د شعر و رەخنەیا عەرەبیدا جێگیربوویە کو هندەك جاران ب تاکە بنەما و مەرج بۆ پیڤانا شاعران هاتیە نیاسین. نڤیسەر و ڕەخنەگرەکێ وەکو (قاضی جورجانی) داکوکیێ لسەر هندێ دکەت کو (( ئەو چ جیاوازیان نائێخیتە د ناڤبەرا شاعرێن کەڤن و یێن نوی یان یێن جاهلی و موخەزرەم[*] و یێن دی، لێ تشتێ کو ب دیتنا وی پێویستە، ئەوە کو شاعرێن نوی ب ڤەگێرانا شعرێن شاعرێن بەرێ ڕابن و گەلەك شعران ژبەر بکەن))[١٨٦]

ئەڤ مەرجێ ژبەرکرنا شعرا شاعرێن بەرێ و ب تایبەتی شاعرێن جاهلی ب تنێ د سنوورێ ئەدەبیاتا عەرەبیدا نەمایە بەلکو وەکو بەشەك ژ ڕۆشنبیرییا قەسیدەیا عەرەبی بۆ ئەدەبیاتا مللەتێن کو کەفتینە بن دەستەلاتا عەرەبان ژی هاتیە ڤەگۆهاستن. د ناڤ ئەدەبیاتا ڤان مللەتاندا ژی ژبەرکرنا شعرێن شاعرێن بەرێ وەکو مەرجەك هاتیە باسکرن، ب تایبەتی ئەدەبیاتا فارسی کو ب ئێک ژ مەزنترین ئەدەبیاتێن دەڤەرێ دهێتە نیاسین. بۆ نموونە (نیزامیێ عەروزی) د پەرتووکا خۆ ب ناڤێ (ضهار مقالة) کۆمەکا مەرج و تایبەتمەندیان بۆ شاعران دەستنیشان دکەت کو لایەنێ دەربڕین و پەیڤ و واتا و کەسایەتیێ ب خۆڤەدگرن، ئەو پشتی پێشاندانا ڤان تایبەتمەندیان ڤێ چەندێ ڕادگەهینیت کو (شاعر نەشێت بگەهیتە ڤان تایبەتمەندیان ب تنێ ل وی دەمی نەبیت کو ل ژیێ گەنجاتیێ بیست هزار دێران ژ شعرا شاعرێن بەرێ ژبەر بکەت، زێدەباری دەهـ هزار پەیڤان ژ بەرهەمێن شاعرێن پشتی وان و بەردەوام دیوانا ماموستایان بخوینیت و تشتان ژێ وەرگریت، داکو بزانیت دێ چەوا سەرەدەریێ لگەل زەحمەتیێن ئاخفتنێ و وردەکارییێن گوتنێ کەت و ب ڤی ڕەنگی دێ وێنەیێن شعرێ و ڕێکێن وێ د تەبعێ ویدا جێگیربن، بۆ وی دێ باشیێن شعرێ و کێماسیێن وێ دیار بن، ئاخفتنا وی دێ پێشکەڤیت و تەبعێ وی ژی دێ بلند بیت)[١٨٧]. ئەڤ کارتێکرنە هند ب هێزە کو گەلەك جاران ژبەرکرنا شعرا شاعرێن عەرەب بۆ وان گرنگتربوویە ژ شعرێن فارسی، ئەڤ چەندە د ئاخفتنا هندەك شاعر یان ڕەخنەگرێن ئەدەبیاتا فارسییا کەڤندا خویایە و چەندین نموونە بۆ ڤێ یەکێ هەنە، بۆ نموونە ( ڤەدگێرن کو (ابوبکر خوارزمی) ـ ئەدیب و زمانڤانێ سەدێ چوارێ ـ دڤێت سەرا (صاحب بن عباد)ی بدەت، لێ (صاحب بن عباد ) دبێژیت کو ب تنێ دێ وی شاعری بینیت کو بیست هزار دێر ژ شعرێن شاعرێن عەرەبان ژبەرکربیت. دەمێ دبێژنە (ابوبکر خوارزمی) کو مەرجێ (صاحب بن عبادی)ی چییە، ئەو د بەرسڤدا دبێژیت هەرن بێژنە وی بیست هزار دێر ژ شعرا زەلامێن عەرەبان یان ئافرەتێن عەرەبان....)[١٨٨]،

کەواتە ئێدی ژبەرکرنا شعرێن بەرێ ب تنێ مەرجەکێ شعرێ نەبوویە بەلکو جهێ شانازیپێکرنێ بوویە و ب ناسنامەیا شاعری هاتیە زانین.

رەنگە ژبەرکرنا شعرێن بەرێ وەکو دەستپێکەك بۆ ڤێ چەندێ کو کەسەك بچیتە د جیهانا شعرێدا ڕوویێ خۆ یێ پۆزەتیف هەبیت. یانکو دەولەمەند بوونا بیردانکێ ب ئەزموونێن بەرێ هاریکارەکا باش بیت بۆ شاعری. هەر وەکو هندەك ڤەکۆلەر و ڕەخنەگرێن عەرەبان د ڤێ باوەرییێدانە کو (بیردانک جهەکێ داگرتیە ژ بهاییێن کەلەپوری ژبلی ئەزموون و دیمەنێن جۆراوجۆر و دەربڕین و وێنەیان کو نرخ و بهایێ وان گرێدایە ب گەلەك ژبەرکرنا وان. ژبەرکرنا شعر و نامەیان ب ئێک ژ گرنگترین میراتێن شاعری دهێنە ل قەلەمدان. ب ڤی ئاوایی شاعر د دەروونێ خۆ دا دبنە خودانێ تشتەکی کو دکارن ل دویف وێ شعرا خۆ بڤەهینن، دێ شارەزاییێ لسەر زمان و ئیعرابێ و داب و نەریتێن عەربان بدەستڤە ئینن و دێ زانن کو عەرەبان چەوا شعر ڤەهاندیە یانکو دێ وان نەریتێن ئەدەبی زانن کو بێ وان نەشێن وەکو شاعرێن بەرێ بن یانکو پەیوەندییێ ب وان بکەن. )[189] لێ لگەل هندێ ژی ڕوویێ نێگەتیڤێ ڤێ ژبەرکرنێ ئەڤەیە کو فاکتەرەکێ هاریکارە بۆ لاساییکرنا شاعرێن بەرێ و دووبارەکرنا شێواز و وێنەیێن شعرییێن وان شاعران. گەلەك ژ شاعران هەست ب ڤێ مەترسییا ژبەرکرنێ کرینە، هندەك ژ وان هەر ئەون یێن کو داخوازا ژبەرکرنا شعرێن شاعرێن بەرێ کرینە، داخوازا ژبەرکرنا شعرا شاعرێن بەرێ ژ شاعری هاتیە کرن و پشتی کو شاعری ژمارەیەکا زۆر ژ شعرێن شاعرێن بەرێ ژبەرکرینە، داخازا ژبیرکرنا وان شعرا ژ شاعری هاتیە کرن، چونکە مەترسییا دووبارەبوونا دێرێن شاعرێن بەرێ د شعرێن شاعرێن نویدا هەبوویە[190].

ڕەخنەگر و شاعر ژ لایەکیڤە بۆ پاراستنا نەریتێن قەسیدەیا عەرەبی گرنگییێ ددەنە ژبەرکرنا شعرێن بەرێ و ژ لایەکێ دیڤە هەستێ ب ڤێ چەندێ دکەن کو ئەڤ ژبەرکرنە دبیتە بناغەیەك بۆ لاساییکرنەکا دەقاودەق و دزییا ئەدەبی، لەوما هندەك ژ وان د ڤێ باوەرییێدابووینە کو ( ئێک ژ مەرجێن دیێن

شاعربوونێ ژبیرکرنا وان شعرێن ژبەرکریە، داکو وێنەیێ وان پەیڤان د مێشکێ شاعریدا نەمینیت، چونکە هەتا وی دەمێ کو هێمایێن ژبەرکری د مێشکی ویدا هەبن ئەو دێ هەر وان هێمایان دووبارەدکەتەڤە و نەشێت چ داهێنانان بکەت، ئەڤ هێمایە دبنە ئاستەنگەك د ڕێکا هزرکرنێدا. دەمێ شاعر وان شعران ژبیر بکەت، شێوازێ شعرێ دێ د مێشکێ ویدا جێگیر بیت و بیتە نموونە و سەرمەشقێ کارکرنێ، ئەو دێ نەچاربیت هندەك پەیڤێن دی بکاربینیت و دێ ب وی شێوازی شعرێ نڤیسیت...)[191]، ئەڤ چەندە وەکو هاوکێشەیەکێ لدەڤ (ابن رشیق)ی خۆیا دبیت، ئەو دبێژیت (( شعر دکەڤیتە بەر گوهێ شاعری و د سەرێ ویدا دهێت و دچیت و پشتی دەربازبوونا دەمەکێ زۆر ئەو تشتێ بەرێ های لێ بووی دێ ل بیرا وی چیت))[192]. (ابن طباطبا) ژی داکوکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت، ب دیتنا وی ئەڤ چەندە بۆ بوارێن دی ژی سوودبەخشە. ئەو بەحسێ کەسەکی دکەت کو هزار گوتار ژبەرکرن و پاشی ژ بیرا خۆ برن و پشتی ئەنجامدانا ڤی کاری ئەو د هەمی بوارێن دەربڕینێدا ڕەوان بوو و ب چ ڕەنگان بۆ دەربڕینێ توشی گرفت و ئاستەنگان نەدبوو[193].

دەمێ ئەم بەرێ خۆ دەینە شعرا عەرەبی و فارسی ئەڤ چەندە بۆ مە خۆیا دبیت کو ئەڤ نەریتێ ژبەرکرنێ گەلەك بسەر شعرێدا زالبوویە و گەلەك جاران وەکو تاکە ڕێکا شاعر بوونێ هاتیە نیاسین. تەنانەت ژ سنوورێ ژبەرکرنا شعران دەربازبوویە و گەهشتییە ژبەرکرنا پەیڤ و دەربڕین و وێنەیێن ڕەوانبێژی و تەنانەت پەیڤێن سەروایێ ژی. ئەڤ گرنگیدانا زۆر ب ژبەرکرنێ گەلەك جاران دبیتە ئەگەر کو شعرا ڤان مللەتان زێدەتر شعرەکا بیردانکی بیت، یانکو وێنە و ئەزموونێن شعرییێن بەرێ، چ ب ڤیانا وان ب خۆ بیت یان بێ کو ئەو هەستێ پێ بکەن ب ئاوایەکێ بهێز و بەرفرەه بهێنە ڤەگۆهاستن بۆ ناڤ شعرێن واندا.

## ٢.٢.٢.٢. بكارهينانا پيڤەرێ دەمی بۆ هەلسەنگاندنا شاعران:

گرنگيدانا عەرەبان ب بهايێن بيابانشينيێ و پيرۆززاگرتنا ئەدگارێن قەسيدەيا جاهلی، بوويە ئەگەر كو چەند شعر نويتر بيت ب چاڤەكێ نزمتر بهێتە تەماشاكرن، واتە ( دەم وەكو پيڤەرەكێ ڕەخنەيی هاتيە بكارهينان، هندی تشتەك كەڤنتر بيت ڕەسەنتر وباشترە و هندی تشتەك ژ لايێ دەميڤە نويتر بيت و نێزيكتر بيت بۆ سەردەمێ نوی، لاوازترە. )[١٩٤]

هەرچەندە لسەردەمێ عەباسيان هندەك ڕەخنەگرێن وەكو (ابن قتيبە)ی هەولدانە رەوابوونێ بدەنە شعرا نوی و وێ ژی بيننە ڕێزا شعرا كەڤن[١٩٥]، واتە پێكۆلكرينە جياوازيێ نەئێخنە د ناڤبەرا شاعرێن كەڤن و نويدا و وەها داينە خوياكرن كو كەڤناتی نابيتە بەلگە بۆ هندێ كو شاعرەك باشتر بيت ژ شاعرەكێ دی[١٩٦]، لێ ب ڕاستی ئەڤ هەولە نەبووينە ئەگەرێ لاوازبوونا پيڤەرێ دەمی، چونكە هەر لدەڤ ڤان ڕەخنەگران ژی تەنها ڕێكا سەركەفتنا شاعرێن نوی لاساييكرن و پێرەويكرنا شاعرێن جاهليە. بۆ نموونە مەبەستا (ابن قتيبە)ی دەستبەردان ژ ڕابردوويێ و دانانا ڕێبازەكا نوی نينە، بەلكو وی دڤێت شاعرێ نوی ژی هەر وەكو شاعرێ كەڤن بيت و ڕێبازا وی بەرنەدەت. ئەو ب ئاشكرايی دبێژيت (چێنابيت شاعرێن نوی ژ ڕێكا شاعرێن بەرێ دەركەڤن، واتە ل هەمبەر خانيێن ئاڤا ڕاوەستن و بكەنەگری، چونكە يێن بەرێ ل هەمبەر وێرانە و كاڤلان ڕاوەستياينە و كرينەگری. چێنابيت ئەو دەوارێ كو شاعر سويار دبيت و وەسفا وی دكەت هێستر يان كەر بيت، چونكە يێن بەرێ سويار حێشترێ بووينە و وەسفا وێ كرينە... ڕەوا نينە كو بۆ گەهشتن ب كەسێ ستايشكری شاعر ژ دەشت و گولزارێن نێرگز و ياسەمين و گولێن سۆر دەرباز ببيت، چونكە يێن بەرێ ژ بيابانێن پڕ بەر و ئستری دەربازبووينە).[١٩٧]

وەسا ديارە كو شاعر و ڤەكۆلەرێن شارستانيەتا ئيسلامی هندی شياينە پيڤەرێ دەمی بكارئينانينە، شاعرێن كەڤن ب باشتر ژ شاعرێن نوی زانينە، لێ دەمێ

نویکرن د شعرێدا پەیدا بووی و سەرنجا خەلکی ڕاکێشای هەلویستەکێ دی د ڕەخنە و ئەدەبیاتا ئیسلامی- عەرەبیدا خۆیا دبیت؛ ڕابردووپەرستی و حەزا پاراستنا ڕێبازا قەسیدەیا جاهلی دگەهیتە (وی ڕادەی کو گەلەك جاران د ژێدەرێن ڕەخنەیدا باسێ ب دویماهیک هاتنا سەردەمێ شعرێ هاتیە کرن. هەر ئێکی لدویڤ بیروبۆچوون و تێگەهشتنا خۆ بۆ شعرێ شاعرەك وەکو داوی شاعر دەستنیشانکریە، واتە شاعرێن پشتی وی ب شاعر ناهێنە هژمارتن.[198] ئێدی ئەڤ نەریتە بەردەوام بوویە و تەنها لسەر پیرەویکرن و لاساییکرنا نموونەیێن بەرێ بڕیار لسەر شاعر بوون و شاعرنەبوونێ هاتیە دان، هەر وەکو (ابن خلدون ئاماژەیێ ددەتە ڤێ چەندێ کو گەلەك ژ کەسێن خودان ئەزموون د شعرا عەرەبیدا دبێژن کو هۆنراوەیێن (متنبي) و (موعری) شعر نینن، چونکە ئەو لدویف شێوازێ شعرا عەرەبی نەچووینە).[199]

### ٢.٢.٢.٣. دژایەتیکرنا گۆهرین و نویکرنا شعرێ:

پیرۆزراگرتنا شێوازێ قەسیدەیا کەڤن و هەولدان بۆ پاراستنا کەلەپوری، بناغەیێ پەیدابوونا پرانیا وان ڤەکۆلینانە کو پشتی سەرهلدانا ئیسلامەتیێ لدور شعرێ هاتینە کرن، ترسا گۆهڕین و نویکرنێ بسەر پرانیا وان دا زالە یانکو نێگەتیڤبوونا چەمکێ گۆهڕین و وەرارێ ئێکە ژ سیماییێن ڤان ڤەکۆلینان. ( یێ باش تەماشەی هەلویستێن ڕەخنەیی د مێژوویا ڕەخنەیا عەرەبیدا بکەت، دێ زانیت کو هەستکرن ب وەرار و گۆهرینێ فاکتەرەکێ ڤەشارتی بوویە ل پشت گرنگیدانا وان ب ڕەخنەیێ، ئەڤە ژ (ابن قتیبة و ابن طباطبا و قدامة و آمدی و ابن رشیق و عبدالقاهر جرجانی و قرطاجنی و ابن الاثیر)ی ژی دگریت. ئەڤە هەمی هەست ب هندێ دکەن کو شعر یا کەفتیە د قەیرانێدا و چارەسەریان بۆ قەیرانا شعرێ پێشکێش دکەن. وان هەست ب ڤێ چەندێ کریە کو نەریت و نموونەیێن بەرزێن عەرەبی کو شعرا کەڤن لسەر هاتبوونە ئاڤاکرن هاتینە گوهڕین...)[200]، واتە ئامانجا وان ڕزگارکرنا شعرێیە ژ قەیرانا نویکرن و گۆهرینێ، ڤێجا چ

پالدەرێن وان ئایینی یان نەتەوەیی بن. ب ڤی رەنگی پشتراستبوونەکا مەزن سەبارەت ب چەسپاوبوونا بنەماییێن شعرا کەڤن لدەڤ شاعر و ڕەخنەگرێن عەرەبی - ئیسلامی پەیدا بوویە، بۆ نموونە رەخنەگرەکێ وەکو ( قدامە بن جعفر) د ڤێ باوەرییێدا بوویە کو (بنەماییێن شعرا کەڤن چەسپاون چەند سەردەم و ژینگەهـ بهێنە گۆهرین ئەو ناهێنە گۆهرین...، ئەو شعرێ ب پرەنسیپێ ڕاوەستیانێڤە گرێدایە، نە پرەنسیپێ گۆهرینێ...وی نێرینەکا بەرتەنگ ل بەرامبەر شعرا نوی هەبوویە و ڤیایە ڤێ چەندێ بسەلمینیت کو ئەو گۆهرینا د شعرا نویدا چێبوویە، ب تنێ تشتەکێ لاوەکی و سەرڤەسەرڤەیە و ئەرکێ شاعری دانانا پیڤەرێن چەسپاو و گشتیە بۆ شعرێ).[٢٠١]

ب شێوەیەکێ گشتی باوەری هەبوون ب ڤێ چەندێ کو شاعرێن بەرێ باشتر بووینە و چەند شاعر کەڤنتر بیت باشتر و ڕەسەنترە و گۆهرین و وەرار دبیتە ئەگەرێ گەندەلبوونا شعرێ، بۆ ماوەیەکێ درێژ د ئەدەب و کلتۆرێ مللەتێن ئیسلامییێن ڕۆژهەلاتێدا باو بوویە و کاریگەرییێن وێ هەتا ڤی سەردەمی ژی بەردەوامن. هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەرێ سنووردارکرنا چەمکێ شعرێ د چارچووڤێ ئەدگار و تایبەتمەندییێن قەسیدەیا جاهلیدا.

رەنگە هەر باوەری هەبوون ب ڕەهابوونا تایبەتمەندییێن قەسیدەیا جاهلی ئەگەرەك بیت بۆ بکارئینانا واتایا پەیڤا (اسلوب)ا عەرەبی ب واتایا لاساییکرنا تایبەتمەندییێن قەسیدەیا عەرەبییا کەڤن. ئەو تشتێ کو ل ژێر سیبەرا پەیڤا (اسلوب) هاتیە باسکرن تشتەك نینە ژبلی لاساییکرن یان پشتبەستن ب شێوازێ قەسیدەیا جاهلی، چونکە ( پەیڤا ئوسلوبا عەرەبی کو نهو ل هەمبەر شێوازی دهێتە بکارهینان ل سەردەمێن کەڤندا زێدەتر ب واتا هونەر هاتیە بکارهینان. بۆ نموونە (اسلوب) لدەڤ ڕەخنەگرەکێ وەکو (ابن قتیبە)ی ڕێکا ڤەهاندنا شعرێیە لدەڤ عەرەبان...)[٢٠٢]. ب دیتنا(ابن خلدون)ی ژی (اسلوب) وەکو (داریەستا ڕستن و چنینا مافوورانە، یان مینا قالبەکییە کو ئاخفتن تێدا دهێتە دارشتن، ئەگەر ئەم باش بەرێخۆبدەینە ئاخفتنێن وی دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو مەبەستا وی پتر هەمان

رێبازا ڤەهاندنا شعرێیە لدەڤ عەرەبان چونکە داکۆکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو تەنها رێکا بدەستڤەهینانا ڤی قالبی یانکو بدەستڤەهینانا ئوسلووبی ژبەرکرنا شعرێن عەرەبانە...)[٢٠٣].

### ٢.٢.٢.٤. ئازراندنا بابەتێ دزییا شعری:

بابەتێ دزیێ ئێک ژ بەرفرەهترین بابەتێن رەخنەیا ئیسلامی ـ عەرەبییا کەڤنە کو رۆخسار و ناڤەرۆکا شعرێ ب خۆڤە دگریت. مێژوویا دزییا شعرێ بۆ دەستپێکا شعرا عەرەبی ڤەدگەریت. تاوانا دزیێ تشتەکە کو تەنانەت خۆ شاعرێن جاهلی ژی ژێ رزگار نەبووینە و وەکهەڤییا پاژەیی یان وەکهەڤییا تەواو د ناڤبەرا دێرێن شعرییێن شاعرێن ڤی سەردەمی ژی بوینە جهێ بایەخپێدانا رەخنەگران.[٢٠٤]ستوونێ ڤەکۆلینا شعرێ بابەتێ دزیێ بوویە. تەنانەت بەری سەرهلدانا ئەو بزاڤا رەخنەیا کو لدور شعرا (ئەبی تەمام) و شاعرێن نوییێن دی سەرهلدای، چەندین پەرتووك د ڤی بواریدا هاتینە نڤیسین.[٢٠٥] سەرەرای کەڤن بوونا ڤێ دیاردەیێ د شعر و رەخنەیا عەرەبیدا لێ ئازراندنا ڤی زاراڤی و بکارهینانا وێ یا بەرفرەه بۆ سەردەمێ عەباسیان ڤەدگەریت، چونکە (بابەتێ دزیێ یانکو ئەو ڤەکۆلینێن کو ب (سرقات) دهێنە نیاسین لگەل خویابوونا شعرێن (ئەبی تەمام) و (موتەنەبی) و رێچکا وان یا نویخواز ب دروستی سەرهلدداینە، ئامانجا پرانیا وان ژی بریندارکرنا هەستێ شاعران بوویە و پرانیا پەرتووکێن کو د ڤی بواریدا هاتینە دانان چ جیاوازی نەئێخستینە د ناڤبەرا دزی و حالەتێن دیێن وەرگرتنێ)[٢٠٦]. دزییا شعری ب تنێ ئامرازەك بوویە بۆ سەلماندنا ڤێ چەندێ کو شاعرێن نوی نەشیاینە تشتەکی لسەر شعرا شاعرێن بەرێ زێدەبکەن و شعرا وان ب تنێ بریتیە ژ دووبارەکرنا واتایێن بەرێ، هەر ژبەرهندێ هەبوونا هەر جۆرە پەیوەندی و وەکهەڤیەکێ د ناڤبەرا شعرا کەڤن و نویدا ب دزی هاتیە نیاسین.

پرانیا جاران دزییا شعری د ڤەکۆلینێن شعرییێن عەرەبی- ئیسلامییێن کەڤندا هەمی وەکهەڤی و نێزیکییا ناڤەرۆکی یان رۆخسارییا د ناڤبەرا دوو

شعراندا ب خۆڤه دگریت، بۆ نموونه د پێناسەیا دزییێدا هاتیه گوتن كو دزی بریتیه ژ ڤێ چەندێ كو ((شاعر شعرا شاعرەكێ دی وەربگریت یا بەشەك ژ شعرا وی تالان بكەت))[٢٠٧]. چەمكێ دزیێ ڕۆژب ڕۆژ بەرفرەهتر بوویە هەتا وی ڕادە كو ( ژ سەدێ چوارێ كۆچیڤە ڕەخنەگرێن عەرەب باسێ جۆرەكێ دیێ دزیێ كرینە كو ئەو ژی دزییا هونەرێن جوانكارییێیە وەكو دزییا دژیەك و ڕەگەزدۆزی و توانج پۆشی...هتد).[٢٠٨] لگەل دەربازبوونا دەمی بیر و بۆچوونێن جودا سەبارەت زاراڤێ دزیێ خویابووینە و هندەك زاراڤێن دی ل جهێ ڤی زاراڤی یان وەكو جۆرێن دزیێ هاتینە بكارهینان، لێ پرانیا وان هەر ل ژێر سیبەرا چەمكێ دزییا شعرییا عەرەبی هاتینە پێشكێشكرن.

زانایێن ڕەوانبێژییێ ژی زاراڤێ دزیێ پاراستینە و ل داوییا باسكرنا هەر سێ بەشێن ڕەوانبێژییێ وەكو هونەرەكێ ڕەوانبێژییێ باسێ دزیێ كرینە، یانكو ئێدی دزی ژی بوویە هونەرەك ژ هونەرێن ڕەوانبێژییێ و كۆمەكا زاراڤان بۆ هاتینە بكارهینان وەك (حسن الاخذ، التضمين، اقتباس، السرقة الظاهرة، توارد الخواطر، الكسوة، النسخ، الاخذ الفنى، الاخفاء، النقل، السلخ، نظم النثر، حل المعقود)[٢٠٩]. پرانیا ئەو حالەتێن كو هەتا نهۆ ژی د ڕەوانبێژییێدا سەبارەت ب پەیوەندییا د ناڤبەرا شعراندا دهێنە باسكرن، بەرهەمێ وەرارا چەمكێ دزییا شعرینە.

زالبوونا چەمكێ دزیێ بۆ ماوەیەكێ دویر و درێژ ل سەر ڤەكۆلینا شعرێ، بوویە ئەگەر كو گەلەك ڤەكۆلەرێن ڤی سەردەمی ب چاڤێ دزیێ بەرێخۆ بدەنە پرانیا پەیوەندییێن هەڤتێكستییێ، ئەو گەلەك جاران نەشیاینە جیاوازیێ بێخنە د ناڤبەرا هەڤتێكستی و دزییا شعریدا.[٢١٠] دیارە ئەڤە نە بتنێ ئاریشەیا ڤەكۆلەرێن عەرەبە بەلكو ئەگەر تەماشای مللەتێن دیێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامی ژی بكەن؛ دێ هەستێ ب هندێ كەین كو پرانیا جاران تێگەهشتنا وان بۆ مێژوویا ئەدەبێ و ئەدەبێ بەراورد و هەڤتێكستی و كاریگەرییا ئەدەبی ژ سنوورێ دزییا شعرییا بەرێ دەرباز نابیت، ئەو ب تنێ مژیلی ڤەدیتنا دوو دێرێن وەكهەڤ یان نێزیك ژهەڤن د

ناڤبەرا دوو شاعراندانە، دا کو ڤێ ڕاستییێ بسەلمینن کو شاعرێ ژمارە دوو مفا ژ شاعرێ ژمارە ئێک وەرگرتیە.

دیارە کو ل ژێر کاریگەرییا شعرا عەرەبی و ڤەکۆلینێن کو ل دور ڤێ شعرێ هاتینە کرن شاعر و ڕەخنەگرێن فارس ژی ب هەمان شێوە گرنگیدایینە دزیيا شعری، بۆ نموونە ( شمس قیس رازی) ل داوییا پەرتووکا خۆ گرنگیدایە بابەتێ دزیێ و باسێ چوارجۆرێن وێ واتە (انتحال، سلخ، الماِم، نقل) کریە و ب نموونەڤە ئەڤ حالەتە داینە دیارکرن[٢١١]. ب ڤی ڕەنگی چەمکێ دزیيا شعری ژ سنوورێ ڤەکۆلینێن گرێدای ب قەسیدەیا عەرەبی دەربازبوویە و کاریگەریکریە سەر شعر و ڕەخنەیا پرانیا ملەتێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامی.

پشتی وەرارا بابەتێ دزیيا شعری و جێگیربوونا وێ وەکو چەکەك ل دژی شاعرێن نوی؛ هەڤدژییەکا مەزن د ڤەکۆلین و ڕەخنەیا ئیسلامی- عەرەبیدا خۆیادبیت. ( ژ لایەکیڤە ڕەخنەگر شاعران هاندەدن بۆ لاساییکرنا شعرا جاهلی و ژ لایەکێ دیڤە دەمێ شاعر ب لاساییکرنێ ڕادبن هەر جارەکا دی ڕەخنەگر وان ب لاساییکرنێ تاوانباردکەن. ئەڤە ژبلی ڕەتکرنا شعرا نوی و ئامادەنەبوون بۆ گوهداریکرنا وێ.)[٢١٢]، کەواتە باسێ نموونەیی بوونا شعرا کەڤن دهێتەکرن و شاعر دهێنەهاندان بۆ لاساییکرنا وێ و د هەمان دەمدا بۆ شکاندن و کێمکرنا شاعرێن نوی باسێ دزیێن شعری دهێتەکرن؛ داکو ئەڤ ڕاستیە بهێتە سەلماندن کو شاعری چ تشتەکێ نوی نەگوتیە. ئەڤە ب خۆ دبیتە ئەگەر کو د ڕەخنەیا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا سەبارەت ب لاساییکرنا شاعر و بەرهەمێن بەرێ چ هەلویستەکێ چەسپاو نەهێتە دیتن و دویڤچوون لدویف هەلویستێن ڤەکۆلەرێن ئیسلامی بۆ دانانا تیۆرەکێ سەبارەت ب لاساییکرنێ کارەکێ هەروە و بێ سوود بیت. داخازا شاعران دهێتەکرن کو لاساییا شاعرێن بەرێ بکەن و ب درێژی باسێ شێواز و ڕێبازا وان دهێتەکرن داکو شاعرێن نوی بشێن لدویف شوپا وان بچن، پاشی هەر ئەو ب خۆ دهێن و شاعرێن نوی ب لاسایکەر و دز ل قەلەم ددەن و بەشەکێ بەرفرەه ژ ڤەکۆلینێن خۆ بۆ دزیێن شاعران تەرخان دکەن. وەسا دیارە

كو مەبەستا وان ژ ڤێ چەندێ ب تنێ شكۆبەخشین ب ڕابردوویێ و تەپەسەركرنا نویكرنێ بوویە.

چەسپاندنا هزرا نموونەیی بوونا شعرا جاهلی و گرنگیدانەكا زێدە ب بابەتێن دزیێن ئەدەبی بوویە ئەگەر كو تێگەهشتنەكا نێگەتیڤ ل دەڤ شاعران پەیدا ببیت و شعریەتا كلاسیكی بكەڤیتە ڕێرەوەكێ تایبەتیدا.شاعری باوەری ب شیانێن خۆ نامینیت و دگەهیتە ڤێ قەناعەتێ كو ئەو ب تنێ دشێت واتاییێن بەرێ ب ڕەنگەكێ نوی پێشكێش بكەت. ( گەلەك جاران ڕەخنەگرێن عەرەب داكۆكی لسەر ڤێ چەندێ كرینە كو شاعرێن بەرێ هەمی واتا ئازراندینە و چ واتایەك نەمایە كو وان باس نەكریە، لەوما یێن پشتی وان نەچارن كو وان واتایان دووبارەبكەن، د ئەنجامدا گەلەك جاران شاعرەك هزردكەت كو واتایەكا نوی د شعرا خۆ دا باسكریە، لێ دەمێ تەماشەی دیوانێن بەرێ دكەین دبینین كو ئەو واتایەكا دووبارەكریە)[٢١٣].چێدبیت هەر ئەڤە ب خۆ هێڤێنێ بەلاڤبوونا دیاردا دزییا شعری بیت، چونكە ( دەمێ لایەنێ هزری لاواز دبیت و هزر توشی ڕاوەستیانێ دبیت، دزی بهێزتر لێ دهێت. دزی و تالانكرنا شعرێن بەرێ زێدەتر بەرهەمێ هەژارییا هزرینە. شاعر ب وەرگرتن و ڕەنگڤەدان و ڤەگوهاستنا واتایا شعرێن بەرێ ڕادبن و هەر وان واتایان ژ مەبەستەكا شعرێ دبەنە مەبەستەكا دی و ب تنێ وان ب هندەك هونەرێن جوانكارییێ دخەملینن؛ ئەڤە ژی نیشانا نەبوونا داهێنانێیە.)[٢١٤]. ل ژێر سیبەرا ڤێ تێگەهشتنێ شعر و رەخنەیا ئەدەبی د بازنەكا دیاركریدا هاتیە سنووردارکرن، واتە ( پێرەویكرن دبیتە نەریتەكێ پەسەند لدەڤ ڕەخنەگران و تەنها تشتێ گرنگ لدەڤ وان باشبوونا ڤێ پێرەویكرنێیە، واتە ئەو خوازیارن كو شاعر واتایەكا كەڤن بینیت و هندەك گوهڕینێن سەرڤەسەرڤە تێدا بكەت، یان ب كورتكرنەكا وێ واتایا كەڤن ڕابیت یان تشتەكێ جوان لسەر زێدە بكەت... )[٢١٥]، واتە وان دڤێت شعر نە ببیتە لادان و ژ ڕێدەرچوون ژ ڕێبازا شاعرێن بەرێ و نە ببیتە دزی.

## ٢. ٢. ٣. دانانا مەرج و زاراڤان د بەرژەوەندییا بەردەوامبوونا ئەدگارێن وێنەییێن قەسیدەیا عەرەبیدا:

رەخنەیا عەرەبی ـ ئیسلامی بۆ بەردەوامیدان ب لاساییكرنا نموونەیا قەسیدەیا جاهلی و سنووردارکرنا لاساییکرنێ د ڤێ بازنەییێدا هەولدایە مەرج و زاراڤ و تیۆرێن گرێدای ب شعرێڤە ب رەنگەكێ وەسا دانیت كو د خزمەتا قەسیدەیا جاهلیدا بن. دەمێ ڤان رەخنەگران باسێ شعرێ یان تایبەتمەندییێن وێ كریە، ئامانجا وان بەری هەر تشتەكی پاراستنا ئەدگارێن شعرا كەڤن و پاراستنا شعرێ ل هەمبەر هەوا گوهرین و نویكرنێ بوویە. پرانیا ڤان مەرج و زاراڤ و تیۆران بۆ رەخنە و شعرا فارسی و مللەتێن دیێن رۆژهەلاتا ئیسلامی هاتینە ڤەگوهاستن و بووینە بەشەك ژ تایبەتمەندییێن شعرا وان، هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەرێ بهێزتربوونا رێرەوێ لاساییكرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی كو دشێین وێ ب رێرەوێ لاساییكرنا شعریەتا قەسیدەیێ بدەینە نیاسین.

ئەم دشێین رەخنە و ڤەكۆلینێن شعرییێن عەرەبی ـ ئیسلامی لسەر دوو ئاراستەییێن سەرەكی، واتە ئاراستەیا عەرەبی ـ بەدەوی و ئاراستەیا لۆژیكی و فەلسەفی دابەش بكەین. هەر ئێك ژ ڤان ئاراستەیان ب رێكا پێشكێشكرنا تیۆرێن تایبەت و دانانا مەرج و زاراڤان بەشداری د پاراستن و بەردەوامیدان ب ئەدگارێن قەسیدەیا عەرەبی كرییە، لێ ئەو تشتێ كو ل ڤێرێ جهێ گرنگیپێدانا مەیە، ئەو تیۆر و زاراڤ و مەرجن كو زەمینەیەكێ گونجاو سازدكەن بۆ بەردەوامیدان ب لاساییكرنا ئەدگارێن وێنەییێن شعرا كەڤن ب تایبەت ئەدگارێن قەسیدەیێ:

### ٢. ٢. ٣. ١. رۆلێ ئاراستەیا عەرەبی ـ بەدەوی:

رەخنەیا عەرەبی بۆ پاراستنا زمانێ عەرەبی و سنووردارکرنا كاریگەرییا زمانێ نەتەوەیێن دی لسەر زمانێ عەرەبی و ب تایبەت كاریگەرییا فارسان سەرهلدایە[٢١٦]، هەر لسەر ڤی بناغەی ئەڤ رەخنەیە شعرا عەرەبییا جاهلییا بەری

ئیسلامیێ کو ب دیتنا عەرەبان ب چ رەنگان ساختە نینە و خودان زمان و ڕیتمەکا ڕەسەنە، کریە پیڤەر بۆ ڤەکۆلینێن خۆ[٢١٧]. ئەڤ جۆرە ڤەکۆلینە پتر زمانینە و ب چ ڕەنگان ئامانجا وان خزمەتکرنا چێژا ئەدەبی نینە. ئەو شعریێ وەکو ئامرازەکی بۆ پاراستنا ڕەسەنایەتیا زمانێ عەرەبی و شرۆڤەکرنا تێکستێن ئایینی بکاردهینن. (شوقی ضیف) سەبارەت ب ڤێ چەندێ دبێژیت: (دەمارگیرییا زانایێن زمانی دەرئەنجامیێ ئەرکێ وان بوویە، وان خۆ ب پاریزەرێ زمانی و زێرەڤانێ کەلەپورێ زمانی دزانی، و دواریێ شعریێ تەنها تشتێ گرنگ بۆ وان نموونە و بەلگەیێن پێدڤی بۆ کاریێ وان بوو. هەر ئەڤ گرنگیدانا وان ب نموونە و بەلگەیان بوو ئەگەر کو بایەخێ بدەنە بابەتێن پاژەیی و گەلەك جاران لسەر بناغەیێ ڤێ گرنگیدانا پاژەیی بڕیاریێ لسەر باشتربوونا شاعرەکی بدەن...)[٢١٨].

هەولا پاراستنا ڕەسەنایەتییا زمانی و باوەری هەبوون ب نموونەیی بوونا شعرا جاهلی کە بەرئەنجامێن ڤەکۆلینێن زمانی بوون؛ بوونە ئەگەر کو زانایێن موسلمان هەلویست ل بەرامبەر هەر جۆرە نویکرنەکێ هەبیت، هەر ئەڤە ژی بوو بناغەیێ سەرهلدان و گەشەکرنا ڕەخنە و ڤەکۆلینێن شعری، واتە ئەگەر باش بەرێ خۆبدەینە مێژوویا رەخنەیێ د شارستانیەتا ئیسلامیدا دێ گەهینە ڤێ راستیێ کو وەرار و گەشەکرنا ڕاستەقینەیا ڤان ڤەکۆلینان هەڤدەمە لگەل سەرهلدانا نویکرنێ د شعرا عەرەبیدا. ( گرنگترین ئاریشە و گەنگەشەیێن ڕەخنەیی ل دور شعریێ ل سەردەمێ شاعریێ عەرەب واتە (ئەبی تەمام)ی سەرهلداینە، چونکە وی شێوازەکێ نوی بکارئینایە و ب تەمامەتی پێرەوییا نموونەیا جاهلییا شعریێ نەکریە، ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو ب بەردەوامی بەراورد د ناڤبەرا شعرێن وی و یێن پێرەوییا شعرا جاهلی دکرن بهێتەکرن؛ داکو شعربوونا بەرهەمێن وی بکەڤیتە بەر گومانێ. هەر ئەڤ ڤەکۆلینە و ئەو بەلگەیێن ل دژی (ئەبی تەمام)ی هاتینە بکارهینان ل داوییێ ژ لایێ کەسەکی ب ناڤێ (مەرزوقی)ڤە لژێر ناڤونیشانێ (عمودالشعر) هاتنە کۆمکرن، پاشی هەر ئەڤ عەموودا شعریێ وەکو چەکەکێ ل دژی شاعرێن دیێن نویخواز وەکو (موتەنەبی) هاتە بکارهینان)[٢١٩].

بەرزبوون و ساخلەمییا واتایێ و جەزالەتا پەیڤان و ئیستیقامەتا وان، دروستبوونا وەسفان و نێزیکی د لێکچواندنێدا، لێکدایی بوونا بەشێن رێکخستنێ و رێزکرنا وان لدویف کێشێن چێژبەخش، گونجاو بوونا بۆخواستی لگەل ژێخواستی، پەیوەستبوونا لەفز و واتایێ و پێویستبوونا زێدەیا وێ د سەرواییێدا))، حەفت دەروازەیێن ستوونا شعرێنە، هەر ئێک ژ ڤان دەروازەیان ژی پیڤەرێن خۆ هەنە. ئەڤە بنەماییێن شعریەتا عەرەبی بوون و یێ ژ ڤان بنەمایان لادابا دا؛ ب دەرچوو ژ رێبازا عەرەبان دهاتە نیاسین...)[٢٢٠]، کەواتە ستوونا شعرێ و دەروازە و پیڤەرێن وێ ب تنێ هەولدانەك بوویە بۆ بەردەوامیدان ب چێژا قەسیدەیا جاهلی و دژایەتیکرنا گۆهرینان. باشترین بەلگە ژی بۆ سەلماندنا ڤێ راستییێ ئەڤەیە کو د ستوونا شعرێدا ((چ دەروازەیێن سەربەخۆ بۆ کێش یان سەروایێ نەهاتینە دانان چونکە چ ئاریشە یان ناکۆکیەك لدور پێویستبوونا وان نەبوویە))[٢٢١] و کەسێ هەست ب مەترسییا گۆهرینا کێش و سەروایێ نەکریە.

زاراڤێ (عمود الشعر) نیشانا جۆرە راوەستیانەکێیە د شعرێدا، هەر وەکو رەخنەگر دبێژنە شاعران کو ئەڤە تاکە رێبازە کو هوین دشێن هەلبژێرن و ئەگەر شاعرەك ژ ڤێ ستوونێ لابدەت، ئێکسەر دێ کەڤیتە بەر هێرشا رەخنەگران چونکە ئەڤ ستوونە نوینەراتییا چێژا شعرییا عەرەبی دکەت، هەر وەکو وان ستوونا شعرێ ب ستوونا هەبوونا خۆ زانیە. پیڤەرێن ڤێ ستوونا شعرێ ژ چ چەمکێن ئیستاتیکییێن دیارکری نەهاتینە وەرگرتن بەلکو ژ چەمکەکێ شعرییێ دیارکری کو شعرا جاهلیە هاتیە وەرگرتن، ئەو چەمکێ کو پرانیا پرەنسیپێن رەخنەیی لسەر بنیاتێ وێ هاتینە دانان.ئەڤە هەتا وی رادەی کو ئێدی ئامانجا رەخنەگران دانانا پیڤەران بۆ لاساییکرنا سرۆشتی نەبوویە بەلکو دانانا پیڤەران بۆ لاساییکرنا روالەت و جەوهەرێ نموونەکا کەڤن بوویە.وان ئەڤ ئازادیە نەدایە شاعری کو لاساییا سروشتێ خۆ یێ تایبەت بکەت، بەلکو شاعر هاتیە نەچارکرن کو لاساییا وان تشتان بکەت کو یێن بەرێ لاساییا وان دکرن، واتە وان ب خۆ مافێ هەبوونا

خەیالا خۆ یا تایبەت نەبوو و خەیالا وان هەر خەیالا جاهلی بوو.[٢٢٢] گرنگترین بنەماییێن عەموودا شعریێ کو پەیوەستن ب وێنەییێ شعریێ ئەڤەنە:

أ. رۆهنی و دروستبوونا واتاییێ (معنى- شرفه و صحته): ب کورتی مەبەست ئەڤەیە کو واتا ژ ئاستێ تێگەهشتنێ دەربازنەبیت و بەرەڤ لێلییێڤە نەچیت. هەر وەکو (مرزوقی) ددەتە دیارکرن، (واتا ل سەر سێ جۆران دهێنە دابەشکرن، واتاییێن شعرییێن بەرز و ییێن ناڤنجی و ییێن نزم. پیڤەرێ واتاییێ ژی ئەوە کو دەمێ دکەڤیتە بەر نێرینا خودانێ عەقلەکێ دروست و تێگەهشنەکا باش بێ ئاریشە و ب رۆهنی بهێتە شرۆڤەکرن یانکو پشتی خواندنێ چ تشتێن نەدیار و ئالۆز لدەڤ خواندەڤانی نەمینن، فەرە ئەو واتایا کو د مێشکێ شاعریدا هەیە، دەمێ دکەڤیتە د بەرگێ پەیڤاندا، ئالۆز نەبیت و چەوا وەرگر پەیڤان وەکو خۆ وەردگریت، بشێت واتاییێ ژی هەر وەکو چەوا د هزرا شاعریدا بوویە وەرگریت، کەواتە تێگەهشتنا وەرگری پیڤەرە بۆ ساخلەمبوونا شێوازێ شعریێ).[٢٢٣]

ب. جەزالەتا لەفزێ: مەبەست ژ جەزالەتێ، پەیوەستبوونا هێزا پەیڤێیە ب وی جهێ کو تێدا دهێتە بکارهینان، واتە پەیڤ بشێت د جهێ خۆدا ب باشترین شێوە خزمەتا واتاییێ بکەت و لگەل وێ مەبەستا کو شعر ژبۆ وێ هاتیە نڤیسین بگونجیت، گرنگترین مەبەستێن شعریێ ژی کو پێدڤی جەزالەتا پەیڤێنە شانازیکرن و ستایشکرنن. ئەڤ جەزالەتە ژی بەشەکە ژ تەبع و ژیانا شاعریێ عەرەب.[٢٢٤]

ج. دروستبوونا وەسفێ (الاصابة في الوصف): واتە ئەو وەسفا کو بۆ مەوسوفی دهێتە کرن گونجاو بیت، یانکو ئەو پەیڤێن کو بۆ وەسفکرنا پاشایان دهێتە بکارهینانا بۆ خەلکێ ئاسایی نەهێنە بکارهینان، یان ئەوێن بۆ وەسفا ژنان دهێنە بکارهینان بۆ وەسفا زەلامان نەهێنە بکارهینان.[٢٢٥]

د. نێزیكی د لێكچواندنێدا (مقاربة في التشبيه): ئەڤە ژی نێرینەكا عەقلانی بۆ لێكچواندنێیە، واتە پێدڤیە كو د لێكچواندنێدا لێچو و لەوچو د گەلەك سیفەتان دا هەڤپشك بن و جیاوازی د ناڤبەرا واندا كێم بیت، ب ڤی رەنگی ڕوویێ لێكچوونێ دێ گەلەك ئاشكرا و ڕۆهن بیت و چ ئالۆزی و نەرۆهنی نامینن. باشترین لێكچواندن ژی ئەو لێكچواندنە كو لایەنێن هەڤپشك د ناڤبەرا لێچو و لەوچوی هند زۆر بن كو دەمێ جهێ وان دهێتە گۆهرین چ كاریگەری ل لێكچواندنێ نەهێتەكرن.[٢٢٦]

ە. نێزیكبوونا بۆخواستی و ژێخواستی: ئەڤە ژی (گرنگیدانە ب هەمان پیڤەرێن كو بۆ لێكچواندنێ هاتینەدانان و ئاماژەیێ ب گرنگییا نێزیكبوونا بۆخواستی ژ ژێخواستی و ئاشكرابوونا خواستییێ دكەت...).[٢٢٧]

ڤێ ستوونا شعرا قەسیدەیا عەرەبی كاریگەرییا خۆ لسەر شعر و ڕەخنەیا فارسی ژی هەبوویە. ئەگەر ئەم بەرێخۆبدەینە پەرتووكا (شمس قيس ڕازی)، ئەڤ ڕاستیە دێ بۆ مە ئاشكرا بیت كو ژ لایەكیڤە شاعرێن فارس هەولدانە لاساییا بنەماییێن ڤێ ستوونێ بكەن و ژ لایەكێ دیڤە ڕەخنەیا شعرییا فارسی ب رێكا ڤێ ستوونێ هەولا سەپاندنا نەریتێن قەسیدەیا عەرەبی ل سەر شعرا فارسی دایە. (شمس قيس ڕازی) ل جهەكی باسێ (تفويف)ێ دكەت و سەبارەت ب چەمكێ ڤی زاراڤی دبێژیت: ( ئەوە كو شعر لسەر بناغەیێ كێشەكا گونجاو و لەفزێن شرین و دەربڕینێن بهێز و سەروایێن دروست و لێكدانەكا ب ساناهی و واتایێن نازك هاتبیتە ئاڤاكرن داكو بۆ تێگەهشتنێ ب ساناهی بیت، بۆ ڤەدیتن و تێگەهشتنێ پێدڤی ب هزركرنەكا زۆر و كویربوونێ نەبیت.شاعر خۆ ژ خواستنێن دوور و خوازەیێن ناوێزە و لێكچواندنێن درەوین و ڕەگەزدۆزیێن دووبارە بدەتە پاش. هەر دێرەك د واتا و لەفزێدا سەربەخۆ بیت و پێویستی دێرا دی نەبیت، پەیڤێن سەروایێ د جهێ خۆ یێ دروستدا بن، ..)[٢٢٨]. تەفویفا (شمس قيس ڕازی) تشتەك نینە ژبلی بنەماییێن ستوونا قەسیدەیا عەرەبی. داكۆكیكرن لسەر دەروازەیێن ستوونا شعرێ

هەتا سەردەمێ نوی ژی د شعر و رەخنەیا شعرییا فارسیدا بەردەوام بوویە، بۆ نموونە (شبلی نعمان) وەکو ڤەکۆلەرەکێ سەردەمێ نوی، دەمێ باسێ مەرجێن سادەیی و ڕەوانیا شعرێ دکەت، بێ کو ناڤێ ستوونا شعرێ بینیت، تارادەیەکێ زۆر باسێ هەمان بنەماییێن ستوونا شعرا عەرەبی دکەت و وان بۆ ڤەهاندنا شعرێ ب فەر دزانیت[٢٢٩].

## ٢.٢.٣.٢. رۆلێ ئاراستەیا لۆژیکی و فەلسەفی:

ڕۆشنبیریا یونانی کاریگەریەکا مەزن کریە سەر زانایێن موسلمانان ب تایبەتی لسەردەمێ عەباسیان، پرانیا فەیلەسوفێن موسلمان ب هزرێن فەلسەفیێن ئەفلاتون و ئەرەستوی داخبار بووینە و ڕێکار و زراڤێن وان د ڤەکۆلینێن خۆ دا بکارئینانینە. سەبارەت ب چەسپاندن بنەماییێن شعریەتا قەسیدەیێ ل ژێر کاریگەرییا لۆژیک و عەقلانییەتا یونانی دشێین ئاماژەیێ بدەینە سێ پێنگاڤێن کاریگەرێن ڤەکۆلەر و ڕەخنەگرێن سەردەمێ عەباسیان:

### ١.٢.٢.٣.٢. وەرگێران و شرۆڤەکرنا (هونەرێ شعر)ا ئەرەستۆی لدویڤ ئەدکارێن قەسیدەیێ:

د جیهانا ئیسلامیدا پەرتووکا هونەرێ شعرێ بۆ ئێکەمین جار ژ لایێ (متی بن یونس قنائی) ژ سریانی بۆ عەرەبی هاتیە وەرگێران.ئەڤ وەرگێرانە، وەرگێرانەکا شێلی و پڕ ژ هەلە بوویە، لەوما وەرگێرانەکا دی ژلایێ (يحيى بن عدي) هاتیە ئەنجامدان؛ داکو ناڤەروکا کتێبێ بۆ موسلمانان زەلال بیت. وەسا دیارە کو پرانیا فەیلەسوفێن ئیسلامی پشتا خۆ ب ڤان وەرگێرانان گەرم کرینە کو د وەرگێرانا گەلەك زاراڤاندا سەرکەفتی نەبووینە[٢٣٠]، بۆ نموونە (مەتا بن یوسف)ی پەیڤا (تراژیدیا) یونانی بۆ (مەدح) ستایشکرنێ و (کومیدیا) وی بۆ (هجاء) یانکو داشۆرینێ وەرگێرایە.[٢٣١]

بناغەیێ شعریەتا یونانی و ب تایبەت پەرتووکا ئەرەستوی واتە هونەرێ شعرێ لسەر بناغێ تراژیدیا و داستانێ هاتیە ئاڤاکرن. ئەڤە ل وی دەمی کو شعرا عەرەبی ب تنێ شعرەکا نێزیک ژ شعرا لیریکیە؛ئەو شعرا کو ژ لایێ یونانیانڤە نرخ و بهایەکێ وەسا پێ نەهاتبوو دان. (د.غنیمی هلال) سەبارەت ب ڤێ چەندێ دبێژیت: ((...ئەدەبێ عەرەبێ ب مۆرکێ خۆ یێ پارێزگارانە و لاسایکەر و زالبوونا شعرا لیریکی و لاوازیا پەیوەندییا د ناڤبەرا بابەتێن ئەدەبی و ئامانجێن جڤاکی دهێتە نیاسین ئەڤە بووینە رێگر د رێکا هەبوونا تێگەهشتن و پێ کاریگەربوونەکا دروست بۆ تیۆرێن ئەرەستوی))[٢٣٢]، کەواتە ئەو تشتێ کو ئەم د شارستانیەتا ئیسلامیدا دبینین زێدەتر بریتیە ژ وەرگێرانا زاراڤێن ئەدەبیێن یونانییێن تایبەت ب دراما و داستانێ، ب رەنگەکێ وەسا کو لگەل قەسیدەیا عەرەبی کو زێدەتر لیریکیە بگونجیت.

تشتێ کو ژ وەرگێرانا هەلەیا زاراڤێن کتێبا (هونەرێ شعر)ێ ئەرەستوی سەیرترە، هەولا گونجاندنا ڤان زاراڤانە لگەل ئەدگارێن قەسیدەیا عەرەبی، بۆ نموونە ((ابن رشد راببوویە ب وەرگرتنا زاراڤێن شعرا بابەتی کو ب خرابی هاتینە وەرگێران و پاشی هەولدایە وان لسەر بابەتێن شعرا لیریکیا عەرەبی پراکتیزەبکەت))[٢٣٣]. (عصام قصبجي) شرۆڤەکرنەکا لۆژیکی سەبارەت ب ڤێ چەندێ پێشکێش دکەت، ئەو ڤێ چەندێ ب جیاوازیا شارستانیەتانڤە گرێددەت. هەر شارستانیەتەکێ مۆرکێ خۆ یێ تایبەتی هەیە کو د تەڤایا دیاردەیێن ئایینی و زانستی و هونەرییێن وی جڤاکیدا خۆیا دبیت، واتە هەر شارستانیەتەکێ تشتێن تایبەت ب خۆ هەنە و هندەك تشت ژی بۆ وان نامۆنە، دەمێ هەولا تێگەهشتنا تشتێن نامۆ ددەت یان دێ توشی تێگەهشتنەکا ناتەواو و درەوین بیت یان دێ وی تشتێ نامۆ ملکەچی مۆرکێ شارستانیەتا خۆ یا تایبەت کەت. بێ گومان تشتەکێ گەلەك زەحمەت بوویە بۆ شارستانیەتا نویا ئیسلامی کو ب رەنگەکێ دروست ژ شارستانیەتێن دی بگەهیت. ئەڤە ب تەواوەتی لسەر هەولێن رەخنەگرێن ڤێ شارستانیەتێ بۆ تێگەهشتنا سروشتێ شعرا یونانی پراکتیزە دبیت، چونکە هندەك

جاران هەلەیە و هندەك جاران توشی دەستكاری و لادانێ بوویە و پرانیا جاران ژی لگەل سروشتێ قەسیدەیا عەرەبی هاتیە گونجاندن. (مەتا بن یوسف)ی هەر ژ دەستپێكێ هەولدایە كو دیاردەیێن شعرا یونانی لسەر شعرا عەرەبی پیادە بكەت. وی تراژیدیا كرە (مەدیح) و كومیدیا ژی كرە (هجاء)، ب ڕاستی وی چ ڕێكێن دی نەبوون، چونكە شعرا عەرەبی دیاردەیەك بوو ژ دیاردەیێن شارستانیەتا عەرەبی... واتە وی هزرا چ جۆرێن دیێن شعرێ ژبلی قەسیدەیا عەرەبی نەدكر)[٢٣٤]. ئەو تشتێ كو د وارێ شعرێدا دناڤبەرا شارستانیەتا ئیسلامی و یونانیدا ڕویدای بریتیە ژ وەرگێرانەكا هەلە بۆ زاراڤێن ئەدەبیێن یونانی؛ ژ بەر زالبوونا نموونەیا قەسیدەیا عەرەبی و بكارهینانا ڤان زاراڤان لدویف ئەدگار و تایبەتمەندیێن شعرا عەرەبی. ب ڤی ئاوایی ئەو زاراڤێن كو بۆ شعرا درامی و داستانی دهاتنە بكارهینان بۆ شعرەكا لیریكی هاتنە بكارهینان و ئێدی واتا خۆ یا دەستپێكی ژدەست دان.

هەر ژ ناڤەراستێن سەدێ سێیێ كۆچیڤە، زاراڤێ لاساییكرنا یونانی ژی د ڕۆشنبیریا عەرەبی ـ ئیسلامی بەلاڤبوو، ب ڕەنگەكێ وەسا كو پرانیا فەیلەسوفێن ئیسلامی كەفتنە ژێر كاریگەرییا وی[٢٣٥]. (مەتا) وەكو ئێكەمین وەرگێرێ پەرتووكا ئەرەستوی هەر ژ لاپەرێن دەستپێكیا وەرگێرانا خۆ وەسا ددەتە دیاركرن كو (محاكات) یانكو لاساییكرن هەڤواتایە لگەل (تشبیە) یانكو لێكچواندنێ[٢٣٦]. ئەڤ مەسەلا هەڤواتا بوونا لاساییكرنا ئەرەستوی و لێكچواندنێ لگەل بورینا دەمی زێدەتر جهێ خۆ گرت و ئێدی بۆ هەمی زانایێن ئیسلامی ئەڤ چەندە مسوگەر بوو كو مەبەستا ئەرەستوی ژ لاساییكرنێ هەر لێكچواندنە. هەر چەندە كو هندەك زاراڤێن دی ژی بۆ هاتنە بكار هینان لێ ئەو زاراڤ ژی ڕاستەوخۆ یان نەراستەوخۆ ئاماژەیێ ددەنە لێكچواندنێ، (د. غنیمی هلال) دەربارەی ڤێ چەندێ دبێژیت ((ڕەخنەگرێن عەرەب وەسا ل لاساییكرنێ گەهشتن كو یەكسانە گەل مەجازێ، واتە لێكچواندن و خواستن و دركە))[٢٣٧].

ژ بلی لێكچواندن و زاراڤێن نێزیك ژ چەمكێ لێكچواندنێ، زاراڤێ (تەخەیول) ژی بۆ لاساییكرنا ئەرەستوی هاتیە بكارهینان. ئەڤ زاراڤە ((دشیا پیچەك

وەرارێ بێخیتە ڤێ چەندێ، لێ چ پێ نەچوو کو ئەڤ زاراڤە ژی کەفتە بەر شرۆڤەکرنێن وەسا کو ب جۆرەك ژ جۆرێن لێکچواندنێ هاتە ل قەلەمدان. ب ڕاستی ژی هندەك جاران مەبەستا وان ژ تەخەییولێ تشتەکێ بەرفرەهتر بوویە ژ لێکچواندنێ، لێ چ جاران ب تەمامەتی ژێ جودا نەبوو، چونکە هەر دوو ب هەڤواتایێن لاساییکرنێ دهاتنە زانین))[٢٣٨].(قدامة بن جعفر)ی ژی زاراڤێ وەسفێ بۆ لاساییکرنا ئەرەستوی بکارئینایە لێ دەمێ ئەم بەرێ خۆ ددەینە ڕاڤەکرنا وی بۆ وەسفێ وەسا بۆ مە خۆیا دبیت کو مەبەستا وی ژی ژ وەسفێ هەر لێکچواندنە.[٢٣٩]

پێدڤی بوو کەسەکێ وەکو (ابن سینا) کو لسەردەمێ خۆ مەزنترین نوینەرێ ڕۆشنبیریا یونانی بوو، پێنگاڤەکا مەزنتر هاڤێتبا و ب وەرگێرانا (بشر بن مەتا)ی ڕازی نەبا لێ (ابن سینا) ژی هەر لسەر شۆپا وی بەردەوام دبیت و لاساییکرنێ ب (تشبیە) ل قەلەم ددەت و تەنانەت دابەشکرنەکێ ژی بۆ دادنیت و وێ د ناڤبەرا لێکچواندن و خواستنێدا سنووردارد‌کەت[٢٤٠]. (ابن ڕشد) ژی هەر لسەر ڤێ شۆپێ لاساییکرن (محاکات) یانکو تەخەییولێ بسەر سێ جۆران دابەش دکەت کو ئەم دشێین بێژین بریتینە ژ جۆرێن لێکچواندن و خواستن و درکەیێ.[٢٤١]

ب شێوەیەکێ گشتی ڕەخنەگرێن کەڤن ژ میمێسا ئەرەستوی ژبلی لێکچواندنێ چ تشتێن دی وەرنەگرتییە. چێدبیت شکۆمەندیا شعرا جاهلی پالدەرەکێ ڤەشارتی بیت ل پشت ڤێ چەندێ، ئەو ڕەخنەگرێن کو د ڤێ باوەرییێدا بوون کو شعرا جاهلی گەهشتییە کوپیتکا خۆ، باوەرنەدکرن کو تشتەك مابیت کو شعرا عەرەبی نەگەهشتبیتە وی تشتی و دەمێ تشتەکێ کێم دەربارەی میمێسا ئەرەستوی زانین ئێکسەر ئەڤ بڕیارە دان کو مەبەست ژ میمێسێ لێکچواندنە و ب ڤی ڕەنگی هەر دووچەمک تێکەلی هەڤ کرن.[٢٤٢] زانایێن موسلمانان ئێکەم جار بەرێ خو داینە قەسیدەیا جاهلییا عەرەبی و لسەر بناغێ وێ تیۆرا ئەرەستوی شرۆڤەکرینە و ب ڤی ڕەنگی تیۆرا ئەرەستوی ژبلی ڤێ یەکێ کو نەشیایە خزمەتا پێشخستنا شعرێ بکەت، بوویە ئەگەرێ پتر جێگیربوونا بنەمایێن قەسیدەیا جاهلییا عەرەبی د ژێدەرێن ڕەخنەیی و ڕەوانبێژیدا.

## ٢. ٢. ٣. ٢. ٢. دانانا چارچووڤەکێ لۆژیکی و عەقلانی بۆ پاراستن و لاساییکرنا ئەدکارێن قەسیدەیا عەرەبی:

هەر ل سەردەمێ عەباسیان ( گەنگەشە و دانوستاندن ل هەمی بوارێن سیاسی و باوەردارییێ سەرهلدایە و بوویە ئەگەر کو چریسکێن لۆژیکا عەقلی خۆیا بن، ئەڤ چەندە ب خۆ ژی بوویە هۆکارێ بالادەست بوونا گوتاربێژی و هونەرێن وێ، لەوما ئێکەمین زانایێن بوارێ ڕوونبێژییێ و ل پێشیا وان (جاحظ)ی گرنگیدانە دانوستاندن و گەنگەشە و فەلسەفە و لۆژیکێ و ئەڤ نێرینە ژ مەیدانا گووتاربێژییێ بۆ مەیدانا شعرێ ڤەگوهاستینە...)[٢٤٣].

سەرهلدانا ڕەخنەیا ئەدەبی د هەمبێزا ئیعتیزالێدا ڕێخۆشکەر بوویە بۆ نێزیکبوونا شرۆڤەکرنا شعرێ ژ شرۆڤەکرنا گوتارێ. (ئعتیزال ب خۆ بریتیە ژ بڕیاردان و هەلسەنگاندنا عەقلانی. عەقل ل دەڤ وان ژێدەرێ سەرەکییێ چێژێ بوویە... هەر ژبەر ڤێ چەندێ وان شعر وەکو ژێدەرێ مەعریفەیا عەرەبی و ئامرازەکێ ڕازیکرنێ لسەر بناغەیێ گفتگۆکرن و گەنگەشەیێ بکارئینا. ل ڤێرێ دویراتیا د ناڤبەرا شعر و پەخشانێ کێم بوویە، ب ڤی ئاوایی ئەرکێ شعرێ بوویە پێشکێشکرنا زانیاریان. ئێدی ئەم هێلەکا جوداکەر د ناڤبەرا گووتاربێژی و شعرێدا نابینین و ڕەخنەگران هندەك پیڤەر دانایینە کو چەوا بۆ گوتاربێژییێ گونجاون وەسا بۆ شعرێ ژی دەست ددەن).[٢٤٤]

ڕەوانبێژییا بەرێ هەر وەکی ئەرەستوی دایە دیارکرن هونەرێ ڕازیکرنێ بوو. ب شرۆڤەکرنا ئاخفتنێن گوتاری یانکو گوتارا گشتی ڕادبوو. شرۆڤەکرنا ئەرەستوی لسەر بناغەیێ گەنگەشێ (جەدل) کاردکەت، واتە بەلگەهینان بۆ تشتێ کو چێدبیت وەسابیت نە بۆ تشتێ کو پێدڤیە وەسا بیت، واتە سەردەری لگەل تشتێن هەڤپشک یانکو دابێشەیان دکەت و ب ڕێکا وان دگەهیتە ئەنجامێن چاڤەرێکری....ڕەوانبێژییا کەڤن گوتاربێژانە بوو، بۆ جەماوەری دهاتە ئاراستەکرن و ئامانجا وێ ژی بدەستڤەهینانا پشتەڤانیا جەماوەری بوو).[٢٤٥] ب

دەربڕینەکا دی زانایێن ڕەوانبێژیێ ئەو پیڤەر و بنەمایێن عەقلانی و لۆژیکییێن کو ئەرەستۆی بۆ شرۆڤەکرنا گوتارێ بکارئینابوون بۆ شرۆڤەکرنا قەسیدەیا جاهلی بکارهینـان، چـونکه ئـەڤ پیڤـەرە ب تەمامـەتی د بەرژەوەنـدیا ئـەدگارێن زارەکـی و گوتارئاساییێن قەسیدەیا عەرەبی بوون.

(ڕوونبێژی) ب خۆ بەرهەمێ بهەڤگەهشتنا شعریەتا جاهلییا عەرەبان و لۆژیک و فەلسەفا یونانی بوویە و ژ لایێ زانایێن ئیسلامیڤە مینا ئامرازەکی بۆ شرۆڤەکرنا لایەنێ مەجازیێ تێکستێن ئایینی هاتیە بکارهینان و بوویە بەشەك ژ کارێ زمانڤانان. ( سەرهلدانا ڤان ڤەکۆلینان وەکو هەمی زانستێن دیێن عەرەبی ب مەبەستا خزمەتکرنا قورئانێ و پەیڤ و شێوازێن ویێن نامۆ بوویە، ئەڤە ژی ب ڕێکا خواندن و پۆلینکرنا وان.ئێکەمین بەرهەمێ کو د ڤی واریدا گەهشتییە مە (مجاز القران) ا (ابو عبیدة معمر بن مثنى) یە. پاشی ئەڤ خەباتێن زانستییێن گرێدای ب قورئانێ بۆ ماوێ سێ سەدەیان پشتی پەرتووکا (ابوعبیدە)ی بەردەوام بووینە.[٢٤٦] ئێدی ڕەوانبێژی ب بەشەك ژ ئەرکێ زانایێن زمانی و ئایینی هاتیە زانین، بۆ نموونە پەرتووکا (المفتاح) یا (فخرالرازی) کو ژ زانایێن ب ناڤودەنگێ سەردەمێ خۆ بوویە ـ د ناڤبەرا سەدێ شەشێ بۆ حەفتێ کۆچی ـ بۆ سەر سێ بەشان هاتیە دابەشکرن، واتە (سەرف و نەحو و واتاناسی و ڕوونبێژی)[٢٤٧]، یانکو مینا لقەکێ زانستێ زمانی سەرەدەری لگەل هاتیە کرن، زانستەك کو پتر نموونەیێن شعری وەکو کەرەستە بۆ شرۆڤەکرنا تێکستێن ئایینی بکاردهینیت. کەواتە ئاراستەیا عەقلی هاتیە بکارهینان بۆ بهێزکرن و چەسپاندنا ئەو پیڤەرێن کو ژلایێ ئاراستەیا (عەرەبی ـ بەدەوی) بۆ پاراستنا شعرا جاهلی و زمانێ عەرەبی هاتبوونە دانان.ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ ڤەکۆلینە نەشیاینە خۆ ژ بەرمایکێن ڕەخنەیا کەڤن ڕزگاربکەن. ئەو کارێ وان کری پتر بریتیە ژ زێدەکرنا هندەك پیڤەرێن نوی لسەر پیڤەرێن کەڤن ل ژێر ڕۆناهیا تێگەهشتنا وان بۆ قەسیدەیا جاهلی یانکو ئەڤ ڕەخنە و ڤەکۆلینە بریتینە ژ ( هندەك زاراڤێن کتێبا هونەرێ شعرا ئەرەستوی، زێدەباری زاراڤێن گرێدای ب گوتاربێژییێڤە.کەواتە ئێدی ڕەخنە بریتیە ژ

کۆمکرنا زاراڤێن بەدەوییێن شعرێ و زاراڤێن فەلسەفە و لۆژیکێ د چارچووڤەکیدا)[٢٤٨]، لێ لگەل هندێ ژی ئەڤ ڤەکۆلینە شیان ب رێکا دانانا کۆمەکا زاراڤێن نوی ببنە فاکتەرەکێ بهێز بۆ پێناسەکرن و شرۆڤەکرنا چەمکێ شعرێ لسەر بناغەیێ ئەدگارێن قەسیدەیا جاهلی، نە ب تنێ بوونە ئەگەرێ پاراستنا ئەدگارێن قەسیدەیێ، بەلکو بوونە پالدەر بۆ زێدەرۆیکرن د بکارهینانا هندەك هونەر و تەکنیکێن شعری و بهێزکەفتنا لاساییکرنا شعری. گرنگترین زاراڤێن کو ڤان ڤەکۆلەران بۆ پاراستنا ئەدگارێن شعریەتا قەسیدەیێ بکارئینانینە و رۆلەکێ مەزن د سازکرنا زەمینەیەکا لاساییکری بۆ وێنەیێ شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی هەبووینە، ئەڤەنە:

**أ. تەبع و تەکەلوف:**

(طبع و تكلف) ئێکە ژ کەڤنترین باسێن کو د رەخنەیا ئەدەبییا عەرەبی- ئیسلامیدا گرنگیەکا زۆر پێ هاتیەدان و بۆ ماوەیەکێ دویر و درێژ وەکو پیڤەرەکێ رەخنەیی بۆ هەلسەنگاندنا شاعران و پۆلینکرنا وان هاتیە بکارهینان. (وەسا دیارە کو بابەتێ (طبع) و (تکلف)ێ ژ نڤیسین و گفتگۆیێن موتەکەلیمان(*) هاتیە ڤەگوهاستن بۆ ناڤ بوارێ شعرێدا، ئەڤە ژی پەیوەندیدارە ب دەمێ نڤیسینێڤە، واتە (الطبع) پەیوەستە ب گوتنا کو دەمودەست و ب (بەدیهە) دهێتە گوتن و تەکەلوف ژی ئەدگارێ وێ گوتنێیە کو ب رێکا هزرکرن و هویربوونێ دهێتە دەربرین)[٢٤٩]. بنەمایێ زانستیێ ڤان هەر دوو زاراڤان جهێ گومانێیە، چونکە بۆ ئێکەمین جار لسەر بناغەیەکێ زانستی نەهاتینە بکارهینان. ( ئێکەمین کەس کو ئەڤ زاراڤە بکارئینانینە (جاحظ)ە و مەبەستا وی ژی دژایەتیکرنا بزاڤا شعووبیەتێ بوویە، وی راگەهاندیە کو ئەو شعرێ لسەر بناغەیێ سنعەتکاریێ دڤەهینن، ئەڤە ل وی دەمی کو عەرەب لسەر بناغەیێ تەبع و سروشتی ڤی کاری ئەنجام ددەن، یانکو هەمی تشت ل دەف عەرەبان بریتیە ژ بەدیهە و ئیرتیجالێ و هەر وەکو ئیلهامێیە، ڤەهاندنا شعرێ لدەڤ وان بێ ماندیبوون و وەستیان و بێ هاریکاری و خەباتا هزرییە)[٢٥٠].

دیاره زارەکیبوونا سروشتیێ شعرا جاهلی ژی رۆلێ خۆ د ڤێ چەندێدا هەبوویە. جۆرە بەدیهەیەك یان گوتنا شعرێ ب ئاوایەکێ نەژگاڤ و بێ هزرکرن د شعرا عەرەبییا کەڤندا هەبوویە و ئەڤ چەندە بوویە پیڤەرێ سەرەکییێ تەبعێ شعرێ و گەلەك هاتیە ستایشکرن و تەنانەت هندەك جاران ب گرنگترین مەرجێ شاعربوونێ هاتیە هژمارتن. (ب دیتنا (ابن قوتەیبە)ی شاعرێن مەتبوع ئەون یێن کو دەلیڤێ ددەنە شعرێ و د سەروایێدا خودان شیانن و ئەگەر بهێنە تاقیکرن ناهلنگڤن و دێ سەرکەفتی بن، مەبەستا وی ژ تاقیکرنێ ژی گوتنا شعرێ ب شێوەیێ دەمودەست و بەدیهێیە. موتەکەلف ژی ئەو شاعرن کو ب رۆشنبیریا خۆ شعرێ بهێزدئێخن، پێداچوونێ لسەر شعرا خۆ دکەن و چەند جاران لپەیهەڤ ڤەنێرینێ تێدا دکەن)[٢٥١].

ئەڤ پیڤەرە ب رێکا لاساییکرنێ بۆ گۆرەپانا ئەدەبیاتا فارسی ژی هاتیە ڤەگوهاستن، کەسەکێ وەکو (نظامی عروضی) سەبارەت ب ((سەرەدەریا شاعری لگەل دەستەلاتدار یان شاهان، دبێژیت کو چ تشت ژ بەدیهەیێ گرنگتر نینە، بەدیهە سولتانی کەیف خۆش دکەت و دیوانا وی گەرم دکەت و ب ڤی رەنگی شاعر دگەهیتە مەبەستا خۆ))[٢٥٢]، ل جهەکی دبێژیت: (( بەدیهە ژ گرنگترین ستوونێن شعرێیە و پێدڤیە شاعر تەبعێ خۆ دەولەمەند بکەت؛ داکو بشێت ب رێکا بەدیهەیێ واتایان بئازرینیت و دەستەلاتداران خۆشحال بکەت))[٢٥٣].

رەخنەگرێن عەرەب د ڤێ باوەرییێدا بووینە کو (ئێک ژ کێماسییێن کو رەنگە توشی ئەزموونا شعرێ بیت بکارهینانا تەکەلوفێیە و ئەو شعرا کو ب ئاوایەکێ سروشتی و بێ دەستکاری دەردکەڤیت هەمی دەمان باشترە، لەوما ئەزموونا شاعرێن وەکو (ابی تمام)ی کو هەولدانە ووردەکارییێ د شعرێدا بکەن و وێ ب بەدیعێ بخەملینن، هەمیشە ب نزمتر ژ وێ شعرێ دهێتە زانین کو سادەیە و راستە و گونجان د ناڤبەرا لەفز و واتایێدا هەیە و بێ تەکەلوف و هزرکرن و هویربینیێ دهێتە دەربرین)[٢٥٤]، لەوما پێدڤیە بێژین کو سەرەرای گرێدانا مەسەلا تەبعێ ب ئیلهام و دەربرینا سروشتی و دوورکەفتن ژ دەربرینێن دەسکرد لێ ئەگەر

ئەم تەماشەی وێ واتایێ بکەین کو پەیڤا تەکەلوف بۆ هاتیە بکارهینان، دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو پرانیا جاران ئەڤ زاراڤە جهێ گۆهرین و نویکرن و لادانێ دگریت و تەبع بەروڤاژی ڤێ چەندێ بریتیە ژ پێرەویکرن و لاساییکرن و لانەدانێ.

بەری هەر تشتەکی چێدبیت چ ڕاستییەکا وەسا بۆ هەبوونا شعرا بێ تەکەلوف یان بێ سنعەتکاری د مێژوویا شعرا عەرەبیدا نەبیت، چونکە تەنانەت (شاعرێ جاهلی ژی خۆ ب گەلەك زاراڤ و بنەمایانڤە گرێداینە و گەلەك بهایێن وێنەیی و موسیقی هەبووینە کو ژ لایێ وانڤە هاتینە بەرچاڤگرتن، یانکو ب دەربڕینەکا دی ئەو د ڤەهاندنا شعرێدا سەربەست نەبوویە و تارادەیەکێ زۆر ئازادیا شاعری هاتیە سنووردارکرن. شعرا جاهلی دەربڕینەکا هونەریا ئازاد نینە، بەلکو دەربڕینەکا هونەریا بەندکریە، واتە دەربڕینا سروشت و تەبعێ نینە، بەلکو دەربڕینا تەکەلوف و سنعەتکارییێیە. هزرا دابەشکرنا شاعران بسەر یێن مەتبوع و یێن موتەکەلف کو هەتا نهو ژی د بوارێ ڕەخنەییێدا بەردەوامە، پێدڤی پێداچوونێیە، چونکە کەڤنترین بەرهەمێن شعرییێن ئەدەبیاتا عەرەبی پشتەڤانیا ڤێ دابەشکرنێ ناکەن و تەڤایا وان بریتینە ژ شعرەکا دەسکرد و موتەکەلف)[٢٥٥].

ب کورتی دشێین بێژین کو (تەبع و تەکەلوف) د ڕەخنە و ڤەکۆلینێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا ئامرازەك بوویە بۆ سەپاندنا ئەدگارێن قەسیدەیا عەرەبی ل سەر شاعران و سنووردارکرنا وان. ڕەخنەگران ڤیایە ب ڕێکا ڤان هەر دوو زاراڤان ڕێکا گۆهرین و داهینانێ بگرن، چونکە هەر نویکرنەك ل دویف دیتنا وان دچیتە چارچووڤێ تەکەلوفێ.

**ب. لەفز و واتا:**

ئێك ژ تایبەتمەندییێن کارێ ڕەخنەیا عەرەبی ـ ئیسلامی جوداکرنا ڕوخسار و ناڤەرۆکێیە، ئەڤە ژی ب ڕێکا بکارهینانا هەر دوو زاراڤێن لەفز و واتایێ. دیارە (ڕەخنەگر بووینە دوو دەستە هندەك د ڤێ باوەرییێدا بووینە کو لەفز

گرنگتره و هندەکێن دی پشتەڤانیا واتایێ کرینە و ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ ڕاستیە لدەڤ وان زەلال نەبوویە کو جوداکرنا روخساری ژ ناڤەرۆکێ زیانێ دگەهینیتە بەرهەمێ ئەدەبی)[٢٥٦].

چێدبیت ئەڤ بابەتە ژی بەرهەمێ سەقایێ هزری و فەلسەفیێ سەردەمێ عەباسیان بیت و ( ل ژێرکاریگەرییا کۆمککرنا بەشەك ژ فەلسەفا ئەرەستوی و ئاریشەییێن موتەکەلمێن ئیسلامی سەبارەت ب کەڤنبوون و نویبوونا لەفز و واتایا قورئانێ سەرهلدابیت، چونکە بۆ چارەسەرکرنا ڤێ ئاریشەیێ زانایێن ڕەوانبێژیێ بۆچوونێن جیاواز سەبارەت ب ڤێ چەندێ کو واتا کەڤنترە یان لەفز پێشکێشکرن. هەر ئەڤە ژی بوو ئەگەر بگەهنە ڤی ئەنجامی کو خەیالا شعری د وێنەیێ شعرێدایە، نە د کەرەستەیێ شعرێدا. هەر ل بن سیبەرا ڤێ تێگەشتنێ جوداکرنەکا ڤەبڕ د ناڤبەرا ڕۆخسار و واتاییێدا دروستبوو)[٢٥٧].گرنگیدان ب لەفز و واتایێ بوو ئەگەر کو دەمارگیریا ڕەخنەگران بەرەڤ زێدەرۆییێڤە بچیت، تا وی ڕادەی کو لەفز و واتایێ وەکو دوو یەکەییێن سەربەخۆ بدەنە نیاسین. وان باوەری ب هندێ نەما کو چێنابیت لەفز بێ واتا بیت یان واتا بێ لەفز بیت؛ ئەڤە هەتا وی ڕادەی کو هندەك کەسان ئەڤ چەندە ڕاگەهاندیە کو شاعر ل دەستپێکێ هزرا خۆ د واتاییێدا دکەت و پاشی پەیڤان بۆ ڤان واتایان دبینیتەڤە و ب ڤی ڕەنگی شعر چێدبیت. بۆ نموونە (ابی هلال العسکری) دبێژیت: (هەکە تە ڤیا شعرەکێ بنڤیسی ل دەستپێکێ واتایێن کو تە دڤێت وان ڤەهینی د هزرا خۆ دا ئامادەبکە و د دلێ خۆدا بهێلە، پاشی کێش و سەروایەکا گونجاو بۆ هەلبژێرە...)[٢٥٨].

دیارە هەر ل دەستپێکێ ئەڤ جوداکرنە د بەرژەوەندیا لەفزێدا بوویە و ئێدی وەکو نەریتەك د مەیدانا شعر و رەخنەیا ئەدەبیدا پتر گرنگی ب لەفزێ هاتیەدان. ڕەنگە (جاحظ) ئێکەمین بەرپرسێ بەلاڤبوونا ڤێ هزرێ بیت. ئەو د ڤێ باوەرییێدا بوویە کو ( واتا تشنەکێ بەردەستە، یانکو تشتەکە کو هەمی کەس تێدا هەڤپشکن و ژبۆ عەرەب و عەجەمان و گوندی و بەدەویان بەردەستە و بهێزبوونا شعرێ چ پەیوەندی ب واتاییێڤە نینە، بەلکو تشتێ گرنگ کێشداربوون و ڕەوانبوون و

بکێرهاتنا لەفزێ و ساخلەمیا تەبعێ و کوالیێتیا دارشتنێیە. ئەڤێ بۆچوونێ کاریگەریەکا مەزن کریە سەر رەخنەیێ)[٢٥٩]. هەر (جاحظ) ب خۆ ئێکەم کەس بوویە کو ( رەخنە ژ دوو دیرێن شاعرەکێ عەرەب گرتیە و وەها دایە دیارکرن کو د وان دێراندا واتا ب سەر لەفزێ زالە، وی داکۆکی لسەر ڤێ چەندێ کریە کو شعر سنعەت و دارشتن و جۆرەك ژ رستن و وێنەکرنێیە. ئێدی پشتی (جاحظ)ی هەمی رەخنەگران شعر ب هونەرێ وێنەکرن یان رستنێ یان نەخش و سیاغێڤە گرێدایە...)[٢٦٠]. ئەوێن کو ب لایەنگرێن واتایێ ژی دهێنە نیاسین ب دروستی پشتەڤانێن واتایێ نینن و و لایەنگریا وان بۆ واتایێ پتر د ئاستێ هندەك بابەتێن پاژەییدایە، بۆ نموونە (ابن رشیق ئەڤ ئاخفتنا زانایان کو لەفز پر بهاترە ژ واتایێ و واتا د دەروونێ هەمی کەساندا هەیە و مرۆڤێن زانا و نەزان د ڤی واریدا وەکو هەڤن و تشتێ گرنگ کوالیێتیا لەفزێ و جوانیا دارشتنێ و ساخلەمبوونا پێکهاتەییێیە رەتدکەت، لێ دەمێ مرۆڤ تەماشەی بەرگریا وی بۆ واتایێ دکەت ئەڤ راستییە خۆیا دبیت کو واتا لدەڤ وی ژ چارچووڤێ لۆژیک و زمانڤانییێ دەرناکەڤیت و مەبەستا وی زێدەتر گونجاوبوون و بەرئاقلبوونا واتاییێیە)[٢٦١].

گرنگیدان ب لەفزێ و فەرامۆشکرنا واتایێ و باوەری هەبوون ب ڤێ چەندێ کو واتا تشتەکێ سادە و ساناهییە و بەردەستە بۆ هەمی کەسان و ( بەلاڤبوونا ڤێ هزرێ کو یێن بەرێ چ بۆ یێن نوی نەهێلاینە و واتا ب دویماهیک هاتینە کاریگەریەکا مەزن لسەر بەلاڤبوونا جوانکاریێ هەبوو)[٢٦٢]، واتە ئێدی شاعر ل دویڤ واتایێن نوی نەدگەریان بەلکو ب تنێ هەولددان واتایەکا کەڤن ب رەنگەکێ نوی پێشکێش بکەن. ئەڤ ب خۆ ژی ئێک ژ فاکتەرێن سەرهلدان و گەشەکرنا لاساییکرنێ د ئەدەبێ عەرەبیدا و پاشان ئەدەبێ مللەتێن دیێن دەڤەرێیە. گەشەکرنا دیاردەیا پەنابرن بۆ جوانکاری و نەخشاندنێ و زێدەرۆیکرن د ڤێ چەندێدا کو ژ سەردەمێ عەباسیان دەستپێدکەت، هەر بەرهەمێ گرنگیدانا نڤیسەران ب لەفزێ بوویە، هەتا وی رادەی کو ڤەکۆلەرەکێ عەرەب د ڤێ باوەرییێدایە کو ((ئەو نویکرنێن د سەرهلدانێن ئەدەبیێن عەرەبیدا هاتینەکرن؛

هەمی سەرڤەسەرڤە بووینە و ب تنێ گرنگیداینە ڕۆخساری و چ پەیوەندی ب لایەنێ گیانیڤە نەبووینە، سنعەتکاری و جوانکاری بسەر واندا زالبوویە. وەکو هەر تشتەکێ دی لاساییکرن دڤی بواریدا ژی ب کوشتن و گەندەلکرنێ ڕابوویە، شیانێن مەزن زیندەبەگۆرکریە و کەسایەتییا نڤیسەران لاوازکریە و بوویە ئەگەرێ بەلاڤبوونا هەستەکێ درەوین و بێ چێژ))[٢٦٣]، نڤیسەر ب تنێ خۆ ب پەیڤ و نەخشاندنا وان مژیکرینە و هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەر کو شعر ژلایێ هەست و سۆز و خەیالێڤە لاواز ببیت. دیارە فەرامۆشکرنا واتایێ د شعرا عەرەبیدا گەهشتییە ئاستەکێ مەترسیدار و بوویە ئەگەر کو ڤەکۆلەرەك بێژیت (عەرەبان ژلایێ لەفز و کێشێڤە گرنگیدایە شعرێ، لێ یونانیان ژ لایێ خەیال و سۆز و عەقلیڤە گرنگیدایە شعرێ و موسیقا فەرامۆشکرینە.)[٢٦٤] یانکو ڤی ڤەکۆلەری هەست ب ڤێ چەندێ کریە کو ئێکەمین قوربانیا فەرامۆشکرنا واتایێ دوو ڕەگەزێن سەرەکییێن ئەدەبێ واتە هەست و خەیالن.

دەمێ ئەم باسێ کاریگەرییا ڤی بابەتی دکەین، پێدڤیە دوو ڕەهەندان بەرچاڤ وەرگرین، ژ لایەکیڤە بهێین باسێ ڤێ چەندێ بکەین کا جوداکرنا لەفز و واتایێ و فەرامۆشکرنا واتایێ تا چ ڕادە کاریگەری لسەر بهێزبوونا لاساییکرنێ د مەیدانا شعرێدا هەبوویە و ژ لایەکێ دیڤە لسەر ڤی بابەتی ڕاوەستین کو دارشتنا بنەماییێن رەخنەیا ئەدەبی لسەر بناغەیێ گرنگیدان ب لەفزێ و فەرامۆشکرنا واتایێ تا چ ڕادە بوویە ئەگەر کو هندەك لایەنێن گرێدای ب نویکرنێ د شعرێدا بهێنە فەرامۆشکرن و ب تنێ گرنگی ب هندەك لایەنێن گرێدای ب پەیڤ و ڕۆخساری بهێتە دان. کەسەکێ وەکو (سید قطب)ی هەست ب ڤێ ئاریشەیێ کریە، ئەو د ڤێ باوەرییێدایە کو ( پێدڤیە نرخ و بهایێ لەفزێ یانکو پەیڤێ بۆ بهێتە زڤراندن لێ نە وەکو هندەك ڕەخنەگرێن کەڤنێن عەرەبان بانگەشە بۆ کریە و ڤیاینە نرخ و بهای بدەنە لەفزێ لسەر کیستێ قوربانیکرنا واتایێ، بەلکو بهاییێن سۆزدارییێ ژی جهەکێ ڕەسەن و گرنگ د هەلسەنگاندنا بەرهەمێ ئەدەبیدا هەیە و ئەڤ چەندە ژ بهاییێن دەربڕینێ ناهێتە جوداکرن. لەفز ئامرازەکە بۆ هەستکرن ب بهاییێن

سۆزدارییێ د بەرهەمێ ئەدەبیدا، تەنها ئامرازە کو نڤیسەر دشێت ب ڕێکا وێ ئەزموونا سۆزداریا خۆ بۆ مە ڤەگوهێزیت. ئەڤ هەر دوو فاکتەرە ب تنێ ل وی دەمی دێ ڕۆلێ خۆ بینن کو پێکڤە بهێنە گرێدان.[٢٦٥] ئاخفتنا (سید قطب)ی ئاماژەیە بۆ ڤێ چەندێ کو ڕەخنەیا ئەدەبییا عەرەبی - ئیسلامی ب لەفزێڤە هاتیە گرێدان و نەشێت ب تەمامەتی خزمەتا هەمی لایەنێن تێکستێ ئەدەبی بکەت.

ج. ڕاست و درەو:

پیڤەرێ ڕاستی و درەوێ د بنەرەتدا بابەتەکێ لۆژیکیە کو (ئەرەستو) و شرۆڤەکارێن پەرتووکا وی د جیهانا ئیسلامیدا گرنگی پێداینە، لێ ئاریشە یا د ڤێ چەندێدا کو زانایێن ڕەوانبێژیێ ئەڤ چەندە بۆ شرۆڤەکرنا بەرهەمێن خەیالی بکارئینانیە کو ڕاستی و درەوێ چ گرنگیا خۆ د ڤان بەرهەماندا نینە، چونکە بناغەیێ وان ئاخفتنا خەیالییە[٢٦٦]، یانکو ب دەربڕینەکا دی چ جاران ڕەخنەگرێن موسلمان نەشیاینە ل چەمکێ خەیالێ بگەهن.

ڕەخنەگرێن سەر ب هزرا ئیعتیزالێ و یێن کاریگەر ب فەلسەفا ئەرەستوی، پشتبەستن لسەر ڤێ ئاخفتنا ئەرەستوی کرینە کو دەربڕینێن شعری لسەر بناغەیێ تەخەیولێ ئاڤا دبن، لێ وەسا دیارە کو تەخەیول ل دەڤ وان یەکسان بوویە لگەل درەوێ، هەر وەکو (فارابی) داکۆکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو چ دەلیڤە بۆ ڤێ چەندێ نینە کو دەربڕینێن شعری درەون و وەسا دیارە کو هەر لسەر ڤی بناغەی (قدامە بن جعفر)ی ئەو ئاخفتنا خۆ یا ناڤدار کریە کو دبێژیت (باشترین شعر درەوینترین شعرە)[٢٦٧]، یان (ابن ڕشیق)ی گوتیە (ئەو تشتێ کو شعرێ ژ تشتێن دی جودا دکەت ئەڤەیە کو هەمی لسەر درەوبوونا وێ ڕێککەفتینە و ئەو تشتێ دەڤ خەلکی ب تاوان دهێتە زانین، د شعرێدا موستەحەبە)[٢٦٨].

دەمێ دەربڕینێن شعری ژ ڕوانگەهەکا فەلسەفی ب درەو هاتنە ناڤکرن؛ ڕەخنەگرێن موسلمان ب ئاوایەکێ جیاواز ژ زاراڤێ درەوێ گەهشتن، ئەو وەسا تێگەهشتن کو ئەڤ درەوە هەر ئەو درەوا بەروڤاژی ڕاستییێیە. زاراڤێ (صدق) یانکو ڕاستیێ واتایەکا ئایینی– ڕەفتاری هەبوو؛ ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ بەلاڤبوونا ڤێ

هزرێ کو درەو ئامانجا شعرێیە و ڕاستی ئامانجا ڕەوشتییە، هەر وەکو هەڤدژییەك د ناڤبەرا شعر و ڕەوشتیدا هەیە. ژێدەرێ ڤێ خەلەتییێ ژی بۆ تێکەلکرنا چەمکێ درەو و خەیالێ دزڤریت. ڕەخنەگرێن عەرەبی ئەڤ چەندە ڕەتکرن کو ئەدگارێن راستییا ئیستاتیکی یان ڕەوشتی بدەنە بال شعرێڤە.[٢٦٩] ل ڤێرێ هەڤدژییەکا مەزن د شعریەت و رەخنەیا ئەدەبییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا دهێتە دیتن؛ ئەو ژی داکۆکیکرن لسەر هەبوونا ڕاستییەکا لۆژیکی د شعرێدا و فەرامۆشکرنا ڕاستیێ وەکو واقع و ئەزموونا شاعریە، (ئەو د بابەتێن پاژەیێن وەکو لێکچواندنێ گرنگیێ ددەنە ڕاستیێ و قەبوول ناکەن کو تشتێن نەبەر ئاقل بهێنە گوتن و دبێژن پێدڤیە لێکچواندن نێزیک و ڕاستگۆیانە بیت و ژ لایەکێ دیڤە پشتەڤانییا وێ شعرێ دکەن کو لسەر درەوێ هاتبیتە ئاڤاکرن یانکو دەمێ باسێ لێکچواندنێ دکەن مەبەستا وان ژ درەوێ دویربوونە لێ دەمێ باسێ شعرێ دکەن مەبەستا وان ژ درەوێ نێزیکیە.)[٢٧٠]

زالبوونا لەفزێ لسەر واتایێ و سروشتێ شعرا عەرەبی کو لسەر بناغەیێ ئێکەتییا تاکەدێران هاتیە ئاڤاکرن و هەبوونا چەند مەبەستێن دیارکری د شعرا عەرەبیدا ب خۆ ڕێخۆشکەربووینە بۆ تێگەهشتنا تایبەتییا وان بۆ چەمکێ درەوێ د شعرێدا یانکو ( مەبەستا وان ژ درەوێ ئەڤەیە کو مادەم شاعری شیانا داڕشتنا هەمی بابەتان هەیە، نەچارنینە کو خۆ ب بابەتەکێ دیارکریڤە گرێبدەت. چەوا خرابی و باش نەبوونا جۆرێ داری نابیتە کێماسی بۆ دارتاشی، هەر ب ڤی ڕەنگی درەوبوونا بابەتی ژی نابیتە کێماسی بۆ شاعری... شاعر ژ لایەکیڤە بەندەوارێ ڕۆخسارییە و ژ لایەکێ دیڤە بەندەوارێ درەوێ، بۆ شاعری گرنگ نینە کو شعر خۆدیکا وی نەبیت و ببیت خۆدیکا تشتان، واتە بلا ئەو تشتێ کو ئەو دادرێژن ژ لایێ بابەت و ناڤەرۆکێڤە بێ بها بیت لێ ژ لایێ داڕشتن و پێکهاتەیڤە جوان بیت).[٢٧١]

بۆ ڕۆهنڤەکرنا مەسەلا ڕاستی و درەوێ د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا دێ دوو هەلویستێن (قدامە بن جعفر)ی وەرگرین. ئەو ل جهەکی ڤێ چەندێ ددەتە خویاکرن کو ئەگەر شاعرەك ب جوانی و شارەزایی د شعرا خۆ دا

ستایشا تشتەکی بکەت و پاشی د هەمان شعر دا ب جوانی و شارەزایی بهاڤێژیتە وی تشتی و ڕەخنەیێ ژێ بگریت، نە ب تنێ بۆ وی نابیتە کێماسی بەلکو نیشانا شیانا شاعریە. یانکو لدویف بۆچوونا وی سەیر نینە ئەگەر شاعر ل دەستپێکێ ستایشا دیناری بکەت و پاشی نەکامییا دیناری بکەت، یان ستایشا ڕوباری بکەت و پاشی خرابیێن وێ بدەتە دیارکرن. ئەو ل دەستپێکێ ستایشا تشتەکی دکەت و شیانێن خۆ د واریێ دەربڕینێدا نیشان ددەت و پاشی بۆ سەلماندنا ڤێ چەندێ کو ئەو دشێت نەکامی و زەما وی تشتی بکەت دێ هاڤێژیتە هەمان تشتێ کو ستایشا وی کری[٢٧٢].ل ڤێرێ (قدامە) چ بهایەکی نادەتە پەیوەندییا شعرێ ب واقعی، هەر وەسا ئێکەتییا شعرێ و تەوەرێ ستوونیێ خەیالا شعری و هەست و سۆز و کەسایەتییا شاعری و ئەزموونا وی.هەر ئەڤ ڕەخنەگرێ عەقلانی نموونەکێ بۆ (اصابة المعنى) یانکو دروستبوونا واتایێ دهینیت و دبێژیت کو د شعرا لاوانەوەییێدا، واتە ئەو شعرا کو ب هەلکەفتا مرنا کەسەکی دهێتە گوتن، نابیت دەربڕینەکا ب ڤی ڕەنگی بهێتە بکارهینان: ( هەسپێ وی یێ بۆ وی دکەتە گری). بەلگەیێ وی ژی ئەڤەیە کو هەسپی چ خۆشی ددەستێ خودانێ خۆ دا نینە و خودان بەس وی عێجز دکەت لەوما دەمێ ئەو دمریت پێدڤیە هەسپ ب کەیف بیت و عێجز نەبیت[٢٧٣]. د نموونەیا ئێکێدا ڕاستی ب واتایا خۆ یا گشتی هاتیە ڕەتکرن و د نموونەیا دوویێدا گرنگی ب ڕاستیەکا لۆژیکی د چارچووڤێ رستەیەکێدا هاتیەدان. تەنانەت وەسا دیارە کو (مەبەستا ڤەکۆلەرەکێ وەکو (عبدالقاهر جورجانی) ژی ژ ڕاستییێ، ئەڤەیە کو واتا ژ لایێ عەقلیڤە ڕاست بیت، مەبەستا وی ژ ڕاستییێ ئەو نینە کو ئەو تشتێ شاعر دبێژیت لگەل واقعی بگونجیت، بەلکو ئەوە کو لگەل پیڤانا عەقلی بگونجیت.[٢٧٤]

لگەل هاتنا ئیسلامەتیێ ( چەمکێ ڕاستییێ ب شعرێڤە هاتیەگرێدان و پەسنا وان شاعران هاتیەکرن کو د شعرێن خۆ دا پشتەڤانییا ڕاستییێ دکەن و خۆ ژ درەوێ ددەنە پاش...)[٢٧٥]، لێ دیارە ئەڤ چەندە نە ب تنێ نەبوویە بناغەیەك بۆ گۆهرینا بنیاتێ شعرێ بەلکو بوویە جهێ ڕەخنەگرتنا بسپۆر و ڕەخنەگرێن بوارێ شعرێ، بۆ نموونە (ب دیتنا کەسەکێ وەکو (اصمعي) ڕێبازا شعرێ ڕێبازا شاعرێن

کەنەکەنەیە(فەحول)ە، یێن وەکو (امریء القیس) و (نابغە) و (زوهیر)ی، ئەگەر شعر ژ بابەت و مەبەستێن وان دەرکەڤیت و گرنگیێ بدەتە بابەتێن خێرێ وەکو بابەتێن ڕەوشتی و ئایینی دێ بەرەڤ لاوازیێڤە چیت)[٢٧٦].( ابی هلال العسکری) ژی دبێژیت: (ئەو داخوازا کو ژ شاعران دهێتەکرن ئەوە کو ئاخفتنەکا جوان پێشکێش بکەن، ڕاستی تشتەکە کو ژ پێغەمبەران دهێتە خواستن).[٢٧٧] ئەڤ هەلویستە ژ لایەکیڤە هەولدانەکە بۆ پاراستنا ئەدگارێن شعرا جاهلی و ژ لایەکێ دیڤە سنووردارکرنا شعرێیە د چارچووڤەکێ دیارکریدا.دیارە ئەڤی هەلوێستی کارتێکرنا خۆ لسەر شعرا فارسی ژی هەبوویە لەوما کەسەکێ وەکو جامی د پەرتووکا بەهارستاندا دبێژیت: ((شعر ئاخفتنەکا کێشدارو سەرواداره و هەبوونا تەخەیولێ یان نەبوونا وێ، ڕاستبوون یان ڕاست نەبوونا وێ گرنگ نینە...))[٢٧٨]

## ٣.٢.٣.٢.٢. لاوازکرنا چەمکێ بەدیعێ:

ڕەخنەگر و ڤەکۆلەرێن شارستانیەتا عەرەبی- ئیسلامی هەولددەن هەر دیاردەکا هونەری کو تایبەت نەبیت ب شعر و قەسیدەیا سەردەمێ جاهلی ببەنە ڕێزا تەکەلوف و دەستکردبوونێ. دیارە بەدیع چ ب واتا خۆ یا لڤۆك و ئەکتیڤا دەستپێکێ و چ وەکو ئەو واتایا بێ گیان و سواوەیا کو گەهشتییە مە، بوویە ئێک ژ قوربانیێن ڤێ هەولدانێ، بۆ نموونە گەلەك جاران عەرەبان سەرهلدان و ڕۆلێ نێگەتیڤانەیا بەدیعێ ب کاریگەرییا فارسانڤە گرێدایە و گوتینە کو ( شارستانیەتا ماتریالی و خۆشگۆزەرانا فارسان بوویە ئەگەرێ گرنگیدان ب جوانکارییا دەربڕینێ چونکە ئەڤ چەندە د شعرا بەدوییا عەرەبیدا نەبوویە...)[٢٧٩]، یانکو هەول داینە ب ڕێکا ئازراندنا مەسەلا ڕەسەنایەتیێ، ڕۆل و گرنگییا (بەدیع)ێ بێخنە بەر گومانێ.

ئەم دشێین بێژین کو (بەدیع) بەرهەمێ جیاوازی و ململانەیا د ناڤبەرا چێژا جاهلییا بیابانی و چێژا شارنشینییا خۆشگۆزەرانە، هەر ئەڤە ژی ب

هۆکارەکێ سەرەکییێ وەرارا و بکارهینانا هەر دوو زاراڤێن تەبع و تەکەلوفێ دهێتە هژمارتن. ( عەرەب بکارهینانا زێدە یا هونەرێن بەدیعێ دبەنە چارچووڤێ تەکەلوفێ و وەسا دبینن کو ئەڤ چەندە دبیتە ئەگەر کو تەبعێ شاعری بەرەڤ لاوازییێڤە بچیت و مرۆڤ هەست ب تەکەلوف و سنعەتکارییێ بکەت...).[٢٨٠] وەکو بەری نوکە مە ئاماژەپێدای چ بناغەییێن زانستی بۆ هەبوونا (تەبع) و (تەکەلوف)ێ نینە و ب تنێ چەکەکە بۆ سەرکوتکرنا نویکرنێ وبەردەوامیدان ب لاساییکرنا ئەدگارێن قەسیدەیا جاهلی، لەوما پۆلینکرنا بەدیعێ ژی د چارچووڤێ تەکەلوفێ نیشانا ڤێ چەندێیە کو بەدیع هەلگرا ئالایێ نویکرن و جیاوازییێ بوویە. کەواتە دەمێ ئەم دهێینە سەر باسێ بەدیعێ و باسێ پەیوەندییا وێ ب لاساییکرنێڤە دکەین؛ پێدڤیە گەلەك هشیارانە سەرەدەرییێ لگەل بیر و بۆچوونێن ڕەخنەگران بکەین، چونکە پرانیا ڕەخنەگر و ڤەکۆلەرێن کەڤن لایەنگرێن قەسیدەیا جاهلی بووینە و ب ئاوایێن جۆراوجۆر دژایەتییا خۆ ل هەمبەر بکارهینانا شێوازێن نوییێن شعری داینە دیارکرن؛ ئەگەر ئەم هەمی دەمان ل دویڤ شۆپا وان بچین، پێدڤیە ل داوییا هەر ڤەکۆلینەکێ بگەهینە نێرینەکا نێگەتیڤ بۆ بەدیعی.

ل دەستپێکێ بەدیعێ واتایەکا پۆزەتیڤ و لڤۆك هەبوو و وەکو نهۆ بەرتەنگ و سنووردار نەبوو. ئەڤ زاراڤە ( سەرەتا بۆ هەر تشتەکێ نوی دهاتە بکار هینان، واتە ڕویدان یان دەربڕینەك کو ژ لایێ شارەزایی و نامۆییێڤە ژ یێن دی جودا بیت، یانکو ژ سنوورێ تشتێن باو و بەربەلاڤ دەرباز ببیت. د فەرهەنگێن عەرەبیدا ژی بەدیع وەسا هاتیە پێناسەکرن، بۆ نموونە د فەرهەنگا (مقاییس اللغة)دا هاتیە کو بەدیع دەستپێکرنا تشتەکی و چێکرنا وی تشتی بێ بەرچاڤگرتنا چ نموونەیانە. هەر وەسا د فەرهەنگا (محیط) دا هاتیە کو (البدیع) و (البدع) ئەو تشتە کو ئێکەم بیت، بەدیع واتە تشتێ نوی و یێ سەیر)[٢٨١]. ب ڤی ڕەنگی (بەدیع) بریتی بوویە ژ نویکرن و دەرکەفتن ژ لاساییکرنێ، ( ڕەخنەگران ژی بۆ دەمەکێ درێژ هەر وێنەیەکێ شعریێ نوی دیتبا بێ دەستنیشانکرنا جۆرێ وی هونەری، دا زاراڤێ بەدیعێ بۆ بکارئینن)[٢٨٢].

ئێكەمین كەس كو ئەڤ پەیڤە تومارکری (جاحظ)ە، لێ بەری وی ئەڤ زاراڤە د مەیدانا ئەدەبیدا باو بوویە و بۆ ڕێکێن نوییێن دەربڕینێ و وێنەییێن داهێنەرانە هاتیە بكارهینان، تەنانەت (خواستن) ژی بۆ ماوەیەكێ درێژ بەشەك بوویە ژ بەدیعێ. (جاحظ) د نڤیسینێن خۆدا ڤێ پەیڤێ بۆ شاعرێن نوی بكاردهینیت، كەواتە ئەڤ زاراڤە نیشانەیەك بوویە بۆ ئەو وێنە و دەربڕینێن كو بەری هنگی د ئەدەبێدا باو نەبووینە، هەرچەندە كو گەلەك ژ وان د شعرا جاهلی و تەنانەت د قورئانێدا ژی هاتینە بكارهینان لێ د ئەدەبێ كەڤندا نەبووینە دیاردە.[٢٨٣] (ابن معتز) ژی وەكو ئێكەم كەس كو پەرتووكەكێ تایبەت ب (بەدیع)ێ نڤیسی، (بەدیع) ب واتایا خۆ یا گشتی بكارئینایە، واتە هەر وێنەیەكێ هونەریێ نوی كو ببیتە جهێ سەرسۆرمانێ.[٢٨٤]

ب شێوەیەكێ گشتی بەدیع ل دەستپێكێ بۆ هندەك هونەرێن دەستنیشانكری نەهاتیە بكارئینان بەلكو بریتی بوویە ژ بەرێخودانا هەر بەرهەمەكی بۆ ڤەدیتنا ڤێ چەندێ كو ئایا ئەو تشتێ شاعری پێشكێشكری نویە یان كەڤن و لاساییكریە، ب دەربرینەكا دی بەدیع هەلگرا ئالایێ واتایێن نوی بوویە، بریتی بوویە ژ نیشاندانا هەولا شاعران بۆ هینانا واتایێن نوییێن گونجای لگەل گیانێ ژیان و شارستانییەتا نوی.[٢٨٥]د بەرهەمێن نڤیسەرێن ئیرانی ژی، هەر ژ (محمد بن عمر رادویانی) و كتێبا وی واتە (ترجمان البلاعة) بگرە هەتا (حدائق السحر)یا (رشید وطواط)ی و كتێبا (معاییر اشعار العجم) یا (شمس قیس رازی)، پەیڤا بەدیع ب واتا خۆ یا بەرفرەهـ هاتیە بكارهینان و لدەڤ وان ڕوونبێژی ژی هەر بەشەك بوویە ژ بەدیعێ[٢٨٦].

هەرچەندە كو (بەدیع) لسەر دەستێ زانایێن رەوانبێژیێ یێن پشتی (ابن معتز)ی تووشی پۆلینكرن و زاراڤسازییەكا زێدەبوویە و هەر زانایەكی هەولدایە ژلایێ خۆڤە ژمارا هونەرێن بەدیعی زێدەبكەت[٢٨٧]، لێ تشتێ پۆزەتیڤ ئەڤەیە كو (ڤان زانایان بەدیع وەكو زاراڤەكێ جودا بكارنەئینایە و پرانیا جاران مەبەستا وان ژ بەدیعێ هونەرێن ڕەوانبێژییێن سەر ب ڕوونبێژی و واتاناسی و جوانكارییێڤە بوویە.

پێڤاژۆیا جوداكرنا بەدیعێ ژ بەشێن دیێن ڕەوانبێژیێ ژ (سكاكی) دەست پێ دكەت...)[٢٨٨].

ل سەدێ حەفتێ كۆچی، (سەكاكی) (٦٢٢مرن) د پەرتووكا (مفتاح العلوم) دا ب كارەكی ڕابوو كو زیانەكا مەزن گەهاندە بەدیعێ. وی ڕەوانبێژی لسەر دوو بەشێن سەرەكی، واتە واتاناسی و ڕوونبێژیێ دابەشكر و وەكو پاشكۆیەك باسێ بەدیعێ كر. هەر وەسا وی زاراڤێ بەدیعێ بكارنەئینا و ل جهێ وێ پەیڤا (محسنات) یانكو جوانكاریێ بكارئینا و بابەتێن بەدیعێ لسەر دوو جۆران دابەشكر: جوانكارییێن ووشەیی و واتایی. ئەو د ڤێ باوەرییێدا بوو كو ڕەوانبێژی لسەر بناغەیێ هەر دوو زانستێن ڕوونبێژی و واتاناسیێ ئاڤا بوویە و بەدیعێ ڕۆلەكێ وەسا د ڤی بواریدا نینە. ل سەدێ هەشتێ ژی (خطیب القزوینی) هەر لدویڤ شۆپا (سەكاكی) چوو، لێ زاراڤێ بەدیعێ بۆ (محسنات)ێ بكارئینا. ژبەر جودابوونا هەر دوو بەشێن ڕوونبێژی و واتاناسیێ لسەر دەستێ (سەكاكی) ئێدی بەدیع ژی وەكو بەشەكێ ڕەوانبێژیێ خویابوو و ل ڤێرێ ب ئاوایەكێ فەرمی ڕەوانبێژی لسەر سێ بەشان هاتە دابەشكرن و ئێدی بەدیع وەسا هاتە پێناسەكرن كو زانستەكە بۆ جوانكرنا ئاخفتنێ دهێتە بكارهینان و دبیتە دوو جۆر ووشەیی و واتایی.[٢٨٩]

جوداكرنا جوانكارییا واتایی و ووشەیی و دانانا وان د بەشێن جیاوازدا یان دەرخستنا وان ژ چارچووڤێ ڕەوانبێژیێ، ئێك ژ هەولێن زانایێن ڕەوانبێژیێ، نەمازە (سەكاكی) بوویە. وی زێدەتر ئەڤ هونەرە برینە د چارچووڤێ فەساحەتێدا و ژ بەلاغەتێ جودا كرینە. وی نەڤیایە ئەڤ هونەرە تەڤلی هونەرێن ڕوونبێژی و واتاناسیێ بن كو ڕاستەوخۆ پەیوەندیدارن ب ئیعجازا قورئانیڤە، ئەو ل دویڤ شۆپا زانایێن كەڤن چوویە كو دگوتن كەس نەشێتن ل ڕاستییا قورئانێ بگەهیت ب تنێ ل وی دەمی نەبیت كو ل زانستێن ڕوونبێژی و واتاناسیێ بگەهیت[٢٩٠]. هەلەیا مەزن كو هەر ژ سەردەمێ سەكاكی دەستپێكریە و هاتیە ناڤ بەدیعا فارسیدا ژی؛ ئەڤەیە كو ئاخفتن ب بویكەكێ هاتیە لێكچواندن كو واتاناسی و ڕوونبێژی گیان و پەیكەرێ وێنە و بەدیع و هونەرێن وێ مینا وان جوانكاریانن كو بۆ

خەملاندنا ڤێ بویکێ دهێنە بکارهینان. ئەڤ زانایە نەشیاینە وەکو گشتەکێ تەماشەی دەڤێ ئەدەبی بکەن. هەر لسەر ڤی بناغەی ئالۆزی و بێ سەرو بەری د بابەتێ بەدیعێدا دهێتە دیتن و تەنانەت بابەتێن وەکو دزیێن شعری و قالبێن شعری ژی د بەدیعێدا دهێنە باسکرن[٢٩١]، یانکو ئێدی هەر شێوازەك یان هەر بابەتەك یان هەر هونەرەکێ نوی دچیتە چارچووڤێ بەدیع یان جوانکارییێدا.

ب کورتی (ئەم دشێین بێژین بکارهینانا کەڤن و گشتییا بەدیعێ بۆ وی سەردەمی دزڤریت کو هێشتا پشکێن ڕەوانبێژیێ ژ هەڤ نەهاتبوونە جوداکرن، واتە وی دەمێ کو هێشتا بابەتێن ڕوونبێژی و واتاناسی و بەدیعێ تەڤلی هەڤبوون، لێ پشتی دابەشکرنا ڕەوانبێژیێ هەرتشتێ کو بەشەك نەبوویە ژ ڕوونبێژی و واتاناسیێ ب بەدیع هاتیە ناڤکرن[٢٩٢].ئەم ئەڤروکە پەیڤا جوانکاریێ بۆ بەدیعێ بکاردئینین، لێ ب ڕاستی ئەڤە وەرگێرانا زاراڤێ (محسنات)ە ئەوا کو سەکاکی بکارئیناى. پشتی سەکاکی ئێدی بەدیع نە واتا نامۆبوونێ ددەت و نە چەمکەکێ گشتگرە، بەلکو ب تنێ بۆ وان هونەران دهێتە بکارهینان کو هەبوون و نەبوونا وان گەلەك گرنگ نینە، یانکو بەشەکێ ڕەسەن نینن ژ دەربڕینا ئەدەبی. دیارە کو مەبەستا (سەکاکی) ب تنێ ئەڤە بوویە کو ئەو هونەرێن کو ب ڕێژەکا بەرچاڤ د شعرا جاهلی و قورئانێدا هاتینە بکارهینان ژ هونەرێن دی جودا بکەت و وان بێخیتە د پشکا ڕوونبێژییێدا، هەر (ئەڤ جوداکرنە و دانانا پێناسەیێن جودا بۆ بەدیع و ڕوونبێژیێ بوویە ئەگەرێ دروستبوونا هندەك هەڤدژیان، چونکە هندەك ژ هونەرێن بەدیعێ وەکو (دژیەك و تەمسیل و غەلو و ئیهام) بەشەکن ژ وێنەیێن شعری و پێدڤیە لگەل هونەرێن ڕوونبێژیێ بهینە خواندن...)[٢٩٣]لێ نهو د چارچووڤێ جوانکارییا واتاییدا دهێنە پۆلینکرن.ئەو ڕەوانبێژییا کو گەهشتیە مە لسەر بناغەیێ لایەنگریکرنا تایبەتمەندییێن قەسیدەیا جاهلی هاتیە ئاڤاکرن، ژ لایەکیڤە هەولددەت کو هونەرێن وێنەیێن باو د قەسیدەیا جاهلیدا د چارچووڤێ ڕوونبێژییێدا پێشکێش بکەت و ژ لایەکێ دیڤە هەولددەت ب ڕێکا بێ بایەخ کرن و لاوەکی کرنا بەدیعێ هونەرێن نوی ب هونەرێن پلە دوو بدەتە نیاسین. دەرگەهێ

ڕوونبیژیێ وەکو گیان و ماهیەتا شعرێ هاتیە گرتن و هەر داهێنانەکا نوی بەری ژدایکبوونا دبیتە پلە دوو و دچیتە چارچووڤێ بەدیعێدا. هەر ئەڤ تێگەهشتنا ڕەخنەگر و ڤەکۆلەرێن شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بوویە ئەگەر کو شاعر پتر ل دور هونەرێن ڕوونبیژیێ بزڤرن و کێمتر هەولا بکارهینانا وێنەییێن جیاواز و ڤاریێ ژ ڕوونبیژیێ بدەن، دەمێ کو ئەو ڤان هونەران ژی بکاردئینن ئێکسەر سیبەرا بەدیع یان جوانکاریێ دکەڤیتە سەر وان و بێ کو شاعری بڤێت ب پلە دوو دهێنە هژمارتن.

## پەراوێزێن پشکا دووێ

(*) مەبەست ژ بەرهەمێن چیرۆکامێز، ئەو ژانرێن ئەدەبینە کو لسەر بناغەیێ ڤەگێرانێ دروست دبن.

(۱) احمد مطلوب، في المصطلح النقدي، منشورات المجمع العلمي، بغداد، ۲۰۰۲، ص۷۲.

(۲) ابتسام مرهون الصفار، فضاءات في الادب العربي القديم، دار الصفاء، عمان، ۲۰۰۸، ص۲۰.

(۳) ايڤالد ڤاگنر.اسس الشعر العربي الكلاسيكي الشعر العربي القديم، ترجمة:سعيد حسن بحيري، مؤسسة مختار للنشر، القاهرة، ۲۰۰۸، ص٦۳.

(٤) هەمان ژێدەر، ص٦۸.

(٥) عصام القصبجي، اصول النقد العربى القديم، منشورات جامعة الحلب، حلب، ۱۹۹۱، ص۱۲۲.

(٦) هەمان ژێدەر، ص۱۲۱.

(۷) ادونيس، الشعرية العربية، دار الاداب، بيروت، ۱۹۸٥، ص٦.

(۸) بدوي طبانة، التيارات المعاصرة في النقد الادبي، دار الثقافة، بيروت، ۱۹۸٥، ص۷۸.

(۹) منيف موسى، في الشعر و النقد، دار الفكر اللبناني، بيروت،۱۹۸٥، ص۲۷- ۲۸.

(۱۰) ج.م.عبدالجليل، تاريخ ادبيات عرب، ترجمة: آ.آذرنوش، انتشارات اميركبير، چاپ چهارم، تهران، ۱۳۸۱، ص٦۰.

(۱۱) هەمان ژێدەر، ص٥۹.

(۱۲) محي الدين صبحي، نظرية النقد العربي و تطورها الى عصرنا، الدار العربية للكتاب، القاهرة، بدون سنة، ص۱۳.

(۱۳) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص۱۳- ۱٤

(۱٤) ايڤالد ڤاگنر.اسس الشعر العربي الكلاسيكي الشعر العربي القديم،...، ۲۰

(۱٥) منيف موسى، في الشعر و النقد...، ص۲۹- ۳۰

(۱٦) عبدالقادر القگ، في الشعر الاسلامى و الاموى، دار المعارف، قاهره، بدون سنه، ص۳۸٦

(١٧) هەمان ژێدەر، ص٣٨٦.

(١٨) منيف موسى، في الشعر و النقد...، ص٣٠.

(١٩) عبدالحكيم حسان.الادب المقارن و التراث الاسلامية، مكتبة الاداب، قاهرة، بدون سنة، ص١٠.

(٢٠) منيف موسى، في الشعر و النقد...، ص٣٠- ٣١.

(٢١) ابتسام مرهون الصفار، فضاءات في الادب العربي القديم،...، ص٢١٢.

(٢٢) محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث، دار العودة، بيروت، ١٩٧٣، ص١٥٩.

(٢٣) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد، دار المعارف، اسكندرية، بدون سنة، ص١٢٨.

(٢٤) محمد زكي العشماوي، دراسات في النقد الادبي المعاصر، دار الشروق، بيروت، ١٩٩٤، ص١٠٣- ١٠٤.

(٢٥) محمد غنيمي هلال، الادب المقارن،...، ص١١١.

(٢٦) شبلى نعمان، شعر عجم يا ادبيات منظوم ايران، ترجمة: سيد محمد تقى فخر داعى گيلانى، تهران، ١٣١٤ه.ش، ص١٠١..

(٢٧) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص٣٣٠

(٢٨) هەمان ژێدەر، ص٣٢٧ )

(٢٩) . ر. ناپ و گلدزيهر، اسلام در ايران شعوبيه.ترجمه: محمد رضا افتخار زاده، نشر ميراثهاى تاريخ ايران و اسلام، تهران ١٩٩٢، ص١٥٦.

(٣٠) ابتسام مرهون الصفار، فضاءات في الادب العربي القديم،...، ص١٣٢وص١٤٣.

(٣١) احمد قربانى، نقد ادبى يا اعدام ادبى، نشر ماز، ١٣٧٨هـ.ش، گوتنبرگ، ص١١- ١٢.

(٣٢) ذبيح الله صفا، شعوبيت فردوسى، مجله مهر، شماره١٣٦٠،٥٥.ش، ص٦٢٠- ٦٢١.

(٣٣) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص١٤٣- ١٤٤.

(٣٤) سيروس شميسا، درمعرفت شعر (گزيده المعجم في معايير اشعار العجم)، انتشارات سخن، تهران، ١٣٧٤، ص١٧.

(٣٥) هەمان ژێدەر، ص١٧- ١٨.

(٣٦) هەمان ژێدەر، ص٩٦.

(٣٧) هەمان ژێدەر، ص١٣٥.

(٣٨) حسين فقيهى، ادبيات عربى در متون ادبيات فارسى تا قرن هفتم، انتشارات دانشگاه الزهراء، تهران، ١٣٨١، ص٩- ١٠.

(٣٩) هەمان ژێدەر،ص١٣- ١٥)

(٤٠) هەمان ژێدەر، ص١٥.

(٤١) هەمان ژێدەر، ص١٣.

(٤٢) هەمان ژێدەر، ص١٢.

(٤٣) محمد جعفر محجوب، سبك خراسانى در شعر فارسى،...، ص٥٩- ٦١.

(٤٤) هەمان ژێدەر، ص٢٢.

(٤٥) هەمان ژێدەر، ص١٣٥.

(٤٦) هەمان ژێدەر، ص١٣٥.

(٤٧) هەمان ژێدەر، ص٤٣٣.

(٤٨) هەمان ژێدەر، ص٥٥٨.

(٤٩) شبلى نعمان، شعر عجم يا ادبيات منظوم ايران،...، ص٨٨- ٩٨.

(٥٠) سيروس شميسا، سبك شناسى شعر، انتشارات فردوسى،چاپ هفتم، تهران، ١٣٧٦ه.ش، ص٥٨- ٥٩.

(٥١) سيروس شميسا، درمعرفت شعر (گزيده المعجم في معايير اشعار العجم)،...، ص١٠٧.

(٥٢) احمد قربانى.نقد ادبى يا اعدام ادبى،...، ص١٦.

(٥٣) سيروس شميسا، سبك شناسى شعر،...، ص١٩٢.

(٥٤) هەمان ژێدەر، ص١٩٣.

(٥٥) هەمان ژێدەر، ص١٩٣.

(٥٦) حسين عطوان.مقدمة القصيدة العربية في شعر الجاهلي، دار المعارف، مطابع الدار المعارف، القاهرة، ١٩٧٠، ص١١٤.

(٥٧) سندس محسن حميدي.اتجاهات الاغراض الشعرية نحو المديح (شعر دعبل الخزاعي أنموذجا)، مجلة كلية علوم الاسلامية، جامعة بغداد، العدد ٤٣، الجزء الاول ايلول، ٢٠١٥، ص٣٩٨.

(*) جارنا ژی فارسان جیاوازی ئێخستیه د ناڤبەرا تەغەزول و تەشبیبێ واته وەسا داینه دیارکرن کو ئەگەر بابەتێ پێشەکی ل دور عەشق و جوانیا ئافرەتێ بیت دێ بیته غەزەل و ئەگەر لدور وەسفا سروشتی یان بابەتێن دی بیت دێ بیته تەشبیب.بنێره : (منصور رستگار فرسایی.انواع شعر فارسی، انتشارات نوید شیراز، چاپ دوم، شیراز، ١٣٨٠ه.ش، ص٤٧٥)

(٥٨) سیدمحمدرضا ابن الرسول. تأثیر فرهنگ عربی در غزل فارسی، فصلنامه لسان مبین (پژوهش ادب عربي)، سال دوم، دوره جدید، شماره یک، دیماه، شماره ١٣، ص٣٧.

(٥٩) زهرا سعادتینیا و دیگران، تغزل عربی متن پنهان تغزل فارسی، مجله ادب فارسی، سال ٦، شماره ٢، پاییز و زمستان، ١٣٥٩، شماره پیاپی ١٨،ص٧.

(٦٠) هەمان ژێدەر، ص٨- ١٧.

(٦١) سیروس شمیسا، سیر غزل در شعر فارسی،چاپ سوم،انتشارات فردوسی،تهران،١٣٧٠،ص٤٢.

(٦٢) اسعاد عبدالهادی قندیل، فنون الشعر الفارسی،...، ص٢٠١.

(٦٣) هەمان ژێدەر، ص٢٠١- ٢٠٢.

(٦٤) هەمان ژێدەر، ص٢٠٢.

(٦٥) رشید یحیاوي، الشعریة العربیة الانواع و الاغراض، دار افریقیا الشرق، دارالبیضاء، ١٩٩١.

(٦٦) احمد مطلوب.معجم مصطلحات النقد العربي القدیم، مکتبة لبنان، بیروت، ٢٠٠١، ص٣٢٣.

(٦٧) سیدمحمدرضا ابن الرسول. تأثیر فرهنگ عربی در غزل فارسی،...، ص٣٥.

(٦٨) محي الدین ابو شقرا.مدخل الی سوسیولوجیا الادب العربي، المرکز الثقافي العربي، دار البیضاء، ٢٠٠٥، ص٨٦- ٨٨.

(٦٩) منیف موسی، في الشعر و النقد،...، ص٣٠.

(٧٠) محي الدین ابو شقرا.مدخل الی سوسیولوجیا الادب العربي،...، ص٨٨.

(٧١) سیروس شمیسا، سیر غزل در شعر فارسی،...، ص٤٥.

(٧٢) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القدیم،...، ص٢٢١- ٢٢٢.

(٧٣) سیروس شمیسا، سیر غزل در شعر فارسی،...، ص٥٠.

(٧٤) هەمان ژێدەر، ٥٠.

(٧٥) سيروس شميسا، سير غزل در شعر فارسى،...، ص٥٠.

(٧٦) سيد محمدرضا ابن الرسول. تأثير فرهنط عربى در غزل فارسى،...، ص٤١

(٧٧) سيروس شميسا، سير غزل در شعر فارسى،...، ص٥١

(٧٨) هەمان ژێدەر، ص٥٢

(٧٩) سيد محمدرضا ابن الرسول. تأثير فرهنگ عربى در غزل فارسى،...، ص٣٥.

(٨٠) هەمان ژێدەر، ص٣٧.

(٨١) جلال الدين همايى، فنون بلاغت و صناعات ادبى، انتشارات اهورا، تهران، چاپ اول، ١٣٨٩، ص٩٠.

(٨٢) هەمان ژێدەر، ص٩١.

(٨٣) سيد محمدرضا ابن الرسول. تأثير فرهنگ عربى در غزل فارسى،...، ص٣٦.

(٨٤) احمد مطلوب.معجم مصطلحات النقد العربي القديم،...، ص١٤٣

(٨٥) سيد محمدرضا ابن الرسول. تأثير فرهنگ عربى در غزل فارسى،...، ص٣٨.

(٨٦) جلال الدين همايى، فنون بلاغت و صناعات ادبي،...، ص٩١.

(٨٧) منصور رستگار فرسايى.انواع شعر فارسى، انتشارات نويد شيراز، چاپ دوم، شيراز، ١٣٨٠ه.ش، ص٤٠١.

(٨٨) هەمان ژێدەر، ص٥١٦.

(٨٩) هەمان ژێدەر، ٥١٠.

(٩٠) اسعاد عبدالهادى قنديل، فنون الشعر الفارسى،...، ص٢٠٢.

(٩١) ميمنت ميرصادقى، واژنامه هنر شاعرى،...، ص١٨٨و٢٠٨.

(٩٢) سيروس شميسا، سبك شناسى شعر،...، ص٣٠٠.

(٩٣) منصور رستگار فرسايى.انواع شعر فارسى،...، ٥١٣- ٥١٤.

(٩٤) زهره احمدى پور انارى و ديگران.بررسى تخلص در غزل هاى نظيرەوار دوره بازگشت، مجله فنون ادبى، سال دوم، شماره١، تابستان١٣٨٩، ص٣٣.

(٩٥) ضياءالدين سجادى و طلعت بصارى.سبكها و مكتبهاى ادبى، انتشارات آرمان، تهران، بدون سال، ص٢٣.

(٩٦) هەمان ژێدەر، ص٢٦٠

(٩٧) هەمان ژێدەرص٢٦٠

(٩٨) منصور رستگار فرسایی، انواع شعر فارسی،...، ص٤٩٧

(٩٩) محمد جعفر محجوب، سبک خراسانی در شعر فارسی،...، ص٥٦٢.

(١٠٠) منصور رستگار فرسایی، انواع شعر فارسی،...، ص٤٦٧.

(١٠١) اسعاد عبدالهادی قندیل، فنون الشعر الفارسی، دار الاندلس، الطبعة الثانیة، بیروت، ١٩٨١، ص٢٢٩- ٢٣٠.

(١٠٢) جلال الدین همایی، فنون بلاغت و صناعات ادبی،...، ص ١٠٤.

(١٠٣) محمد رضا شفیعی کدکنی، صور خیال در شعر فارسی،...، ١٨٥.

(١٠٤) محمد جعفر محجوب، سبک خراسانی در شعر فارسی،...، ص٢١.

(١٠٥) جلال الدین همایی، فنون بلاغت و صناعات ادبی،...، ص١٠٨.

(١٠٦) اسعاد عبدالهادی قندیل، فنون الشعر الفارسی،...، ص١٦٧.

(١٠٧) هەمان ژێدەر، ص١٦٨.

(١٠٨) منصور رستگار فرسایی.انواع شعر فارسی،...، ص٤٥١.

(١٠٩) سیروس شمیسا، درمعرفت شعر (گزیده المعجم في معاییر اشعار العجم)،...ص ١٢٣. [١٠٩]

(*) کلیله و دمنه دبنەرەتدا هندییە، لێ بەری هاتنا ئیسلامەتیێ هاتییە وەرگێران بۆ سەر زمانێ پەهلەوی .

(١١٠) حسین فقیهی، ابیات عربی در متون ادبیات فارسی تا قرن هفتم،...، ص٦- ٧.

(١١١) محمد جعفر محجوب، سبک خراسانی در شعر فارسی،...، ص١٠٠.

(١١٢) جلال خالقی مطلق، از شاهنامه تا خداینامه، http/www Noufa.com.

منصور رستگار فرسایی.انواع شعر فارسی،...، ص٤٠٤- ٤٠٦. ١١٣

(١١٤) هەمان ژێدەر، ص٤٠٦.

(١١٥) شبلی نعمان.شعر عجم یا ادبیات منظوم ایران،...، ص٥١.

(١١٦) منصور رستگار فرسایی.انواع شعر فارسی،...، ص٤٣٣- ٤٣٥.

(١١٧) جلال خالقی مطلق.تن کامەسرایی در ادب فارسی، مجموعه گذشته و آینده ادب فارسی، گنجینه ٢٢، ١٣٩١، ص٧٣.

(١١٨) سحر سامي. شعرية النص الصوفي في الفتوحات المكية، الهيئة المصرية العامة للكتاب، قاهرة، ٢٠٠٥، ص٥٤.

(١١٩) هەمان ژێدەر، ص٤٥.

(١٢٠) محمد عبدالمنعم خفاجي.الادب في التراث الصوفي، دار غريب، قاهرة، بدون سنة، ص٦٣.

(١٢١) احمد مطلوب.في المصطلح النقدي،...، ص٢٢٢.

(١٢٢) هەمان ژێدەر، ص٢٢٢.

(*) بۆ زانيارييێن زێدەتر دەربارەی هەر دوو زاراڤێن تەوەرێ ستوونی و ئاسۆييێ خەيالا شعری، بنێرە بابەتێ كاريگەريا لاساييكرنێ لسەر وێنەيێ گشتيێ شعرێ.

(١٢٣) محمد رضا شفيعی كدكنی، صور خيال در شعر فارسی،...، ص١٨٦.

(١٢٤) هەمان ژێدەر،ص٢١٨.

(١٢٥) هەمان ژێدەر، ص١٨٦.

(١٢٦) سيروس شميسا، كليات سبک شناسی، نشر ميترا، چاپ دوم، تهران، ١٣٨٨ه.ش، ص٨٩.

(١٢٧) محمد عبدالمنعم خفاجي.الادب في التراث الصوفي،...، ص١٦٧.

(١٢٨) شەعبان چالی. شێوازی شيعری جزيری، سپيرێز، دهوك، ٢٠٠٨، ص٧٧.

(١٢٩) سيروس شميسا، درمعرفت شعر (گزيده المعجم في معايير اشعار العجم) ،...، ص ١٠٢- ١٠٣. ١٢٩

(١٣٠) هەمان ژێدەر، ص٤٣- ٤٤. ١٣٠

(*) مەبەستا وی عراقا عەجەم يانكو ناڤەند و رۆژئاڤا ئيرانێيە.

(**) مەبەست شعرا دەری يانكو تەغەزولێن دەڤەرا سەبكێ خوراسانييە.

(١٣١) سيروس شميسا، درمعرفت شعر (گزيده المعجم في معايير اشعار العجم)،...، ٣٤ص- ٣٥.

(*) چێدبيت مەبەست ژ اورامين يان اورامان هەمان هەورامان بيت.

(١٣٢) سيروس شميسا، درمعرفت شعر (گزيده المعجم في معايير اشعار العجم)،...، ص١٠٧.

(١٣٣) http://amiralavi.persianblog.ir سيد علی مير افضلی، خاستگاه رباعی و دوبيتی،

(١٣٤) علاءالدين سجادی، مێژووی ئەدەبی كوردی، چاپی دووەم، بغداد، ١٩٧١، ل٤١- ٨١.

(١٣٥) مارف خەزنەدار، مێژوویی ئەدەبی کوردی بەرگی یەکەم، هەولێر، ئاراس، ٢٠٠١، ل١٥٨-  ١٦٠.

(١٣٦) سید علی میر افضلی. خاستگاه ڕباعی و دوبیتی، ...

(١٣٧) هەمان ژێدەر، ...

(١٣٨) پەرویز سپیتمان (اذکیایی).ترانەهای باباگاهر، انتشارات مادستان، همدان، ١٣٨٦، ص١.

(١٣٩) مارف خەزنەدار، مێژوویی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم،...، ل١٨٧-  ١٨٨.

(١٤٠) محمد امین هەورامی.زاری زمانی کوردی لە تەرازووی بەراورد دا، بەغداد،١٩٨١، ل١٧.

(١٤١) مارف خەزنەدار، مێژوویی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم،...، ل١٦٢.

(١٤٢) هەمان ژێدەر، ل١٦٠.

(١٤٣) مارف خەزنەدار، مێژوویی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم،...، ل١٦٠.

(١٤٤) صدیق صفی زادە بۆرەکەیی. مێژووی وێژەی کوردی، بەرگی یەکەم،هەولێر، ئاراس، ٢٠٠٨، ص٤١-  ٨٢.

(١٤٥) ئەنوەر قادر محمد، لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، دەزگای سەردەم، سلیمانی، ٢٠٠٧، ل٢١.

(١٤٦) هەمان ژێدەر،ل٣٧.

(١٤٧) هەمان ژێدەر، ل٧.

(١٤٨) مارف خەزنەدار، مێژوویی ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم، ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢، ١٤٤-  ١٤٥.

(١٤٩) هەمان ژێدەر،...، ل١٤٥.

(١٥٠) مارف خەزنەدار، مێژوویی ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم،...، ل٢٤٧.

(١٥١) هەمان ژێدەر، ل٢٧١.

(١٥٢) شەعبان چالی. شێوازی شیعری جزیری،...، ل١٩٠.

(*) نموونە بنێرە: حافظ(دیوان)، تصحیح و توضیح:پرویز ناتل خانلری، جلد دوم، انتشارات خوارزمی، چاپ دوم، ١٣٧٥.د ڤێ چاپێدا ب تنێ تەرکیب بەندەك دهێتە دیتن.

(١٥٣) شەعبان چالی. شێوازی شیعری جزیری،...، ل٨٤

(١٥٤) نظيرى (ديوان)، مطبعه: نامى كريمى، لاهور، ١٩٢٨، ص٥٩، ١٣٩، ١٥٠، ١٥٣.

(١٥٥) جزيرى (ديوان)، شەرح: هەژارى موكريانى، انتشارات سروش، تهران، ١٣٦١، ل١٤٤، ١٤٨، ١٥٥، ٢٨٣، ٢٩٥، ٣٨٣، ٥٩٧، ٦٠٢.

(١٥٦) ئەحمەدێ خانى. مەم و زين، پشكا ئێكێ، شرۆڤەكرن: پەرويز جيهانى، دەزگەهێ سپيرێز، دهوك، ل١٣.

(١٥٧) هەمان ژێدەر، ل٤٥.

(١٥٨) حيدر عمر. احمد خاني في الملحمة مم و زين، مطبعة العجلوني، دمشق،١٩٩١، ص٢٩.

(*) هەر چەندە كو نهو پتر ئەڤ باوەريە جێگيربوويە كو نالى هەتا سالا ١٨٧٧ز ژيايە.

(١٥٩) ئەنوەر قادر محمد، ليريكاى شاعيرى گەورەى كورد مەولەوى،...، ص٢٢.

(١٦٠) مارف خەزنەدار، مێژوويى ئەدەبى كوردى، بەرگى سێيەم، دەزگاى ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٣، ل٣٧.

(١٦١) مارف خەزنەدار، مێژوويى ئەدەبى كوردى، بەرگى يەكەم، ...، ل١٦٠.

(١٦٢) ضياءالدين سجادى و طلعت بصارى، سبكها و مكتبهاى ادبى،...، ص٢٣

(١٦٣) كوردى (ديوان)، لێكۆلينەوە:محەمەد مستەفا (حەمە بۆر)، بەرگى يەكەم، ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠، ل٣٥- ٣٦.

(١٦٤) هەمان ژێدەر، ل٣٤- ٣٥.

(١٦٥) مارف خەزنەدار، مێژوويى ئەدەبى كوردى، بەرگى سێيەم،...، ل١٦٨.

(١٦٦) هەمان ژێدەر، ل١١٧.

(١٦٧) كامل حسن بەصير، وێژەى كوردى و رەخنەسازى، دار الجاحظ، بغداد، ١٩٩٠، ل٥٦- ٥٧.

(١٦٨) عبدالرزاق بيمار، خوێندنەوەيەكى تازەى هەلبەستى كوردى، دەزگاى ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٢٥.

(١٦٩) محمد حسين الاعرجي، الصراع بين القديم و الجديد في الشعر العربي،...، ص٩.

(١٧٠) هەمان ژێدەر، ص٢٠.

(١٧١) عصام القصبجي، اصول النقد العربى القديم،...، ص١٢٣- ١٢٤.

(١٧٢) منيف موسى، في الشعر و النقد،...، ص٢٨.

(١٧٣) ادونيس، الشعرية العربية،...، ص٤١.

(١٧٤) هەمان ژێدەر،ص٤٠.

(١٧٥) محمد حسين الاعرجي، الصراع بين القديم و الجديد في الشعر العربي،...، ص١٩.

(١٧٦) محمد تحريشي، ادوات النص، منشورات اتحاد كتاب العرب، دمشق، بدون سنة، ص٤٠.

(١٧٧) بدوي طبانة، التيارات المعاصرة في النقد الادبي،...، ص٨٠.

(١٧٨) داود سلوم، مقالات في تاريخ النقد العربي، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨١، ص٨٥.

(١٧٩) عوضي الوكيل، الشعر بين الجمود و التطور، المؤسسة المصرية العامة، قاهرة، ١٩٦٤، ص٨٠.

(١٨٠) محمد تحريشي، ادوات النص،...، ص٣٦- ٣٧.

(١٨١) مصطفى السعدني، في التناص الشعري،...، ص٨٢.

(١٨٢) ايظالد ڤاگنر.اسس الشعر العربي الكلاسيكي الشعر العربي القديم،...، ص٦٧.

(١٨٣) حسين الحاج حسن.النقد الادبي في اثار اعلامه، المؤسسة الجامعية للدراسات و النشر، بيروت، ١٩٩٦، ص١٣٨.

(١٨٤) محمد عبدالعظيم.في ماهية النص الشعري، مؤسسة الجامعية للنشر، بيروت، ١٩٩٤، ص١٤.

(١٨٥) محمد جعفر محجوب، سبک خراسانی در شعر فارسی،...، ص٢٧- ٢٨.

* موخەزرەم (مخضرم) ئەو شاعرێن عەرەبن کو ل هەر دوو قوناغێن جاهلی و ئیسلامیدا ژیابن.

(١٨٦) داود سلوم، مقالات في تاريخ النقد العربي،...، ص٢٥٥.

(١٨٧) احمد بن عمر بن على نظامى سمرقندى، ضهار مقالة، تصحيح و اهتمام: محمد قزوينى، انتشارات ارمغان، تهران، بدون سال، ص٤٧.

(١٨٨) نادر وزين پور. مدح داغ ننگ بر سيماى ادب فارسى، انتشارات معين، تهران، ١٣٧٤، ص١٣٩.

(١٨٩) مصطفى السعدني، في التناص الشعري،...، ص٨١.

(١٩٠) قاسم الرويس. حينما فقد ابو نواس الذاكرة،
http://www.alriyadh.com

(١٩١) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص١٢٨.

(١٩٢) مصطفى السعدني، في التناص الشعري،...، ص٨٣.

(١٩٣) هەمان ژێدەر، ص٨١.

(١٩٤) محمد حسين الاعرجي، الصراع بين القديم و الجديد في الشعر العربي،...، ص١٩.

(١٩٥) محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث،...، ص١٧٢.

(١٩٦) داود سلوم، مقالات في تاريخ النقد العربى،...، ص١٥١.

(١٩٧) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص١٨٣.

(١٩٨) محمد حسين الاعرجي، الصراع بين القديم و الجديد في الشعر العربي،...، ص٥٢.

(١٩٩) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد،...، ص٢٢٩.

(٢٠٠) حسين الحاج حسن.النقد الادبي في اثار اعلامه،...، ص١٨.

(٢٠١) هەمان ژێدەر،ص١٨- ١٩.

(٢٠٢) احمد مطلوب، في المصطلح النقدي،...، ص١١٨.

(٢٠٣) محمد جعفر محجوب، سبك خراسانى در شعر فارسى،...، ص٢٥- ٢٧. [٢٠٣]

(٢٠٤) هند حسين طه، النظرية النقدية عند العرب، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨١، ص١٨١.

(٢٠٥) هەمان ژێدەر، ص١٨٧.

(٢٠٦) عزالدين المناصرة، علم التناص المقارن (نحو منهج عنكبوتي تفاعلي)،...، ص٢١٣.

(٢٠٧) انعام خوالي عكاوي، المعجم المفصل في الادب، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٢، ص٥٢٤.

(٢٠٨) عبدالعزيز عتيق، في النقد الادبي، دار النهضة العربية،...، ص٣٢٩.

(٢٠٩) عزالدين المناصرة، علم التناص المقارن (نحو منهج عنكبوتي تفاعلي)،...، ص٢١٣.

(٢١٠) هەمان ژێدەرص١٨٥.

(٢١١) سيروس شميسا، درمعرفت شعر (گزيده المعجم في معايير اشعار العجم)، ....، ص٢٣٤- ٢٤٣.

(٢١٢) عصام القصبجي، اصول النقد العربى القديم،....، ص١٢٦.

(٢١٣) مصطفى السعدني، في التناص الشعري،....، ص٤٣.

(٢١٤) عبدالعزيز عتيق، في النقد الادبي،....، ص٣٢٧.

(٢١٥) مصطفى السعدني، في التناص الشعري،....، ص٥١.

(٢١٦) داود سلوم، مقالات في تاريخ النقد العربى،....، ص٦٢- ٦٣.

(٢١٧) هەمان ژێدەر، ص٧٩.

(٢١٨) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،....، ص١٢٦.

(٢١٩) محمد عبدالكريم حسين، عمود الشعر، دار النمير، دمشق، ٢٠٠٣، ص٥٩- ٦٢.

(٢٢٠) احمد مطلوب.في المصطلح النقدي،....، ص١٥٦.

(٢٢١) هەمان ژێدەر، ص١٥٥.

(٢٢٢) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،....، ص٢١٥.

(٢٢٣) محمد عبدالكريم حسين، عمود الشعر،....، ص١٥١- ١٥٣.

(٢٢٤) هەمان ژێدەر، ص١٥٦- ١٥٩.

(٢٢٥) هەمان ژێدەر ص١٦٠- ١٦١.

(٢٢٦) هەمان ژێدەر،....، ص١٦٨.

(٢٢٧) هەمان ژێدەر، ص١٧٨- ١٧٩.

(٢٢٨) سيروس شميسا، درمعرفت شعر (گزيده المعجم في معايير اشعار العجم)،....، ص١٨٦.

(٢٢٩) شبلى نعمان.شعر عجم يا ادبيات منظوم ايران،....، ص٥٧.

(٢٣٠) عبدالحسين زرين كوب، ارسطو و فن شعر،....، ص١٠٨- ١٠٩.

(٢٣١) خليل الموسى، وحدة القصيدة بين ارسطو و نقاد العرب القدماء،....، ص٣٩.

(٢٣٢) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد، دار المعارف، اسكندرية، بدون سنة، ص٣٦.

(٢٣٣) خليل الموسى، وحدة القصيدة بين ارسطو و نقاد العرب القدماء،....، ص٣٤.

(٢٣٤) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،....، ص٥٧.

(٢٣٥) قصي الحسين، سوسيولوجية الادب،....، ص١٥١.

(٢٣٦) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص١٣٤.

(٢٣٧) هەمان ژێدەر، ص١٣٥.

(٢٣٨) هەمان ژێدەر، ص١٣٣.

(٢٣٩) هەمان ژێدەر، ص١٣٥.

(٢٤٠) هەمان ژێدەر، ص٨٩.

(٢٤١) قصي الحسين، سوسيولوجية الادب،...، ص١٧٠.

(٢٤٢) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص١٣٣.

(٢٤٣) نبيل رِشاد نوفل.العلاقات التصويرية بين الشعر العربي و فن الاسلامي، دار المعارف، اسكندرية، بدون سنة، ص٨٠.

(٢٤٤) حسين الحاج حسن.النقد الادبي في اثار اعلامه،...، ص١٧.

(٢٤٥) عدنان بن ذريل.النص و الاسلوبية بين النظرية و التطبيق، اتحاد كتاب العرب، دمشق، ٢٠٠٠، ص٥٣.

(٢٤٦) محمد عيد.قضايا معاصرة في الدراسات اللغوية و الادبية، عالم الكتب، قاهرة، ١٩٨٩،، ص١١٣.

(٢٤٧) شوقي ضيف.البلاغة تطور و تاريخ، الطبعة الحادية عشر، دار المعارف، بدون سنة، ص٢٨٧.

(٢٤٨) حسين الحاج حسن.النقد الادبي في اثار اعلامة،...، ص٢٢

(*) مەبەست ژ موتەكلیمان زانایێن زانستێ كەلامێنە، واتە ئەوێن كو هەولددان ب رێكا ئایەت و فەرموده و بەلگەئینانا عەقلی ڕاستبوونا بنەمایێن ئایینێ بسەلمیینن و گومانێ لدور نەهێلن.

(٢٤٩) عبدالحكيم راضي، دراسات في النقد العربي،...، ص١٨٠

(٢٥٠) شوقي ضيف، الفن و مذاهبه في الشعر العربي، لجنة التاليف و الترجمة و النشر، قاهرة، ١٩٤٣،ص٧.

(٢٥١) عبدالحكيم راضي، دراسات في النقد العربي،...، ص١٨٠- ١٨١.

(٢٥٢) احمد بن عمر بن على نظامى سمرقندى، *ضهار مقالة*،...، ص٤٨.

(٢٥٣) هەمان ژێدەر، ص٥٦- ٥٧.

(٢٥٤) داود سلوم، مقالات في تاريخ النقد العربى،...، ص٢٦١.

(٢٥٥) شوقي ضيف. الفن و مذاهبه في الشعر العربى،...، ص٤.

(٢٥٦) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد،...، ص٣٤٥.

(٢٥٧) عاطف جودة نصر.الخيال مفهوماته و وظائفه، دار نوبار، قاهرة، ١٩٩٧، ص٢٠٣- ٢٠٤.

(٢٥٨) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد،...، ص٣٦١- ٣٦٢.

(٢٥٩) محي الدين صبحي، نظرية النقد العربي و تطورها الى عصرنا،...، ص٣٤.

(٢٦٠) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص١٣٠.

(٢٦١) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد،...، ص٣٥٣.

(٢٦٢) هەمان ژێدەر، ص٣٦٥.

(٢٦٣) محمد الحليوي.مباحث و دراسات ادبية، الشركة التونسية للتوزيع، تونس، بدون سنة، ص٨٨.

(٢٦٤) منيف موسى، في الشعر و النقد،...، ص١٣.

(٢٦٥) سيد قطب، النقد الادبي اصولة و مناهجة، دار الشروق، الطبعة الثامنة، قاهرة، ٢٠٠٣، ص٧٩- ٨٠.

(٢٦٦) عاطف جودة نصر.الخيال مفهوماته و وظائفه،...، ص١٩٩.

(٢٦٧) محي الدين صبحي، نظرية النقد العربي و تطورها الى عصرنا،...، ص١٢٢.

(٢٦٨) وهيب طنوس، نظام التصوير الفني في الادب العربي، منشورات جامعة الحلب، حلب، ١٩٩٣، ص١٣٣.

(٢٦٩) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص١٨٤.

(٢٧٠) هەمان ژێدەر، ص١٨٤- ١٨٥.

(٢٧١) هەمان ژێدەر، ص١٨٤- ١٨٥.

(٢٧٢) وهيب طنوس، نظام التصوير الفني في الادب العربي،...، ص١٣٣.

(٢٧٣) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص١٢٠.

(٢٧٤) نجوى صابر.النقد الاخلاقي اصوله و تطبيقاته، دار العلوم العربية، بيروت، ١٩٩٠، ص٧٦.

(٢٧٥) هەمان ژێدەر، ص٦٨.

(٢٧٦) محي الدين صبحي، نظرية النقد العربي و تطورها الى عصرنا،...، ص١٣.

(٢٧٧) وهيب طنوس، نظام التصوير الفني في الادب العربي،...، ص١٣٣.

(٢٧٨) احمد قربانى.نقد ادبى يا اعدام ادبى،...، ص١٤.

(٢٧٩) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد،...، ص٢٨٢.

(٢٨٠) داود سلوم، مقالات في تاريخ النقد العربى،...، ص٢٦٢.

(٢٨١) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد،...، ص١٧- ١٨.

(٢٨٢) هەمان ژێدەر، ص٢٢.

(٢٨٣) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد،...،ص٢٤.

(٢٨٤) هەمان ژێدەر،ص٢٥.

(٢٨٥) هەمان ژێدەر، ص٣٥٨.

(٢٨٦) جلال الدين همايى، معانى و بيان، نشر هما، تهران، ١٣٧٠، ص٢١.

(٢٨٧) رجاء عيد.المذهب البديعي في الشعر و النقد،...، ص٢٨.

(٢٨٨) حميد زرين كوب، مجموعة مقالات، انتشارات معين، تهران، ١٣٦٧، ص٧١.

(٢٨٩) رجاء عيد، المذهب البديعي في الشعر و النقد،...، ص٤٦- ٤٧.

(٢٩٠) شوقي ضيف.البلاغة تطور و تاريخ،...، ص٣١٢.

(٢٩١) مهدى محبتى. بديع نو، انتشارات سخن، تهران، ١٣٨٠، ص١٩٤- ١٩٦.

(٢٩٢) تقى كاميار وحيديان، بديع از نگاه زيباشناسى، انتشارات دوستان، تهران، ١٣٧٩، ص١٣.

(٢٩٣) هەمان ژێدەر، ص١٣.

# پشكا سێیێ

## (كاریگەرییا لاساییكرنێ لسەر وێنەیێ پاژەیی و گشتیێ شعرا كلاسیكییا كوردی )

- **دەروازە:**
  - كاریگەرییا لاساییكرنێ لسەر وێنەیێن پاژەیی:
  - لاساییكرنا وێنەیێن شعرا كەڤن وەك ژێدەرێ سەرەكیێ ئاڤاكرنا وێنەیان:
  - كاریگەرییا لاساییكرنا سیستەمێ ڕوونبێژی و وێنەسازییا شعرا كەڤن

- **كاریگەرییا لاساییكرنێ لسەر وێنەیێ گشتیێ شعرێ**
  - بەردەوامبوونا مەبەستێن شعری و هەبوونا وێنەیەكێ گشتیێ لاساییكری
  - رۆلێ سیستەمێ قەسیدە و فرەمەبەستیێ
  - رۆلێ ئێكەتییا تاكەدێرێ

# دەروازە

ل بەشێن بوری مە ئەڤ چەندە دا خویاکرن کو ئەگەر لاساییکرن د کلاسیزما ئورۆپیدا لسەر بناغەیێ نموونەییکرنا بەرهەمێن داستانی و دراميێن کەڤن هاتبیتە ئاڤاکرن و ڤەکۆلینێن ئەدەبی و بەرهەمێن ڕەخنەیی ڕۆلەکێ سەرەکی د چەسپاندنا ڤێ لاساییکرنێ هەبن؛ د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا ژی قەسیدە نموونەیا لاساییکرنا شاعران بوویە و ڤەکۆلینێن شعری و ڕەوانبێژیێن موسلمانان ژی بووینە هۆکارەك بۆ بەردەوامبوونا ئەدگارێن ڤێ نموونەیا شعری و چەسپاندنا تایبەتمەندییێن وێ ل ژێر ناڤێ چەمکێ شعر یان یاسا و مەرجێن ڤەهاندنا شعرێ.

پرانیا ئەدگار و تایبەتمەندییێن شعرا کلاسیکییا فارسی و کوردی ب تایبەت یێن کو ل ژێر ناڤێ قەسیدە و غەزەلێ یان ئەو قالبێن کو لسەر بنەمایێ لاساییکرنا نموونەیا قەسیدەیێ هاتینە دانان وەکو (تەرجیع بەند و تەرکیب بەند )، بەرهەمێ لاساییکرنا تایبەتمەندییێن قەسیدەیا کەڤنن؛لاساییکرنەك کو ژ لایەکیڤە شاعر ب ڕێکا چاڤلێکرنا بەرهەمێن بەری خۆ بەردەوامیێ پێ ددەن و ژ لایەکێ دیڤە ڕەخنەگر و ڤەکۆلەر ل ژێر ناڤونیشانێن جیاواز هەولا ب یاساکرن و پیدڤیبوونا وان ددەن.ئەڤ چەندە پرانیا تایبەتمەندییێن ڕیتمی و زمانی و واتایی و جوانکاری و وێنەییێن شعرێ ب خۆ ڤە دگریت، لێ ڤەکۆلینا مە ب تنێ لسەر لاساییکرنا وێنەیێ شعری و ڕەنگڤەدان و کاریگەرییا وێ د شعرا کلاسیکییا کوردیدایە.

بەری بچینە سەر بابەتێ کاریگەرییا لاساییکرنێ لسەر وێنەیێ شعرا کلاسیکییا کوردی، ب فەر دزانین کو مەبەستا خۆ ژ وێنەی بدەینە دیارکرن.پێناسەکرنا زاراڤێ وێنەی پرانیا جاران هەڤدەمە لگەل لێلی و نەبوونا هویربینیێ، (ئالۆزە چونکە مرۆڤ دشێت وێ ب واتایەکا لێل و گەلەك بەرفرەهـ بکاربینیت، ئەڤە ژی ل وی دەمی کو ئەم ڤی زاراڤی ب دیتنەکا شێوازییا تایبەت بکاربینین، هویربین ژی نینە دەمێ کو ئەم وێ ب نێرینا ڕەوانبێژی باس بکەین، چونکە ئەڤ نێرینە ژی سنووردارە و هویربینی تێدا نینە)[1]. ب شێوەیەکێ گشتی ئالۆزی و لێلیەکا زۆر د ڤەکۆلینێن ئەدەبیدا سەبارەت ب دەستنیشانکرنا چەمکێ وینەی دهێتە دیتن، ئەڤ ئالۆزیە دگەهیتە وی ڕادەی کو دشێین بێژین تێگەهشتنێن بێ سنوور بۆ ڤێ چەندێ هەنە.[2]

ئەستەمبوونا دەستنیشانکرنا چەمکێ وێنەی بۆ گەلەك ئەگەران دزڤریت، ژ ڤان ئەگەران دشێین ئاماژەیێ بدەینە باوبوونا ڤی زاراڤی د زانستێن جودا جودا دا، جیاوازبوونا ڕێباز و بزاڤ و میتۆدێن ڕەخنەییێن کو گرنگیێ پێ ددەن و بەرفرەهییا وێنەی کو دشێت گەلەك ژ لایەنێن داهێنانا مرۆڤی ب خۆڤە بگریت، ئەڤە هەمی دبنە ئاستەنگ د ڕێکا دانانا پێناسەیەکا دیارکری دا.[3] ژبلی ڤێ چەندێ (وێنە تەڤلی گەلەك چەمکێن دی دبیت هەر ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرێ فرەواتاییا ڤی زاراڤی، ڤان چەمکان ژی پەیوەندیەکا موکوم لگەل وێنەیێ ئەدەبی هەیە، هەر لسەر ڤی بناغەی د چارچووڤێ تیۆری و شرۆڤەکرنا ڕەخنەییدا زراڤێن وەکو ڕەنگڤەدان، نواندن، دەربڕین، مرۆڤگەرایی دهێنە بکارهینان و دبنە سیبەرێن وێنەی...)[4].

سەرەرای ئەڤ ئالۆزی و لێلییا کو لدور چەمک و پێناسەیا وێنەی د شعرێدا هەیە، ئەم دێ هەولدەین ب نێرینەکا بەرفرەهـ تەماشەی وێنەی بکەین، واتە ب تنێ پشتبەستنێ لسەر چەمکەکێ سنووردار کو چەند جۆرە وێنەیەکێ دیارکری ب خۆڤەدگریت ناکەین.ئەم لسەر بناغەیێ دوو خالان دێ بەرێ خۆ دەینە وێنەی د شعرێدا:

١. وێنە د شعرێدا ب دوو ئاوایان خۆیا دبیت: وێنەیێ پاژەیی و وێنەیێ گشتی. مەبەست ژ وێنەیێ پاژەیی ئەو وێنەنە کو دیمەنەکێ دیارکری یان سەقایەکێ دیارکری وێنە دکەن، وێنەیێ گشتی ژی ئەو وێنەیە کو ژ کۆمەکا وێنەیێن پاژەیی پێکهاتبیت، چێدبیت ئەڤ وێنەیە تەڤایا دەقی ب خۆڤە بگریت، هەر وەسا چێدبیت دەقەك ژ چەند وێنەیێن گشتی پێکهاتبیت. وێنەیێ پاژەیی دۆخەکێ دیارکری ژ دیمەنەکی پێشکێش دکەت و سۆزەکا دیارکری ب خۆڤە دگریت، لێ وێنەیێ گشتی پتر ژ دیمەن و دۆخەکی بخۆڤەدگریت چونکە بریتیە ژ کۆمەکا وێنەیێن پاژەیێن تێکچرژاو.[٥]

٢. وێنەیێن پاژەیی ژی ب تنێ بریتی نینن ژ ئەو وێنەیێن کو د چارچووڤێ ڕەوانبێژی و ب تایبەت ڕوونبێژییێدا هاتینە باسکرن. (هندەك هەولا سنووردارکرنا وێنەی د چارچووڤێ هونەرێن ڕەوانبێژییێ واتە لێکچواندن و خواستن و درکە و مەجازێدا ددەن. ئەو گرنگیێ ددەنە هندەك وێنەیێن پاژەیی... لێ وێنە ب تنێ وێنەیێن ڕەوانبێژییێ ب خۆڤە ناگریت چونکە چەمکێ نوییێ وێنەی گەلەك جاران ڤالایە ژ هەر جۆرە مەجازەکی، یانکو چێدبیت وێنە بریتی بیت ژ هندەك دەربڕینێن حەقیقی و دەلالەتێ لسەر خەیالەکا دەولەمەند بکەت...)[٦]. وێنە د چارچووڤێ ئەدەبێدا پەیوەستە ب زمانیڤە، پێکهاتەیەکە و بناغەیێ وێ پەیڤ و پەیوەندییا پەیڤان ب هەڤدوویە. ((وێنە بەرهەمێ پێکهاتەکا نوییا پەیڤانە یانکو بریتی نینە ژ چ هەلبژاردنێن دەستنیشانکری بۆ وێنەی).[٧] (سی دی لویس) سەبارەت ب ڤێ چەندێ دبێژیت: (( وێنە نیگارەکە کو ژپەیڤان پێک دهێت. وەسف و لێکچواندن و مەجاز دشێن وێنەیان پێشکێش بکەن، ژبلی ڤێ چەندێ چێدبیت وێنە ب ڕێکا دەربڕین یان ڕستەیێن کو وەسفێن ڕاستەوخۆ بسەر وان زالن بهێتە پێشکێشکرن، گرنگترین مۆرکێ وێنەی بینراوبوونا وێیە...)٨، یانکو (وێنە د ئەدەبێدا بریتیە ژ دارشتنەکا زمانییا تایبەت کو ب ڕێکا وێ واتا ب ئاوایەکێ نوی و داهێنەرانە دهێنە نواندن)[٩].

## ٣.١. كاريگەرييا لاساييكرنێ لسەر وێنەيێن پاژەيى:

### ٣. ١. ١. لاساييكرنا وێنەيێن شعرا كەڤن وەك ژێدەرێ سەرەكيێ ئاڤاكرنا وێنەيان:

هاندانا شاعران بۆ ژبەركرن و پێرەويكرنا شعرا كەڤن، ب نموونەييكرنا شعرا كەڤن و گرێدانا چەمكێ شعرێ ب نموونەيەكا دياركريڤە، چەسپاندنا ڤێ هزرێ كو شاعرێن بەرێ هەمى واتا ب داوى ئينانە و چ بۆ شاعرێن نوى نەهێلاينە، پشتبەستن ب درەوبوونا شعرێ و پەيوەستنەبوونا وێ ب ئەزموون و ژيانا شاعرى، سەرخستنا لەفزێ لسەر واتايێ و فەرامۆشكرنا رۆلێ واتايێ، ئازراندنا دزييا ئەدەبى بۆ پاراستنا ئەدگارێن شعرا كەڤن؛ بهێزترين فاكتەرن بۆ ڤێ چەندێ كو شاعرێ كلاسيكيێ رۆژهەلاتا ئيسلامى پتر پشتبەستنێ لسەر وەرگرتنا وێنەيێن سواوەيێن شاعرێن بەرێ يان دارشتنا وان ب ئاوييێن جياواز بكەت.

نهۆ پێويستە لسەر ڤێ چەندێ راوەستين كو پشتبەستن ب وێنەيێن شاعرێن بەرێ چ وەكو لاساييكرنەكا نێگەتيڤ، واتە دووبارەكرنا وان بێ ئەنجامدانا چ گۆهرينێن ريشەيى، يان لاساييكرنا پۆزەتيڤ واتە بكارهينانا وان ب ئاوايەكێ نوى و جياواز، تا چ رادە كارتێكرنێ لسەر ناسنامەيا وێنەيێ شعرێ و پێكهاتا گشتييا شعرێ دكەت. دهێتە گوتن كو ((وێنە ژيان و شكۆمەندييا شعريە))[١٠]، يان شعر ب تنێ ب رێكا وێنەيان دبيتە شعر و بنياتێ سەرەكيێ شعرێ وێنەيە[١١]، ب دەربرينەكا دى ئەستەمە شعر ڤالا بيت ژ وێنەيان لێ خالا گرنگ ل ڤێرێ هێز و موكومييا رەگەزێن پێكهێنەرێن وێنەيێن شعرينە، چونكە مەرج نينە هەميشە شعر كۆمەكا وێنەيێن نوى و ئافراندى و بهێز بخۆڤە بگريت.

سەبارەت ب رەگەز يانكو توخمێن وێنەيێ شعرى بيروبۆچوون و دانوستاندنێن جياواز هەنە، لێ ب شێوەيەكێ گشتى بريتينە ژ: زمان، بير، خەيال، واقيع، سۆز، نەست[١٢]. پشتبەستن ب وێنەيێن شاعرێن بەرێ پرانيا ڤان رەگەزان

دئێخیتە د مەترسیێ، یانکو دبیتە ئەگەرێ جێگیربوونا شێوەیەکێ دیارکری بۆ دارشتنا وێنەیان. چێدبیت د ناڤ ڤان ڕەگەزان دا، ڕەگەزێن خەیال و واقع و هەست و سۆز پتر ژ ڕەگەزێن دی بکەڤنە بەر مەترسییا لاوازبوون و چالاك نەبوونێ.

ئێکەمین ڕەگەز ژ ڕەگەزێن پێکهێنەرێن وێنەیێ شعری خەیالە، خەیال ب ڕێکا کۆمکرنا ڕەگەزێن دیێن وێنەی ب ڤی کاری ڕادبیت.[١٣] پەیوەندییا د ناڤبەرا خەیال و وێنەیدا هند بهێزە کو گەلەك جاران جوداکرنا وان ژ هەڤدوو کارەکێ زەحمەتە. ئەڤ چەندە د زاراڤێ (image)ا ئنگلیزی خۆیادبیت کو د بنەرەت دا ژ پەیڤا (imagination)ێ واتە خەیالێ هاتیە وەرگرتن، یانکو خەیال و وێنە ژ سەرچاوەیەکی هاتینە وەرگرتن[١٤]. شعر ب خۆ بنگەهێ ئەدەبێ خەیالییە یانکو شعر جەوهەرێ ئەدەبێ خەیالییە، لسەر بناغەیێ خەیالێ ئاڤابوویە، هەر دەرئەنجامێ ڤێ چەندێ ئەم دشێین بێژین شعر وەکو وێنەگرتنێیە.[١٥]هەر ئەڤ پەیوەندییا موکومە کو بوویە ئەگەر (ئەرشیبالد ماکلیش) سەبارەت ب وێنەی بێژیت ((ئەو هێزا جادوویە کو ب تنێ خەیال دشێت وێ بەرهەم بینیت)).[١٦]

هەر وەکو بەری نهۆ مە ئاماژەپێدای سەرەرای ئەو پەیوەندییا موکوم کو د ناڤبەرا خەیال و بیردانکێدا هەیە، لێ بیردانک خەیال نینە و پێویستە شاعر ب تنێ پشتبەستنێ لسەر پێکڤەگرێدانا وان وێنەیان نەکەت کو د بیردانکێدا هاتینە پاراستن، بەلکو پێویستە سنوورێن بیردانکێ دەربازبکەت و پشتبەستنێ لسەر خەیالا خۆ بکەت، بەرچاڤنەگرتنا ڤێ چەندێ دبیتە ئەگەر کو شعر پتر ب شعرەکا بیردانکی بهێتە هژمارتن تاکو شعرەکا ئەزموونکی. چێدبیت بەشەکێ مەزن ژ شعرا مللەتەکی بیردانکی بیت لێ ئەگەر ئەڤ وێنەیێن بیردانکی بریتی بن ژ وێنەیێن شاعرێن بەرێ دێ ڕۆلێ نێگەتیڤێ بکارهینانا وان پتر خۆیا بیت.

پەیوەندیەکا موکم د ناڤبەرا وێنە و هەست و سۆز و ئەزموونا شاعریدا ژی هەیە، ((وێنە نوینەراتییا ئەزموونا شاعری دکەت، هزر و سۆزێن وی تەنانەت هەست و سۆزێن ویێن ئەبستراکی ژی ب خۆڤە دگریت))[١٧]، یانکو ((ئامرازێ جەوهەری بۆ ڤەگۆهاستنا ئەزموونێ وێنەیە....))[١٨]. تەنانەت گەلەك جاران

ڕەنگڤەدان و گەهاندنا هەست و سۆز و ئەزموونا شاعری ب ئەرکێ وێنەیێ شعرێ هاتیە زانین. سەرەرای هندێ کو بابەتێ ئەرکێ شعرێ بابەتەکێ دویر و درێژە لێ ئەم دشێین وێ د دوو خالان دا سنووردارێکەین: وێنەکرنا ئەزموونا شاعری و گەهاندنا وێ بۆ خواندەڤانان.[19] واتە ئێک ژ ئەرکێن وێنەی گەهاندنا ورووژان و هەست و سۆزێن شاعریە. واتە شاعر ب ڕێکا وێنەیان هەمان هەست و سۆز و ورووژانا کو لدەڤ وی چێدبیت بۆ خواندەڤانان ڤەدگوهێزیت[20].کەواتە پشتبەستن لسەر وێنەیێن شاعرێن بەرێ و دووبارەکرنا وان ڤێ پرسێ د مێشکێ مرۆڤیدا دئازرینیت کو تا چ ڕادە ئەڤ وێنەیە کو ژ داهێنانا شاعری نینن دشێن نوینەراتییا هەست و سۆز و ئەزموونا خودییا شاعری بکەن.

پشتبەستن ب وێنەیێن کەڤن و دووبارە بکارهینانا وان، پەیوەندییا وێنەی لگەل واقع و سروشتی ژی دئێخیتە بەر مەترسیێ، چونکە (وێنە ژبلی ئەزموونا شاعری و گەهاندنا وێ بۆ خواندەڤانی ڕۆلەکێ مەزن د بەرجستەکرنا جیهانا دەوروبەری و نێزیککرنا وێ بۆ هزرا خواندەڤانی دبینیت)[21]. هندەك ڤێ چەندێ ب بناغەیێ دروستبوونا وێنەی دزانن و دبێژن کو (ئێکەمین پێنگاڤا ئافراندنا وێنەیان ئەوە کو شاعر خۆ نێزیکی وان تشتان بکەت کو دکەڤنە بەر هەستێن وی)[22]، پێویستە شاعری هشیاریەك ل هەمبەر ژینگەهـ و دەوروبەرێ خۆ هەبیت و ڤێ چەندێ وەکو کەرستەیەك بۆ ئافراندنا وێنەیێن نوی بکاربینیت. (ب دیتنا کینلەری (kneller)ی کەسێ داهێنەر ل هەمبەر ژینگەها خۆ گەلەك هەستیارە، ئەو وان تشتان دبینیت کو کەسێن دی نابینن وەکو ڕەنگ و ڕواڵەتێ تشتان و کارڤەدانا کەسێن دی ...و هندەك کەلێن و بۆشایی کو د هزرێن بەربەلاڤ و تشتێن دیدا هەنە)[23]. ل ڤێرێ ئەم دشێین بێژین کو دووبارەکرن یانکو لاساییکرنا وێنەیێن شعریێن بەرێ دبیتە ئەگەرێ لاوازبوونا ڤێ هەستیاریێ واتە دبیتە ئەگەر کو شاعر ژ ژینگەهـ و سروشتێ دەوروبەرێ خۆ دویربکەڤیت و باسێ وان ئەدگار و ساخلەتان بکەت کو پەیوەندیدار نینن ب ئەزموونا ویڤە، بەلکو ئەزموونا کەسێن دینە کو ل سەردەم و جهێن جودا دا ژیاینە. ئەم دشێین ((ب نێرینەکا نوی

بەرێخۆبدەینە وێنەیێن شعری واتە لسەر ڤی بناغەی کو ڤان وێنەیان تا چ ڕادە پەیوەندی ب ژینگەها شاعری هەیە، تا چ ڕادە سروشت و ژینگەها جڤاکی و کلتوری و سیاسی و مێژوویی بووینە هێڤێنێ ڤان وێنەیان... تا چ ڕادە وێنە ژ هەرێمێ جوگرافیایی و ژینگەهێ هاتیە وەرگرتن و تا چ ڕادە ب ڕێکا نەریت و لاساییکرنێ ژ شعرا شاعرێن دی هاتینە وەرگرتن، یان د ناڤبەرا وێنەیێن شاعری و خەیالا وی یا شعری ڕێککەفتن و گونجان هەیە یان نە، و ئەگەر هەیە تا چ ڕادەیە؟[٢٤]بەرسڤدانا ڤێ پرسیارێ گرنگە چونکە ((ئەو وێنەیێن کو ب ڕێکا پەیوەندیەکا ڕاستەوخۆ لگەل سرۆشتی بەرهەم دهێن بزاڤ و پەیوەستبوونەکا موکومتر لگەل ژیانێ هەنە))[٢٥] و ئەوێن ب ڕێکا لاساییکرنێ دهێنە وەرگرتن وەسا چالاك و بالکێش نینن. نینن.

گەلەك جاران لاساییکرن دبیتە ئەگەر کو شاعر هشیارییا خۆ ژ دەست بدەت، واتە های ل وان جوانی و بالکێشیان نەمینیت کو ل دەوروبەرێ وی هەنە و ل جهێ ڤێ چەندێ باسێ وان تشتان بکەت کو د ژینگەها وی دان نینن یان گەلەك دەگمەنن. بۆ نموونە دشێین ئاماژەیێ بدەینە (( هەلویستێ شاعرێن نوییێن عەرەب یێن سەر ب قوتابخانەیا (دیوان) کو ژ بکارهینانا پەیڤا بلبل کو دبنەرەت دا بالندەکێ کۆچبەرە و بۆ ماوەیەکێ کێم ل مسرێ دمینیت پاشگەز بوون و هەولدان کو باسێ (کەرەوان)ێ بکەن کو بالندەکێ ڕەسەنێ مسرێیە))[٢٦]، واتە هەست ب ڤێ چەندێ کرن کو لاساییکرن بوویە ئەگەر کو ئەو ژ گەلەك وێنەیێن نوی بێ بەش بن.

نهۆ دشێین بێژین ئەو زەمینەیا لاساییکرییا کو د شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا دهێتە دیتن، دبیتە ئاستەنگەك د ڕێکا بەرجستەبوونا ڕۆلێ تەڤایا ڕەگەزێن پێکهێنەرێن وێنەیێ شعری، لێ لگەل هندێ ژی نابیتە بەلگەیەك بۆ ڕەتکرنا بهایێ وێنەیان، چونکە پشتبەستن ب وێنەیێن کەڤن و سەر ژنوی دووبارەکرنا وان ب ئاوایەکێ جیاواز ژی ئێکە ژ سەرچاوەیێن دروستبوونا وێنەیێن شعری، یانکو ئەم دشێین سێ سەرچاوەیان بۆ دروستبوونا وێنەیان دەستنیشان بکەین:

١. دیتن و ئەزموونێن تایبەتیێن شاعری
٢. ڤەگۆهاستنا وان ب رێکا بیستن و خواندنێ، ل ڤی حالەتی شاعر دێ مفای ژ ئەزموونا کەسێن دی وەرگریت.
٣. شیانا شاعری د سەرژنوی دروستکرنا وێنەیێن کەڤن و گونجاندنا وان لگەل هەڤ، بۆ پێشکێشکرنا وێنەیەکێ داهێنەرانەیێ نوی. جوانییا ڤی وێنەی ژی پەیوەستە ب سروشتێ عەقلێ شاعری و بەرفرەهی و کویراتییا خەیالا وی).[٢٧]

چەوا بۆ ئاڤاکرنا وێنەی چەندین سەرچاوە دهێنە بکارهینان وەکو ئەدەبێ مللی، ئەفسانە، کۆمەلگەه، سروشت، مێژوو[٢٨]، چێدبیت ئێک ژ ڤان سەرچاوەیان ژی وێنەیێن شعرییێن شاعرێن بەرێ بیت. ئەم نەشێین دەمێ باسێ وێنەی دکەین ب تنێ باسێ وێنەیێن ئورجینال بکەین، چونکە وەکو د بابەتێ هەڤتێکستیێدا مە دایە دیارکرن چ دەق نەشێن ب ئێکجاری پەیوەندییا خۆ لگەل دەقێن بەری خۆ ژناڤببەن، لێ ئاریشە یا د ڤێ چەندێدا کو د رێرەوێ لاساییکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا وێنەیێن جۆرێ دوویێ و سێیێ پتر بەرچاڤن و ئافراندنا وێنەیێن پەیوەست ب ژینگەها سروشتی و مێژوو و ئەدەبێ مللی و فۆلکلۆری و واقعێ جڤاکی و سیاسییا سەردەمی کێمتر دهێتە دیتن، یانکو ژێدەرێ پرانیا وێنەیان هەر شعرا شاعرێن بەرێیە. پەیوەندییا شاعرێ کلاسیکی ب ژینگەهـ و سەردەمیڤە د ئاستێ پەیوەندییا وی ب تێکستێن شعرییێن کەڤن دا نینە، ئەو پتر وێنە و دەربرینێن خۆ ژ شاعرێن بەری خۆ وەردگریت و کێمتر هەولددەت مفای ژ ژینگەهـ و واقعێ سەردەمێ ببینیت. لاساییکرنا شعرێن کەڤن و هەبوونا یاساییێن رەخنەییێن بهێز و فەرهەنگا دیارکرییا زمانێ شعری و سنووردارکرنا داهێنانا شعری ڤێ دەلیڤێ نادەتە شاعری کو ب ساناهی بەرێ خۆ بدەتە سروشت و واقعێ دەوروبەرێ خۆ. دیارە کو خواندن و ژبەر کرنا شعرێن شاعرێن بەرێ ژی رۆلەکێ مەزن د ڤی بواریدا هەبوویە، یانکو شعرا لاساییکرییا رۆژهەلاتا ئیسلامی پتر شعرەکا بیردانکییە تاکو شعرەکا ئەزموونکی بیت.

شاعرێن کورد ژی ب رێکا بکارهینان وێنەیێن شاعرێن فارس و عەرەب و لاساییکرنا شعرێن وان هەولدانە شعرێن خۆ بگەهیننە ئاستێ شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی، جهێ شعرا کلاسیکییا کوردی د رێرەوێ لاساییکرنا شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا رێخۆشکەرە بۆ هندێ کو دیاردەیا لاساییکرنا وێنەیێن شاعرێن بەرێ پتر خۆیاببیت؛ ئەگەر یاساییێن رەخنەیێن شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی ڤێ دەلیڤێ نادەنە شاعری کو زوی ب زوی وێنەیەکێ تازە بینیتە ناڤ شعرا خۆ و پتر بەرێ وی ددەنە لاساییکرنا شاعرێن بەرێ، شاعرێ کلاسیکیێ کوردی ژبەر واقعێ رۆشنبیریێ سەردەمێ خۆ نەچاربوویە پشتبەستنەکا زێدەتر بکەتە سەر شعرا فارسی و عەرەبی و پتر وێنەیێن وان دووبارە بکەت و کێمتر مفای ژ ژینگەهـ و کەلەپور و واقعێ سەردەمێ خۆ وەرگریت.ئەگەر ئەم پێداچوونەکێ لسەر وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی بکەین دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو پرانیا جاران ژێدەرێ سەرەکیێ ئاڤاکرنا وێنەیان، شعرا شاعرێن فارس و عەرەبە. رەهـ و ریشالا پرانیا ڤان وێنەیان ژی بۆ قەسیدەیا کەڤنا عەرەبی و فارسی ڤەدگەریت:

### ١.١.١.٣.ژینگەها سروشتی:

ئێک ژ ژێدەرێن سەرەکیێن ئافراندنا وێنەیان سروشتە.ئەم دشێین سەرەدەرییا شاعری لگەل سروشتی بۆ سێ جۆرێن سەرەکی دابەش بکەین. (ئێکەمین جۆر سروشتگەرایيالاساییکریە. ل ڤێرێ شاعر لاساییا شاعرێن بەرێ دکەت. ئەڤە ژی بریتیە ژ وەرگرتنا وان نموونەیان کو لگەل ژینگەهـ و شێوازێ ژیانا شاعری ناگونجن و شاعری چ ئاشنابوونەك لگەل وان نینە. جۆرێ دوویێ (سروشتگەرايياوەسفی)یە؛ د ڤی جۆریدا شاعر ل هەمبەر دیارەکا سروشتی رادوەستیت و راپۆرتەکا وەسفی ل دور وی تشتێ دبینیت پێشکێش دکەت. ئەڤ وەسفە گەلەك جاران زۆر هویربینن، لێ پرانیا جاران وەسفن و ژ سنوورێ وەسفێ دەرباز نابن.جۆرێ سێیێ (سروشتگەرايياڤئاوێتەیی و راڤەیی)یە.ل ڤێرێ شاعر تەڤلی

سروشتی دبیت، یان مینا هەڤالەکی سەرەدەریێ لگەل سروشتی دکەت یان ب ڕاڤەکرنا وێ ڕادبیت...)[٢٩]. هەر لسەر ڤی بناغەی ئەم دشێین بێژین ل قوناغێن سەرەتاییێن سەرهلدان و گەشەکرنا قەسیدەیا عەرەبی و فارسی جۆرێ دوویێ و تا ڕادەیەکێ سێیێ ب ڕێژەیەکێ بەرچاڤ دهێنە دیتن، لێ ل قوناغێن پشتی هنگی پشتبەستنەکا زێدە لسەر جۆرێ ئێکێ دهێتە کرن.

د شعرا جاهلییا عەرەبیدا، شاعر ژبەر هەبوونا ئەزموونەکا شعرییا ڕاستەقینە، پەیوەندیەکا موکوم لگەل ژینگەها سروشتییا خۆ هەیە، لێ لگەل بورینا دەمی دویراتی کەفتیە د ناڤبەرا شاعر و ژینگەها ویدا و کۆمەکا شاعر و ڕەخنەگران بووینە بەربەست د ڕێکا کارلێکا شاعری لگەل ژینگەها وی یا سروشتی، باشترین بەلگە ژی ڕەتکرنا دیمەنێن سروشتییێن تایبەت ب ژینگەها نوییا سەردەمێ عەباسیان د پێشەکییا قەسیدەیاندا بوویە.

سەرەرای دژایەتیکرنا کۆمەکا ڕەخنگەر و شاعران ل هەمبەر ڕەنگڤەدانا دیمەنێن تایبەت ب سروشتی د پێشەکییا قەسیدەیاندا، لێ کارلێکا شعرا عەرەبی لگەل فارسان بوویە ئەگەر کو شاعرێن سەردەمێ عەباسی مفای ژ ڕەگەزێن ژینگەها نوی ب تایبەت دیمەنێن گرێدای ب بهارێ وەرگرن، بۆ نموونە گولێن بهارییێن وەکو (نێرگز، یاسمین، بەیبون، زەعفەران، سوسن، شقایق (لالە، کولیکێن نیسانێ)، نیلوفەر، نسرین، ..هتد) هاتنە ناڤ شعرا عەرەبی و بوونە بەشەك ژ وێنەییێن شعری، جارنا بوونە لێچو و ب ئاواییێن جیاواز هاتنە وەسفکرن و جارنا ژی بوونە لەوچو؛ بۆ نموونە چاڤ ب نێرگزێ و لام ب گولێ هاتنە لێکچواندن[٣٠]. ئەڤ گۆهرینا مەزن پەیوەندیدارە ب سەرەخۆبوونا وەسفێ و سەرەدەریکرن لگەل وەسفێ وەکو مەبەستا جودا ژ مەبەستێن دی، د ڤی چارچووڤەیدا شعر تا ڕادەیەکێ ژ ژینگەها بیابانی دویرکەفت و جوانترین شعر د وەسفا سروشتیدا، ب تایبەت بهارێ هاتنە نڤیسین[٣١].

هەر ل سەردەمێ عەباسیان، ب تایبەت د شعرا فارسییا بەری سەدێ پێنجێ و شەشێ کۆچی ئەڤ پەیوەندییا بهێز د ناڤبەرا وێنە و سروشتیدا دهێتە دیتن و پشتی

هنگی بەرەڤ لاوازییێڤە دچیت. (ئێک ژ سەرەکیترین ئەگەرێن سنووورداربوونا خەیالا شعری د پرانیا شعرێن فارسییێن سەدێ پێنجێ و شەشێ کۆچی ئەڤەیە کو شاعر ل جهێ هندێ کو هەولبدەن هندەك ڕەگەزێن نوییێن ژیان و سروشتی بینە د شعرا خۆدا و خەیالا خۆ پێ دەولەمەند بکەن، بەردەوام هزرا خۆ د پەیوەندییێن سنووردارێن د ناڤبەرا هەمان ڕەگەزان کو شاعرێن کەڤن بکارئینانینە چارچووڤەدارکرینە، لەوما د تەڤایا شعرێن واندا جۆرە وردەکارییەك هەیە کو بەرهەمێ هەست و سۆزێ نینە، بەلکو بەرهەمێ هزرکرنێیە)[٣٢]. کەواتە ئەم دشێین بێژین کو (شعرا فارسییا سەبکێ خوراسانیی ب تایبەت یا سەدێ چوارێ کۆچی ژلایێ وێنەیێن هەستپێکری و هەبوونا ئەزموونێن ڕاستەوخۆیێن شعری دەولەمەندترین قوناغا شعرا فارسیە. شاعرێن ڤێ قوناغێ ب پشتبەستن ب ئازادییا خەیالا خۆ گەلەك وێنەیێن شعرییێن نوی پێشکێشی شعرا فارسی دکەن.هەر ئەڤ وێنەیە چەندێن سەدەیان پشتی هنگی ب دەستکاریڤە د شعرا فارسیدا دهێنە بکارهینان. شاعرێن پشتی ڤی سەردەمی گەلەك جاران ژ ڕوانگەها خەیالا شاعرێن ڤێ قوناغێ تەماشەی دیاردەیێن سروشتی دکەن)[٣٣]، یانکو شعرا فارسییا پشتی ڤێ قوناغێ بۆ مفا وەرگرتن ژ سروشتی د وێنەیێن خۆدا پتر مفای ژ ئەزموونا شاعرێن بەری خۆ وەردگرن.

د شعرا کلاسیکییا کوردیدا ژی ب تایبەت ئەوا کو ڕاستەوخۆ پەیوەستە ب ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی، ئەڤ دیاردەیە دهێتە دیتن. سەبارەت ب وێنەیێن پەیوەست ب سروشتی یان ئەو وێنەیێن کو ڕەگەزێن سروشتی تێدا دهێنە بکارهینان، ئەم دشێین گەلەك وێنەیان د شعرا کلاسیکییا کوردیدا دەستنیشان بکەین کو بەرهەمێ لاساییکرنا وینەیێن شعرییێن بەرێنە. ڤێجا یان شاعر ب هەمان نێرینا شاعرێن بەرێ تەماشەی سروشتی دکەت یان وان ڕەگەزێن لاساییکرییێن شعرا کەڤن بکاردهینیت کو د ژینگەها ویدا نینن. یا باش ئەوە کو ژ وەسفا سروشتی ب خۆ دەست پێ بکەین کو لگەل بورینا دەمی هاتیە سنووردارکرن و ئێکە ژ وان بواران کو گەلەك کەفتییە ژێر کارتێکرنا لاساییکرنێ.

جارنا لاسایيكرن گەلەك ئاشكرايە، واتە شاعر د وەسفا دیمەنێن سروشتیدا پشتبەستنێ لسەر هەمان دیمەنان دكەت كو بەشەك بووینە ژ ژینگەها شاعرێن بەرێ:

هــات زەمزەمــەیی بولبــول و ئــاوازەیی قــومری     هات بادی سەبا، دێن و دەچن عەرعەر و بانات
...(نالی (دیوان)، ل١٤١)

دارا (بان) دارەكە كو ل جەزیرا عەرەبی شین دبیت[٣٤]، عەرعەر ژی جۆرە دارەكە و د بنەرەتدا پەیڤەكا خوراسانیە[٣٥]، كەواتە ئەڤ وێنەیە بەرهەمێ نێرین و كارلێكا شاعرێن عەرەب و فارس لگەل سروشتیە و ژێدەرێ شاعرێ كورد بۆ پێشكێشكرنا ڤی وێنەی، وێنەیێن شاعرێن بەرێیە.

جارنا ژی ئەو وێنەیێن سروشتییێن كو دهێنە پێشكێشكرن بەشەكن ژ ژینگەها شاعری، واتە شاعری كارلێكەكا بەردەوام لگەل وان هەبوویە، لێ ئەو ب نێرینا شاعرێن بەرێ تەماشەی وان دكەت:

لالە مەجمەرێكە كە بە با خۆش و گەش دەبێ     نــاوی كــە پــڕ خــەلۆزە بــە شەبنمگەشــایەوە.
...(نالی (دیوان)، ل٥٥٤)

لێكچواندنا لالەیان (كولیكێن نیسانێ) ب ئاگری یان پەلێن ئاگری، هەر وەسا ڕەشاتییا نیڤا گولێ ب ڕەژی و سۆتنێ، نیشاندانا كاریگەرییا خۆناڤا سپێدەهیان(شەونم،شەبنەم) د تەناكرنا سۆتنا ناخێ گولێ، ژ وێنەیێن باون د شعرا كلاسیكییا فارسیدا.(*) دیارە (نالی) ژی هەر ژ ڤی ڕوانگەهی تەماشەی دیمەنێن جوانێن بهارێ كریە. ڕاستە كو شاعری ب ئاوایەكێ جوان و هونەری ئەڤ وێنەیە پێشكێشكریە لێ ڤەدیتنا ڤان پەیوەندییان داهێنانا وی نینە، یانكو ئەو بۆ دروستكرنا ڤی وێنەی پشتبەستنێ لسەر وێنەیێن كەڤن دكەت.

مەبەست ژ مفا وەرگرتن ژ سروشتی ب تنێ وەسفا سروشتی نینە بەلكو بكارهینانا دیاردەیێن سروشتی ژبۆ سالۆخدانا مرۆڤ و بارودۆخ و تشتێن دیێن دەوروبەرێ مرۆڤی ژی ب خۆڤە دگریت، بۆ نموونە د شعرا كلاسیكییا ڕۆژهەلاتا

ئیسلامیدا پرانیا جاران سروشت دبیته هێڤێنێ لێکچواندن و خواستنێن غەزەلی. دیارە د شعرا کلاسیکیيا کوردیدا بۆ ئاڤاکرنا ڤان وێنەیان پشتبەستنەکا زێدە لسەر شعرا شاعرێن بەرێ دهێتەکرن:

دلۆ وەر سەیرێ بالایان د گولزارا سەمەن سایان
(بهــا تـهتـز بـانــات لنـا مــن مـیس قــامــات)
...(جزیری(دیوان)، ل٤٨٢)

عەرعـــــەرا ڕەنگـــین ژ تــــاییێن ســــۆر و زەر
قـــــومرییان ســــەد ڕەنــــگ خولخـــــولە
...(جزیری(دیوان)، ل٤٥٦)

ل ڤێرێ بەژنا کچێن جوان ب دارا بان و عەرعەرێ هاتیە لێکچواندن، واتە شاعر ب هەمان نێرینا شاعرێن کەڤن ڕەگەزێن سروشتی بۆ وەسفکرنا جوانی و ڕێکوپێکییا بەژنێ بکاردهینیت.

ژبلی دار و ڕوەکان، گەلەك جاران ئەو گیانەوەرێن کو دبنە جهێ گرنگیپێدانێ و بەشداریێ د پێکهاتەیا وێنەیان دا دکەن ئەو گیانەوەرن کو ب ڕێکا شاعرێن بەرێ و ب تایبەت یێن سەردەمێ قەسیدەیێ هاتینە ناڤ شعرا کلاسیکیيا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دا:

ئـاسـکی صــەحرایی چـینی بـۆ نیگـا و وەســتان و ڕەو
کـەبکی کـۆهی زابلستانی، بەلەنجە و خـەط و خـال...(کوردی (دیوان)، ل٢٧١)

(ئاسکی صەحرایی چین) و (کەبکێ کوهێ زابلستان) دوو گیانەوەرن کو چ هەبوون بۆ وان د ژینگەها شاعریدا نینە . ئەڤە دوو وێنەیێن باون د قەسیدەیا سەبکێ خوراسانیدا. دیارە مەبەست ژ کەبکێ زابلستان هەر کەبکێ دەریە. ئاسکێ سەحرایێ چین ژی، ئاسکێن دەڤەرا تورکستانێیە کو سەرەدەری و پەیوەندیەکا موکوم لگەل دەڤەرا خوراسانێ هەبوویە. شاعری ب ڕێکا لاساییکرنا شعرا فارسی

ئەڤ وێنەیە ڤەگوهاستینە ناڤ شعرا خۆ. تشتێ سەیر ئەڤەیە کو سەرەرای بناڤدەنگ بوونا کەوێن کوردستانێ ئەو باسێ کەوێن چیایێ زابلستانێ دکەت.

لگەل هندێ کو پرانیا وێنەیێن کو رەگەزێ سروشتی تێدا بکارهاتین بەرهەمێ لاساییکرنا شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامینە، لێ جارنا شاعرێن کورد شیاینە د هندەك شعراندا خۆ ژ ڤێ لاساییکرنێ رزگاربکەن. دەمێ شاعر ژ چارچووڤێ لاساییکرنا وێنە و دەربڕینێن شعرییێن کەڤن دەردکەڤیت و پشتبەستنێ لسەر هەست و ئەزموونا خۆ یا ڕاستەقینە دکەت؛ سروشت و ژینگەهـ ب ئاوایەکێ نوی و زیندی د شعرێدا ئامادە دبن. ئەڤ جۆرە وێنەیە د شعرا کلاسیکییا داخبار ب ڕەوتا قەسیدە و غەزەلا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا کێمن و پتر د هندەك حالەتێن دەگمەن دا دهێنە دیتن؛ هەر وەکو نامەیا (نال)ی بۆ (سالم)ی کو بەروڤاژی هەمی شعرێن وی بخۆ ب توندی ب سروشت و ژینگەها سلێمانیێ ڤە هاتیە گرێدان:

وەك ئـاهـەكـەم دەوان بـە هـەتا خـاكی كـۆیی یـار
وەك ئـەشكـەكـەكـەم ڕەوان بـە هـەتـا ئـاوی (شیوە سوور...(نالی (دیوان)، ل١٨٧)

ئـەمجـارە مـە وەسـتە هـەتا دەگەیە عەینی سەرچنار
ئـاوێكـە پـڕ لـە نـار و چـنـار و گـوڵ و چـنـوور...(نالی (دیوان)، ل١٨٨)

شاعر لسەر بناغەیێ ئەزموون و هەستەکێ ڕاستەقینە بەرێ خۆ ددەتە ژینگەها خۆ و ژ چارچووڤێ سروشت و ژینگەها تەقلیدییا شعرا کلاسیکی دەردکەڤیت، پەیوەندییێ لگەل سروشتێ وەلاتێ خۆ سازدکەت. وەسفکرنا دیمەنێن سروشتی و بازێر و گەرەك و جهێن وەکو (شێوە سوور، سەرچنار، بەکرەجۆ، خاك و خۆل، سولەیمانی، شارەزوور، پردی سەر شەقام، داری پیرمەسوور، سەیوان، کانی ئاسکان، شیوی ئاودار، تانجەرۆ، خانەقا، کاکەسوور، ...) کو شاعری کارلێك لگەل وان هەبوویە، چێژ و تامەکا تایبەتی ددەتە ڤێ شعرێ.

هەر ب ڤی ڕەنگی بەرێخۆدان و گرنگیدانا (خانی) ب ڕوبیارێ دیجلەیێ و تەڤلیهەڤکرنا وێ لگەل ئێش و ئازارێن (مەم)ی بەرهەمێ کارلێک و نێزیکبوونا شاعری ل سروشت و دەوروبەرییە:

هەر لەحزە تە ژی چ تێتە بیرێ ... سەرگەشتە دچی ل ڕەخ جزیرێ
ئەڤ شەهرەیە گەر ژ بۆ تە مەحبووب ... حاسل کرییایە بۆ تە مەطلوب
دائم د دلێ تە دایە مەنزل ... دەستێ تە ل گەردەنی حەماییل

... (خانی(مەم و زین)، پشکا دوویێ، ل٧١٢- ٧١٣)

ل ڤێرێ مرۆڤگەرایی هاتیە بکارهینان، مەم لگەل دیجلەیێ دپەیڤیت و بەراوردیەکێ د ناڤبەرا خۆ و دیجلەیدا دکەت، شاعر شیایە پەیوەندییا نوی و بهێز د ناڤبەرا دیجلە و باژێرێ جزیرێ سازبکەت، دیجلە میناکەسەکیە کو دەستێ خۆ هاڤێتیە دور گەردەنا کەسەکێ دی کو مەبەست باژێرێ جزیرێیە. هەر ئەڤ کارلێکا کو شاعری دناڤبەرا دۆخێ (مەم)ی و ریبارێ دیجلەی سازکریە بوویە هێڤێنێ دروستبوونا وێنەیەکێ دیێ نوی و سەرنجراکێش:

دیوانە مە، من پەری بدەردا ... ئەز دیجلەمە زەنبەری م بەردا
وەستانی و نێرگزی و سەقلان ... دەروازە و عومەری و مەیدان
وان سەیرگەهان تو لێ دکی گەشت ... ئەز مامە ژبۆ مرا دەر و دەشت

... (خانی(مەم و زین)، پشکا دوویێ، ل٧١٦)

مەم ب دیجلەی هاتیە لێکچواندن، لێ دیجلەیەك کو زەنبەری یانکو سکرەك لبەر بزاڤا وێ هاتیە ئاڤاکرن و ناهێلیت کو ئەڤ رووبارە بچیت و بگەهیتە ئامانجا خۆ کو دەریایە. ب رێکا ڤی وێنەی بێ دەستەلات بوونا مەمی دهێتە پیشاندان، چونکە بەربەست د ناڤبەرا وی و زینێدا هاتینەدانان و ناهێلیت کو ئەو ب دیتنا وێ شاد ببیت. ئەڤە بەروڤاژی دۆخێ رووبارێ دیجلەیە کو بەردەوامە لسەر بزاڤا خۆ و سەرا خۆشترین سەیرانگەهێن جزیرا بۆتان، واتە (وەستانی و نێرگزی و سەقلان) ددەت.

دیاره شعرا دەڤەرا هەورامان و ب تایبەتی شعرێن (مەولەوی) پتر پەیوەستن ب ژینگەها شاعریڤە. هەرچەندە ڕەگەزێن لاساییکرییێن شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی د شعرا ڤێ دەڤەرێ ژی دهێنە دیتن، لێ ژمارەکا زۆر ژ وێنەیان بەرهەمێ کارلێکا شاعری لگەل ژینگەهێنە، ب تایبەت پرانیا وێنەیێن شعری پەیوەست ب سروشتیڤە. هشیارییا (مەولەوی) بەرامبەر سروشتی و نیشاندانا وردەکارییێن وێ ژینگەها کو تێدا ژیایە؛ نیشانا هندێیە کو وی پتر مفا ژ ئەزموون و نێرین و هەستێ خۆ وەرگرتییە تاکو وێنەیێن باو د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دا:

زووسانەن وەی ڕەنگ وە گەردوون یاوان    گێجیایی لوول گێج کلێڵەی کاوان

...(مەولەوی (دیوان)، ل ٣١٦)

شـەمـال، دارانـەن.. شـەمال دارانـە    زەردی ڕەنـگ نـە ڕووی وەڵـگــی دارانــەن

تەمەن گەردولوول بـادەن بـارانــەن    بێزیـای وارگـەی سـەر کـۆســارانـەن

هـەوای سـیامال وێنـەی جـارانــەن    پـەی سـەمـتی زەهـاو و زەردە و یـــارانەوە

هــەوهەو و بەو بەو تەڵمیت بارانـەن    گــەرمیی بـەزمـی نەزم سەر هـەوارانـەن

... (مەولەوی (دیوان)، ل ٣٥٣)

شاعر پتر پشتبەستنێ لسەر وەسفا وان دیمەنان دکەت کو ئاشنایی لگەل وان هەیە. ئەڤ تابلۆیێن نوی و زیندی دەربڕینێ ژ کارلێکا بهێزا شاعری لگەل سروشتی دکەن. شاعر ب تنێ خۆ ب وان وێنەیان کو ب ڕێکا شعرا شاعرێن بەرێ گەهشتینە وی گرێنادەت بەلکو بوێرانە هەولا ڤەدیتنا وێنە و دیمەنێن نوی د سروشت و ژینگەها خۆ دا ددەت. کارلێکا شاعری لگەل هەر دوو وەرزێن پایز و زڤستانێ و ژیانا خەلکێ دەڤەرێ ب ئاشکرایی د وێنەیان دا خویایە.

کارلێکا شاعرێن دەڤەرا هەورامان لگەل سروشتی وان وێنەیان ژی ب خۆڤە دگریت کو تێدا بۆ وەسفکرنا جوانییا مەعشوقێ و یان دۆخێ عاشقی مفا ژ ڕەگەزێن سروشتی دهێتە وەرگرتن:

بەی جەستەی غەمین ڕەنگ زەردەوە — یا جە نۆ قەبرم تازەکەردەوە
ئامانت ئەوسا وە قەبرم بەران — نیشانەی جەستەی خەستەم بکەران
بە وەلگ خەزان بپۆشان سەنگم — تا نیشانە بۆ پەی زەردی ڕەنگم

... (بێسارانی(دیوان)، ل٤٣)

وەریانا بەرگێن زەرێن پاییزی و بەرزەبوونا گۆڕێ شاعری ل بن ڤان بەرگان و وەکهەڤییا زەراتییا وان لگەل زەربوون و لاوازبوونا شاعری وێنەیەکێ نامۆیە. شاعری پتر ب ڕێکا نێرین و دیتنا تایبەتییا خۆ بۆ سروشتی ئەڤ وێنەیە ئافراندیە.

## ٢.١.١.٣. واقعێ جڤاکی و سیاسی:

پێکڤەگرێدانا ژیان و ئەدەبێ بریتی نینە ژ دووبارەکرن و پشتەڤانیکرنا دروشمێ (ئەدەب ڕەنگڤەدانا ژیانێیە)، چونکە ئەڤ دروشمە گەلەك ژ ئەدگارێن بنگەهینێن ئەدەبێ دئێخیتە بەر مەترسیێ. ئەم نەشێین ئەدەبێ ب ڕەنگڤەدانا ژیانێ ل قەلەم بدەین، لێ نەشێین نکۆلیێ ل پەیوەندییا بهێزا د ناڤبەرا ئەدەب و ژیانێدا ژێ بکەین. (شاعر نەشێتن لسەر بناغەیێ ڤالاتیێ وێنەیێن خۆ پێشکێش بکەت، بەلکو بەردەوام کارلێکێ لگەل واقعێ خۆ یێ جڤاکی و مرۆڤایەتی و ئەو بها و هزرێن کو د ڤی واقعیدا هەنە دکەتن. ژیانا جڤاکی و مرۆڤایەتی ژێدەرەکێ سەرەکیێ ئاڤاکرنا وێنەیانە، هەر لسەر ڤی بناغەی شعر دیکۆمێنەکێ مێژوویێ پڕ گرنگە.)[٣٦]

واقعێ جڤاکی و سیاسی دشێن ب بەردەوامی وێنەیێن نوی و سەرنجراکێش پێشکێشی شعرێ بکەن، کارلێکا شاعری لگەل واقعی جڤاکی و سیاسی بخۆ هەڤدەمە لگەل گۆهرینێ. دیارە شاعرێن قوناغێن دەستپێکیێن ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی ژبلی ئەو کارلێکا کو لگەل سروشتی هەبووینە تا ڕادەیەکێ زۆرکارلێک لگەل واقعێ خۆ یێ جڤاکی و سیاسی ژێ کرینە و شیاینە ڤێ چەندێ بکەنە هێڤێنێ دروستبوونا کۆمەکا وێنەیێن شعری،

لێ لگەل بەردەوامبوونا ڕێرەوێ لاساییکرنێ ئەڤ پەیوەندیە ژی بەرەڤ لاوازییڤە چوویە و شاعرێن قوناغێن پشتی هنگی پتر پشتبەستن لسەر وان وێنەیان کرینە کو بەرهەمێ کارلێکا شاعرێن بەرێ لگەل کاودانێن جڤاکی و سیاسییێن سەردەمێن بەرێ بوویە، واتە کارێ ڤان شاعران پتر بریتیە ژ هەولدان بۆ سەرژنوی دارشتن یان گۆهرینا ئاراستە و پەیاما شاعرێن بەرێ.

بۆ پێشاندانا ڤێ چەندێ کو چەوا هندەك وێنە کو د بنەرەتدا بەرهەمێ واقعێ جڤاکی و سیاسیێ شاعرێن بەرێ بووینە؛ ژلایێ شاعرێن پشتی وان هاتینە لاساییکرن و گەهشتینە شعرا کلاسیکییا کوردی؛ دێ باسێ سێ جۆر ژ وێنەیێن لاساییکری کەین کو ئەو ژی وێنەیێن پەیوەست ب ( واقعێ ئەرستوکراتی و شاهدبازی و لەشکەری)یێ شعرا کەڤنا عەرەبی و فارسینە:

## ٣.١.١.٢.١. بکارهینانا وێنەیێن تایبەت ب ژیانا ئەرستوکراتییا شعرا کەڤن:

شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی ب تایبەت قەسیدە د هەمبێزا کۆچکان و ژینگەهەکا ئەرستوکراتیدا گەشەکریە. ئەڤ شعرە هەر ژ سەردەمێ ئەمەویان و عەباسیان بگرە تاکو دگەهیتە دەستەلاتدارێن سامانی و غەزنەوی و سەلجوقی و تەنانەت پشتی هنگی ژی بەشەك بوویە ژ کۆچکا دەستەلاتداران و ب ئاواییێن جۆراوجۆر د خزمەتا واندا بوویە، ئەڤە هەتا وی ڕادەی کو کەسەکێ وەکو (نزامیێ عەروزی) د پەرتووکا (چهار مقالە)دا ڤێ چەندێ ددەتە خویاکرن کو (پزیشک و ئەستێرەناس و کاتب و شاعر چوار ڕەگەزن کو هەمیشە پاشا و دەستەلاتدار پێدڤی وانن و بێ وان سەرکەفتنێ بدەستڤە ناهینن )[٣٧]، یانکو ئەم دشێین بێژین ئەڤ شعرە زێدەتر ڕەنگڤەدانا گیانێ کۆچکێ یانکو باشتر بێژین ئارەزو و داخوازیێن دەستەلاتداران بوویە تاکو دەربڕینێ ژ گیانێ گشتیێ سەردەمی بکەت.

ژیانا ئەرستوکراتی یانکو ژیانا کۆچکان ژیانەکا ئێک ڕەنگ و سواوەیە.

د ناڤ ڤی سەقایدا گەلەك ب زەحمەتە کو تشتەك بهێتە گۆهرین و نەریتەك جهێ نەریتەکێ دی بگریت. ئێک ڕەنگ بوون و چەسپاوبوونا ڤێ ژیانێ کاریگەری کریە سەر وێنەییێن شاعرێن کۆچکان و شعرێن وان ژی پر بووینە ژ وێنەییێن دووبارەکرییێن ژیانا ئەرستوکراتی.[٣٨] بەرێ شاعرێ کۆچکێ پتر بۆ جیهانا دەرڤەیە، ژبلی ستایشکرنا شاهی هزرا وی د چارچووڤێ کار و چالاکییێن شاهیدا کاردکەت، دەمێ ناڤ کۆچکێیە ب وەسفکرنا کۆچکێ ڕادبیت، ئەگەر ل سەفەرێ لگەل شاهی بیت، دێ ب وەسفکرنا سروشتێ ڕێکێ و ئوردوگاهێ شاهی ڕابیت، ئەگەر ژی شاهـ د جەنگ و شەراندا بیت، دێ ب وەسفکرنا سوپا و چەك و ئامرازێن شەری ڕابیت.[٣٩]

شاعرێن کۆچکان مینا شاعرێن دەرڤەی کۆچکێ ئازاد نینن، شاعر و زاهدەکێ وەکو (ئەبو عەتاهیە)ی هەست ب ڤێ چەندێ کریە. ئەو (جیاوازیێ دئێخیتە د ناڤبەرا دوو جۆرێن شعرێ، یێ ئێکێ شعرا کۆچکان و ڤەگێرکارێن شعرێیە، واتە ئەو شعرا کو سیماییێن قەسیدەیا جاهلی تێدا بن. جۆرێ دوویێ ژی ئەو شعرە کو کەسێن دی گرنگیێ ددەنێ و شاعر ب کەیفا خۆ هەلسوکەوتێ دکەت)[٤٠]، واتە شعرا کۆچکان ب شعرەکا تەقلیدی ددەتە نیاسین کو تێدا شاعر ژبەر پەیوەستبوون ب نەریتێن دیارکری نەشێت ل دویف حەزا خۆ شعرێ بڤەهینیت بەلکو هەمیشە پتر گرنگیێ ددەتە وەرگرێ شعرێ. هەر لسەر ڤی بناغەی دشێین بێژین ( هشیاری و ئاگەهییا خودی و ڕاستگۆییا خودییا پێویست بۆ ئافراندنێ لدەڤ شاعرێ لیریکیێ کۆچکان ناهێتە دیتن.)[٤١]

هەرچەندە کو چارچووڤێ داهێنانا شاعرێن کۆچکێ سنووورداربوویە، واتە ژ لایەکیڤە ب دابونەریتێن شعرا جاهلیڤە هاتینە گرێدان و ژ لایەکێ دیڤە پەیوەست بووینە ب نەریتێن کۆچکێڤە، لێ شیاینە مفایەکێ باش ژ سەقاییێ ئەرستوکراتیێ دەوروبەرێ خۆ وەرگرن، جارنا ب وێنەکرنا وێ ڕابن و جارنا ژی ڕەگەزێن وێ د وێنەیان دا بکاربینن.

کاریگەرییا ڕاستەقینەیا مۆرکێ ئەرستۆکراتیەتێ لسەر شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بۆ سەردەمێ عەباسیان ڤەدگەریت.ل ڤی سەردەمی شاعر دبنە بەشەك ژ سیستەمێ ئەرستوکراتیێ کۆچکا عەباسیان ( ب تایبەتی ل سەردەمێ ڕەشیدی کو خۆشگوزەرانیەکا ژ ڕابدەر دهێتە دیتن. پرانیا خەلیفەیێن عەباسی بەشداری د ڤێ خۆشگۆزەرانییێدا کرینە و ب ئاواییێن جیاواز مژیلی ڕابواردن و چێژوەرگرتنێ بووینە. مەیڤەخوارن و دانانا مەجلسێن تایبەت ب ڤێ چەندێ لگەل ئامادەبوونا ئسترانبێژ و مۆسیقاژەن و شاعران، ئێک ژ ئارەزۆ و کارێن بەردەوامێن ڤان خەلفەیان بوویە. گەلەك جاران ئەڤ مەجلسە هەتا سپێدێ بەردەوام بووینە و ژبلی مەیڤەخارنێ جهەك بووینە بۆ تێرکرنا حەزێن سکسییێن دەستەلاتداران؛ ڤێجا یان وان خۆ دەربارەی ڤێ چەندێ ئاخفتییە یان کەسێن دی هان داینە کو سەبارەت ب بابەتێن گرێدای ب ڤی لایەنیڤە بپەیڤن. شاعران ژی ئەڤ مەجلسێن وەسا بۆ خۆ ب دەلیڤەکا باش زانییە و لدویڤ حەز و ڤیانا خەلیفەی شعرێن خۆ ڤەهاندینە؛ دا کو ب ڤی ڕەنگی بشێن پاداشتەکا باش بدەستڤە بینن.[٤٢] (ابن معتز) وەسفا ئێک ژ هۆلێن تایبەت ب مەجلسا مەیڤەخوارنێ لسەردەمێ ئێک ژ خەلیفێن عەباسی دکەت. پشتی سالۆخدانا وێ هۆلا شکۆدار و نیشاندانا جوانی و نەخش و نیگارێن وێ، ژبلی خزمەتکار و شاعران ئاماژەیێ ددەتە ئامادەبوونا مەیگێرێن نازك و جوان. هەر وەسا باسێ بەردەوامبوونا مەجلسا مەیڤەخوارنێ بۆ دەمەکێ درێژ دکەت. ل داویێ ژی ئاماژەیێ ددەتە ئەو پارە و بەخشیشا کو خەلیفەی بسەر ئامادەبوویان دابەشکری.[٤٣]

ئەگەر ئەم بەرێخۆبدەینە قوناغێن دەستپێکا سەرهلدان و گەشەکرنا شعرا فارسی؛ دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو پشتی گول و گیا و داران، ڕەگەزێن ژیانا ئەرستوکراتی گرنگترین کەرەستەیێن ئافراندنا شعرێ بووینە. ئەم دکارین زالبوونا مۆرکێ ئەرستۆکراتی لسەر وێنەیان ب ئێک ژ تایبەتمەندییێن شعرا قوناغێن سەرەتاییێن شعرا فارسی ل قەلەم بدەین، ئەڤ چەندە پتر د قەسیدەییێن ستایشیدا دهێتە دیتن، واتە ئەو قەسیدەیێن کو د خزمەتا بەرجستەکرنا

شكۆمەندييا شاهانەدا بووينە.[٤٤] دیارە دەستەلاتدارێن ئیرانا وی سەردەمی ژی هەر ل ژێر کاریگەرییا کۆچکا عەباسیان، ب هەمان ئاوا سەرەدەری لگەل شاعران کرینە. ( پاشایان پرانیا دەمێ خۆ د مەجلسێن خۆشگۆزەرانی و مەیڤەخوارنێ دبوراند، ئەرکێ شاعران ژی تەمامکرنا خۆشی و چێژا وان بوو، لەوما دهاتنە داخوازکرن بۆ بەزم و مێڤانداریێن پاشایان. د دیوانا ڤان شاعراندا ژمارەکا زۆر ژ شیعران هاتینە تەرخانکرن بۆ وەسفا بەزمێن ڤان دەستەلاتداران.دانانا ڤان مێهڤانداری و ئاهەنگان زێدەتر بۆ سەردەمێ سامانی و غەزنەوی و سەلجوقیان ڤەدگەریت، ئەڤە ژبلی ئەو شعرێن تایبەت ب وەسفا نێچیرێن شاه و سولتانان[٤٥]. کاریگەرییا سەقایێ کۆچکێ لسەر شاعرێن سەردەمێ غەزنەویان تا وی ڕادەی بوویە کو ڤەکۆلەرەك دبێژیت: ((شاعرێن کۆچکا غەزنەویان ژبلی ستایشا دەستەلاتداران و هاندانا وان ژبۆ هێرشکرن بۆ سەر وەلاتێن نەمسلمان و تالانکرنا وان و هینانا و دابەشکرنا غەنیمەیان و سالۆخدانا مەجلسێن مەیڤەخوارنێ و سەرەدەری لگەل کوڕێن جوان و ساقیان چ تشتەکێ دی پێشکێش نەکرینە))[٤٦]

چەوا ل سەردەمێ عەباسیان ( گەلەك شاعران بەرێ خۆ دایە شەرابێ، ئەوا کو ل دێر و مەیخانە و کۆچکاندا هەبوو، گرنگیدانە وەسفکرنا شەراب و مەیگێر و کاسێن مەیێ و دەنگێ سترانبێژێن ژن یان زەلام، چێژ ژ دیتنا ئافرەتێن سترانبێژ و جاریەیێن سەماکەر وەرگرتینە، هەتا وی ڕادەی کو خو دیوانا شاعرەکی ڤالا نینە ژ وەسفا شەراب و مەیێ ڤێجا چ ڤەخوار بیت یان نەڤەخواربیت)[٤٧]، هەر ب ڤی ڕەنگی د شعرا فارسیدا ژی ( شراب و مەیڤەخوارن و مەجلسێن بادەنۆشیێ جهەکێ تایبەت هەبویە و شاعران گرنگیەکا زێدە دایە ڤی بابەتی...)[٤٨] هەتا وی ڕادە کو ئێدی د ئەدەبیاتا فارسیدا (بابەتێ مەیڤەخوارنێ د تەشبیبا دەستپێکا قەسیدەیان و غەزەلێ و تەنانەت مەسنەوی و چوارین و ژی هاتیە بکارهینان...)[٤٩]. هەبوونا جاریەیان د کۆچکاندا و پەیوەندییا وان ب خۆشگۆزەرانییا دەستەلاتداران فاکتەرەکێ گرنگ بوویە دگەشەکرنا مەبەستا غەزەلێدا، لێ تشتێ بالکێش ئەڤەیە کو هەر د ڤی سەقایدا غولام ژی هەبووینە کو ئەو ژی بووینە جهێ سەرنجا شاعران.[٥٠]

ژبلی خۆشگۆزەرانییا پەیوەست ب ژیانا ڕۆژانەیا کۆچکێ، ئەو سامان و گەوهەر و زێر و زیڤ و جوانکاری وگولاڤ و کەلوپەلێن شاهانەیێن ناڤ کۆچکێ ژی ب ئاوایێن جۆراوجۆر بۆ دروستکرنا وێنەیان هاتینە بکارهینان بۆ نموونە (ابن معتز) د شعرێن خۆ دا گەلەك مفای ژ کەرستە و گەوهەر و گولاڤ و ئالاڤێن جوانکاری و خۆشگۆزەرانییا تایبەت ب کۆچکان وەردگریت، د وێنەیێن شعرییێن خۆدا ڤان تشتان وەکو لێچو یان لەوچو یان بۆخواستی و ژێخواستی بکاردهینیت.[٥١] د شعرا شاعرێن سەبکێ خوراسانیدا ژی هەست ب زالبوونا ڤان لایەنان لسەر وێنەیان دهێتەکرن، بۆ نموونە د شعرا گەلەك ژ شاعرێن سەبکێ خوراسانیدا دیاردەیا زێرینکرن و زیڤینکرن و یاقوتیکرنێ دهێتە دیتن، واتە شاعر ڕەنگێ گەلەك تشتان ب ڕەنگێ زێری یان زیڤی یان یاقوت و بەرێن گرانبهایێن دی وەسف دکەت، هندەك جاران ژی زێدەرۆیی د ڤێ چەندێدا دهێتەکرن، واتە گەلەك تشت کو ئەستەمە ڕەنگێ وان زێرین یان زیڤین بیت ب ڤان ڕەنگان دهێنە وەسفکرن[٥٢]، ب دەربڕینەکا دی ژیانا ئەرستوکراتی بسەر وێنەیاندا زال دبیت و شاعر پرانیا جاران ژ ڤی ڕوانگەهیڤە تەماشەی دیاردەیان دکەت.

پەیوەستبوونا شعرا کلاسیکییا کوردی ب لاساییکرنا شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیڤە بوویە ئەگەر کو شعرا کلاسیکییا کوردی ژی ب ژینگەها ئەرستوکراتییا شعرا ڕۆژهەلاتیڤە بهێتە گرێدان.گەلەك ژ وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی یان بەرهەمێ لاساییکرنا وان وێنەیانن کو دبنەرەتدا بەرهەمێ کارلێکا شاعرێن کۆچکان لگەل ژینگەها وان یا ئەرستوکراتی بوویە یان بریتینە ژ بەردەوامیدان ب داهێنانا وێنەیان د چارچووڤەکێ ئەرستوکراتیدا، واتە مۆرکێ ئەرستوکراتی زالە لسەر گەلەك وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی.

هەر وەکو شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی، ئێک ژ تایبەتمەندییێن شعرا کلاسیکییا کوردی ژی هەبوونا جوانکاری و جلوبەرگ و گەوهەر و کەلوپەلێن تایبەت ب ژینگەها ئەرستوکراتی د ئاڤاهیێ وێنەیاندایە. جارنا ئەڤ پەیڤە هەر د چارچووڤێ هەمان پەیوەندییاندا دهێنە بکارهینان کو شاعرێن بەرێ

ب داهێنانا وان ڕابووینە و جارنا ژی ب گۆهڕین و داهێنانڤە دهندەك وێنەیێن جیاوازدا خۆیا دبن، لێ بن سیبەرا مۆرکێ ئەرستوکراتییێ شعرا بەری خۆ دەرناکەڤن:

سۆفتییێن پڕ لەعل و مەرجان ب موژگـانان حەتا

دیدە ڕۆشەن بوو ب دینا دێم دوڕێ سیمین غـەبەب...(جزیری)(دیوان)، ل ٧٦)

لەعل و مەرجان خواستنن و ئامازەنە بۆ ڕۆندکێن چاڤان، چێدبیت ڕەنگێ ڤان دوو بەرێن پربها کو پرانیا جاران سۆرە ئامازەیەك بیت بۆ ئەو گرییا زێدە کو تێدا ڕۆندك و خوین تەڤلیهەڤ دبن. تێکەلبوونا ڕۆندکان لگەل مژیلانکان ژی ب سمتنا لەعل و مەرجانان هاتیە وەکهەڤ کرن. دێم ب دوڕێ هاتیە لێکچواندن و غەبەب یانکو گوشتێ بن ئەرزینکێ ب زیڤین هاتیە وەسفکرن کو ئێک ژ وێنەیێن سواوەیێن شعرا کلاسیکیە. ئەڤ وێنەیە د شعرا شاعرێن بەری جزیری ژی هەر ب ڤی ئاوایی هاتینە بکارهینان و بەرهەمێ تەڤلیهەڤبوونا شعرێ لگەل ژینگەها ئەرستوکراتینە.

طە یرك و عیقد و شوراب و نەترك و بەرگ و وەرەق

هـەر بلەرز و جەزبەیێن یاقووتی تایێ ڕاسـت و چەپ...(جزیری (دیوان)، ل٩٤)

طـە یـرك و عیقـد و شـوراب و بـەرگ و وەرەق ژ جوانکـارییێن گرانبهـایێن ئافرەتـانن، بـۆ چـێکرنا گەلـەك ژ وان زێـر و زیـڤ دهێنـە بکارهینـان، ل ڤێـرێ مرۆڤگەرایی هاتیـە بکارهینـان چونکە مینـا کەسێن جەزبـەگرتی سـەرەدەری لگـەل ڤـان جوانکاریـان هاتیـەکرن، ئـەم دکـارین ڤـی وێنـەی وەکـو خواسـتنا ڤەشـارتی ژی شـرۆڤە بکـەین. یـاقوت ژی ژ بـەرێن گرانبهایـە و گەلـەك جـاران وەکـو خواسـتن بـۆ لیڤـان دهێتـە بکارهینـان، ئەڤـە ژی وێنەیـەکێ بـاوە د شـعرا کلاسـیکییا ڕۆژهـەلاتا ئیسلامیدا. هـەر دوو وێنـە پێکڤـە گرێداینـە و وێنەیـەکێ مـەزنتر پێشـکێش دکـەت، واتە (جوانکارییێن کو یارێ بکارئینایـنە ل دەمێ بریڤـەچوونا وێ دلـەرزن و جەزبـە وان

دگريت، ئەڤ جەزبەيە ژى ل ژێر كاريگەرييا وان لێڤانە كو مينا ياقوتينە). شاعر شيايە ب رێكا گۆهرين و هەرەسكرنا وێنەيێن بەرێ وێنەيەكێ نوى پێشكێش بكەت، لێ ب شێوەيەكێ گشتى د وێنەيدا پشتبەستن لسەر ئەزموونا شعرييا شاعرێن كۆچكنشين ب تايبەت يێن سەردەمێ عەباسيان هاتيەكرن.

زالبوونا مۆركێ ئەرستۆكراتى لسەر شعرا لاساييكرييا رۆژهەلاتا ئيسلامى، بوويە ئەگەر كو شاعرێن كورد ژينگەها ئەرستوكراتى ب ژێدەرەكێ سەرەكى بۆ ئافراندنا وێنەيان بزانن، واتە مەرج نينە هەميشە ب رێكا دووبارەكرنا وێنەيێن شاعرێن بەرێ كەفتبنە داڤا مۆركێ ئەستوكراتيێ شعرا كەڤن، بەلكو ئێدى ئاڤاكرنا وێنەيان د سەقايەكێ ئەرستۆكراتيدا دبيتە ئێك ژ ئامانجێن شاعرێن كورد:

زەردوويى و گۆ بازن، گوستيلكە و بازى بەند
قوريان و بەلاگەردى پەنجە و مەچەك و بالت
تەنيا كە لە خۆت دێ و بەس، لوولە و بەرەگۆ و ساجلەخ
كۆلوانەيى سيمين و زێربافتى قەباى ئالت...(كوردى(ديوان)، ل٧١)

ل ڤێرێ ب رێكا وەسفەكا راستەوخۆ وێنەيەكێ گشتى ل دور جوانييا يارێ هاتيە پێشكێشكرن، كچەك ب بازن و گوستيل و بازيبەند و لولە و بەرەگۆ و ساجلەخ و كۆلوانەيى سيمين و جلوبەرگەك كو ژ پەرۆيەكێ زەربافت ـ ئەو پەرۆيێ كو داڤێن زيرى تێدا دهێنە بكارهينان و گەلەك پربهايە ـ هاتيە وێنەكرن. ئەم نەشێين بێژين ئەڤە وێنەيەكێ دووبارەكريە لێ ب شێوەيەكێ گشتى شاعر ژ چارچووڤێ ئەرستوكراتيێ وێنەيێن شاعرێن بەرى خۆ دەرنەكەفتيە واتە ئەو ئافرەتا ئەو ب وێنكرنا وێ رادبيت ژ چينا ئەرستوكراتيە.

ئیرۆ سەحەر طوغرانیشان ئیعراب و حەرفێن زەرفشان
هاتن لگەل بایێ صەبان مە ژ جانبی دلداری خەط
ئیرۆ بەراتا ئەحمەدی، گوغرا نیشان زەرکەش مە دی
خەگی هەمایون کێ وە دی، شیرین و مەعناداری خەط ...(جزیری (دیوان)، ل٢٩١)

وەسفێن وەکو (توغرانشان واتە نەخشاندی ب مۆرا شاهی، زەرفشان واتە زێرین یانکو زێرباران، زەرکەش واتە نەخشاندی ب زێری و هومایون کو پتر د وەسفا کەسێن پایەبلند دا دهێتە بکارهینان بۆ سالۆخدانا نامەیەکا مەعنەوی هاتینە بکارهینان. شاعر مینا پاشا یان سولتانەکی سەرەدەرییێ لگەل ڤرێکەرێ نامەی دکەت و مفای ژ هەمان کەرەستەیێن ئەرەستوکراتییێن شعرا کەڤن وەردگریت.

ئێک ژ وێنەیێن باو د شعرا کلاسیکییا کوردیدا وێنەیێ مەجلسا مەینۆشییا ئەرستوکراتییە. باشترین جۆرێ مەی و شەرابێ و دەنگخۆشترین ستنرانبێژ و باشترین موسیقاژەن جوانترین سەماکەر و چێژوەرگرتن و تێرکرنا حەزێن سکسی ڕەگەزێن سەرەکییێن ڤان جۆرە دیمەنانن:

با لە شەرتی بادە مەردئەفگەن بێ ساقی نەوجوان
دیدە سێوەنگی و کلاوکەچ کات و دوگمەی سینە واز
زولف و کاکۆل و غولامانەی هەموو ئەفشان دەکا
بێ بە زانوودا بدا جامێ بە عیشوە و شەرم و ناز...(کوردی (دیوان)، ل ١٥٨)

شاعر وێنەیەکێ تەواو ژ مەجلسەکا مەیڤەخوارنێ پێشکێش دکەت، باس ژ مەیا بهێز و کاریگەر هاتیەکرن. لگەل ڤێ چەندێدا هەبوونا مەیگێرێن سنێلە و سەرنجراکێش ژی ب مەرج هاتیە زانین.

سەلوا سەهێ قەد خەمملی لەو کەمملی مەستانە ڕەقص
وەر سوحبەتێ گەر قابلی دێ بێت و ڕەت شاهانە ڕەقص
مەستانە مەستان نۆش نوش قەرقەف د جامان هاتە جۆش
مادێ بمینیت کەس ل هۆش وەقتێ کو بێن دوردانە ڕەقص ...(جزیری (دیوان)، ل٢٧٩)

دیمەنێ مەجلسەکا مەیڤەخوارن و سەما و خۆشگۆزەرانییا شاهانە هاتیە پێشکێشکرن. ئاماژە ب هەبوونا ژنێن جوان یان غولامێن جوان هاتیەدان وەسفا شەرابێ هاتیەکرن. یانکو ب کورتی هەر هەمان رەگەزێن مەجلسێن مەیڤەخوارنێ واتە (مەی و مەستی و موسیقا و سکسی و چێژ) هاتینە وێنەکرن. گەلەك جاران شاعر ڤان وێنەیان بۆ مەبەستێن دی و ب تایبەت سۆفیگەریێ بکاردهینن، لێ ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ وێنەیە ژی ژ چارچووڤێ لاساییکرنا وێنەیێن شاعرێن کۆچکنشین دەرناکەڤیت چونکە ئەو کارێ ئەڤ شاعرە دکەن پتر بکارهینانا وێنەیێن بەرێ وەکو رەمز یان هێمایانە:

من سەحەرگاها ئەزەل دی مەی فرۆشان راست و چەپ
رەقص بەستن تێن سەمایێ دۆش ب دۆشان راست و چەپ
شاهدێن دێم بەدر ساقی زوهرە سیما خضر پۆش
موطربان نەی چەنگ و ئاواز با سروشان راست و چەپ
دل ژمن بر موغبەچانێ سیم ئەندام چەهرە گول
چەشم مەستان جام د دەستان خەمرە نۆشان راست و چەپ...(لاغەری(دیوان)،ل٢٩)

(سەحەرگاها ئەزەل) بەلگەیە بۆ ڤێ چەندێ کو شاعری دڤێت مەجلسا مەیڤەخوارنا خۆ ژ قەید و بەندێن ماتریالی رزگاربکەت و رەهەندێن ئایدیالی و گیانی ببەخشیتە وێنەیێن خۆ. ئەڤە ژی پێنگاڤەکا گەلەك گرنگە بۆ خۆ رزگارکرن ژ دەلالەتێن ئەرەستوکراتییێن شعرا کەڤن لێ لگەل هندێ ژی ئەو وێنەیێ کو شاعر پێشکێش دکەت ب تەمامەتی دەربرینێ ژ مەیڤەخوارن و خۆشگۆزەرانییا شاهانە دکەت. هەبوونا مەیێ، ئامادەبوونا شاهدان کو مەبەست پێ غولامێن جوانن، بەرهەڤبوونا موتربان و موسیقاژەنان و موغبەچەیان دبنە ئەگەر کو تابلۆیا (مەی و مەستی و مۆسیقا و سکس و چێژ)ا ئەرستوکراتی دووبارە ببیتەڤە.

### ٣ . ١. ١. ٢. ٢. بكارهينانا وێنەیێن تايبەت ب واقعێ شاهدبازی و نێرخوازیێ شعرا کەڤن:

دیاردەیا هەڤرەگەزخوازیێ تایبەت نینە ب چ نەتەوە یان جڤاکێن دیارکریڤە، بەلکو ل هەمی جڤاکان ب ڕێژەیێن جیاواز دهێتە دیتن. ژێدەرێن مێژوویی ڤێ ڕاستیێ ددەنە خویاکرن کو هەر ژ کەڤنترین سەردەمان حەژێکرن و ڤیانا هەڤرەگەزی ب ئاوایێن جیاواز هەبوویە.ل ئوروپا و ئەفریقا و ئاسیا دەستەلاتا سیاسی و ئایینی هەلویستێن جیاواز ل هەمبەر ڤێ یەکێ هەبووینە؛بۆ نموونە ڤیانا هەڤرەگەزی ل یونانا کەڤن هەبوویە و ب عەشقا ئەفلاتونی هاتیە نیاسین، ل وەلاتەکێ وەکو ژاپۆنێ تشتەکێ ئاسایی و ڕەوابوویە و ل ئیرانا سەردەمێ هەخامەنشیان و ساسانیان ب توندی دژایەتییا وێ هاتیەکرن و سزایا سێدارەدانێ بۆ هاتیە دانان[٥٣].

کەواتە ئەڤ دیاردەیە ژ سەردەمێن کەڤنڤە تەڤلی ژیانا مرۆڤان بوویە و بەرجستەنەبوونا هەڤرەگەزخوازیێ د ئەدەبیاتا مللەتەکیدا نابیتە بەلگە بۆ نەبوونا وێ. (سیروس شمیسا) د ڤێ باوەرییێدایە کو (نەبوونا چ ئاماژەیێن ڕاستەوخۆ ب ڤێ دیاردەیێ د ئێکەمین شعرێن کلاسیکییێن فارسی و شعرا عەرەبییا سەردەمێ جاهلی نیشانا ڤێ چەندییێیە کو ئەڤ دیاردەیە د ناڤ ئیرانییێن کەڤن و عەرەبێن سەردەمێ جاهلیدا نەبوویە).[٥٤] دیارە کو گەلەك جاران دابونەریتێن جڤاکی دبنە بەربەست د ڕێکا دەربڕینا ڤان جۆرەبابەتان و مەرج نینە هەمی دەمان شاعر بشێت تەڤایا ڕاستی و دیاردەیێن کو د جڤاکیدا هەنە بەرجستە بکەت.[*]

سەرەرای هندێ کو ئەم د ڤێ باوەرییێداینە کو ئەڤ دیاردەیە ژ کەڤنترین سەردەمان هەبوویە لێ ئەو تشتێ کو ئەم داکۆکیێ لسەر دکەین بەرجستەبوونا بەرچاڤا وێ د ژینگەها خۆشگۆزەرانا سەردەمێ عەباسیان و ب تایبەت ل دەڤەرا خوراسانێیە. ئەڤ دیاردەیە وەسا باو بوویە کو ب ئاشکرایی بوویە بەشەك ژ شعرا ڤی سەردەمی، ب ئاوایەکێ سەرەتایی د هەمبێزا قەسیدەیا عەرەبی خویابوویە و مینا

تایبەتمەندی یان دیاردەیەکا گشتی بسەر قەسیدەیا سەبکێ خوراسانی زالبوویە و پاشان بۆ شعرا نەتەوەیێن دیێن دەڤەرێ هاتیە ڤەگوهاستن.

گرنگیدان ب مەعشوقێ نێر بۆ ئێکەمین جار د شعرا عەرەبییاسەردەمێ عەباسیان دهێتە دیتن، داهێنەرێ ڤێ جۆرە شعرێ (والبە بن الحباب، مرن:٧٨٦ك) بوویە، پاشی ژ لایێ قوتابیێ ویڤە واتە (ابو نواس)ی گرنگیکەکا زۆر پێ هاتیەدان و هەر ب رێکا شعرێن وی هاتیە ڤەگوهاستن بۆ ناڤ شعرا فارسی، دیارە ل سەردەمێ عەباسیان زەمینە بۆ ڤێ جۆرە شعرێ هەموار بوویە چونکە بەلگەیێن مێژوویی ئاماژە ددەنە پیتەپێدانا خەلیفەیێن عەباسی ب غولامان.[٥٥] تەنانەت باسێ هندێ دهێتە کرن کو گەلەك جاران خەلیفەیێن عەباسی جاریە یان غولامەك وەکو دیاری پێشکێشی وی شاعری کرینە کو ب ستایشکرنا خەلیفەی رابوویە.[٥٦]

هەرچەندە کو رەهـ و ریشالێن شاهدبازی و نێربازیێ د قەسیدەیا عەرەبییا سەردەمێ عەباسیان دا دهێنە دیتن لێ ئەڤ چەندە د شعرا فارسیدا گەهشتییە کوپیتکا خۆ و بوویە دیاردە (ئەگەر ئەم غەزەلا فارسی هەر ژ دەستپێکێ هەتا دگەهیتە سەردەمێ نوی بێخینە بەر ڤەکۆلینێ دێ گەهینە ڤێ ئەنجامی کو د شعرا تەغەزولییا فارسی مەعشوقا مێ گەلەك دەگمەنە و ئەو وەسفێن کو شاعرێن ئیرانی بکاردهینن زێدەتر وەسفا وان زەلامانە کو سالۆخێن ئافرەتان ل جەم وان هەنە، ب دەربرینەکا دی مەعشوق د شعرا فارسیدا پتر دوو نفشیە تاکو تاك نفش بیت و ئەو نفشێ کو پتر بوویە جهێ گرنگیپێدانا شاعران نفشێ نێرە..)[٥٧] یانکو ب دەربرینەکا دی ئەم دشێین بێژین ئەڤ دیاردەیە (د غەزەلا فارسیدا ب بەردەوامی هەبوویە و ل سەدان نوت ژ تەغەزولێن دەستپێکا قەسیدەیێن شعرا فارسییا کەڤن ب خۆڤە دگریت. ئەڤ دیاردە ل سەردەمێن پشتی هنگی ژی (لگەل هندەك گوهرینان) واتە د شعرێن شاعرێن ناڤدارێن وەکو حافز و سەعدیدا ژی بەردەوام بوویە...)[٥٨] کەواتە ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ تایبەتمەندیە زالە بسەر شعرا کلاسیکییا فارسی.

سەرەتایا خویابوونا ڤێ دیاردەیێ د شعرا فارسیدا بۆ سەردەمێ سامانیان دزڤریت، هەر چەندە د شعرا سەردەمێ سامانیدا ئاماژەکا وەسا ب ڤێ دیاردەیێ نەهاتیە دان لێ چونکە ل ڤی سەردەمی هێدی هێدی غولامێن تورك د دەولەتا سامانیدا بووینە خودان پلە و پایەیێن لەشکری و رۆلێ خۆ دیتینە لەوما جارنا شاعران باسێ جوانی و سەرنجراکێش بوونا ڤان غولامان کرینە، ب ڤی ئاوایی ئاماژەیێن سەرەتایێن شاهدبازیێ د قەسیدەیێن ئێکەمین شاعرێ ناڤدارێ ئەدەبێ فارسیدا واتە (رودەکی)دهێتە دیتن.[٥٩]

وەرار و گەشەکرنا شاهدبازیێ د شعرا فارسیدا بۆ سەردەمێ غەزنەویان دزڤریت. ل ڤی سەردەمی نێربازی و حەژێکرنا غولامان دیاردەیەکا باو بوویە. پرانیا سولتانێن غەزنەوی گیرۆدەیێن ڤێ چەندێ بووینە، تەنانەت (سولتان مەحمودێ غەزنەوی) ژی غولامێن خۆ هەبووینە و چیرۆکا حەژێکرنا وی و غولامەکێ تورك ب ناڤێ (هەیاس)ی ب ناڤودەنگە[٦٠]، ئەڤ دیاردەیە د شعرا ڤی سەردەمیدا هەتا وی ڕادەی بهێزە کو دشێین بێژین (د شعرا سەردەمێ غەزنەویدا گەلەك ب زەحمەت نموونەیێن عەشق و حەژێکرنا ڕەگەزێ مێ دهێنە دیتن)[٦١]

ل سەردەمێ سەلجوقیان ژی شاعران گرنگیدایە شاهدبازی و حەژێکرنا غولامان. گەلەك سەرهاتیێن مێژوویی ژی هەنە کو گرنگیدانا سولتانێن سەلجوقیان ب شاهدبازیێ پشتراست دکەن.[٦٢]ب ڤی ئاوایی مەعشوق د پرانیا قەسیدەیێن شاعرێن سەبکێ خوراسانی واتە یێن وەکو ((فەروخی، موعزی، مەنوچهری و ئەنوەری و...هتد ئەو شاهدێن بازارینە کو بۆ هەمی کەسان بەردەستن. ئەڤرو لگەل ئێکینە و سوباهی لگەل ئێکێ دینە. ئەڤ شاهدە ژی پتر ئەو غولامێن تورکێن تازەپێگەهشتی بوون کو موجاهدان د هێرشێن خۆ یێن سەدەیێن سێیێ و چوارێ کۆچی بۆ سەر دەڤەرێن (ماوراء النهر) وەکو ئخسیر گرتبوون و کربوونە کۆیلەیێن خۆ و د هەر مالەکێدا دهاتنە دیتن))[٦٣]

هەرچەندە کو وەرارا دیاردەیا نێربوونا مەعشوقان و شاهدبازیێ پتر پەیوەستە ب شعرا تەغەزولییا دەستپێکا قەسیدەیا خوراسانی لێ دیارە وەکو

گەلەك ژ ئەدگارێن قەسیدەیێ ئەڤ تایبەتمەندیە د غەزەلێن سەبکێ عەراقیدا ژێ هاتیە پاراستن (تەنانەت د ئێکەمین غەزەلێن فارسییێن سەدێ شەشێ کۆچی ژێ کو پاشی دبنە هێڤێنێ سەرهلدانا غەزەلا پێگەهشتییا فارسییا سەبکێ عەراقی ل سەدێ حەفتێ ئەڤ دیاردەیە هەیە. د ڤان غەزەلاندا ژێ باسێ چاڤێن خومار و زولفا دووتا و ژهەڤجودابوون و بهەڤگەهشتن و بەژنا وەکو سەروێ و سونبول بوونا زولفێ و نێرگس بوونا چاڤان و مەیگێربوونا مەعشوقان هاتیەکرن لێ تشتێ ئاشکرا ئەڤەیە کو مەعشوق نێرە تەنانەت د شعرێن (حافزێ شیرازی) و (سەعدی شیرازی)دا ژێ مەعشوق هەر نێرە ئەڤ نەریتە د غەزەلێن سەبکێ عەراقیدا هند بهێزە کو ( شاعر دەلیڤێ ددەتە خۆ کو مینا مەعشوقەکی سەرەدەرییێ لگەل شاهان ژێ بکەت. بۆ نموونە پرانیا شعرێن (حافزێ شیرازی) ژێ کو د ڕوالەتدا دلدارینە د بنەرەتدا بۆ ستایشکرنا (شاهـ شوجاع)ی هاتینە ڤەهاندن)[٦٤]

هەر لسەر بناغەیێ بەردەوامبوونا ڤێ دیاردەیێ ب درێژییا هەبوونا شعرا کلاسیکییا فارسی، دشێین بێژین کو شاهدبازی و نێربازی بوویە بەشەك ژ نەریت و لاساییکرنا شعرا فارسی و گەلەك شاعران لسەر بنەمایێ لاساییکرنێ مەعشوقێ نێر بکارئینایە. ب تایبەت شاعرێن عارف و سۆفی چونکە هەر ژ (سەدێ حەفتێ کۆچیڤە هندەك شاعرێن ناڤدار دهێنە دیتن کو وەسف و پەسنا هەر سێ جۆرێن مەشوقان دکەن واتە جار پەسنا کچ و ژنێن جوان دکەن و جارنا باسێ کوڕێن نازك و سەرنجراکێش دکەن و جارنا ژێ بەرێ خۆ ددەنە عەرشا ئیلاهی و پەسنا خودێ دکەن. پرانیا ڤان شاعران کو سۆفینە ژ لایەکیڤە دلێ وان ب عەشقێن دنیایڤە هاتیە گرێدان و ژ لایەکێ دیڤە باسێ زوهد و باوەرییێن عرفانی و حەژێکرنا خودێ دکەن و ژلایەکێ دیڤە بەردەوامی ددەنە پەسن و ستایشا فەرمانرەوا و دەستەلاتداران[٦٥]، کەواتە ئەڤ دیاردەیە ب ڕەنگەکێ نوی بوویە بەشەك ژ سۆفیگەرییا ئیسلامی. سۆفیان عەشقا ڕەگەزێ نێر وەکو ڕێکەك بۆ گەهشتن ب عەشقا خودایی بکارئینانە. سۆفی د ڤێ باوەرییێدانە کو ئەو دشێن ب ڕێکا ڤێ جۆرە حەژێکرنێ بگەهنە حەژێکرنا حەقیقی یانکو ڕاستەقینە کو حەژێکرنا خودایێ

مەزنە. دیارە هندەك ژ ڤان سۆفیان ژی زێدەرۆیی د ڤێ چەندێدا کریە و گەهشتینە ڤێ قەناعەتێ کو تەماشاکرنا کوڕێن سنێلە و کویربوون د ڤێ چەندێدا هەر وەکو ڤێ چەندێیە کو ئەو تەماشەی جوانییا خودێ دکەن یانکو د ڤێ باوەرییێدابووینە کو خودێ د وێنەیێن جواندا دەردکەڤیت.[٦٦] هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەر کو سۆفی واتایەکا جیاوازببەخشنە هندەك زاراڤێن تایبەت ب شاهدبازیێ، هەر بۆ نموونە (شاهد  بوویە ئێک ژ زاراڤێن سۆفیان و بۆ وان کەسان هاتیە بکارهینان کو خودان دێمەکێ جوان و سەرنجراکێشن و دبنە بەلگە بۆ شیان و هێزا خودایێ مەزن...).[٦٧] سەرەرای هەولدانا سۆفیان بۆ گۆهرینا ڤێ جۆرە عەشقێ و ئاراستەکرنا وێ بەرەڤ عەشقەکا ئیلاهی، ئەم نکارین هەمی دەمان ڤێ چەندێ ب دابڕان ژ هەڤرەگەزخوازییا شعرا قەسیدەنڤیسێن سامانی و غەزنەوی و سەلجوقیان ل قەلەم بدەین چونکە زۆربەی جاران وێنەیێن تایبەت ب هەڤرەگەزخوازیێ هەمان وێنەیێن شاهدبازییا سەبکێ خوراسانیە.

شاهدبازی و ڤەهاندنا غەزەلان د وەسف و حەژێکرنا ڕەگەزێ نێر کو د سەبکێ خوراسانیدا گەهشتییە کوپیتکا خۆ و پاشی کاریگەرییا خۆ لسەر سەبکێ عەراقی کریە، ب ئاوایێن جۆراوجۆر ڕەنگڤەدانا خۆ د شعرا کلاسیکییا  کوردیدا هەبوویە و پرانیا شاعرێن کورد کەفتینە ژێر کاریگەرییا  مۆرکێ شاهدبازیێ شعرا فارسی.

تشتێ بالکێش سەبارەت ب ڕەنگڤەدانا شاهدبازی و زالبوونا وێ بسەر دیمەنێن غەزەلا دلدارییا کوردی ئەڤەیە کو شاعرێن کورد گەلەك جاران زانینە کو د غەزەلا واندا ئاراستەیەکا هەڤرەگەزخوازیێ هەیە، واتە گەلەك ژ غەزەلێن وان بەروڤاژی تێگەهشتنا مە یان بۆ هەر دوو ڕەگەزێن نێر و مێ هاتینە ئاراستەکرن یا هەڤرەگەزخوازی د ڤان غەزەلاندا زالە و شاعری پتر گرنگی ب ڕەگەزێ نێر دایە. دیارە کو (نالی) هەست ب نێربوونا مەعشووقی د غەزەلا فارسیدا کریە و ڤیایە هەڤسەنگییەکێ بێخینە د ناڤبەرا لاساییکرنا ڤی نەریتێ شعرا فارسی و سروشتێ خۆ :

دێرا ئێکێ:

عیشـــقت كـــه مـــەجازی بـــێ، خـــواهیش مەكـــە ئـــیللا كـــچ

شیـــــرین كـــچ و لـــەیلا كـــچ و ســـەلما كـــچ و عـــەزرا كـــچ

دێـرا پێنجێ:كـورڕ وەك گـولْی گــولزارە، ئــەمما ســەمەری خــارە

وەك هەنـــــگی چـــــزوودارە، هەنـــــگوینی موســـــەففا كـــــچ

دێـــرا یـــازدێ:كورڕ تـــازە و تـــەڕ، مـــادام وەكـــوو خـوشكـــی بـــێ

ئـــــەمما كـــــە ڕوا ســــــەبزە، دیـــــبا كـــــورڕ و زیـــــبا كــــچ

دێـرا چـواردێ: جـــەننەت پـــڕی ویلدانـــە، خـــادیم هـــەمی غیلمانـــە

خـــانم كـــە تێـــدا حـــۆرین، یەكســـەر هـــەموو حـــەسنا كـــچ

...( نالی (دیوان)، ل ١٦٥)

كچ و كورڕ دشێن وەك مەعشوق ڕۆلێ خۆ ببیبنن یانكو هەر دوو سەرنجراكێش و جوانن لێ جوانییا كورێ ناگەهیتە جوانییا كچێ، دەمێ (سەبزە) كو مەبەست ڕیهن دەردكەڤن جوانییا كورێ كێم دبیت و ناگەهیتە جوانییا كچكێ. هەر وەسا د بەهەشتێدا غولمان خزمەتگوزارێن حوریانن. ب شێوەیەكێ گشتی شاعر چێژ و خۆشیێ د هەبوونا هەر دوو ڕەگەزاندا دبینیت لێ ب دیتنا وی ڕەگەزێ مێ سەرنجراكێشترە. (كور) ب گولا گولزارێ هاتیە لێكچواندن، تەڕی و نازكییا گولێ ب جوانی و نازكییا كورێ، سمبێل و ڕیهێن كورێ ژی ب ئیستریێن گولێ هاتینە لێكچواندن.پشتی دەركەفتنا ڕیهـ و سمبێلان ژی كورڕ جوانییا خۆ ژ دەست نادەت بەلكو هێشتا وەكو دیبا یانكو پەرۆیێ ئارمیشیە. پاشی كورڕ و كچ لگەل حورێ و غولمانێن بەهەشتێ دهێنە هەڤبەركرن چونكە د بەهەشتێدا غولام سەرەرای جوانی و بالكێشیێ پتر خزمەتكارێن حوریانن. دیارە ئەڤ هەلویستێ وی بوویە جهێ گفتگۆ و دانوستاندنا شاعرێن پشتی وی، بۆ نموونە (ئەدەب) د شعرەكێدا كو لدویف شۆپا (نالی) هاتیە ڤەهاندن بۆچوونا خۆ سەبارەت ڤێ چەندێ ددەتە دیاركرن:

دێرا ئێكێ:

دێـرا ئێكـێ: بـۆ ئـەو كـە عیشـقی بـێ، فـــەرقی نییە:كـــورڕ، یـــا كـــچ

هـــەرچەندە كـــە مەعـــلوومە، فـــەرقی چـــییە، كـــورڕ یـــا كـــچ

دێرا چوارێ: کوڕ، یا کچی سیمین تەن، هەر دوو گوڵی یەك گولشەن
هەردوو صەنەمی ئێمەن، لاتە کوڕ و عوززا کچ

دێرا سێزدێ: بێ هەر دوو حەرامە عەیش، بێ ڕوکن و قەوامە عەیش
ئەو وەقتە تەمامە عەیش؛ یومنا کوڕ و یوسرا کچ

دێرا هەڤدێ:کوڕ شاهیدی سەیرانی، کچ دلبەری پەنهانی
بۆ بەزمی مەهەیا کوڕ بۆ عەیشی مەحەللا کچ

دێرا بیست و سێ:نالی کە ئەوی دیبا، ئەلبەتە دەبوو وتبای
عیشقێ کە مەجازی بێ، تالب مەبە ئیللا کچ

...(ئەدەب (دیوان)، ل٨٩- ٩٠)

شعر د هەمان کەشوهەوایێ شاعرێن قەسیدەنڤیسێن کۆچکا سامانی و غەزنەوی و سەلجوقیاندا هاتیە پێشکێشکرن. ئەوکۆچکێن کو پڕ بوون ژ جاریە و غولمانان و بەردەوام مەجلسێن مەیڤەخوارن و سەماکرنێ ب خۆڤ دگرتن. د وێنەیێن شاعریدا جاریە و غولمان دهێنە دیتن. شاعر داکۆکیێ ل بالکێشبوونا هەر دوو ڕەگەزان دکەت. ئەو کچ و کورێن جوان ب سیمین تەن وەسف دکەت و وان ب گولا گولزارەکێ وەکهەڤ دکەت و وان ب صەنەم یانکو بت وەسف دکەت یانکو بت کو گەلەك جاران د شعرا کلاسیکیدا بۆ مەعشوقێ دهێتە بکارهینان لێکچواندن یانکو خواستنەکە کو بۆ هەر دوو ڕەگەزان دهێتە بکارهینان.کوڕ مەعشوقەکە کو تو دشێی هەمی جهان ب تایبەت ل گەشت و سەیرانان لگەل بی لێ کچ مەعشوقەکا نیهانیە یانکو کورێن جوان بۆ دەمێ مەستیێ گونجاون و کچ بۆ وی دەمی باشن کو مەستییا مرۆڤی دگەهیتە کوپیتکێ. شاعر ل داوییا شعرا خۆ سەرەرای دووبارەکرنا ئاخفتنا (نالی) ڕەخنێ ژ وی دگریت کو زێدەرۆیی د گرنگیدان ب عەشقا ڕەگەزێ مێ کریە. یانکو ب ئاوایەکێ نەراستەوخۆ داکۆکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو عەشقا ڕەگەزێ نێر عەشقەکا حەقیقیە یانکو ب دەربڕینەکا دی دڤێت جەختێ لسەر عرفانی بوونا عەشقا ڕەگەزێ نێر بکەت. دیارە کو (حەریق) ب ئاشکراییەکا زێدەتر دەربڕینێ ژ ڤێ چەندێ دکەتن و ڕەخنێ ژ هەلویستێ (نالی) دگریت:

دێـرا ئێکـێ: عەشـقت کـە حـەقیقی بـێ تالـب مـەبــە ئـێلا کــورِ
هـــەم حـــەزرەتی لـــەولا کـــور و هـــەم یـوســـف والا کـــور
دێـرا سـێیێ: عەشـقی کــە بـە قـــوەت بـێ مایـل بـەر مـــروەت بـێ
نـــەم دیـــوە کـــە تالـــب بـــێ ئـــێلا کـــە تـەلـــەب کـا کـــورِ
دێرا حـەفتێ: کـچ تـەبعی کـەچ و نـاقص کـورِ تـەبعی تـەر و خـالص
هـــەم صـــوحبەت و هـــەم جـــالس خـــۆش منشـــورە ســیما کـــورِ
دێرا یـازدێ: قامـەت کـە وەکـو نـەی بـێ کـێ دیویـە لـو گـەل بـەی بـێ
ئـــــەم نیســـــبەت ئـەخـلاقـــــە دەرحـــــەق کچـــە یـــا کـــور
دێـرا دوازدێ: سـەد حـەیفی کــە تــۆ (نـالی) بــەو پیریـــیە مـــندالی
بـــەم تـــەرزە لـــە عەشـــق ئـــەدوی زیبـــا کـــچ و دیبـــا کـــور
(حەریق (دیوان)، ل ٤٦- ٤٩)

(حەریق) د ڤێ باوەرییێدایە کو پێدڤیە گرنگی ب عەشقا کوڕی بهێتەدان چونکە عەشقەکا حەقیقیە، عەشقا کوڕی بهێزترە و دانیشتن و تێکەلی لگەل کوڕێن جوان باشترە ژ کچێن کو سروشتێ وان تەواو نینە واتە ئەو جوانیێ د ڕەگەزێ نێردا دبینیت.کورِ خودان دێمەکێ جوانترە، بەژنا کوڕی وەکو نەیێ یانکو لەڤەنێیە یانکو لێکچواندنا بەژنا کوڕی ب لەڤەنێ بەرئاقلتر و گونجاوترە.

ڕاستە کو د ڤان نموونەیان جیاوازی د ناڤبەرا بۆچوونا هەر سێ شاعراندا هەیە واتە (نالی) عەشقا ڕەگەزێ مێ ب باشتر ژ ڕەگەزێ نێر ل قەلەم ددەت و ئەدەب د ڤێ باوەرییێدایە کو کورِ بۆ عەشقا حەقیقی و کچ بۆ عەشقا مەجازی گونجاون. حەریق ژی پتر لایەنگرێ عەشقا ڕەگەزێ نێرە و وێ ب عەشقەکا حەقیقی ل قەلەم ددەت لێ ب شێوەیەکێ گشتی هەر سێ شاعر پشتەڤانییا ڤی نەریتێ شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دکەن کو پتر بەرهەمێ کاریگەرییا سەبکێ خوراسانی و بەردەوامبوونا وێ د غەزەلا سەبکێ عەراقییە، کەواتە چێدبیت دیتنا وان بۆ ڤی بابەتی جیاواز بیت لێ گرنگیدانا وان ب ڕەگەزێ نێر و ئەو وێنەیێن کو ئەو بۆ نیشاندانا جوانییا مەعشوقێ نێر بکاردهینن هەر ئەو وێنەنە کو

شاعرێن سەبکێ خوراسانی ژ بەر ئەو کارلێکا کو لگەل مەعشوقێ نێر هەبووینە ب ئافراندنا وان ڕابووینە.

ڕەنگڤەدانا ڤی نەریتی د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی چەندین ئاراستە و حالەتێن جیاواز ب خۆڤە دگریت.جارنا گەلەك ئاشکرایە ب چ ئاوایان نکۆلی لێ ناهێتە کرن و جارنا ژی ب تنێ بریتیە ژ دووبارەکرنا ئەو پەیڤ و لێکچواندنێن تایبەت ب تەغەزولا شاهدبازییا خوراسانی.

شاهدبازی یان هەڤرەگەزخوازی ب ئاشکرایی د ڤان نموونەیاندا دهێتە دهێنە دیتن:

شـیریـن وەکـو خـوسـرەو پسەری هورمزە جافە
چـاو مـامــزە لـێـو قـرمــزە ئـیمـانسـزە جـافـە...( شیخ ڕەزا (دیوان)ل ١١٠)

شۆخی تەرسا بەچەیێ، غارەتی دین و دلی کرد
نــە دڵـی هـێشت و نەتاقەت، نە قـەرارم بە خـودا...(ئەدەب (دیوان)، ل٥١)

ســـەروی ڕەوانـــە قــامـــەتـی لاوی ڕەوانــدزی
ئـافـاتی جـانـە غـــەمـزەیـی چاوی ڕەوانـــدزی
لەو ناسیحــانی ئیـّمــە کــە بۆ دڵ دەدەن بــە دز
دڵ ڕەنـجـە بــوو نیـگـــارم و دیــنی لـــەوان دزی...(مەحوی (دیوان)، ل٣٨٥)

ڤیانا ڕەگەزێ نێر و ئاماژەدان ب هەڤرەگەزخوازیێ گەلەك ئاشکرایە. ل دێرا ئێکێ شاعر ب هەستەکێ سکسی و چێژ و پەرۆشییەکا زۆر باسێ سەرنجراکێش بوونا ڕەگەزێ نێر دکەت. پەیڤا (پسەر) واتە کوڕ چ گومانەکی بۆ نێربوونا کەسێ وەسفکری ناهێلیت لێ شاعر چاڤێن وی ب چاڤێن مامزێ وەکهەڤ دکەت. د نموونەیا دوویێدا ژی (تەرسا بەچە) واتە بچویک یان زارۆکێن مەسیحیان، کو گەلەك جاران د شعرا کلاسیکییا فارسیدا هاتیە بکارهینان.د نمونەیا سێیێدا ژی ب ئاشکرایی باسێ حەژێکرنا ڕەگەزێ نێر هاتیە کرن و (لاوی ڕەواندزی) ئاماژەیەکا ڕاستەوخۆیە بۆ ڤێ جۆرە حەژێکرنێ، بەژنا ڤی لاوی ب دارا

سەرویٚ هاتیە لێکچواندن. خواندەڤان و ڤەکۆلەر دشێن ب رێکا راڤەکرنەکا عرفانی یان سۆفیگەری ئاراستەیا واتایا ڤان دێرا بگۆهرن لیٚ نەشێن نکۆلییٚ ل هندیٚ بکەن کو ئەڤ دێرێن شعری مۆرکیٚ هەڤرەگەزخوازییا شعرا بەری ڤیٚ قوناغیٚ ب خۆڤەدگرن. ئەگەر ئەڤ نەریتە د شعرا کلاسیکییا فارسیدا باو نەبا شاعرێن کورد ژی نەدشیان وەسا ب رۆهنی و ئاشکرایی ڤان وێنەیان پێشکێش بکەن.

سەرەرای نموونەیێن سەری کو تێدا ب ئاشکرایی باسیٚ هەڤرەگەزخوازییٚ هاتیەکرن. پرانیا جاران شعرا کلاسیکییا کوردی گیرودەیا مۆرکیٚ شاهدبازی یان هەڤرەگەزخوازییا شعرا کەڤنە. ئەڤە ژی دبیتە ئەگەر شعر وەکو پێدڤی د خزمەتا بەرجستەکرنا جوانییا ئافرەتیٚ و نازکییا وێدا نەبیت.دشێین وەك نموونە ئاماژەییٚ بدەینە بکارهینان پەیڤا (شاهد) کو مەعشوقیٚ نێرە:

وەهـ کو بیٚ شاهد و مەحبوب تە عومریٚ خوە بـوار
کـارەکـی رابـە بکـە وەقـتە کـو ئیشـارە درەنـگ ...(جـزیری (دیوان ٣٣٩)

شـاهد و ساقی و موطرب کـو ل وی جـەمـع دبـن
ژ خـوەشی صوحبەتیٚ یەك سالیٚ د وان یەك چاخە ...(هـادی (دیـوان)، ل٦٤)

شـاهیـدان حـەقیانە، نـازی جوانی بفرۆشـن وەلـیٚ
ئەم بە مالٚ و دل رەضا نابێت و، سـەر یەغما دەکـا ...(کوردی (دیوان)، ل ٥٧)

شاهد ئاماژەدانەکە بۆ حەژێکرن و ڤیانا رەگەزیٚ نێر، ئەڤ وێنەیە پەیوەستن ب مێژوویا سەدان سالەیا ویٚ هەڤرەگەزخوازییا کو د سەقاییٚ ئەرستوکراتییا کۆچکا دەستەلاتدارێن تورك نەژاد و جڤاکیٚ ئیسلامییٚ رۆژهەلاتا ئیرانێدا هەبوویە. د نموونەیا ئێکێدا تەڤایا دێرا شعریٚ وێنەیەکی پێشکێش دەت، شاعر پەشیمانە ژ ڤیٚ چەندیٚ کو ژییٚ خۆ بیٚ شاهد و موترب و مەیگێر بوراندیە یانکو وێنە دەربرینیٚ ژ داخباربوونا شاعری ل هەمبەر ژ دەستدانا دەلیڤێن خۆشییٚ دکەت، ژی ب رۆژەکیٚ هاتیە لێکچواندن کو گەهشتیە دەمیٚ ئێڤاریٚ و چ نەمایە ب داوی بهێت. نموونەیا دووییٚ ژی هەمان وێنەییٚ دێرا ئێکیٚ ب ئاوایەکیٚ دی

پێشکێش دکەت؛ دەمێ شاهد یانکو مەعشوقێن ڕوی جوان و مەیگێر و موترب کوم دبن مەجلسەکا وەسا دهێتە سازکرن کو تێدا هەر سالەك دبیتە دەمەك یانکو ئێدە مرۆڤ هەستێ ب دەربزبوونا دەمی ناکەت. د نموونەیا سێیێ وەسفا شاهدەکی دهێتەکرن کو نە ب تنێ دل و مالێ مرۆڤی ب تالان دبەت بەلکو قەستا کوشتنا مرۆڤی ژی دکەت.

ژبلی بەشداربوونا شاهدی وەکو مەعشوقێ نێر د شعرا کلاسیکییا کوردیدا، گەلەك وێنە هاتینە تەرخانکرن بۆ وی دەمێ کو شاهدێ شاعری بەرەڤ قوناغا سنیلەیێ ڤە دچیت و ڕیهـ و سمبێلێن وی خۆیا دبن و دبنە ئەگەر کو ئەو جوانی وبالکێشییا خۆ یا بەرێ ژ دەست بدەت. پرانیا جاران بۆ بەرجستەکرنا ڤی دیمەنی وێنەیێ (سەبزە) یان (خەتێ سەبز) یان (خەتێ نەوخیز) دهێتە بکارهینان. ئەڤ وێنەیە ( د قەسیدە و غەزەلا فارسیدا هاتیە بکارهینان. مەعشوقێ نێر بەری ڕیهێن *وی بهێن جوان و سەرنجراکێشە لێ دەمێ ڕیهێن وی دهێن جوانی و سەرنجراکێشبوونا خۆ ژ دەست ددەت)[68]:

تـا لە دەوری لێـوی ئـالی خەتـتـــی سـەبـزی بوو عـەیـان

عــاشـقــانی جومـلە وەك بەنـگـــی دەبیـنم گـێژ و وێـــژ...(مەحوی (دیوان)، ل١٩١- ١٩٢)

چونکە نرخی ماچی تۆ گۆڕێ هـەموو دەســت و دوعـان

خەتـتی نەوخـێزت وەکـو زولفت خـودا پـیری نەکــا...(حاجی (دیوان)، ل٥٦)

زولفی بۆ دەفعی هوجوومی لەشکـەری ســولتانی خــەت

کەوتە خاك و سەرکشی دانا وەکو عەهـدی ئەلەست

بــــا وجــودی نـەوجـوانی خـــەتـتی ســـەوزی دەرکـەوێ

عەهد و پەیمانی نەبوو موو بۆیە پشـــتی پێ نـەبەست...(حاجی (دیوان)، ل ٦٢)

لـەبـــەر نـــەوخـێزی سەبـرەی دەوری لیـّوت

تــــەنم کاهیدە میسلی بەرگـــی کــایە...(حاجی (دیوان)ل ١٢٥)

نـەشتـەری مـوژگـانـی تۆ هاتـوتە سەر سەفـحـەی دلـم

هەر خەتی بوو، غەیری خەتتی سەبزی تۆ پاکی کراند...(حەریق (دیوان)، ل٤١)

گـورِەیی شـەورەنگ و خەتتی سـەبز و زولفت کافییە

بـۆ عـــەزابی مـە چ لازم بـەنـد و زنجـیـر و طـــەنـــاب...(ئەدەب (دیوان)، ل ٦٢)

تەڤایا ڤان دێران باسێ وان کورِێن سنێلە دکەن، ئەوێن کو ژنوی رِیهێن وان دهێن و ئەڤ چەندە ژی دبیتە ئەگەر کو جوانی و بالکێشییا وان وەکو بەرێ نەمینیت. داڤێن رِیهـ و سمبێلان خەتەکێ تازەشینبوویە کو بەرەڤ زێدەبوونێ دچیت، ئەڤ چەندە ژی شاعری ئازاردەت، جارنا ژی شاعر ڤی خەتی ب سوپا یان لەشکەرەکی وەکهەڤ دکەن کو هێرشێ دکەت دێمێ شاهدی کو ئەو ژی گەلەك جاران ب سولتان یان وەلاتەکی دهێتە لێکچواندن.شاعر پرانیا جاران ڤێ چەندێ ب ئاریشە ل قەلەم نادەن داکۆکیێ ل بەردەوامبوونا عەشقا خۆ بۆ شاهد یان مەعشوقێ نێر دکەت. ب دیتنا مە ئەڤ دێرێن نالی ژی ئاماژەدانەکە ب (خەتێ سەبزە) و عەشقا رِەگەزێ نێر:

برۆت بالی هومای سایەی سەری سولتانی حـوسنت بوو

خەتت هات و ووتی: من ناسیخی توغرایی خوندکـارم...(نالی (دیوان)، ل٢٨٤)

ل ڤێرێ (خەت) یانکو داڤێن تازە شینبوویێن رِیهـ و سمبێلان ناسخێ جوانییا داڤێن زولفا خەلەکن، واتە چەوا هندەك ئایەتێن قورئانێ هندەك ئایەتێن دی نەسخ دکەن، خەتێ سەبز ژی جوانییا دێمێ مەعشوقی ناهێلیت. ل ڤێرێ مرۆڤگەرایی ژی هاتیە بکارهینان چونکە ئاخفتن کو ژ ئەدگارێن مرۆڤانە هاتیە دان بال خەتێ سەبز.

حەمایل کە دەمی تیغت لە حەلـقەی گـــەردنی

مەگەر تێراو ببم بەو رِەنگە، تینووی ساعیدی یارم...(نالی (دیوان)، ل٢٨٦

بكارينانا (دەمی تیغ) زێدەتر لگەل ساخلەتێن مەعشوق یان دلداریٚ نێر دگونجیت، دەڤ و لێڤ ب تیغ یانکو کێریٚ هاتیە لێکچواندن، ئەڤە ژی ژبەر وان داڤێن ڕیهـ و سمبێلان کو تیژن و گەردەنا شاعری بریندار دکەن.

پرانیا جاران ئەم نەشێین هەبوونا وێنەیێن تایبەت ب هەڤرەگەزخوازییٚ بکەینە پیڤەر بۆ هەبوونا حەزا هەڤرەگەزخوازییٚ لدەڤ شاعرێن کلاسیکیێن کورد یانکو وەکو گەلەك ژ وێنەیێن دیێن شعرا کلاسیکییا کوردی ڕەنگە ئەڤ وێنەیە ژی پەیوەست نەبن ب ئەزموون و ژیانا شاعریڤە واتە ب ڕێکا لاسایکرنا نەریتێن شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی هاتبنە ناڤ شعرا کلاسیکییا کوردیدا .مەبەستا مە بەرگریکرن ژ شعرا کلاسیکییا کوردی نینە. ئەم دڤیٚ باوەرییێداینە کو چێدبیت گەلەك جاران ڕاستییەك ژی بۆ هەبوونا ڤیٚ حەزیٚ لدەڤ شاعرێن کورد هەبیت لیٚ ئەگەر ئەم هەبوونا وان نموونەیێن شعری کو مۆرکیٚ شاهدبازییٚ ب وانڤە دیارە بکەینە پیڤەر بۆ هەڤرەگەزخوازبوونا شاعری پێویستە یان پرانیا شاعرێن کورد ب نێرباز ل قەلەم بدەین یان وان ب سۆفی و عارفێن شاهدپەرست بزانین؛ لەوما یا باش ئەوە کو هشیارانە سەرەردەرییٚ لگەل نموونەیێن ب ڤی ڕەنگی بکەین.

نکۆلی ل هندیٚ ناهێتە کرن کو شاهدبازییٚ کاریگەریەکا مەزن کریە سەر شعرا کلاسیکییا کوردی و بوییە جۆرە نەریتەك واتە هەمی دەمان پەیوەست نینە ب واقع و ئەزموونا ژیانا شاعری ب خۆ، بۆ نموونە هندەك جاران هەر وەکو شعرا فارسییا سەبکیٚ عەراقی ب تایبەت شعرێن حافزی د ستایشکرنێدا ژی هەمان سالۆخێن کو بۆ ئافرەتیٚ دهێنە بکارهینان دهێنەدان بال زەلامی ژی. ئەم دشێین ویٚ شعرا (کوردی) وەك نموونە ببینین کو تێدا پیروزباهییا جەژنیٚ ل (عوسمان بەگیٚ بابان) دکەت:

جانا وەرە ئەم جەژنە بە قوربانی سەرت بم
بۆ تیری قەضا چاوی حەسوودان سوپەرت بم
شادن لە تەماشای نەظەرت مەحرەم و ئەغیار
مروەت نییە تەنها هەر ئەمن دەربەدەرت بم...(کوردی (دیوان)، ل٢٨٨)

وەكو خويايە (كوردى) وەكو مەعشوق سەرەدەريێ لگەل (عوسمان بەگێ بابان) دكەت، هەر وەكو وى ئەڤ پيرۆزباهيە كو پتر ستايشكرنە ئاراستەى خۆشتڤيا خۆ كريە، ئەڤ هەتا وى رادەى كو ل دێرا حەفتێ دبێژيت:

بۆ قەتلى منى خەستە موژەت هەر وەكو تيرە

ئەى من بە فيداى تيرى نيگاى پر خەترت بـم ...(كوردى (ديوان)، ل٢٨٨)

رەنگە لدويڤ تێگەهشتنا پرانيا خواندەڤانێن شعرا كوردى لێكچواندنا مژيلانكان ب تيران وێنەيەكێ تايبەت بيت ب وەسفكرنا كاريگەرييا جوانييا ئافرەتێ لێ بەروڤاژى ڤێ چەندێ ل ڤێرێ بۆ ستايشكرنا رەگەزێ نێر هاتيە بكارهينان.هەر ب ڤى رەنگى (هادى) ژى د ستايشا (شيخ عبدالقادرێ هەزانى)دا دبێژيت:

ئەو شەپالا نازكا پورِ جەمالا نازكا سيـمين بـــەدەن

ديـن و دل بر ژ هەر كەس با دەف و چـەنگ و رەبـــاب

ئەز گونەهكارم و حەزين و بێ كەس و يێ مـايـــەمــە

كەلبێ دەرگاهى تويەم، رەحمەتێ ئـەز يەك حـــوبـاب...(هادى (ديوان)، ل٧٢)

ل ڤێرێ ژى وەسفێن وەكو (شەپالا نازك) و لێكچواندنێن وەكو (سيمين بەدەن) بۆ سالۆخدانا (شيخ عبدالقادرێ هەزانى) هاتينە بكارهينان و ئاماژەنە بۆ بەردەوامبوونا مۆركێ شاهدبازيێ د شعرا كلاسيكييا كوردى.

هەرچەندە كو د شعرا كلاسيكييا سەر ب ديالێكتا گۆرانيڤە پتر هەست ب هەبوونا نازكى و جوانييا تايبەت ب ژنێ دهێتەكرن و شاعر گرنگيەكا تايبەت ددەنە ڤێ چەندێ لێ شعرا ڤێ ديالێكتێ ژى كەفتييە ژێر كارتێكرنا ڤێ دياردەيێ، بۆ نموونە (مەولەوى) سەرەراى ڤەهاندنا شعرێن پرسۆز و كاريگەر بۆ عەشق و كۆچكرنا (عەنبەر خاتوون)ا هەڤژينا خۆ، شعرێن وەها هەنە كو دچنە چارچووڤێ عەشقا رەگەزێ نێر، ئەڤ چەندە د دوو شعرێن ويدا ب ئاشكرايى دهێتە ديتن:

خالۆی مەنزلچی سەرکردە، سەرکـردەکـەی دەرد
تــەمــام بــە تـۆ بـیٚ، ئـای یـــە چیٚـشـت کـــەرد
وەخـتــیٚ بـــەو گــــەردون ســـیمـی ســـــافـــەوە
چـــــون وەش غـــــەزالان وە بـــــۆی نـــــافــــــەوە...(مەولەوی (دیوان)، ل٢٢٨)

مەولەوی داخباربوویە ب مرنا کورەکیٚ جوان، ئەڤ کورە دەمیٚ لگەل هندەك کەسان مژیلی نیٚچیریٚ بوویە گیانیٚ خۆ ژ دەست دایە. شاعر گازندەیان ژ سەرۆکیٚ نیٚچرڤانان دکەت کو بۆچی باش چاڤیٚ خۆ نەدایە ڤی کوڕی، ئەو باسیٚ عەشق و پەرۆشی و خۆلیلییا خۆ بۆ ڤی کوڕی دکەت. گەردەنا وی ب زیڤیٚ سافی وەکهەڤ دکەت، هەروەسا د ویٚنەیەکیٚ دیدا جوانییا ڤی کوڕی وەکو جوانییا غەزالەکیٚ ل قەلەم ددەت.

نـە ئـاهـینگـەریٚ، نـــە ئـاهـینگـەریٚ
ئارۆ ڕاگەم کەفت نە ئاهـــینگـەریٚ
دیم کە نیشە بیٚ کانی گـەوهەریٚ
پــادەم مــەدەمـنا زولـــف عــــەنبــەریٚ...(مەولەوی (دیوان)، ل٤٩٣)

ل ڤیٚریٚ (مەولەوی) باسیٚ هندیٚ دکەت کو چەوا دیتنا کورەکیٚ جوان کو مژیلی کاریٚ ئاسنگەرییٚ بوویە کاریگەری لسەر وی کریە. شاعر ب ئاشکرایی باسیٚ عەشق و حەژیٚکرنا خۆ بۆ ڤی کوڕی دکەت. ئەڤ کورە ب کانا گەوهەران و زولفا وی ژی ب عەنبەریٚ دهیٚتە لیٚکچواندن.

نهۆ دشیٚین بیٚژین کو بکارهینانا هندەك ویٚنەییٚن تایبەت ب شاهدبازییٚ یان بکارهینانا ویٚنەییٚن تایبەت ب وەسفکرنا ڕەگەزیٚ میٚ بۆ وەسفکرن و ستایشکرنا ڕەگەزیٚ نیٚر بەرهەمیٚ کارلیٚکا شاعریٚن سەردەمیٚ عەباسیان ب تایبەت ییٚن دەڤەرا خوراسانیٚ لگەل واقعیٚ وان ییٚ جڤاکی بوویە.شاعریٚن پشتی ڤی سەردەمی هەر بەردەوامیدانە بکارهینانا شاهدبازییٚ و هەولدانە ڤیٚ چەندیٚ بۆ مەبەستیٚن جیاواز بکاربینن.

### ٣. ١. ١. ٢. ٣. زالبوونا مۆرکێ لەشکەرییێ شعرا کەڤن لسەر وێنەیان:

عەرەب هەر ژ کەڤنترین سەردەمان تەڤلی جەنگ و شەران بووینە هەتا وی رادەی کو دشێین بێژین تەڤایا عەرەبان مژیلی ڤی کاری بووینە.کارڤەدانا شەڕان لسەر وان هند بهێزبوویە کو هەمی لایەنێن ژیانا وان کەفتینە ژێر کاریگەرییا شەڕی، د ناڤ ڤان لایەناندا زمان و ئەدەب پتر ب شەڕیڤە هاتینەگرێدان. جەنگ ژێدەرەکێ سەرەکییێ خەیالا شاعرێ عەرەبی و ئامرازەکێ سەرەکییێ ئاڤاکرنا وێنەییێن شعریە.[٦٩]

عەرەب بەری ئیسلامێ مژیلی جەنگێن خۆ یێن قەبەلی بوون و پشتی هاتنا ئیسلامەتییێ ژی شەرێن د ناڤبەرا موسلمان و نەموسلمانان و پاشی د ناڤبەرا عەرەب و فارسان یان عەرەب و رۆمیان دهێنە دیتن، هەر ب رێکا ڤان شەران عەرەب گەهشتنە باکورێ ئەفریقیا و ئەندەلوسێ.[٧٠] تشتەکێ ئاساییە کو ئەو شاعرێ د سەقایەکێ وەسادا بژیت و بەشەك بیت ژ کۆچکا خەلیفەی و کارێ وی یێ سەرەکی ستایشکرنا خەلیفەی بیت دێ گرنگیەکا زۆر دەدەتە وەسفکرنا شەڕ و سەرکەفتنێن خەلیفەی و چەوانییا شکەستن و لاوازبوونا دوژمنان د مەیدانا شەریدا.

گرنگیدانا شاعرێن عەرەب ب شەران ب تنی بریتی نینە ژ وەسفا شەران و چەکێن شەڕی و شانازیکرن بسەرکەفتنێن سەربازی بەلکو ڤان سنووران دبەزینیت و تەڤلی هزر و خەیالا وان دبیت، هەتا وی رادەی کو ئێدی شاعرێ عەرەب ب تنێ ب رێکا دیمەنێ شەڕی کو د هزرا ویدا جێگیر بوویە دەربڕینێ ژ واتایێن دیێن شعری دکەت.شاعرێن عەرەب د لێکچواندن و خواستنێن خۆدا گەلەك پەنایێ بۆ شەری و پێویستییێن شەری و واتایێن گرێدای ب شەریڤە دبەن و ب ڤێ رێکێ وێنەییێن خۆ یێن شعری دئافرینن. ئەڤە ب خۆ ژی نیشانا بەرنیاسبوونا دیمەنێن شەری و پێویستییێن شەڕی د هزرا خواندەڤاناندایە. ئەڤ نێزیکی و بەرنیاسبوونا شەری

بەرهەمێ كاودانێن جڤاكییێن وی سەردەمی بوون سەردەمەك كو تێدا شەر لایەنەكێ سەرەكییێ ژیانا خەلكی و شاعری بوویە.[٧١]

دیمەنێن شەڕی وەكو كوشتن و خوینرشتن ژ وێنەیێن باو و سەرنجراكێش بوون لدەڤ عەرەبان، ژبەر هندێ شاعرێن غەزەلێ چ یێن بێ پەردە و چ یێن پاك ل دەمێ وەسفكرنا جوانییا ژنێ و باسكرنا كاریگەرییا وێ و وێنەكرنا پەرۆشییا خۆ بۆ جوانییا ژنێ، شەر و ئامرازێن شەری و واتاییێن پەیوەست ب شەری ب بیاڤەكێ بپیت و دەولەمەند زانینە بۆ بەرجستەكرنا خەیالا خۆ.ئەو شیاینە ب ڤێ ڕێكێ گەلەك لێكچواندن و خواستنان پێشكێش بكەن، هەرچەندە كو دیراتیەكا زۆر د ناڤبەرا بیاڤێ دلداری و شەریدا هەیە، یێ ئێكێ هەست و سۆز و پەرۆشیە و یێ دوویێ كەرب و نەڤیانە، لێ بەرێخۆدانا شاعرێ كەڤن بۆ هەر دوو بواران بوویە ئەگەرێ نێزیكبوونا وان چونكە هەردوو ژێدەرێن ئێش و ئازارێن وی بوون. چەوا وی هەست ب ئازار و نەخۆشییا دویربوونا خۆشتڤییا خۆدكر، وەسا هەست ب ئازار و نەخۆشییا هەبوونا دوژمنەكی دكر كو ڕەنگە ببا ئەگەرێ ژناڤچوونا وی، ژبەرهندێ د وێنەیێ دوژمنێ خۆ دا خۆشتڤییا خۆ ددیت و د وێنەیێ خۆشتڤییا خۆدا وێنەیێ دوژمنی ددیت لەوما تشتەكێ سەیر نینە كو شاعرێ عەرەب خۆشتڤییا خۆ وەكو دژمنەكی بدەت خویاكرن كو دخوازیت خوینا وی بریژیت.هەر لسەر ڤی بناغەی ئەو گەلەك جاران خۆ ب كوشتییێ دەستێ خۆشتڤییێن خۆ د شەرێ ئەڤینییێدا وێنە دكەن واتە ئەو دبنە كوشتی و یارا وان دبیت بكوژ و عەشق ژی دبیتە مەیدانا شەری و گەلەك جاران ژی ئاماژە ب زۆربوونا ژمارەیا كوشتیان یانكو عاشقان دهێتەدان.[٧٢]د هندەك وێنەیاندا یار بكوژەكە كو چەكێ خۆ یێ بەرهەڤكری بۆ كوشتنا شاعری، گەلەك جاران ئەڤ چەكە تیروكڤانە كو ژ دویرڤە كاریگەریێ دكەتە سەر شاعری. شاعرێ عەرەب گەلەك جاران جوانییا خوشتڤیا خۆ ب چەكێن شەری وەسف دكەت واتە جوانییێن وێ ب شیرێن تیژ و ڕم و تیر و كڤانی وەكهەڤ دكەت بۆ نموونە نێرین و چاڤێن وێ ب شیر و تیران هاتینە لێكچواندن.[٧٣]

نکۆلی ل پەیوەستبوونا سەقایێ کۆچکان ب جەنگاوەران و لەشکەریان و دەنگوباسێن سەرکەفتنێن سەربازی و تەنانەت بەشداربوونا گەلەك ژ شاعرێن کەڤن د شەراندا ناهێتەکرن.شاعرێن سەردەمێ قەسیدەیێ کو ئەرکێ سەرەکییێ وان ستایشکرن بوو کارلێکەکا ڕاستەوخۆ لگەل دیمەنێن شەری هەبوون. تشتەکێ ئاساییە کو ئەڤ شاعرە ل دەمێ ستایشکرنا دەستهەلاتداران کو پرانیا جاران سەرکردەیێن لەشکەری ژی بوون، پەنایێ بۆ دیمەنێن شەڕی ببەن. هەر لسەر ڤی بناغەی تشتەکێ ئاساییە کو ئەڤ چەندە د شعرا فارسییا سەبکێ خوراسانی ژی کو لسەر بناغەیێ لاساییکرنا قەسیدەیا عەرەبی و د سەقایێ کۆچکاندا سەرهلدایە بهێتە دیتن. (شعرا فارسی د سەقایەکی سەرهلدایە کو گیانێ جەنگاوەری بسەر پرانیا دەستەلاتدار و ڕۆلەیێن جڤاکی زال بوویە هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەر کو پتر گرنگی ب قەسیدە و مەسنەویان بهێتەدان و غەزەل بهێتە فەرامۆشکرن. د قەسیدەیاندا پتر گرنگی ب فەتحان هاتیەدان واتە ئەو سەرکەفتنێن لسەر دەستێ شاه و سولتانان هاتینە تومارکرن. سالۆخێن سوارچاکبوون و شارەزایی د تیرهاڤێژی و بکارهینانا شیری بۆ ستایشکرنێ هاتینە بکارهینان)[٧٤].

د شعرا فارسیدا ژی هەمان کاریگەرییا شەڕی لسەر شعرێ دهێتە دیتن یانکو شەڕ دبیتە بەشەك ژ هزر و خەیالا شاعری و شاعر ب تنێ ب وەسفکرنا شەری ڕازی نابیت بەلکو گەلەك واتا و مەبەستان ب ڕێکا بکارهینانا ڕەگەز و وێنەیێن تایبەت ب شەری پێشکێش دکەت. (شعرا فارسی ب تایبەت یا لیریکی ل هەمی سەردەمان و تەنانەت هەتا نهو ژی ژ لایێ وێنەیانڤە ( مەبەست وەسفا خۆشەویستانە) پەیوەندیەکا نەپچراو لگەل سوپا و ژیانا سوپایانڤە هەیە. هەر ژ سەدێ پێنجێڤە نموونەیێن ژیانا لەشکەری و ئامرازێن گرێدای ب ژیانا سەربازان د شعرا فارسیدا دهێنە دیتن و ل سەردەمێن پشتی هنگی ژی وەکو نەریت یانکو لاساییکرنەکا ئەدەبی ئەڤ چەندە د ناڤ شعرا فارسیدا بەردەوام بوویە)[٧٥].

وەکهەڤیەکا زۆر د ناڤبەرا مۆرکێ لەشکەری شعرێ و وێنەیێن شعری د ناڤبەرا شعرا عەرەبی و فارسیدا دهێتە دیتن، ئەم دشێین گەلەك جاران باسێ لاساییکرنا شاعرێن فارس ژ شاعرێن عەرەب ژی بکەین، لێ لگەل هندێ ژی ئەڤ چەندە ب ڕەنگەکێ بەرفرەهتر و بهێزتر د شعرا فارسییا سەبکێ خوراسانیدا دهێتە دیتن، ئەگەرێ ڤێ چەندێ ژی سەرهلدان و بهێزکەفتنا نێربازیێ یانکو شاهدبازیێ د جڤاکێ وی سەردەمیدایە. (شاهدبازیێ ڕۆلەکێ سەرەکی د وەرارا گیانێ لەشکەری د قەسیدەیا فارسیدا هەبوویە. هەبوون و بەربەلاڤبوونا دیاردەیا هەڤرەگەزخوازیێ ل ڕۆژهەلاتا ئیرانێ ل ڤێ قوناغێ بابەتەکێ بەرنیاس و ئاشکرایە و دیارە کو هەبوون و بەردەوامبوونا شەران بوویە ئەگەر کو خەلکێ خوراسانێ ژبۆ بحههینانا نیازێن خۆ یێن سکسی بەرێ خۆ بدەنە غولامێن تورك و ب ڤی ئاوایی نێربازی بوویە بەشەك ژ ژیانا خەلکێ ڤێ دەڤەرێ)[٧٦].

د قەسیدەیا فارسییا سەردەمێ غەزنەویان کو ب دەستپێکا سەردەمێ دەستەلاتدارییا تورکان د مێژوویێدا دهێتە ل قەلەمدان پرانیا جاران مەعشوق سەربازەکێ تورکە، لگەل دەربازبوونا دەمی هەر ئەدگارێن ڤان غولامان وەکو ڤێرین و بێ وەفایی و ستەمکاربوون و بێ سۆزبوون و خوینرێژبوون بوونە تایبەتمەندیێن مەعشوقان د شعرا فارسیدا، تەنانەت تایبەتمەندیێن لەشی ژی هەر تایبەتمەندیێن وانن وەکو چاڤێن تەنگ، کەمەر باریک، بەژنا بلند، زولفا گرێدای، هەر بۆ نموونە گەلەك جاران مەعشوقێ قەسیدەنڤیسێ ب ناڤودەنگێ ڤی سەردەمی واتە (فەروخیێ سیستانی) سەرهەنگەکە یانکو ژ شعرێن وی وەسا خۆیا دبیت کو حەژ سەرهەنگەکی کریە[٧٧*].ب ڤی ئاوایی ئەم دشێین بەلاڤبوون و گەشەکرنا ڤێ دیاردەیێ د قەسیدەیێن سەبکێ خوراسانیدا ب دوو فاکتەرانڤە گرێبدەین، ژ لایەکیڤە هەبوونا مەعشوقێ لەشکەری و ژ لایەکێ دیڤە گەشەکرنا شعرێ د سەقایێ کۆچکان و ئاراستەکرنا شعرا ستایشکرنێ بۆ وان دەستەلاتداران کو بخۆ جەنگاوەر و لەشکەری بوون[٧٨].

نێربوونا مەعشوقان و هەبوونا غولامێن جەنگاوەرێن تورك نەژاد و سەقایێ کۆچکان کو ڕاستەوخۆ پەیوەستبوو ب شەر و سەرکەفتنێن لەشکەری و داگیرکرنێ بوونە ئەگەر کو مۆرکەکێ لەشکەری بسەر قەسیدەیا سەبکێ خوراسانیدا زال ببیت لێ تشتێ بالکێش ئەڤەیە کو پشتی ب دویماهیکهاتنا وان هەلومەرجان شعرێ ئەڤ مۆرکە ژدەست نەدایە و ئەڤ چەندە وەکو نەریتەك د شعرێدا بەردەوام بوویە. ب دەربڕینەکا دی شعرا سەبکێ خوراسانی ب تایبەت هەتا سەدێ پێنجێ کۆچی ژبەر ئەو نێزیکییا کو لگەل شەری هەبوو تەڤلی وێنە ورەگەزێن شەری بوویە لێ پشتی ڤی سەردەمی ب تایبەت پشتی لاوازبوونا قەسیدەیێ بهێزکەفتنا غەزەلێ ئەو مۆرکێ لەشکەرییێ زال بسەر وێنەیان پتر بریتیە ژ لاساییکرنا شاعرێن سەبکێ خوراسانی، یانکو (.لگەل سەرهلدانا غەزەلێ و وەرارا وێ د شعرا فارسیدا... شاعرێن فارس هەولدداینە ب ڕێکا ڕەگەزێن سەربازییێن شعرا کەڤن هندەك وێنەیێن نوی بئافرینن لێ هندەك جاران نەشیاینە خۆ ژ وێنەیێن سواوەیێن شعرا بەرێ ڕزگاربکەن لێ لگەل هندێ ژی هەولداینە د چارچووڤێ ڤان وێنەیاندا ب داهێنان و نویکرنێ ڕابن واتە ب ڕێکا پەنابرن بۆ خواستن و لێکچواندن و ئامرازێن دیێن وێنەسازیێ ڕەنگەکێ ئەدەبی ببەخشنە ڤان ڕەگەزان)[٧٩]، واتە زالبوونا مۆرکێ لەشکەری لسەر وێنەیان د شعرا سەبکێ عەراقی کو تا ڕادەیەکێ زۆر دویرە ژ سەقایێ کۆچکان و شەڕوشۆران، هەر وەسا تەڤلی عەشق و سۆفیگەرییێ بوویە پتر دچیتە چارچووڤێ دووبارەکرنا واتایێن کەڤن ب ئاوایەکێ نوی و هندەك جاران ژی دچیتە بن سیبەرا لاساییکرنەکا نێگەتیڤ.

د شعرا کلاسیکییا کوردیدا ژی کو بەشەکە ژ ڕێرەوێ لاساییکرنا شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی و پتر کەفتیە ژێر کاریگەرییا سەبکێ عەراقییا شعرا فارسی، ئەڤ ڕەگەزێن لەشکەرییێن شعرا کەڤن دهێنە دیتن، ب تایبەت د وێنەیێن گرێدای ب دلدارییێڤە.شاعرێن کلاسیکیێن کورد ب ڕێکا بکارهینانا ئەو وێنەیێن کو مۆرکێ لەشکەری لسەر وان زالە کاریگەرییا یارێ ددەنە دیارکرن، ئەم دشێین گەلەك جاران ئاوێتەبوونا عەشق و شەری د وێنەیاندا ل ژێر سیبەرا ئەزموونا

شاعرێن عەرەب شرۆڤە بکەین، لێ پەیوەستبوونا بهێزا شعرا کوردی ب شعرا کلاسیکییا فارسی مە بەرەڤ هندێ هان ددەت کو هزرا خۆ د بەردەوامبوونا مۆرکێ لەشکەریێ شعرا فارسی کو تێکەلە لگەل شاهدبازیێ ژی بکەین. د شعرا فارسییا سەبکێ خوراسانی پرانیا جاران مەعشوقێ نێر تورکێن لەشکەرینە، واتە ئەڤە بەشەکە ژ واقعێ سەبکێ خوراسانی کو د شعرێن سەبکێ عەراقی ژی هاتیە بکارهینان. لێ هەر ئەڤ وێنەیە جارنا ژلایێ شاعرێن کورد ژی هاتیە بکارهینان:

نەوەك هەر چاوی مەستە خۆشی مەستە

بەلادا دێ کە دێ وەك تورکـــی مەستە...(مەحوی (دیوان)، ١٠٤)

ل ڤێرێ شاهدبازی ب مۆرکێ خۆیێ لەشکەری و جەنگاوەری خۆیادبیت. وێنەیێ سەربازەکێ تورکێ سەرخۆش هاتیە پێشکێشکرن واتە هەمان سەربازێن تورك کو سەرەرای جوانییا خۆ مەترسیدار بوون و کەس نەدوێرییا زوی ب زوی خۆ نێزیکی وان بکەت.(*)

(نالی) ژی د وێ شعرا خۆدا کو چێدبیت بۆ وەسفا سوپایێ میرنشینێ بابان ڤەهاندبیت تارادەیەکێ زۆر د سەقایێ شعرا سەردەمێ غەزنەویان دژیت، ئەو شعرێن کو تێدا وەسفا جەنگاوەرێن تورك دهاتە کرن، ئەوێن ژ لایەکیڤە جوان و سەرنجراکێش بوون و ژ لایەکێ دیڤە جەنگاوەر بوون:

ئـــــەم تــاقـمـــــــە مـومــــــتازە کــــەوا خــــاسەیی شـــاهن

ئـاشـــــووبی دلـــی مـەمـلەکـــەت و قـــەلبی ســوپاهـــن

ســـەف ســـەف کـــە دەوەســـتن بـــە نـــەزەر خەتـــتی شـــوعاعن

حـەلـــقە کـــە دەبـــەستن وەکـــو خـەرمـــانەیی مـــاهن

نـــەرگس نیگەهـــ و ســاق ســـەمەن، کورتـــە بـەنـەفشـــەن

مـــوو ســـونبول و ڕوومـــەت گـــول و هـــەم لالـــە کـــولاهن

گـــــولزاری دەر و دەشــــــتن و غیـــــلمانی بـــەهـەشـتـــــن

(نالی (دیوان)، ل٣٥٠- ٣٥١)

ئەڤ سوپایێ کو (نالی) وەسفا وی دکەت پتر نێزیکی وان وەسفانە کو بۆ سوپایێ سولتان (مەحمود غەزنەوی) یان (مەسعودێ غەزنەوی) دهاتنە بکارهینان، کۆمەکا کەسان کو ژ لایەکیڤە سەرباز و جەنگاوەرن و ژ لایەکی غولامێن جوان و سەرنجراکێشن، ل دەمێ شەری قەهرەمانانە دجەنگن و ل دەمێن دی ژی دبنە ئالاڤەك بۆ ڕابواردن و خۆشگۆزەرانییا دەستەلاتداران. لێکچواندنێن وەکو (نەرگس نیگەه، ساق سەمەن، کورتە بنەفشە، ڕوومەت گول و موو سونبول، لالە کولاهـ یان لێکچواندنا سەربازان ب غیلمانان) لگەل ساخلەتێن جەنگاوەران ناگونجیت ب تنێ ل وی دەمی نەبیت کو ب نێرینا شاعرێن سەبکێ خوراسانی تەماشەی سەربازان بهێتەکرن.

د شعرا کلاسیکییا کوردیدا ژی جارنا هەر لدویڤ نەریتێ تەغەزولا باوا سەبکێ خوراسانی یار جەنگاوەرەکێ دەستهەلە کو د مەیدانا شەریدا بوێرانە هێرشێ دبەت و درندانە دوژمنان ژناڤ دبەت:

چەندی کو خوبان بێنە ڕەزم، من ژێ د دل دانن گــەزم
ئامانجێ وان ڕەمزان ئەزم، سەر عەسکەرێ سەیارێ چەرخ...(جزیری (دیوان)، ل١٩٧)

هــەر مــەجــالا ئەو د جەنگێ بێت و ڕەت هەر جارەکــێ
ڕاست و چەپ دێ بێخیتن صەدصەد ب مزراق و قەسەب...(جزیری (دیوان)، ل٧٤)

ئەو وێنە و وەسفێن کو بۆ یارێ هاتینە بکارهینان لەشکەرینە، بەردەوامییا وان وێنەیانن کو د شعرا عەرەبییا کەڤن هەبووینە و د شعرا سەبکێ خوراسانیدا گەهشتیە کوپیتکا خۆ و پاشی وەکو نەریتەك د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بەردەوام بووینە. د دێرا ئێکێدا یار کەسەکە کو دهێتە مەیدانا شەری و تیران ئاراستەی عاشقان دکەت، نێرین و چاڤێن یارێ ب تیران هاتینە لێکچواندن. د نموونەیا دوویێدا ژی کەسەکە کو هەر جارێ دهێتە مەیدانا شەری ب ڕمێن کورت و درێژ گەلەك عاشقان دکەتە ئامانج، مزراق و قەسەب خواستنەکە کو بۆ چاڤ و مژیلانکێن مەعشوقێ هاتینە بکارهینان. هەر ب ڤی ئاوایی وەکهەڤکرنا

چاڤ و مژیلانک و نێرین و زولفێن مەعشوقان ب چەکێن شەڕی ئێکە ژ تایبەتمەندییێن شعرا کلاسیکییا کوردی، ئەڤە ژی پرانیا چەکێن شەری ب خۆڤە دگریت (رم و شەمشیر و خەنجەر و تیروکڤان و...هتد):

شـاهب قەصدا کوشتنا من ڕم هەژاندن ڕاست و چەپ
دامە چەشمێ قەهر و خەشمێ ڕم ل دل دا کو ئەدەب...(جزیری (دیوان)، ل٧٣)

دلـبەرێ ئـیـرۆ سـەحەر هاڤێتە جەرگێ من دوو دۆخ
یـەك ل سینە، یـەك د دل دا لەو ژ من تێن ئـاخ و ئۆخ...(جزیری (دیوان)، ل٢٠١)

ئـــەو کـــە دلێ دوو قـــەد دەکـــا شـیـری بـــرۆی
ئیکـــە خەنـجـەر بـۆ بـەقــەد خــۆیا دەکـــا...(مەحوی (دیوان)، ل ٥٥)

شـــوکـــر هـــەر مـــامـــەوە بـــۆ یـادگـــاری
بە کـاری زەخـمــەکـەی شمشـێـری ئەبـــرووت...(مەحوی (دیوان)، ل١١٢)

گـرفـتـارم بە نـازی چاوەکـانی مـەسـتی فـەتانـت
بـــرینـدارم بە زەبری سـینەسـۆزی تیری مـۆژگـانـت[*]...کوردی (دیوان)، ل ١٠٤)

د دێرا ئێکێ ڕم خواستنە و بۆ مژیلانکان، ل نموونەیا دوویێ ژی دۆخ خواستنە بۆ نێرینا یارێ، ل نموونەیا سێیێ و چوارێ ژی برۆ ب شیری هاتیە لێکچواندن.

گەلەك جاران چاڤ و برۆ و مژیلانک و لێڤ و ئەندامێن دیێن دێمێ یارێ ب تەمامەتی دبنە چەك و ئالاڤێن جەنگی، ب ڕەنگەکێ وەسا کو کەسەکێ شارەزا د شعرا کلاسیکی نەبیت هەستێ ب غەزەلیبوونا وێنەی ناکەت:

تێن ب دەعـوای و جدالێ جـەنگیانێ مەی پـەرست
شوبهەتی شهرێ ژیان و پوڕ درەخشان ڕاست و چەپ
ئـەو ب شیر و ڕمح و تـیران تێـنە جەنـگ و بازییێ
شەهلەوەندان لبسێ زرهێ درع دۆشان ڕاست و چەپ ...(لاغەری (دیوان)، ل٢٩)

ئێک ژ باوترین وێنەیێن دیێن شعرا کلاسیکی کو ب ڕەنگەکێ بەرچاڤ د شعرا کوردیدا دهێتە دیتن، سالۆخدانا دێمێ یارێ ب مەیدانا شەرێ نەتەوە و دەولەتانە کو ب ئاوایێن جۆراوجۆر ژ لایێ شاعرانڤە هاتیە بکارهینان:

زەنگی جەوشەن ڤەبەستن پێش بەری جوقا حەبەش
دابرستن یەك بە یەك چوون بەر لیوایێ ڕاست و چەپ...(جزیری (دیوان)، ل٩٦)

هەر لدورا حەجەرئەسوەد حەبەشان چەرخ و طەواف
تێن وقوفا عەرەفاتێ ب سەما نوبی و زەنگ
صەف ب صەف تورك و موغول دوگوش و هیندی دکەمین
ب عەجەب هاتنە جەنگێ حەبەش و ڕوم و فەرەنگ...(جزیری (دیوان)، ٣٤١- ٣٤٢)

کوفری زولفە تار و ماری ئەرقەمە
سفری خالە حەلقەیی هیندوسیان
زولفی جەرراڕی سەفاسەف ختە پێش
یەعنی زەنگی لەشکەری قیروسیان...(نالی (دیوان)، ل٣٣٤)

جەیشی حەبەشی زولفی لەگەل خەتتی بە شەر هات
سۆفی دڵی بێ چارە لە بەرپێ بووە هەنجیر...(حاجی (دیوان)، ل٦٨)

لەسەر ڕوو لادە تاری گوورەیی مشکینی تاتارت
حەبەش دەستی تەطاول با نەکێشێ با بەسەر ڕوما...(سالم (دیوان)، ل٣٣)

د ڤان وێنەیێن جەنگیدا هەولا وەسفکرنا وێ ئاوێتەبوونێ دهێتەدان کو د ناڤبەرا ڕەشاتییا ڕەنگێ پرچێ و سپیاتییا دێمێ یارێ یان د ناڤبەرا داڤێن ڕیهـ و سمبێلان ڕویێ شاهداندا هەیە. ئەڤ وێنەیە ل دویڤ نەریتەکێ باو د شعرا کلاسیکیدا هاتینە دروستکرن. پرچ یان داڤێن ڕیهـ و سمبێلان ب سوپایێ نەتەوەیەکێ ڕەش پێست یان ئەسمەر وەکو حەبەشی یان عەرەب یان زەنگیان و ڕوویێ یارێ نەتەوەیەکێ سپی پێست وەکو ڕۆمیان دهێنە لێکچواندن.هندەك

جاران شاعرێن کورد هەولداینە ب رێکا زێدەکرنا هندەك رەگەزێن نوی رویەکێ تازە ببەخشنە ڤان جۆرە وێنەیان:

صەف صەف مە دیـن هیندی و زەنـگ، چەنگیز هات تەیمورێ لـەنـگ
خـەف وان رەشـــاندن دل خـــەدەنگ، تـەشبیهێ تیرێن خان شــەرەف
...(جزیری (دیوان)، ل٣١٤)

مـیر و کـرمـانج ل هـۆلان قـــەدەرەك وەستانە
لێ ب نیڤێ بصەف و تیپی عەرەب هاتنە جـەنـگ...(جزیری (دیوان)، ل٣٤٢)

وەکهەڤکرنا نێرین یان مژیلانکێن یارێ ب تیرێن (خان شەرەف)ی و بکارهینانا خواستنا (میر و کرمانج)ان بۆ روویێ یارێ ئاماژەنە بۆ ڤێ چەندێ کو شاعرێن کورد شیاینە ب رێکا مفا وەرگرتن ژ واقعی گیانەکێ نوی ببەخشنە ڤان جۆرە وێنەیان.ئەڤ وێنەیە ژی بەردەوامییا لاساییکرنا هەمان وێنەیێن کەڤنن و مۆرکێ لەشکەرییێ شعرا عەرەبی و فارسی لسەر وان زالە لێ لگەل هندێ ژی نکۆلی ل هیاربوونا شاعری و حەزا وی بۆ گۆهرینا وێنەیێن کەڤن ناهێتە کرن. ئەم دشێین هەر ڤان جۆرە وێنەیان ب ئاوایەکێ نویتر ژی ببینین:

هوجوومی (هیندوو)ی خـەت سەر (فەرەنگستان)ی رەخـسـاری
بە حەشری بوو، وەکو ئەو حەشرە (میقادۆ) بە (چار)ی کرد
...(مەحوی (دیوان)، ل١٤٩)

ل ڤێرێ شاهدبازی و مۆرکێ لەشکەری تەڤلی هەڤبووینە. شاعر خەت، واتە ئەو داڤێن ریهان کو تازە لسەر دێمێ کورێن سنێلە خۆیادبن ب سوپایێ هندوویان کو هێرشێ دبەنە سەر سوپایێ فەرەنگیان لێکچواندیە، پاشی ئەڤ جەنگە لگەل دیمەنێ شەرێ د ناڤبەرا ژاپۆن و رووسیایێ وەکهەڤ کریە، واتە شاعری ڤیایە ب مفا وەرگرتن ژ گۆرانکارییێن سیاسییێن سەردەمێ خۆ گیانەکێ نوی ببەخشیتە ڤی وێنەی.ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ وێنەیە ژی بەردەوامیدانا مۆرکێ لەشکەرییێ شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامینە.

ل ڤان نموونەیان ئەڤ چەندە خویابوو کو ژمارەکا زۆر ژ وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی بەرهەمێ کارلێکا ڕاستەوخۆیا شاعران لگەل واقعێ جڤاکی و سیاسییا سەردەمی نینە بەلکو پتر بریتیە ژ مفا لاساییکرنا وان وێنەیان کو بەرهەمێ کارلێکا شاعرێن کەڤن لگەل واقعێ جڤاکی و سیاسیێ سەردەمێ وانە، واتە شاعرێ کلاسیکیێ کورد ژی وەکو گەلەك ژ شاعرێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامی پتر وێنەیێن شاعرێن بەری خۆ دکەتە ژێدەرێ ئافراندنا وێنەیان، جارنا ژ چارچووڤێ وان دەرناکەڤیت و جارنا ژی هەمان وێنەین ب هندەك گۆهرین و دەستکاریان پێشکێش دکەت کو ب گۆهرینێن ڕیشەیی ناهێنە ل قەلەمدان و نابنە ئەگەر کو شاعر ل ژێر کاریگەرییا لاساییکرنا وێنەیێن شاعرێن بەرێ دەردکەڤیت.

دەمێ شاعر پشتبەستنێ لسەر واقعی دکەت، واتە واقعی دکەتە ژێدەرێ سەرەکیێ وێنەیێن خۆ، شعر پتر ژ داڤا وێنەیێن شاعرێن بەرێ ڕزگار دبیت و وێنەیێن نوی ژدایک دبن.تەڤلیهەڤبوونا واقع و خەیالا شاعری سەرەتایەکە بۆ ڤەدیتنا پەیوەندییێن نوی و دەرکەفتنا ئەزموونەکا شعرییا نوی. سەرەرای هندێ کو شعرا کلاسیکییا کوردی پتر پشتبەستنێ لسەر وێنەیێن شاعرێن بەرێ دکەت لێ جارنا شاعر شیاینە ب ڕێکا کارلێکەکا بهێز لگەل واقع و دەوروبەرێ خۆ وێنەیێن نوی پێشکێش بکەن، وەك نموونە دشێین ئاماژەیێ بدەینە وێ شعرا (نالی) کو تێدا وەسفا وێ حوجرەیێ دکەت کو تێدا ژیایە:

وەك قەفەس ئەم حوجرە کون تێیە کەوا گرتوومیە ناو
تار و پۆیی عەنکەبووتە، زۆرە لێی کردوومە داو
دوودی سەرمیچی گولەنگی لەت لەتی دەسرازە کۆن
بان و دیواری ب میثلی لانکەی ئەجزا شکاو
هەر لە سەریان دار بە داری ڕاەلی بژمێرە وەك
لاپەراسووی بارگیرێکی کە زیندوو بێ ب ناو

...(نالی (دیوان)، ل٣٦٦)

پرانیا وێنەیێن کو د ڤێ شعرێدا هاتینە بکارهینان نوینە، وێنەیێن وەکو لێکچواندنا بان و دیوارێ حوجرەی ب لاندکەکا شکەستی و لێکچواندنا کاریتەیێن حوجرەی ب پەراسییێن بارگیرەکێ لاواز ژ وێنەوییێن نوی و دەگمەنن د شعرا کلاسیکییا کوردیدا. چاڤێ شاعری مینا لێنزا کامیرێ دیمەنێن واقعێ دەرڤە وەردگریت و ب رێکا خەیالا خۆ وان لگەل هندەك وێنەیێن دی وەکهەڤ دکەت و وێنەیێن شعرییێن نوی دئافرینیت.

ژبلی سروشت و واقعێ ژیانێ، ئەفسانە و داستان و مێژوو ژی دبنە ژێدەرێ وێنەیێن شعری، لێ ئەگەر ئەم باش تەماشەی شعرا کلاسیکییا کوردی بکەین دێ گەهینە ڤی ئەنجامی کو پرانیا جاران ئەڤ پەیوەندیە ژی هەر ب رێکا لاساییکرنا وێنەیێن شاعرێن بەرێ بەرجستە دبیت. ل ڤێرێ پەیوەستبوونەکا زێدە ب خەباتا شاعرێن سەبکێ خوراسانیێ فارسی دهێتە دیتن، هەر ئەو داستان و ئەفسانەیێن وان ئینباینە ناڤ شعرێدا د سەبکێ عەراقیێ شعرا فارسیدا ژی دهێنە دیتن و شاعرێن کلاسیکیێن کورد ژی پتر وان وەکو کەرستەیەك بۆ ئاڤاکرنا وێنەیێن خۆ بکاردهینن.ئێک ژ ڤان داستانان، داستانا (سولتان مەحمود)ێ غەزنەوی و (هەیاس)یە:

ئیعجازی عیشقە مەنشەئی هەر موعجیزێکی حوسن
مەحمووده بەندە، بووه پادشا ئەیاز...(مەحوی (دیوان)، ل١٨٢)

حوسن ب ئایینەیێ عیشق تەجەللی نادەت
عیشقی مەحمود د مەعنی نەمەکی حوسنی ئەیاس...(جزیری (دیوان)، ل٢٥٩)

ئەیازی هەمراز نالە و ئاخ و دوود
عەرزش هەن وە خاك ئاسانەی مەحموود...(مەولەوی (دیوان)، ل٥٢)

وەکو خویایە عەشقا د ناڤبەرا سولتان (مەحمودێ غەزنەوی) و (ئەیاس)ی پتر عەشقەکا سکسی بوویە و (ئەیاس) ئێک ژ غولامێن بارەگایێ (سولتان مەحمود)ی بوویە. سولتان مەحمودێ غەزنەوی پتر تەڤلی غولامان بوویە و هەیاس ژی ئێک ژ ڤان غولامان بوویە. ژمارەك ژ سۆفیان و شاعرێن فارس هەولداینە ڤێ عەشقێ ببەنە چارچووڤێ سۆفیگەریێ لێ گونجاندنا ڤێ سەرهاتیێ د چارچووڤێ عەشقەکا سۆفیزمانە بەرئاقل نینە[٨٠]، کەواتە شاعرێن کورد ل ژێر کاریگەرییا

نەریتێن شعرا فارسی و چیرۆك و چیڤانوكێن باو ئاماژەداینە ڤێ سەرهاتییێ، ئەڤە ل وی دەمی کو هەر ڤان شاعران  سەرەرای ئەو خەباتا کو (فەقییێ تەیران) کری، پشتبەستنەکا وەسا ب چیرۆکەکا سۆفیزمانەیا وەکو زەمبیل فرۆشی نەکرینە.

نــەی لــە نــالینـا چ گوستاخانەیە بۆ ئەربابی ســەمــع
بــاسی ئــەیامی گوزەشتەی کەیقوباد و کەی دەکــا
تــا ســـوپاهی خوسرەوی عــەشقت ئیحاکهی جــانیدا
بۆ شەڕو شۆڕی مـوصـیبەت دڵ لە مولـکی ڕەی دەکـــا
کـــاروان ئەر سست ڕۆیی تـــا دەگاتە کـۆیــی لــــەیل
شەوقی بێ پایانی دل ووشتر بە مەجنوون پــەی دەکــا...(سالم (دیوان)، ل٢٩)

(کەیقوباد، کەی، خوسرەو) و ( لیلی و مەجنون) پتر ئەو داستان و ئەفسانەنە کو شاعرێن بەرێ بکارئینانینە، هەر ب ڤی ڕەنگی دشێین ئاماژەیێ بدینە (شیرین و خوسرەو، ویس و ڕامین، وامق و عەزرا، شیخێ سەنعانی...هتد)، بێ گومان شاعرێ کورد مافێ ڤێ چەندێ هەیە کو ڤان ئەفسانە و داستانان وەکو کەرستەیەك بۆ ئاڤاکرنا وێنەیێن خۆ یێن شعری بکاربینیت لێ فەرە کو پەیوەندیەکا ڕاستەوخۆ ژی لگەل فۆلکلۆر و ئەدەبێ مللیێ خۆ ژی سازبکەت و وان ژی وەکو کەرستەیەك بۆ ئاڤاکرنا وێنەیێن نوی بکاربینیت، ئەڤ چەندە ب دەگمەن د شعرا کلاسیکییا  کوردیدا دهێتە دیتن:

مویەکێ ئەز ژ تە نادەم ب دوو  سەد زین و شیــرینان
چدبیت گەر تو حسیب کی مە ب فەرهاد و مـەمێ...(جزیری (دیوان)، ل٤٧٢)

ئاماژەدان ب داستانا (مەم و زین)ێ لگەل داستانا (فەرهاد و شیرین)ێ کارەکێ بالکێشە. شاعر ژبلی داستانێن دلدارییێن باو د شعرا کلاسیکییا  فارسیدا ئاماژەیێ ددەتە داستانەکا خۆمالی و دۆخێ خۆ لگەل دۆخێ (مەم)ی ژی وەکهەڤ دکەت. هەر ل ڤێرێیە کو گرنگییا بەرهەمێن داستانی د ئەدەبیاتا هەر مللەتەکیدا خۆیا دبیت، ئەگەر ئەم تەماشەی پرانیا داستانێن کلاسیکییێن کوردی بکەین دێ مهینە ڤی ئەنجامی کو خەباتا وان ژی دچیتە چارچووڤێ دووبارەکرنا بەرهەمێن کەڤن ب اوایەکێ نوی هەر ژ (شیرین و خوسرەو)ا (خانایێ

قوبادی) بگره تاكو دگەهیتە (یوسف و زولەیخا)یا (سەلیمێ هیزانی) و (لەیلا مەجنون)ا (حارسێ بەدلیسی)، ئەڤە ژی گرنگییا كارێ (ئەحمەدێ خانی) بۆ مە ددەتە خویاكرن، چونكە بەرجستەكرنا داستانەكا فولكوری و پێشكێشكرنا وێ د قالبێ بەرهەمەكێ كلاسیكیدا دشێت ببیتە ژێدرەكێ گرنگ بۆ وێنەیێن شاعرێن هەڤچەرخ و یێن كو پشتی شاعری دهێن.

## ٣ . ١ . ٢. كاریگەرییا لاساییكرنا سیستەمێ ڕوونبێژی و وێنەسازییا شعرا كەڤن:

### ٣ . ١ . ٢ . ١. زالبوونا پەیوەندییێن لێكچواندنی و ماتریالیبوونا وێنەیان:

لێكچواندن هونەرەكێ سەرەكییێ شعرا جاهلییا عەرەبان بوویە، هەمیشە ڕەخنەگران وەسا هزركریە كو ئەڤ شعرە گەهشتییە كوپیتكێ و د مێشكێ واندا ژبلی نموونا شعرا جاهلی چ چەمكێن دی بۆ شعرێ نەبوویە، ئەڤە ژی بوویە ئەگەر كو هەمی تشت ب لێكچواندنێڤە بهێتە گرێدان. تەنانەت - هەر وەكو بەری نهو مە ئاماژە پێدای - وان میمێسا ئەرەستوی ژی وەكو هەڤواتایەكا لێكچواندنێ پێناسەكریە)[٨١]. كەواتە گرنگیدانەكا زێدە ب لێكچواندنێ ژی بەشەكە ژ لاساییكرن و پاراستنا ئەدگارێن قەسیدەیا جاهلی.

ئێك ژ ئەدگارێن وێنەییێن باو د قەسیدەیا عەرەبیدا ماتریالی بوون یان بەرهەستبوونە، ئەڤە ژی دبنەرەت دا ئێكە ژ ساخلەتێن شعرا جاهلی و هونەرێ لێكچواندنا عەرەبی، خواندنا (شعرا جاهلی ڤێ ڕاستیێ بۆ مە ددەتە دیاركرن كو شاعرێ جاهلی گەلەك شارەزاییێ سنوورێ چارچووڤەكرییێ بزاڤا داهێنانا خۆ بوویە، زانیە كو ئەركێ وی ئەوە كو ب ڕاستگۆیانەترین شێوە ب ڤەگۆهاستنا تێروتەسەلا واقعێ دەرڤە ڕابیت، ب ڤی ئاوایی هندی شیایە ب بەرجستەكرنا وێنەیێن بینراو ڕابوویە و بۆ ڤێ مەبەستێ ژی پتر ژ هەر تشتەكێ دی لێكچواندنێن نێزیك و ئاشكرا بكارئینانینە)[٨٢].

سروشتیێ کاریێ زانایێن بواریێ زمان و ڕەوانبێژییێ و فەیلەسوف و ڕەخنەگرێن جیهانا ئیسلامی کو ب ئاوایەکێ عەقلانی سەرەدەری لگەل شعریێ دکرن لگەل بەر هەستبوون و ماتریالیبوونا لێکچواندنا قەسیدەیا جاهلی دگونجیت، هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەر کو ئەو پتر جەختیێ لسەر ڤی لایەنی بکەن. (ئێک ژ بنەمایێن گرنگ ل دەڤ ڕەخنەگرێن عەرەب و زانایێن ڕەوانبێژییێ ڕۆهنی و ئاشکراییە، واتە ئەو حەز ناکەن چ جاران واتا بەرەڤ ئالۆزییێ ڤە بچیت، ب دەربڕینەکا دی پەیوەندیەکا موکوم د ناڤبەرا بەرهەستبوونا وێنەیێن شعرا جاهلی و ئامانجا ڤان ڕەخنەگراندا هەیە، واتە (ڕەخنەگران گرنگیدایە ڕۆهنی و وێنەیێن بەرهەست... و پشتا خۆ دایە تەجریدا عەقلی، ب تایبەتی د بواریێ هونەریێ شعرێدا. ئەڤ ڕەخنەگرە هیبووینە ڕۆهنی و ئاشکرابوونێ و ڤیاینە هندەك بنەما و یاسایان دانن؛ داکو شعر بەرەڤ لێلی و نەرۆهنییێ ڤە نەچیت. هەر ژبۆ بجهکرنا ڤێ ئامانجیێ گرنگیدانە وێنەکرن و لێکچواندن و نواندنا تشتیێ بەرهەست ب تشتێن بەرهەست)[٨٣].

نهو ئەم دشێین بێژین ئەو چەمکێ لێکچواندنێ کو د ڕەخنە و شعرا کلاسیکیدا باو بوویە بەرهەمێ بهەڤگەهشتنا ماتریالیبوونا لێکچواندنا جاهلی و عەقلانییەتا زال بسەر ڤەکۆلینێن شعریە؛ هەر ئەڤ چەندە ژی دبیتە ئەگەریێ فەرامۆشکرنا لایەنێ دەروونی و هەست و سۆز و چەمکێن مەعنەوی. (دەمێ عەقل ب ڕۆهنڤەکرن و لاساییکرنا تشتان ڕادبیت هەولا سازکرنا پەیوەندییێ د ناڤبەرا واندا ددەت، لێ چ ڕێک بۆ لاساییکرنا بینراوانە و ئاشکرا یا هەستیێ مرۆڤی نینن، چونکە پرانیا جاران ئالۆز و مژاوییە. دەمێ عەرەب باسێ ڕوونبێژی (البیان)ێ دکەن د بنەڕەتدا مەبەستا وان ئەو ئامرازن کو واتا پێ دهێنە ڕۆهنڤەکرن، کەواتە ڕۆهنی ئەدگارەکە ژ ئەدگارێن ڕوونبێژییێ، یانکو ڕوونبێژی بریتیە ژ مەبەستا ئاخفتنێ و ئەڤ ڕوونبێژیە ژی ل وی دەمی دێ بجهـ هێت کو ئاخفتن ژلاییێ زمانی و واتاییڤە دروست بیت. یانکو ڕوونبێژییێ چ پەیوەندی ب ئاخفتنا لێل و واتایێن دوورەدەستڤە نینە...)[٨٤]. ئەڤ چەندە ژی د بەرژەوەندییا زمانێ گوتارئاساییێ قەسیدەییێ و

ئەدگارێن وێ ب تایبەتی قەسیدەیا ستایشكرنێ هاتیەدانان، لەوما (گەلەك ژ لێكچواندن و خواستنێن شعرا عەرەبی ب تنێ دەلالەتێ لسەر شارەزاییا شاعری د دروستكرنا وێنەیێن بەرهەستدا دكەن، بێ كو چ هەست و سۆز ل پشت وان هەبن. مەبەستا مە ئەو هەست و سۆزە كو لسەر تەڤایا دەقی زال بیت. ڤان جۆرە وێنەیان چ بها د تەرازییا ڕەخنەیا نویدا نینە، باشترین نموونە ژی ئەو دەربڕین و دێرێن شعرینە كو د پەرتووكێن ڕەوانبێژییێدا دهێنە دیتن.ب ڤی ڕەنگی دشێین بێژین كو سنعەتكارییا ڕەوانبێژییێ بۆ خویاكرنا لایەنێن لێكچواندنێ و ڕوویێ لێكچواندنێ و نیشاندانا خواستنێ و پێشاندانا جۆر و ڕوویێن وێ یێن جیاواز كارەكێ بێ بهایە، چونكە پەیوەندییا وێنەی لگەل لایەنێ سۆزداری و دەروونی ب تەواوەتی هاتیە قەتاندن و مینا كەلەخێن مرییێن بێ جان سەرەدەری لگەل وان دهێتەكرن.(٨٥)

دیارە كو ئەڤ لێكچواندنی بوون و ماتریالی بوونا وێنەیێن قەسیدەیێ لسەر شعر و رەخنەیا فارسی ژی زالبوویە. (رشید وگواك) د پەرتووكا (حدائق السحر) دا دبێژیت: (بێ گومان ئەو كارێ كو هندەك شاعر دكەن پەسەند نینە، ئەڤ كارە ژی بریتیە ژ لێكچواندنا تشتەكی ب تشتەكێ دی كو د خەیال و وەهمێدا هەبیت واتە ئاشكرا و بەرچاڤ نەبیت...)(٨٦). (شمس قیس ڕازی) دەمێ باسێ لێكچواندنێ دكەت داكۆكیێ لسەر بەرهەستبوونا لایەنێن وێ دكەت، ب دیتنا وی باشترین لێكچواندن ئەو لێكچواندنە كو مرۆڤ بشێت ب ساناهی لەوچوی دانیتە جهێ لێچوی، هەر وەكو لێكچواندنا پرچێ ب شەڤێ یان لێكچواندنا نالی ب هیلالێ، ب دیتنا وی خرابترین لێكچواندن ژی یێن وەهمینە واتە ئەوێن كو مرۆڤ نەشێت وان بینیتە پێش چاڤێن خۆ وەكو هندەك شاعران كو تەنویرێ ئاگری ب دەریایەكا تژی مسك لێكچواندینە...)(٨٧).هەر چەوا بیت ئەڤ هەلویستێن ڕەخنەیی یان ڕەنگڤدانا واقعێ ئەدەبیێ سەبكێ خوراسانینە یان بریتیە ژ هەولدانا ڕەخنەیێ بۆ سەپاندنا ئێك ژ بنەمایێن وێنەسازییا قەسیدەیا عەرەبی و دبنە بەلگە بۆ بەردەوامبوونا ڤی نەریتی د شعرا فارسیدا.

ب ڤی ئاوایی وێنەیێ باو د شعرا کلاسیکیدا پتر لێکچواندن و خواستنە، ئەڤ لێکچواندن و خواستنە ژی پرانیا جاران ماتریالی و بەرهەستن، کەواتە پشتبەستنا ژرادەبدەرا شاعرێن کلاسیکییێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامی لسەر لێکچواندن و وێنەییێن ماتریالی بەرهەمێ لاساییکرنا نموونەیا قەسیدێیە کو ل ژێر سیبەرا لاساییکرنا شاعران ژ شاعرێن بەرێ و ملکەچبوون بۆ ڕوونبێژیێ بەردەوامی پێ هاتیەدان. هەر چەندە کو شعرا کلاسیکییا کوردی دکەڤیتە سەردەمێ زالبوونا غەزەلێ و گەشەکرنا سۆفیگەرییێ، لێ لگەل هندێ ژی ئەڤ دیارەیە ب ئاشکرایی لسەر ڤێ شعرێ زالە.

د شعرا کلاسیکییا کوردیدا هزرا شاعری پتر لدور وەکهەڤی و بەراورد کرنێ دزڤریت، دەمێ شاعر تشتەکێ بالکێش دبینیت و دخوازیت هەستێ خۆ بەرامبەر وی تشتی دەرببریت پرانیا جاران هەولددەت ڤی کاری ب ڕێکا ڤەدیتنا پەیوەندییا وەکهەڤیێ د ناڤبەرا وی تشتی و تشتەکێ دی ئەنجام بدەت، واتە شاعرێ کلاسیکی کێم جاران هەولددەتە لسەر تشتەکی ڕاوەستیت و بێ لێکچواندن وێنەیێ وی تشتی پێشکێش بکەت.

د ناڤ شعرا کلاسیکییا کوردیدا گەلەك وێنەییێن جوان و سەرنجراکێش دهێنە دیتن، لێ خواندنا هویر و بەردەواما شعرا کلاسیکی ڤێ ڕاستیێ ددەتە خویاکرن کو پرانیان ڤان وێنەیان بەرهەمێ پەیوەندییا لێکچواندنێ یان ڤەدیتنا وەکهەڤییا د ناڤبەرا دوو تشتانن کو ب ئاوایێن جیاواز دهێنە پێشکێش کرن:

دەخیلت بم نەخیلی یا ڕوتابی
وەها شیرین و سینە نەرم و دلْ ڕەق...(نالی (دیوان)، ل ٢٥٩)

لێچو: تۆ (یار) لەوچو: (ڕوتاب)

شاعر ب ڕێکا ڤەدیتنا وەکهەڤییا د ناڤبەرا یارا خۆ و ڕوتەبێ وێنەیەکێ جوان پێشکێش دکەت، یار وەکو ڕوتەبێیە، سینگێ وێ نەرمە و دلێ وێ ڕەقە. ب شێوەیەکێ گشتی لێکچواندن دەروازەیا داهێنانا وێنەیانە د شعرا کلاسیکییا

کوردیدا، زۆرترین وێنەیێن نوی و داهێنەرانە لسەر بناغەییَ لێکچواندنێ دروست دبن و پترین وێنەیێن لاساییکری و سواوە ژی بەرهەمێ لێکچواندنێنە. سەرەرای جوانی و بالکێشبوونا لێکچواندنێ، لێ پشتبەستنا زێدە لسەر ڤی هونەری بوویە ئەگەر کو گەلەك جاران شعرا کلاسیکییا کوردی بەرەڤ سنعەتکارییەکا زێدەڤە بچیت و شاعر وەکو پێویست د بەرجستەکرنا جوانی و نازکییا دیمەنان و تەڤلیهەڤکرنا وان لگەل هەست و سۆزێن خۆ سەرکەفتی نەبیت:

کەلیمە ئەو دەمە، زولفی عەسایە، خەتتی فیرعــەونە

یــەدی بەیــزایەتی گەردن، جەبینــی تــووری ســینــایە...(حاجی (دیوان)، ل١٣٢)

ل ڤێرێ دوو تایبەتمەندییێن لاساییکرییێن شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی واتە سواوەبوونا وێنەیان و قەرەبالغییا وێنەیان ـ ل باسێن بهێتدا دێ ئاماژەیێ دەینە وان ـ دهێنە دیتن، لێ ژبلی هندێ ئەڤ پرسە بەرجستە دبیت کو پشتبەستن ب لێکچواندنێ تا چ ڕادە شیایە خزمەتا جوانییا یارێ بکەت.وەکو خویایە پێنج لێکچواندنێن جودا د ڤێ دێرێدا هاتینە بکارهینان. شاعر بلەز ژ وێنەیەکی دچیتە وێنەیەکێ دی و دخوازیت ب ڕێکا کۆمەکا لێکچواندنان وێنەیەکی پێشکێش بکەت، لێ خولیایی و پەرۆشییا وی بۆ بکارهینانا لێکچواندنان و سازکرنا وەکهەڤییەکێ د ناڤبەرا چیرۆکا موسا پێغەمبەری و جوانییا دێمێ یارێ بسەر ئامانجا وی کو وەسفکرنا دێمێ یارێیە زال بوویە. ل ڤێرێ نکۆلی ل زیرەکی و چەلەنگییا شاعری بۆ دروستکرنا لێکچواندنان ناهێتەکرن و ڕەنگە ئەڤ دێرە شعرە ئێک ژ گونجاوترین نموونەیان بیت بۆ کارێ زانایێن ڕەوانبێژییێ، لێ وەکو خویایە شاعر نەشیایە وەکو پێویست جوانی و نازکییا دێمێ یارێ نیشان بدەت.

گەلەك جاران شاعرێ کلاسیکی ژ بۆ نیشاندانا هێز و شیانێن خۆ هەولددەت پەیوەندیەکا لێکچواندنی ب چەندین ئاوایێن جیاواز پێشکێش بکەت، ئەڤ چەندە د شعرا کلاسیکیدا نیشانا هونەرمەندی و دەستهەلییا شاعرییە، شاعر ل

جهێ هندێ كو لدویڤ پەیوەندیەكا نوی بگەریت، هەولددەت پەیوەندیەكا كەڤن ب ئاوایەكێ جیاواز پێشكێش بكەت، دیارە هەر ئەڤ چەندە ب خۆ ژی دبیتە ئەگەر كو سواوە بوونا وێنەیەكی د چارچووڤێ شعرا شاعرەكی بهێتە دیتن :

ئــەگــەر فیلــم لــەبــەر ئەسپی تــۆ دا، فەرزە بەیدەق بــم

وەگەر شاهم لە عەرسەی عەشقی تۆ دا بێ ڕوخت مــانــم...(بێخود (دیوان)، ل٥٦)

بــروانە حیشمەتی كە لە عــەرســەی بــوزورگــیا

ئـەسـپ و وەزیری مەملەكەتی، فیل و شایە غــەوس...(بێخود (دیوان)، ل٤٧)

لــە عــەرســەی شــاتــرنجی ئیتیقــادا

لەسەر ئەسپی سەداقەت شایە خــادم ...(بێخود (دیوان)، ل٥٩)

(بێخود) چەند جاران ژ بۆ پیشاندانا مەزناهییا كەسەكی مفای ژ یارییا شەترەنجێ وەردگریت، ب شێوەیەكێ گشتی وێنەیێ شعری د هەر سێ دێران دا بەرهەمێ پەیوەندییێن لێكچواندنیە، ئەڤە ب تنێ بەرهەمێ زێدەرۆیكرن د بكارهینانا پەیوەندییێن لێكچواندنێیە و شاعری دڤێت ب ڕێكا ڤان وێنەیان شیانێن خۆ د ڤی بواریدا نیشان بدەت، ئەڤە ل وی دەمی كو گەلەك ڕێك و شێوەیێن دی بۆ ئافراندنا وێنەیێن شعری هەنە.

گرنگیدانا زانانییێن ڕەوانبێژیێ ب جۆرێن لێكچواندنێ و پۆلینكرنێن زێدە و ژ ڕادەبدەرێن وان، باشترین بەلگەیە بۆ لێكچواندنی بوونا خەیالا شاعرێ كلاسیكی. دیارە شاعرێن كورد نە ب تنێ ب ڕێكا خواندن و ژبەركرنا شعرێن شاعرێن فارس و عەرەب كەفتینە ژێر دەستەلاتا لێكچواندنێ، بەلكو خواندن و شارەزابوونا وان د ڕەوانبێژییێدا ژی پالدەرەك بوویە كو ئەو ل جهێ گەریان لدویڤ پەیوەندی و ڕێكێن نوی بۆ پێشكێشكرنا وێنەیان؛ هەول بدەن داهێنانێ د هەمان پەیوەندییێن لێكچواندنییێن بەرێدا بكەن، لەوما ئەو تشتێ كو پتر د شعرا كلاسیكییا كوردیدا دهێتە دیتن بریتیە ژ پێشكێشكرنا پەیوەندییێن لێكچواندنی ب ئاواییێن جوداجودا. شاعرێن كورد هەولداینە پرانیا جۆرێن لێكچواندنێ د

شعرێن خۆ دا بکاربینن، ئەڤ چەندە د پەرتووك و ڤەکۆلینێن ڕەوانبێژیێ یێن تایبەت ب شعرا کوردی ب ئاشکرایی دهێتە دیتن، نکۆلیێ ل هندێ ژی ناهێتەکرن کو ڤەدیتنا نموونەیێن شعری بۆ جۆرێن لێکچواندنێ د شعرا کلاسیکییا کوردیدا کارەکێ زەحمەت نینە. هەرچەندە کو جۆرێن لێکچواندنێ ژ شاعرەکی بۆ شاعرەکێ دی جیاوازە و ڕەنگە هەمی جۆرێن لێکچواندنێ د شعرا شاعرەکیدا نەهێنە دیتن لێ ئاشکرایە کو شاعرێ کورد کەفتییە داڤا لێکچواندن و جۆرێن وێ یانکو خەیالا شاعری پتر خەیالەکا لێکچواندنییە.پەیوەندیێن لێکچواندنی د شعرا کلاسیکییا کوردیدا ب ئاوایێن جیاواز لسەر ڕووبەرێ دێرا شعری دهێنە بکارهینان، جارنا وێنەیێن لێکچواندنی تەڤایا دێر یان نیڤەدێرەکێ ب خۆڤەدگرن، جارنا ژی بریتینە ژ لێکچواندنێن کورتکری کو ژ دوو پەیڤان پێک دهێن. ب شێوەیەکێ گشتی لێکچواندن ژی وەکو پرانیا ئەدگارێن شعریەتا قەسیدەیێ ژ سنوورێ دێرا شعری دەباز نابیت.کورتتیرین لێکچواندن ئەو لێکچواندنن کو ب تنێ ژ لێچو و لەوچوی پێک دهێن، ئەڤ جۆرە لێکچواندنە د شعرا کلاسیکیدا ب بەرفراوانی دهێنە دیتن، بۆ نموونە ڕێژەیەکا بەرچاڤ ژ لێکچواندنێن کورت د وان شعرێن (مەلایێ جزیری) دا هەنە کو هونەرێ کەرتکرنێ یانکو تەشتیرێ تێدا هاتیە بکارهینان:

حـــووری وەشە، شیرین مەشە، کاکول ڕەشـــە، خال حـــەبـــەش

خـــالێن د قـــەر، میسکـــا تەتەر، نـــازك بەشـــەر کـــافـــور بـــوو...(جزیری (دیوان)، ل٤٠٧)

هەر نیڤەدێرەکا ڤێ شعرێ بسەر چوار کەرتان هاتیە دابەشکرن و گەلەك لێکچواندن تێدا هاتینە بکارهینان (حووری وەش، خال حەبەش، کافور)، ئەڤە ژی کورتترین جۆرێن لێکچواندنێنە کو ب لێکچواندنا ڕەوان دهێنە نیاسین و تێدا هەر دوو بنەرەتێن لاوەکیێن لێکچواندنێ واتە (ئامراز) و (روویێ لێکچواندنێ) هاتینە لادان.

شەب کاکولە، خال فلفلە، چین سونبلە دێم کەوکــەبە

مــن غــەفــلــەتــیٚ دی قبــلــەتــیٚ وەك مــاهـ دتەیســا غــەبغەبە...(جزیری (دیوان)، ل٤٥٩)

ل ڤێریٚ ژی د نیڤە دێرا ئێکێدا چوار لێکچواندن هاتینە بکارهینان (شەب کاکول، خال فلفل، چین سونبول، دێم کەوکەب)، کورتبڕی بسەر ڤان وێنەیان زالە، چونکە هەمی ژ جۆریٚ لێکچواندنا ڕەوانن. ل نیڤەدێرا دوویێ ژی لێکچواندنەکا تەواو دهێتە دیتن، غەبغەب ب هەیڤیٚ دێتە لێکچواندن، (وەك) ژی ئامرازیٚ لێکچواندنێیە و (دتەیسا) ژی ڕوویێ لێکچواندنێیە. شاعر ب تنێ ژ لێکچواندنەکیٚ دچیتە لێکچواندنەکا دی، یانکو ب دەربڕینەکا دی ئەڤ دێرە ب تەمامەتی لسەر بناغەییٚ لێکچواندنیٚ ئاڤا بووینە، خەیالا شعری پتر د ئاراستەیا ڤەدیتنا وەکهەڤییٚ د ناڤبەرا دوو تشتان کاردکەت.

گەلەك جاران شاعر تەڤایا دێرا شعریٚ بۆ لێکچواندنەکیٚ تەرخان دکەت، واتە نیڤەدێرەك ب تەمامەتی دبیتە لێچو و نیڤە دێرا دی دبیتە لەوچو، جارنا وێنەیەك ب وێنەیەکیٚ دی دهێتە لێکچواندن و جارنا ژی کۆمەکا لێچو و لەوچویان ب ڕێکا پێچان و بەلاڤکرنیٚ پێکڤە دهێنە گرێدان، هندەك جاران ژی شاعر لێکچواندنێن ب ڤی ڕەنگی لسەر بناغەییٚ (اسلوب معادلە) یان شێوازیٚ هاوکێشەی کو د سەبکیٚ هندیدا باوە پێشکێش دکەن، واتە شاعر ل نیڤەدێرەکیٚ باسیٚ تشتەکیٚ مەعنەوی دکەت و پاشی ل نیڤەدێرا دی ب ڕێکا وەکهەڤی یان پەیوەندییا پێچان و بەلاڤکرنیٚ (لف و نشر) یان لێکچواندنەکا لێکدای ( مورکب) ڤی تشتی ب وێنەیەکیٚ ماددی د دێرا دوویێدا گریٚ ددەت:

عــاشــقــی بیٚ دڵ دەنــالــیٚ، مــەیلی گــریــانــی هــەیــە

بــیٚ شکــە هـــەورە تـــریشــقــە تــاوی بــارانــی هــەیــە

چاوی من دەم دەم دەرێژیٚ ئاوی ساف و خوێــنی گــەش

دا بــڵــێــن دەریــای عـــومــان دوڕ و مــەرجــانی هــەیــە...(نالی (دیوان)، ل٥٧٨- ٥٨٢)

عاشقەك كو حەزا گریانێ هەیە ب هەورەكی دهێتە لێكچواندن كو بریسیا ڤەددەت و باران ژێ دباریت، هەر وەسا شاعری چاڤێن خۆ كو ڕۆندك و خوین ژێ دبارن وەكهەڤ كریە لگەل دەریایا عومانێ كو پڕە ژ دوڕ و مەرجانان، وێنەیەكێ شعریێ جوان ب ڕێكا لێكچواندنێ هاتیە پێشكێشكرن، لێ نە لێكچواندنەكا كورتكری بەلكو لێكچواندنەكا تێروتەسەل كو ڕووبەرێ دێرا شعری بخۆڤەدگریت.

نەكـــەن تا لـەتلەتـم بـــۆسەی نیهانت ڕاستی نـــالێم

بەڵێ قەفقەف هەتا نەی نەیبڕی حـاصل شـــەكـەر نادا ...(سالم (دیوان)، ل ١٧)

ل ڤێرێ ژی شاعر ل نیڤە دێرا ئێكێ دۆخەكێ مەعنەوی پێشكێش دكەت و ل نیڤە دێرا دوویێ وێ ب دۆخ یان كارەكێ بەرهەست و ماتریالی وەكهەڤ دكەت، واتە شێوازێ هاوكێشەی (اسلوب المعادله) یێ كو د سەبكێ هندیدا  باوە دهێتە بكارهینان.

دیارە كو پشتبەستنا زێدە ل سەر خواستنێ ژی هەر درێژەپێدانا لێكچواندنی بوونا زمانێ شعرا كلاسیكیە، خواستن و ب تایبەت ئەوا كو دبێژنێ خواستنا ئاشكرا ب ڕێژەیەكا بەرچاڤ د شعراندا هاتیە بكارهینان. هەرچەندە ل دویف تایبەتمەندیێن قەسیدەیا كەڤن پرانیا جاران ڕێژەییا بكارهینانا وێ ناگەهیتە لێكچواندنێ، لێ لگەل هندێ ژی خواستن وەكو هونەرەك كو لسەر بناغەیێ وەكهەڤیێ دروستبوویە، شانبشانێ لێكچواندنێ پرانیا وێنە و دیمەنێن شعرا كلاسیكی پێك دهینن:

ئەی سەروی بوڵەند قەدد و برۆ تاق و مەمك جـــووت

كـــێ دەسـتی دەگـاتە بەی و نـاری نەگەیشـتـــووت

دەم هـەمـدەمـی غونچێكە نـەپشكـووتـووە هێشـــتا

با كەشفی نەكرد بەرگی عەترپۆشی گولی ڕووت

گـریـانـی مـن و خـەنـدەیـی تـۆ ئێستە دەشـوبهـێ

بـــەو مەوسیمی بـــارانە كـەوا غـونـچە دەپـشكـوت

خلْخالْی قــەدم، وەك خــەمــی زولـفەینی ســەراپــات
پـشـتــانی قــەدت بێــت و فــیـــدای بــازنـــی بــازووت
...(نالی (دیوان) ١٥٦- ١٥٩)

ئەڤ شعره ب تەمامەتی لسەر بناغەیێ پەیوەندییا لێکچواندنێ هاتیه ڤەهاندن، شاعر جار لێکچواندنێ و جار خواستنێ بکاردهینیت و ب شێوەیەکێ گشتی ژ چارچووڤێ پەیوەندییا وەکهەڤیێ دەرناکەڤن. د دێرا ئێکێدا یار ب سەروێ، برۆیێن وێ ب تاقێ و مەمکێن وێ ب بیهان هاتینه لێکچواندن، چێدبیت نار ژی وەکو خواستنەك بۆ مەمك یان لامێن کچکێ هاتبیته بکارهینان. ل دێرا دوویێ ژی غونچه خواستنه و ئاماژه یه بۆ دەڤ و لێڤێن کچێ. ل نیڤەدێرا دوویێ ژی ڕوو ب گولێ هاتیه لێکچواندن. ل دێرا سێیێ ژی لێکچواندن ب ڕێکا شێوەیێ هاوکێشەیی (اسلوب موعادله) کو د سەبکێ هندیدا باوه هاتیه پێشکێشکرن؛ شاعر گرییا خۆ و کەنییا یارێ مینا وەرزێ بهارێ نیشان ددەته کو تێدا بارینا بارانێ دبیته ئەگەرێ ڤەبوونا بشکۆژان. ل دێرا چوارێ ژی ب چڕی لێکچواندن هاتینه بکارهینان؛ شاعر سەرەتا بەژنا خۆ ب خلخالێ وەکهەڤ دکەت و پاشی ڤی وێنەی وەکهەڤ دکەته (خەمی زولف) یانکو بەژنا خۆ یا چەمیای لگەل لوول و پێچا زولفا یارێ وەکهەڤ دکەت. هەرچەنده شاعر شیایه وێنەیێن گەلەك جوان پێشکێش بکەت لێ دیاره کو خەیالا شاعری خەیالەکا لێکچواندنیه و هەمیشه هەولا ڤێ چەندێ ددەت کو بۆ وەسفکرنا هەر تشتەکی لدویف دیاردەکا وەکهەڤ بگەریت و وان پێکڤە بێخیته د چارچووڤێ لێکچواندن یان خواستنەکێدا.

ژبلی ڤێ چەندێ کو پەیوەندییێن لێکچواندنی ب ڕێژەیەکا مەزن د شعرا کلاسیکییا کوردیدا دهێنه بکارهینان، پرانیا جاران ئەڤ لێکچواندنه ژی لێکچواندنێن ماتریالینه، ب تایبەت ئەو لێکچواندنێن کو لاساییکرینه و ڕەه و ڕیشالێن وان بۆ سەردەمێ زالبوونا قەسیدەیێ د شعرا عەرەبی و فارسیدا دزڤریت. ماتریالیبوونا لێکچواندنان د قەسیدەیا عەرەبی و فارسیدا و وەرارا قەسیدەیێ د سەقایێ ماتریالیێ کۆچکاندا؛ بوویه ئەگەر کو ب گشتی وێنەیێ شعرا

کلاسیکییا ڕۆژهەلاتی پتر ماتریالی یانکو ماددی بیت، تەنانەت ماتریالیبوونا لێکچواندنا بوویە ئەگەر کو پرانیا وێنەیێن دیێن شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی ژی مۆرکەکێ ماتریالی ب خۆڤە بگرن.هەر چەندە کو سەرهلدانا عرفان و سۆفیگەرییێ بوویە ئەگەر کو جارنا وێنەیێن شعری ڕێچکەیا خۆیا ماتریالی بەردەن و بەرەڤ مەوعنەوییەتیێ ڤە بچن، لێ ب شێوەیەکێ گشتی ئەڤ هەولە نەگەهشتیە وی ئاستی کو سەرکەڤتنێ لسەر وێنەیێن ماتریالیێن شعرا قوناغێن بەری هنگی بدەستڤەبینیت. پرانیا جاران شاعرێن سۆفی ژی بۆ گەهاندنا مەبەستا خۆ پشتبەستن لسەر میراتا وێنەییا شاعرێن بەری خۆ کرینە، کەواتە پرانیا وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی ب تایبەت وێنەیێن سواوە، وێنەیێن بینراو و بەرهەستن، ئەو وێنەیێن کو ژ ئەنجامێ ڤەدیتنا پەیوەندییێ د ناڤبەرا دوو تشتێن بەرهەست دا چێبووینە:

***دەمت*** چییە؟پر لە ***دوڕ، دورجێکی یاقووت***

نیشـانە و مۆری چــی ؟ ***خەتێکی زمـرووت***...(مەحوی (دیوان)، ل ١١١)

ل ڤێرێ ژی وێنە لسەر بناغەیێ پەیوەندییێن وەکهەڤیێن ماتریالی ئاڤا بوویە، د نیڤەدێرا ئێکێدا دەڤێ یارێ ب صندوقەکا یاقووتی یا تژی دوڕ کو مەبەست ددانن هاتیە لێکچواندن، نیڤە دێرا دوویێ ژی هەر ب ڤی ڕەنگی لێکچواندنەکا ماتریالی ب خۆڤە دگریت.

زولــف و ڕوخ و لــەب، عـاریز و خـــەت، زایقـەبەخـشن

وەك زوهرە لە شەو، مەی لە قەدەح، گوڵ لە چەمەنـدا ...(وەفایی (دیوان)، ل٣٠)

خەیالا شاعری ب تەمامەتی ماتریالییە، زولف و ڕوخسار و لیڤ و دێم و خەت و خالا لێڤان هاتینە وەکهەڤکرن لگەل ئستێرا زوهرەیێ د شەڤێدا و مەیا د پەیالێدا و گولا د چەمەنێدا.

موشِشاته کە شانەی لەسەری زولفی سـەنـەم دا

ئــاشفـتـەگـیی حــالی وەفــایــی لـــە قـــەلــەم دا ...(وەفایی (دیوان، ل٢٧)

بەری هەر تشتەکی (صەنەم) خواستنەکا سواوەیە و بۆ یارێ دهێتەبکارهینان(*)، وەکهەڤکرنا یارێ لگەل صەنەمێ بەرهەمێ ماتریالیبوونا لێکچواندنانە و دەمێ ئەڤ لێکچواندنە دبنە خواستن ماتریالیبوون بۆ خواستنان ژی دهێتە ڤەگوهاستن. نیڤەدێرا ئێکێ ب خۆ ژی وێنەیەکێ وەسفیێ ماتریالی و بەرهەستە، مەشاگە ئەوا کو ب شەکرنا پرچێ و کارێن جوانکارییا ئافرەتان رادبیت پرچا یارێ شەدکەت. چێدبیت (مەشاگە) ب خۆ ژی خواستن بیت، چونکە د شعرا فارسییا کەڤندا گەلەك جاران با ب (مەشاگە)یێ(**) هاتیە لێکچواندن، ئەڤە ژی هەر لسەر بناغەیێ پەیوەندیەکا ماتریالی هاتیە ئاڤاکرن.

سەرەرای زالبوونا لێکچواندن و خواستنێن ماتریالی لسەر شعرا کلاسیکییا کوردی، لێ هندەك لێکچواندن و خواستنێن وەها ژی هەنە کو ب تەمامەتی ماتریالی نینن، ئەڤە ژی دبنە چەند جۆرەك، هندەك ژ وان ئەون کو د شعرا عەرەبی و فارسییا کەڤن باوبووینە و شاعرێن کورد ئەڤ وێنە ژ وان وەرگرتینە، یانکو وێنەیێن سواوەنە و پەیوەندییا د ناڤبەرا لێچو و لەوچوی یان بۆخواستی و ژێخواستی ئاشکرایە، واتە رۆویێ لێکچواندنێ دیارە و نابیتە ئەگەرێ لێلی و ئالۆزیێ:

سـەحــار جـوهـتێ جــادوان ئـیرۆ ژ رەمـــزا ئــەبروان

دل گرت و دابەر کاشوان کەرکر ل مسکینان کـەبــەد ...(جزیری(دیوان)، ل٢٢١)

سـەراســەر عــەشـقی تـۆ بۆ مـن تـەلەسـمـە

بــە ئـەفـسـوونـی نیگـاهـی چاوی جــادووت ...(سالم (دیوان)، ل ٤٩)

ل ڤێرێ چاڤ ب جادویێ هاتیە لێکچواندن(*)، واتە لێکچواندن (ماتریالی-مەعنەوی)ییە، لێکچواندنا عەشقێ ب (تەلەسم)ێ ژی ماتریالی نینە و دشێین بێژین

کو ب تەمامەتی مەعنەوییە چونکە هەر دوو لایەنێن لێکچواندنێ بەرهەست نینن. ڕێژەیا بکارهینانا لێکچواندنێن (ماتریالی- مەعنەوی) یان (مەعنەوی- ماتریالی) د قەسیدەیان دا گەلەك کێمتر بوویە ل هەمبەر لێکچواندنێن (ماتریالی- ماتریالی)، پەیوەندییێن لێکچواندنییێن (مەعنەوی- مەعنەوی) ژی گەلەك کێم و دەگمەنن.هەبوونا لایەنێ مەعنەوی و ب تایبەت زالبوونا وێ دبیتە ئەگەر کو ئالۆزی و لێلی د وێنەیدا پەید ببیت و د ئەنجام دا ڕەخنەگرێ شعرا کلاسیکی کو شەیدایێ ڤەدیتنا ڕوویێ لێکچواندن و مەبەستا شاعرییە توشی ئاریشەیان ببیت.

هندەك جاران ژی شاعرێن کلاسیکییێن کورد ب تایبەت یێن سۆفی هەولددەن گیانەکێ مەعنەوی ببەخشنە هەمان وێنەییێن ماتریالییێن کەڤن، بۆ نموونە؛ دیارە (مەلایێ جزیری) هەست ب ماتریالیبوونا گەلەك ژ وێنەییێن شاعرێن بەرێ کریە و هەولدایە ب ڕێکا زێدەکرنا پەیڤان ڕەهەندەکێ مەعنەوی بدەتە ڤان وێنەیان، ئێك ژ ڤان پەیڤان پەیڤا (ئەزەل)ە:

مەشاگەهیێ حوسنا ئەزەل چەنگال زولفان تاب دا
دا عەشق هل بت پێل ب پێل قەلبێ مە پێ جەلاب دا...(جزیری (دیوان)، ل١٣)

ل ڤێرێ هەر ئەو وێنەیێ وەسفی و خواستنا کو بەری نهۆ مە ئاماژە پێدای، ژ چارچووڤێ خۆیێ ماتریالی دەرکەفتیە. ل ڤێرێ (مەشاگەه) خواستنە و بۆ خودایێ مەزن هاتیە بکارهینان بەلگە ژی پەیڤا (ئەزەل)ە.ل ڤێرێ وێنە ڕەهەندەکێ مەعنەوی بخۆڤە دگریت و ئێدی مینا لێکچواندن و خواستنێن ماتریالییێن باو د شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا دەستنیشانکرنا ڕوویێ لێکچواندنێ یانکو خواستیێ کارەکێ ب ساناهی نینە.

بولبولی گولشەن بێ نام و نەنگی
تەزەروی سەر سەروی باغچەی بێ ڕەنگی...(مەولەوی (دیوان)، ل١٠٤)

مەولەوی، (شیخ حەسەنێ مەولانا)ی جارەك ب بلبلا گولزارا بێ ناڤ و بێ گونەهیێ و جارەك ب کەڤوکا سەر سەروا باغچەیا بێ ڕەنگیێ) وەکهەڤ دکەت. لێکچواندنا کەسەکی ب گولزارا بێ ناڤ و بێ گونەهـ و باغچەیا بێ ڕەنگ بوویە ئەگەر کو ئەڤ لیکچوواندنە ب تەمامەتی ژ جیهانا ماتریالی جودابیت، ئەڤ وێنەیە بەرهەمێ خەیالا بێ سنوورا شاعریە و لێکچواندنەکا تەقلیدی نینە، بکێر وان زانایان ناهیت کو لاسایا ڕەوانبێژیێ و شعریەتا قەسیدەیێ دکەن ، چونکە ڕێکارێن رەوانبێژییا عەرەبی نەشێن ب تەمامەتی خزمەتا ڤی وێنە بکەن. مەولەوی شیایە هندەك لێکچواندنێن ماتریالیێن کەڤن ب ڕێکا دانەپالا هندەك سیفەتان ژ چارچووڤێ ماتریالی دەربێخیت، چونکە چ هەبوونەکا فیزیکی بۆ گولشەنەکا بێ ناڤ و بێ گونەهـ و باغچەیا بێ ڕەنگ نینە.

ژبلی ڤان جۆرە وێنەیان هندەك وێنەیێن دەگمەن ژی د شعرا کلاسیکییا کوردیدا دا هەنە کو ب تەمامەتی مەعنەوینە و پتر بەرهەمێ خەیالا شاعری بخۆنە:

نـە تـۆی تاریکـی تای شەدەی بێ گـەرد

لەتافەت چون ئاو حەیات مەوج مـەوەرد...(مەولەوی (دیوان)، ل ٢١٥)

شاعری نازکییا کچەکێ ب ئاڤا حەیاتێ کو لسەر داڤێن ڕەشێن کراسێ وێ پێلان ڤەددەت لێکچواندیە، وێنە ب تەمامی مەعنەوییە و هەر ئەڤ چەندەیە کو سەرنجا خواندەڤانی ڕادکیشیت.

دەنگـی مەلەکـان زمیهـنە زەم زەم

ئــەرواح ژ عـیشـقـێ تێـنە میعــراج...(جزیری (دیوان)، ل ١٦٧)

ل ڤێرێ وێنەیەکێ وەسفیێ مەعنەوی هاتیە پێشکێشکرن، دەنگێ دەنگڤەدانا زەمزەمەیا فریشتەیان دهیت کو چێدبیت مەبەست پێ زکرێ خودێ بیت. گیان یانکو ئەرواح ژی ژبەر عەشقێ بەرز دبن یانکو بەرەڤ دیدارا خودێ دچن. وێنە ب تەمامەتی ژ پەیوەندییێن ماتریالییێن لاساییکری ڕزگاردبیت و بەرڤ لێلییێڤە

دچیت. ئەڤ وێنەیە لگەل چێژا قەسیدەیێ و ڕەخنە و رەوانبێژییا عەرەبی کو پالپشتییا ڕۆهنی و ئاشکرایی و ماتریالیبوونێ دکەت ناگونجیت. مەعنەویبوون د وی ئاستیدایە کو ڕوونبێژی نەشێت مەبەست یان واتایا ڤان دێران ب دروستی بدەتە خویاکرن. ئەڤ هەولێن ب ڤی ڕەنگی جهێ سەرنج و بایەخێنە چونکە ب پێنگاڤەکا گرنک بۆ ڕزگاربوونا شعرێ ژ شعریەتا قەسیدەیێ و وێنەیێن لاساییکرییێن شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی و ب سەرەتایەك بۆ ئافراندنا وێنەیێن نوی دهێتە هژمارتن. سەرەرای هەبوونا نموونەیێن ب ڤی ڕەنگی لێ ب شێوەیەکێ گشتی پرانیا جاران ماتریالیبوونا وێنەیان مۆرکێ گشتیێ شعرا کلاسیکییا کوردیە، هەر لسەر ڤی بناغەی پێویست نینە ئەم ماتریالیبوونا وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی وەکو بەشەك ژ شێوازێ تاکەکەسیێ شاعری ل قەلەم بدەین، بۆ نموونە ڤەکۆلەرەك دەربارەی هندەك وێنەیێن شعرا (مەحوی) دبێژیت ((هەرچەندە مەحوی لە داڕشتن و چنینەوەی شیعرەکانیدا هەولیداوە بە کەرەسە و ئامرازی ماتریالی هۆنراوەکانی هەڵبکۆڵێنێت و بینەخشێنێت، ئەمەش زیاتر بۆ ئەوەیە تا هەموو چینەکانی کۆمەل بتوانن بە ئاسانی لە جۆری عیشقی مەحوی تێبگەن...)[٨٨]، ئەڤە ل وی دەمی دەمی کو ماتریالیبوونا لێکچواندن و وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی بەرهەمێ لاساییکرنا زال لسەر شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیە و د پرانیا شعراندا دهێنە دیتن.

### ٣.١.٢.٢. لاوازبوونا خواستنان:

د ڤەکۆلینێن زمانڤانییێن نویدا گرێدانا خواستنێ ب پەیوەندیەکا دیارکریڤە کو پەیوەندییا لێکچواندنێیە هاتیە ڕەتکرن و باسێ گەلەك پەیوەندییێن دی هاتیەکرن کو دبنە بناغە بۆ دروستبوونا چەندین جۆرێن خواستنان، واتە سنووردارکرنا خواستنێ ب پەیوەندییا لێکچواندنێ پتر بەرهەمێ بەردەوامیدان ب ڤەکۆلینێن ڕەوانبێژییێن کەڤنە[٨٩]، لێ لگەل هندێ ژی گرێدانا

خواستنێ ب پەیوەندییا لێکچواندنێڤە د ئەدەبیاتا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا جێگیربوویە و شاعر و ڕەخنەگران ژ ڤی ڕوانگەهیڤە بەرێخۆدایە خواستنێ.

خواستن ژ گرنگترین جۆرێن وێنەیێن شعریە، لێ ب تنێ هەبوونا خواستنان د شعرا شاعرەکیدا نابیتە پیڤەر بۆ بهێزبوونا شعرێن وی چونکە ((بڕیاردان لسەر مەزناتییا شاعری لسەر بناغەیێ ڕەسەنایەتی و هێزا خواستنێن وییە))[٩٠]، بۆ نموونە ئەگەر ئەم پەیوەندییا لێکچواندنێ وەکو بناغەیێ دروستبوونا وێنەیێ خواستنێ وەرگرین، پێویستە باسێ لێکچواندنەکا نوی بکەین. (مدلتون مری) سەبارەت ب خواستنێ دبێژیت: ((داخوازا مە یا سەرەکی ئەوە کو لێکچواندن لێکچواندنەکا ڕاستگۆییانە بیت، واتە نەهاتبیتە دیتن یان ب ئاوایەکێ کێم هاتبیتە دیتن؛ دا کو کاریگەرییا ڤەدیتنێ هەبیت))[٩١].

د شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا خواستن بن سیبەرا لێکچواندنێ بوویە و بزاڤا شاعران د ڤێ بازنێدا هاتیە چارچووڤەدارکرن. دیارە ل دەستپێکێ شاعران پتر گرنگیدایە لێکچواندنێ و پاشی ژبەر دووبارەکرنەکا ژ ڕادەبدەر ئەڤ لێکچواندنە بووینە خواستن. ڤەکۆلەرەك سەبارەت ب خواستنێ د شعرا کلاسیکییا فارسیدا دبێژیت: (ڕەه و ڕیشالێن هەر خواستنەکێ د لێکچواندنەکێدایە، باشترین خواستن ئەون یێن ڕۆژەکێ لێکچواندن بووینە، لگەل بورینا دەمی و دووبارەبونا لێکچواندنان هزر و خەیالا شاعری بەرەڤ ئافراندنا وێنەیێن خواستنیڤە چوویە و شیایە ب ڕێکا لادانا ئێک ژ بنەرەتێن لێکچواندنێ کاریگەرییێ لسەر وەرگری بکەت، یانکو وەرگری هەست ب ڤێ چەندێ کریە کو توشی دیاردەکا نوی بوویە.د وێنەیێن سەبکێ خوراسانیدا لێکچواندن زالن لێ د سەبکێ عراقیدا خواستن زالە)[٩٢]، کەواتە ئافراندنا ڕاستەوخۆیا خواستنان یان داهێنانا وێنەیان ژ لێکچواندنێن نوی د شعرا فارسیدا کێمە، شاعرێن فارسی زمان نێزیکییا خۆ لگەل لێکچواندنێ پاراستینە و ژ چارچووڤێ ڕۆهنی و ئاشکراییێ دەرنەکەفتینە.

نکۆلی ل ڤێ چەندێ ناهێتەکرن کو خواستنێ ڕۆلەکێ مەزن د ئاڤاکرنا وێنەیێن شعری و لاوازکرنا ماتریالیبوون و بهێزخستنا ئەبستراکبوونا وێنەیاندا

هەیە، لێ دەمێ هەر خواستنەکێ ڕەهـ وریشال د لێکچواندنەکا ماتریالییا سواوە دا هەبیت؛ ئەڤ چەندە دکەڤیتە بەر گومانێ. (محمد رضا شفیعی کدکنی) وەکو بسپۆرەکێ شعرا کلاسیکییا فارسی دبێژیت: (هندی شاعر ژ لێکچواندنێن تێروتەسەل و وەسفی دووردکەڤن و بەرەڤ خواستنێن پۆختەڤە دچن، دبنە ئەگەر کو ماتریالی بوونا لێکچواندنێ کێم ببیت...، ژ دەستپێکا سەدێ پێنجێڤە ـ ژبلی هندەك شاعران ـ لێکچواندنێن تێرتەسەل د شعرا فارسیدا بەرەڤ کێمبوونێڤە دچن و خواستنێن پۆختە جهێ وان دگرن ، هەر وەسا ژ بەر وێ بالکێشییا کو د لێکچواندنێن ئەبستراکیدا هەیە، ئێدی گرنگیدانا شاعران ب لێکچواندنێن مادی بەرەڤ لاوازییێڤە دچیت...)[٩٣]. ئەڤ ئاخفتنە دا د جهێ خۆ دا بیت ئەگەر خواستنێن کو شاعران بکارئینایین گرێدای لێکچواندنێن ماتریالیێن بەرێ نەبان، لێ دیارە کو گومان لسەر ڤێ چەندێ هەیە چونکە نڤیسەر ب خۆ ل جهەکێ دی دبێژیت: (ڕەنگە پرانیا خواستنان پێشینەیەکا لێکچواندنی هەبیت، واتە بۆ دەمەکی لێکچواندن بووینە و پشتی کو هیبوونەك بۆ ڤان لێکچواندنان و هەردوولایەنێن وان پەیدا بوویە هاتینە کورتکرن واتە لایەنەکێ لێکچواندنێ هاتیە لادان و خواستنەك هاتیە چێکرن، هەر ئەڤ گۆهرینا لێکچواندنان بۆ خواستنان نیشانەیا جۆرە لاوازییەکێیە د شێوەیێ خویابوون و شێوازێ دەربڕینا خواستنێدا، ئەڤ چەندە د شعرا فارسییا سەدەیێن چوارێ و پێنجێ ب ئاشکرایی خویایە، لێکچواندنێن سادەیێن شعرا فارسییا سەدێ چوارێ ل سەدێ پێنجێ دبنە خواستن لێ خواستنێن ئاشکرا و نێزیک بۆ تێگەهشتنێ...).[٩٤] نڤیسەر ل ڤێرێ ئاخفتنەکێ دبێژیت کو دژی ئاخفتنا بەری نوکەیە، داکۆکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو خواستن لسەر بناغەیەکێ ساخلەم واتە لسەر بناغەیێ مەجازەکێ شعریێ ڕاستەقینە دروست نەبوویە بەلکو هێشتا نوینەراتییا ماتریالیبوونا لێکچواندنێن بەرێ دکەت.ب کورتی د شعرا کلاسیکییا عەرەبی و فارسی ب دەگمەن شاعر ب ڕەنگەکێ ڕاستەخۆ وێنەیێن خواستنی پێشکێش دکەن، ئاڤاکرنا خواستنان ژ لێکچواندنان ژی پتر پەیوەستە ب لێکچواندنێن سواوە، واتە ئەو لێکچواندنێن کو

ئێدی پەیوەندییا د ناڤبەرا لێچو و لەوچوی گەلەك ئاشکرا بوویە و لادانا ئێک ژ لایەنێن لێکچواندنێ نابیتە ئەگەرێ لێلی و ئالۆزییێ، ئەڤ چەندە ژی بەردەوامیدانە ب ئێک ژ بنەماییێن سەرەکییێن ستوونا شعرا عەرەبی واتە ئاشکرابوون و نێزیکبوونا پەیوەندییا د ناڤبەرا لێچو و لەوچوی یان بۆخواستی و ژێخواستییێ.

نهۆ ئەم دشێین بێژین کو خواستن لسەر بناغەیێ پەیوەندییا وەکهەڤییێ دروست دبیت، لێ ئەڤە ب ڤێ واتایێ نینە کو هەمی جاران شاعر لێکچواندنەکا کەڤن بینیت و بنەرەتەکێ وێ لادەت داکو خواستنەکێ چێکەت، بەلکو شاعر دشێت ب رێکا خەیالا خۆ خواستنەکا نوی و داهێنەرانە پێشکێش بکەت یان لێکچواندنەکا نوی بکەتە خواستن، لێ ئەو تشتێ د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا دهێتە دیتن، ڤێ ڕاستییێ ددەنە خۆیا کرن کو ئەو خواستنێن دهێنە بکارهینان د بنەرەتدا کورتکرنا هندەك لێکچواندنێن کەڤن و سواوەنە، واتە داهێنان د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا ژ لێکچواندنێ دەست پێ دکەت نە ژ مەجازێ.

د شعرا کلاسیکییا کوردی ژی پرانیا خواستنێن ئاشکرا بریتینە ژ کورتکرنا لێکچواندنان واتە ئەو لێکچواندنێن کو ژبەر بکارهینانا زێدە چێژا خۆ ژدەستداینە و نهێنی و پەیوەندییێن وان ب تەمامەتی ئاشکرابووینە، ئەڤ ڕۆهنی و ئاشنابوونە دەلیڤە دایە شاعری کو ئێدی لێچوی لابدەت و لەوچوی ب تنێ بکاربینیت، باشترین بەلگە ژی بۆ سەلماندنا ڤێ ڕاستییێ ئەڤەیە کو پرانیا ڤان وێنەیان ب هەر دوو شێوەیان واتە وەکو خواستن و وەکو لێکچواندن دهێنە بکارهینان، بۆ نموونە ئێک ژ لێکچواندنێن باو لێکچواندنا مژیلانکانە ب تیران:

تـیری مـوژگانت لە سینەمدا دەچـێ بۆ پیـری دڵ
هێندە کەچ ئایینە قەسدی خانەدانی دین دەکــا...(نالی (دیوان)، ل١٠٩)

نــالی وەرە لادە لــە خــەدەنگی مـوژەیـی یار
ئــەو کافرە مەستانە کـە غارەتگـەری دیـنن...(نالی (دیوان)، ل٣٤٩)

دڵـی پـڕ وەحـشـەتم جانا لـەبەر مـوژگــانـی وەك تــیرت
حەسارێ بوو لە حولقەی دەرهەمی گێسوویی زنجـیــرت...(سالم (دیوان)، ل٤٧)

غــەریبی تۆم، نـەخۆشی تۆم، ب گۆشەی چــاوی بیمارت
ئەسیری تۆم، شەهیدی تۆم، بە نووکی تیری مۆژگــانت...(وەفایی (دیوان)، ل٥٧)

هەر ئەڤ لێکچواندنا باوە کو پشتی بکارهینانا زێدە هاتیە کورتکرن، واتە لێچو هاتیە لادان بوویە خواستنەکا ئاشکرا:

ڕاست و چەپ تیر دانە جانی ڕاســت و چەپ
قـەوس و ڕەشتــوزێ کــفانی ڕاست و چەپ...(شیخ نورالدین (دیوان)، ل ٧٨)

پەیڤا تیر وەکو خواستن هاتیە بکارهینان و مەبەست پێ مژیلانک یان نێرینا یارێیە، لێ پتر بەرهەمێ کورتکرنا لێکچواندنەکا کەڤنە و خواندەڤانێ ئاشنا لگەل شعرا کلاسیکی ل دەمێ ڕووبەڕووبوون لگەل ڤێ خواستنێ هەستێ ب چ ئالۆزی و لێلیەکا وەسا ناکەت، چونکە ب تەمامەتی شارەزایی لگەل وێ پەیوەندییا وەکهەڤیێ هەیە کو ئەڤ خواستنە لسەر بناغەیێ وێ هاتیە ئاڤاکرن. هەر ب ڤی ئاوایی لێکچواندنا بەژنێ ب دارا عەرعەرێ ژی لێکچواندنەکا باوا شعرا کلاسیکیە:

شمشادە ئەمە، یا قەدە یا سەروی ڕەوانــە
یــا عەرعەرە یا نەخلی مرادی دل و جـانە...(مەحوی (دیوان)، ل ٣٦٣)

خودا وە تۆش دا بالای عەرعـەرین
هـەر لایق وە تۆن شێوەی دلـبــەری...(مەولەوی (دیوان)، ل ٢٢٣)

عـــــەرعـەر بـاڵایی شای جـەمین جامێ
زولفان چوون کەمەند خەیاتەی خامێ...(بێسارانی(دیوان)، ل٣١)

هەر ئەڤ لێکچواندنە گەلەك جاران وەکو خواستن ژی دهێتە بکارهینان، لێ خواستنەك کو تام و چێژەکا وەسا تێدا نینە، چونکە چەند ئەڤ پەیڤە دهێتە بکارهینان هزرا خواندەڤانی بۆ بەژن و بالایەکا شۆخ و جوان دچیت:

راست و چەپ تێن جگەر و سینە کـولاب

عەرعەرێن شەنگ دلەستن چـەپ و ڕاست...(جزیری (دیوان)، ل١٠٠)

ڕەنگە ئێک ژ کەڤنترین لێکچواندنان د شعرارۆژهەلاتا ئیسلامیدا، لێکچواندنا چاڤان ب نێرگزێ بیت، ئەڤ لێکچواندنە د شعرا کەڤنا کوردی ژی هاتیە بکارهینان:

دیدە نـەرگسان پڕ جـە خــومــارەن

زیـنــەت ئــارایـی بـەزم خان وەهــارەن...(مەستوورە (دیوان)، ل ٣٧)

ئەو دلبەرا لەب لالە ڕوخ پوڕ ژ خەگـگ و خـالە

چــاڤ نــرگــس و خـــەد ئالە، دایــە وی دلان نـالە...(هادی (دیوان)، ل١٠٩)

ئەڤ لێکچواندنە هند کەڤن و سواوەیە کو ئێدی ب دەگمەن وەکو لێکچواندن دهێتە بکارهینان، بەلکو پتر وەکو خواستن خۆیا دبیت، هەرکەسێ کو پیچەك ئاشنایی لگەل شعرا کلاسیکی هەبیت ئێکسەر دزانیت کو مەبەست ژ نێرگزێ چاڤە:

ژ ڕەعنا نێرگزێن شەهلا، مەجالێ هەمقیران بینم

هزار ڕەمز و ئیشاراتن ژوان قەوسێن هیلال ئـــەبرو...(جزیری (دیوان)، ل٤١٢)

هەر کەسێ مەستی صەبوحی نێرگسی مەخمورتە

کەی خەیالی جامی سەهبا یا مـەیی خـللەر دەکـــا...(ئەدەب (دیوان)، ل٥٩)

سواوەبوون و لاوازیا ڤان جۆرە خواستنان ل وی دەمی پتر خۆیا دبیت کو شاعر خواستنەکێ وەکو لێچو یان لەوچو بکاردهینیت:

ئەو سنبلا عەقرەب صیفەت، بێهودە دل ئـەبتەر دکـەت

سـەد کـێرێ بـوڕان لـێـددەت بێ هەش دکەت دێـوانەڕا ...(شیخ نورالدین (دیوان)، ل٤٧)

ل ڤێرێ (سونبول) ب (عەقرەب)ێ هاتیە وەکهەڤکرن، هەر دوو پەیڤ دبنەرت دا لێکچواندنێن سواوەنە کو بۆ زولفا یارێ دهێن بکارهینان، سواوەبوونا ژ ڕادەبدەرا پەیوەندییا د ناڤبەرا زولف و سونبولێ ڤێ دەلیڤێ ددەتە شاعری کو ڤێ پەیڤێ وەکو لێچو بکاربینیت.

نـــەمـــاوە شـــاری بـــابـــل، چـــاهـی هـــــارووت

لە کـوێ خوێندوویە ئەفسوون چـاوی جـــادووت...(تاهیربەگ (دیوان)، ل ٣٨)

فـەرمووتە بێ زوو بە زوو بیکە بە کارم عـــەدو

غــارەتی دینم بە دوو نێرگسی جادوو فـــەریب...(ناری (دیوان)، ل٥٢)

ئــالــۆزی جـیهانێ لـە خـەمی سونبولی خـــاوت

ئاشووبە دوو دونیا لە شـەڕی نێرگسی جـــادووت... ئەدەب(دیوان)،ل ٨٣)

د نموونەیا ئێکێدا (چاوی جادوو) هاتیە بکارهینان، د پەیوەندیەکا وەکهەڤییێدا چاڤ هاتیە دان با جادوویێڤە، ل نموونەیا دوویێ و سێیێ شاعری (نێرگسی جادوو) بکارئینایە، کەواتە ل ڤێرێ خواستن بوویە لێچو و ب جادوویێ هاتیە لێکچواندن، یانکو شاعری زانیە کو نێرگس خواستنەکا گەلەك سواوەیە و خواندەڤانێن شعرا کلاسیکی دزانن کو مەبەست ژ ڤێ خواستنێ چاڤە.

دیارە کو ڕوونبێژییا عەرەبی ـ ئیسلامی پشتەڤانییا ڤان جۆرە خواستنان دکەت، ئەو خواستنێن کو ئەنجامێ کورتکرنا لێکچواندنێن کەڤن بن، داکو زانایێ ڕەوانبێژیێ بشێت ب ساناهی واتا مەجازییا پەیڤێ یانکو بۆخواستیێ و هەر وەسا ڕوویێ لێکچوونێ واتە خواستیێ دەستنیشان بکەت، رۆهنبوونا ڕوویێ لێکچواندنی ئامانجا ڕوونبێژییێ لەوما نەب تنێ سواوەبونا خواستنێ نابیتە کێماسی بەلکو دبیتە ڕێخۆشکەرەك بۆ هندێ کو زانایێن ڕەوانبێژیێ پتر جەختێ

لسەر ڤان نموونەییێن سواوە بکەن، نەکە ب ڕاستی ئەم نەشێین خواستنەکا سواوە یا وەکو (نێرگز)ێ بینینە ئاستێ خواستنەکا نوی:

بـــەنـــابـــاشیی بـــورجی بەرزە دیـــاران
سفیدکاری کەرد تاقچەی موغـاران...(مەولەوی (دیوان)، ل٣١٦)

ل ڤێرێ شاعری پەیوەندیەکا وەکهەڤیێ د ناڤبەرا خودێ و بەناباشی (بەننا)ی سازکریە، بەناباشی وەکو خواستن هاتیە، هەرچەندە کو تا ڕادەیەکێ واتا وێ ڕۆهن و ئاشکرایە، لێ پێشینەکا لێکچواندنییا وەسا نینە کو ئەم وێ ببەینە ڕێزا وان خواستنان کو پەیوەستن ب لێکچواندنێن سواوەڤە.

داهێنانا خواستنێن نوی ئێک ژ پێدڤیاتییێن زمانێ شعریە ڤێجا چ ژ ئەنجامێ کورتکرنا لێکچواندنێن نوی بیت یان بەرهەمێ ڕاستەوخۆیێ خەیالا شاعری ب خۆ بیت، ب ڕاستی ئەڤ حالەتە ب دەگمەن د شعرا کلاسیکییا کوردیدا دهێنە دیتن، داهێنانا شاعرێ کلاسیکی پتر د بوارێ لێکچواندنان دا خۆیا دبیت واتە شاعرێن کورد سەرەرای هەبوونا گەلەك لێکچواندنێن سواوە شیاینە گەلەك لێکچواندندنێن نوی ژی بکاربینن، لێ تشتێ بالکێش ئەڤەیە کو ئەو نەشیاینە ڤان لێکچواندنان بکەنە خواستن:

کــو لێ تێت ئـەو قەبایێ ئاسمانی
لەطیفا شەنگ و نازك وەك بـەلازیز...(جزیری (دیوان)، ل ٢٥٢)

ل ڤێرێ لێکچواندنەکا نوی هاتینە بکارهینان و یار یانکو خۆشەویست ب (بەلازیز) هاتیە لێکچواندن، بەلازیز گولەکە کو ل دەستپێکا بهارێ خویا دبیت. هەرچەندە کو شاعر شیایە ب ڕێکا مفا وەرگرتن ژ ژینگەها خۆ وێنەیەکێ نوی پێشکێش بکەت لێ هەول نەدایە ڤێ لێکچواندنێ وەکو خواستنەکا نوی بکار بینیت. نەریتێن شعرا کلاسیکی ڤێ دەلیڤێ نادەنە شاعری، چونکە دبیتە ئەگەرێ لێلی و نەروهنیێ، لەوما پرانیا جاران شاعرێ کورد سەرەرای پێشکێشکرنا لێکچواندنێن نوی بوێرییا پێشکێشکرنا خواستنێن نوی نینە.

### ٣.٢.١.٠٣. سنووردارِبوونا وێنەیێن مەجازی و بەدیعی:

لایەنگریکرن و پشتبەستنا شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بۆ لێکچواندن و ڕوونبێژیێ، گومانێ دئێخیتە سەر ڤێ چەندێ کو رەخنەیا عەرەبی- ئیسلامی بشێت خزمەتا مەجاز و زمانێ مەجازی بکەت، چونکە (مەجاز پەیڤان ژ سنوورێ وان یێ ڕاستەقینە دردئێخیت، ئەو پەیوەندییێن کو مەجاز د ناڤبەرا ڕاستی و واقعیدا سازدکەت پەیوەندییێن شیمانەیینە (احتمالی)، دبنە ئەگەرێ فرەواتایێ و د ئەنجامدا جیاوازییا تێگەهشتنێ دروست دکەن، هەر ئەڤە ژی دبیتە ئەگەرێ سەرهلدانا بۆچوون و هەلسەنگاندنێن جودا؛ ل ڤێرێ مەجاز بەرسڤا داویێ نادەت، چونکە ئەو ب خۆ بیاڤەکە بۆ هەڤدژیێن واتایی، ب ڤی ڕەنگی مەجاز ب بەردەوامی فاکتەرەکە بۆ ئافراندنا پرسیاران و دبیتە ژێدەرێ نیگەرانی و پەریشانییا وێ مەعریفەیا کو دڤێتن ڤەبڕ و باوردارانە بیت (یقینی)... سیستەمێ معرفیێ ئاینی وەسا مەجازێ ددەتە نیاسین کو بریتیە ژ دوورکەفتن ژ واتایا بەرنیاسا پەیڤان و ب ڤی ڕەنگی بریتیە ژ لادانا پەیڤان ژ جهێ وان، ئەڤ لادانە ژی دبیتە ئەگەرێ ئالۆزییا واتا و زمانی چونکە بەدگومانی و تشتێن هەلە بەرهەم دهینیت، نەمازە کو ئەو د ڤێ باوەرییێدانە کو هەر پەیڤەك ژلایێ خودێڤە هاتیەدانان؛ داکو دەربڕینێ ژ واتایەکا تایبەتی بکەت و ڤەگۆهاستنا وان؛ واتە تێکدانا وان ڕاستییێن کو خودێ دڤێت ئەم ل وان بگەهین، لەوما یا دروست ئەوە کو د بکارهینانێدا هەر پەیڤەك بۆ واتا خۆ یا دروست بهێتە بکارهینان و یا هەلە ژی ئەوە کو پەیڤان بۆ واتاییێن کو بۆ نەهاتینە دانان بکاربینین. ئاشکرایە کو ئەڤ ئاخفتنە نە ب تنێ بریتیە ژ پەکخستنا مەجازێ بەلکو بریتیە ژ ژکارخستنا شعرێ ژی)[٩٥].

ئەڤ تێگەهشتنە ژی بەرهەمێ هەڤسیاتی و پێکڤەژیانا شعرێ لگەل تێکستێن ئایینی د ڕۆشنبیرییا ئیسلامیدایە، تەنانەت فەیلەسوفێن ئیسلامی ژی بزاڤێن (ئاشۆپی کو گرنگیێ نادەنە دویراتییا د ناڤبەرا تشتاندا ب ناپەسەند و نەویست ل قەلەمداینە و د ئەنجامدا ل دەڤ وان لێکچواندن ب باشتر ژ مەجازێ هاتیە زانین و د ناڤ هەمی

جۆرێن مەجازێدا ژی گرنگیدانینە خواستنێ چونکە ب دیتنا وان خواستن لسەر بناغەیێ لێکچواندنێ دروست دبیت، هەر ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو هەولبدەن خواستنێ د چارچووڤێ تاکە پەیوەندیەکێ کو پەیوەندییا لێکچواندنا لۆژیکییە سنووردارکەن.) (٩٦)

ب کورتی گرنگیدانا ڕەخنەگرێن کەڤن ب لێکچواندن و خواستنێ ژبەر وێ ڕۆهنی و بەرهەستبوونێیە کو د ڤان وێنەیان دا دهێتە دیتن، هەر وەکو مە بەری نوکە ئاماژەپێدای د ستوونا شعرا عەرەبیدا گرنگی ب ڤان هونەران هاتیەدان و نێزیکی د ناڤبەرا هەر دوو لایەنان د لێکچواندن و خواستنێدا ب مەرج هاتیە زانین. نهو ژی د ڕوونبێژییێدا لێکچواندن بەری هەمی هونەرێن دی دهێتە خواندن، چونکە د پۆلینکرنێن وان دا لێکچواندن ناچیتە چارچووڤێ مەجازیدا. گرنگیدانا وان بۆ خواستنێ ژی هەر پەیوەستە ب لێکچواندنێڤە و خوازیارن کو ژ شۆپا لێکچواندنێ دەرنەکەڤیت، (وان سنوور بۆ خواستنێ دانانە و هندەك زانا د ڤێ باوەرییێدا بووینە کو خواستن ب تنێ بۆ زێدەرۆیێ دهێتە بکارهینان و ژ سنوورێ ڕاستیێ دەرناکەڤیت. ئەو خوازیارن کو سنوورێن خواستنێ بهێتە پاراستن، و شاعر هند دویر نەچن کو لێلی بکەڤیتە د واتاییێدا و هند نێزیک ژی نەبن کو ببیتە ڕاستی، پێدڤیە شاعر ڕێبازەکا ناڤین بۆ خۆ هەلبژێرن، ئەڤ ئاریشە ژی بەرهەمێ تێکەهشتنا وان بۆ شعرێیە...)(٩٧)

لاساییکرنا شاعرێن بەرێ و فشارا عەقلانییەتا رەخنەیا ئەدەبی کو پتر د خزمەتا ئامانجێن ئایینی و گوتارێدا بوو، بوونە ئەگەر کو د شعرێدا پشتبەستنەکا زێدە لسەر لێکچواندنێن ماتریالی و خواستنێن پەیوەست ب لێکچواندنانڤە بهێتە کرن و ئەڤ هونەرە زالبن بسەر وێنەیێن شعرا کلاسیکی و ئێدی ئەڤ شێوازە ب توندی بهێتە پێرەوکرن و چەسپاندن و ڕەخنە ژ هەر کەسەکی بهێتەگرتن کو هەولا گۆهرینا ڤی سیستەمی بدەت لەوما ئەم دشێین بێژین (شاعرێ جاهلی د پێکهینانا وێنەیاندا پشتبەستن لسەر شیانێن خۆ یێن خوەزایی دکر و تا ڕادەیەك ئازاد بوو، لێ شاعرێ ئیسلامی دەمێ کاریگەرییا عەقلی

قەبارەکێ مەزن ژ ئەزموونا وی خستییە ژێرکاریگەرییا خۆ ب هندەك قەید و بەندانڤە هاتەگرێدان کو لسەردەمێ جاهلی نەبوون. شاعرێ ئیسلامی ل ژێر کاریگەرییا درستییا واتایێ بەرەڤ هندەك مسوگەرییێن هزرییێن گشتیڤە چوو، واتە ملکەچی جۆرە ڕێککەفتن یان نەریت یان تێگەهشتنەکا هەڤپشک بوویە و ئێدی دەستێن وی بۆ داهێنانێ مینا شاعرێ جاهلی ڤەکری نەبوویە).[٩٨]

هەر د ئێکەمین هەولا کو هاتیە دان بۆ دەستکاریکرنا سیستەمێ وێنەییێ شعرا عەرەبی، ڕەخنەگران ب توندی هەولویستێ خۆ نیشاندایە و هێرشکریە سەر وان شاعرێن کو ژ ڤی سیستەمی دەرکەفتین، نە ژبەر ڤێ چەندێ کو پشتا خۆ داینە لێکچواندن یان خواستنێ، بەلکو ژبەر ڤێ چەندێ کو ڕۆهنی و ئاشکرایا پێدڤی د ڤان وێنەیاندا نەبووینە. (ئامەدی دەمێ ڕەخنەیێ ژ (ابی تەمام)ی دگریت ئاماژەیێ ددەتە دروستنەبوونا خواستنێن وی، بۆ نموونە دبێژیت چەوا چێدبیت ستایشکرنێ دەست هەبن یان دەم بەلەك یانکو دوو ڕەنگ بیت، ڕۆژگارێ زارۆك هەبن، شعر خودان گەری و زمان بیت، باشی جار موسلمانە و جار ژرێدەرچووی بیت، شکۆمەندی بترسیت و خودان لەش و جەرگ بیت، ئێمناهی ببیتە خودان نڤینک، و ڕۆژگار خودان پشت بیت و....هتد)[٩٩]. ئەڤ ڕەخنەیە ب خۆ نیشانا ڕەتکرنا پەیوەندییێن مەجازییێن ئالۆزێن وەکو مرۆڤگەرایی و خواستنا ڤەشارتیە د ڕەخنە و ڤەکۆلینێن شعرییێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدایە، هەر چەندە کو د روونبێژییێدا ل ژێر ناڤێ خواستنا ڤەشارتی ئاماژە ب ڤان جۆرە مەجازان هاتیەدان، لێ هەول هاتیەدان کو ئەڤ جۆرە مەجازە ژی د چارچووڤێ لێکچواندنێدا بهێنە سنووردارکرن، لێ ئەڤ مەجازە ژبلی پەیوەندیەکا لێکچواندنی، پەیوەندیەکا مەجازی و جارنا لێکچواندنەکا لڤۆك کو دکاریدا هەیە ب خۆڤە دگرن[١٠٠] و دبنە ئەگەرێ دروستبوونا جۆرە ئالۆزییەکێ د واتایا شعرێدا.

کەواتە مەجاز د شعر و ڕەخنەیا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی تشتەکێ سنووردارە و لگەل چەمکێ ڕاستەقینەیێ مەجازا شعری ناگونجیت، بەلکو پتر ئەو مەجازە کو د گوتاراندا دهێتە بکارهینان، لێکچواندن و خواستنێن نێزیک و

ئاشكرا و عقلانی ڤی زمانێ مەجازی پێك دهینن. ئەڤە ب خۆ جۆرە ترسەكێ لدەڤ شاعری پەیدا دكەت چونكە مەترسییا ڤێ چەندێ هەیە كو ئەو ب رێكا پێشكێشكرنا لێكچواندن یان مەجازەكێ نوی سیستەمێ عەقلانی و ماتریالییا وێنەی تێك بدەت لەوما شاعر نەچارە یان ب رێكا هزركرنەكا هویر و لۆژیكی وێنەیەكێ لێكچواندنیێ نوی پێشكێش بكەت یان رێكەكا ب ساناهیتر هەلبژێریت واتە ب دووبارەكرنا لێكچواندن و خواستن و مەجازێن شاعرێن بەری خۆ رابیت.

ئەگەر حەزا رۆهنی و ئاشكراییا زال لسەر قەسیدەیێ و نێرینا عەقلانییا رەخنە و رەوانبێژییا عەرەبی و ترس خۆپاراستنا رۆشنبیرییا ئیسلامی ژ مەجازێن ئالۆز؛ بوویتە ئەگەر كو شاعرێن كلاسیكی پشتبەستنێ لسەر پەیوەندییێن لێكچواندنییێن ئاشكرا بكەن و وەكو پێدڤی مفای ژ جۆرێن دیێن مەجازێ وەرنەگرن؛ پێرەویكرن ژ ئەدگارێن لاساییكرییێن شعرا كلاسیكییا رۆژهەلاتا ئیسلامی ژی دبیتە ئەگەر كو د پرانیا شعراندا پتر لێكچواندن و پشتی لێكچواندنێ خواستنا ئاشكرا بهێنەدیتن و خواستنا ڤەشارتی و جۆرێن دیێن وێنەیێن مەجازی و هەر وەسا وێنەیێن بەدیعی یانكو ئەوێن ب جوانكارییا واتایی دهێنە نیاسین ب رێژەیەكا كێمتر بهێنە بكارئینان.

بەری هەر تشتەكی پرانیا ئەو مەجازێن كو د رەوانبێژییێدا ب مەجازێن (سەربەست) دهێنە نیاسین؛ دبنەرەتدا بەشەكن ژ مەجازێن زمانی و گەلەك سادەنە، واتە یان مەجازێن باوێن ئاخفتنا رۆژانەنە یان زۆر سواوەنە یان گەلەك رۆهنن و لێلیەكا وەسا دروست ناكەن. مولینو (Molino) و تایمن (Tamine) د پەرتووكا (دەروازەیەك بۆ شرۆڤەكرنا زمانڤانییا شعرێ)دا رەخنەیێ ژ مەجازێ سەربەست دگرن، ب دیتنا وان ئەڤە وێنەیێن رەوانبێژییێن راستەقینە نینن، چونكە گەلەك سادەنە و گەلەك ب ساناهی ژ لایێ وەرگریڤە دهێنە وەرگرتن و دەستنیشان كرن)[١٠١]:

حـــازر ســتيێ نگـيـن دەرئــانى

دا دەستىێ عەجوزەيا زەمــانى...(خانى(مەم و زين)، پشكا ئێكێ، ل٤٥٥)

دبيـێن خــاوەرپــەرســتــى تـو نــزانن مـن د كــەشفێدا

نومـاين من د شەرقێ نازكا گەردەن شەمال ئـەبرۆ...(جزيرى(ديوان)،ل٤٠٤)

ل دێرا ئێكێ پەيڤا (نگين) مەجازەكێ سەرەبەستە، ل جهێ گوستيلێ باسێ نگين واتە ئەو قاش يان بەرێ گرانبهايێ سەر گوستيلێ هاتيەكرن. ل دێرا دوويێ ژى (خاوەر) يانكو رۆژهەلات مەجازەكێ سەربەستە و مەبەست پێ رۆژ يانكو خۆرە. ئەڤ پەيوەنديە پەيوەندييێن ئاشكرانە، د زمان و ئەدەبياتا فارسيدا ب بەرفرەهى هاتينە بكارئينان، ژبلى هندێ كو سواوەنە چ بهايەكێ وێنەيێ وەسا ژى نينن. گەلەك جاران زمانێ رۆژانە و زمانێ شعرى هەڤپشكن د بكارئينانا ڤان جۆرە مەجازان و ئەگەرێ گرنگيدانا زێدەيا زانايێن رەوانبێژيێ ب ڤان جۆرە مەجازان پتر بۆ هەبوونا وان د قورئانێدا دزڤريت، واتە مەزنكرنا قەبارا دويڤچوون و ڤەكۆلينا ڤان جۆرە پەيوەندييان د زمانێ شعرێدا پتر بەرهەمێ لاساييكرنا رەخنە و رەوانبێژييا عەرەبى ـ ئيسلامييا كەڤنە.

ئێك ژ گرنگترين جۆرێن مەجازى كو رۆلەكێ مەزن و كاريگەر د لادان و گەمەيا زمانيدا هەيە، ئەو مەجازن كو د چارچووڤێ وان خواستناندا دهێنە ديتن كو ب خواستنێن ڤەشارتى دهێنە نياسين. وەكى مە بەرى نوكە ئاماژە پێداى عەقلييەتا زەلالخوازا زانايێن رەوانبێژيێ هەولدايە ڤان مەجازان ژى د چارچووڤێ لێكچواندنێدا سنووردار بكەت.

پرانيا جاران ئەڤ وێنەيە سەرەراى هندێ كو هەلگرێ لێكچواندنەكا ڤەشارتينە، جۆرە لێكچواندن يان مەجازەكى ژى بخۆڤە دگرن كو لسەر بناغەيێ لێكچواندنا باو و پەيوەندييێن مەجازێ سەربەست ناهێنە پێشكێشكرن.(١٠٢) ئەڤ جۆرە مەجازە دشێن ئالۆزيێ دروست بكەن و ناسنامەيا رووبێژييا عەرەبى ـ ئيسلامى بێخنە بەر مەترسيێ. وێنەيێن ب ڤى رەنگى دبنە ئەگەرێ تێكدانا پەيوەندييێن

سروشتی و لۆژیکی؛ ئەدگار و کارێن مرۆڤ یان گیانەوەران دهێنەدان بال تشتێ نەزیندی یان چەمکێن مەعنەوی، هەر وەسا چێدبیت تایبەتمەندیێن دیاردەیێن سروشتی و تشتێن نەزیندی بهێنە دان بال مرۆڤ و گیاندارێن دی، یان چێدبیت ئەدگار و کردەوەیێن گیانەوەران بهێنە دان بال مرۆڤانڤە، ژبلی ڤێ چەندێ چێدبیت چەندین جۆرێن دیێن پەیوەندییان ژی هەبن، لێ ئەو تشتێ کو پرانیا جاران د شعرا کلاسیکییا کوردیدا، وەکو بەشەك ژ شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی دهێتە دیتن سواوەبوونا ڤان وێنەیان و پەیوەستبوونا وان ب ئاراستەیا مرۆڤگەراییێ و پتر بکارهینانا وان د هندەك مەبەستێن دیارکریدایە.

ئێك ژ ڤان جۆرە وێنەیان ل وی دەمی دروست دبیت کو ناڤەك ب ئاوایەکێ نەلۆژیکی ببیتە تەواوکەرێ ناڤەکێ دی یان کارەك بهێتە دان بال ناڤەکی کو ئەو کار لگەل سروشتێ وی ناڤی نەگونجیت. دەمێ وێنە ب تنێ بەرهەمێ دانەپالا ناڤەکی بۆ ناڤەکێ دی بیت لێکچواندن و مەجازەك دروست دبن و دەمێ کارەك بهێتە دان بال ناڤەکی دوو پەیوەندییێن ئالۆز کو پتر دچنە چارچووڤێ لێکچواندنێ خۆیا دبن. زۆربەی ڤان وێنەیان دووبارەکرینە و ب وێنەیێن باو د شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی دهێنە هژمارتن:

أ. دانەپالا نەلۆژیکییا ناڤەکی بۆ ناڤەکێ دی (لێچو+ بەشەك یان ئێك ژ پێویستییێن لەوچوی): هەرچەندە کو ئەڤ جۆرە وێنەیە دکارن ئالۆزی و لێلیێ بیخنە زمانێ شعرێ و وێنەیێن ناوێزە دروست بکەن، لێ وەکو خویایە بکارهینانا بێ قەید و بەندا ڤان جۆرە وێنەیان لگەل گیانێ زەلاخوازێ شعرا لاساییکرییا رۆژهەلاتا ئیسلامی ناگونجیت، لەوما ئەو تشتێ کو پتر د شعرا کلاسیکییا کوردیدا دهێتە دیتن لاسایبوون و سواوە بوونا وانە:

دەستێ قودرەت کو هەلاڤێت ژ بەژنا تە نیـقـاب

ل جەمالا جەبەرووتێ مە نەمان پەردە حیجـاب...(جزیری (دیوان)، ل٦٢)

ل ڤێرێ قودرەت هاتیە لێکچواندن ب مرۆڤی چونکە دەست ئەندامەکێ لەشێ مرۆڤیە، د هەمان دەمدا پەیڤا (دەست)ە کو ب واتایا خۆ یا فەرهەنگی نەهاتیە بکارهینان، لەوما مەجازەکە کو لسەر بناغەیێ پەیوەندییێن لێکچواندنێ یان پەیوەندییێن مەجازێ سەریەست دروست نەبوویە، لێ لگەل هندێ وێنەیەکێ سواوەیە کو گەلەك جاران د شعرا کلاسیکیدا هاتیە بکارهینان (دەستێ قەزا، دەستێ عەشقێ، دەستێ رۆژگارێ..)(*).

ساقی وەرە رەنگین کە بە پەنجە لەبی ئەقـداح

بەم راحە، لەسەر راحە، دەلێن: راحەتی ئــەرواح...(نالی (دیوان)، ل١٧٠)

ل ڤێرێ ژی قەدەح ب مرۆڤی هاتیە لێکچواندن و لادان د پەیڤا (لەب)دا هەیە، یانکو (لەب) مەجازە، لێ مەجازەکێ بەربەلاڤە کو گەلەك جاران هاتیە بکارهینان و بەشەکە ژ ئاخفتنا رۆژانە و ب وێنەیەکێ داهێنەرانە ناهێتە هژمارتن.(**)

ب. دانەپالا نەلۆژیکییا کارەکی بۆ ناڤەکی:ئەڤ جۆرە پەیوەندیە دشێن وێنەیێن جوان و بالکێش پێشکێش بکەن، وێنەیێن وەها کو پرانیا جاران دوو پەیوەندییێن لێکچواندنییێن ڤەشارتی بخۆڤەدگرن کو پێکڤە وێنەیەکێ لڤوك پێشکێش دکەن، د شعرا کلاسیکییا کوردیدا وێنەیێن ب ڤی رەنگی هەنە کو پرانیا جاران رۆهن و سواوەنە:

تـا نـەگــریـا ئاسـمـــان و تـەم ولاتـی دانـەگـرت

گــول چەمەن ئارا نەبوو هەم لێوی غونچە وا نەبــوو...(نالی (دیوان)، ل٣٨٢)(***)

ئاسمان ب مرۆڤەکی هاتیە لێکچواندن چونکە گری سیفەتێ مرۆڤانە لێ لادان د پەیڤا (ئاسمان)یدا نینە بەلکو د کارێ (گریان)ێدایە، لسەر بناغەیێ لێکچواندنێ (گریان ل جهێ بارین)ێ هاتیە بکارهینان، ب شێوەیەکێ گشتی

دیمەنێ بارینا بارانێ ژ هەوران ب بارینا ڕۆندکان ژ چاڤێن مرۆڤی هاتیە لێکچواندن، یانکو ل ڤێرێ دوو خواستن هاتینە بکارهینان.

سەحەرگەهـ عەندەلیب مەستن ژ بێهنا وەرد و بشکۆژان
شوبە توتاک و گۆیینان دنالین ئەم د فرقێ دا...(جزیری (دیوان)، ل٤٥)

مەستبوون هاتیە دان بال عەندەلیبان(*)، ب ڤی ڕەنگە عەندەلیب ب مرۆڤی هاتیە لێکچواندن، مەستبوون ژی ل جهێ حالەتێ عەندەلیبان هاتیە بکارهینان کو بریتیە ژ ئەو ئەو جۆش و خرۆشا کو بلبل ل دەمێ چراندنا ئاوازان ژ خۆ نیشان ددەت. ب شێوەیەکێ گشتی وێنەیێ بلبلان کو ب گەرم و گۆڕی مژویلی چراندنا ئاوازێن خۆنە ب مرۆڤەکێ مەست هاتیە لێکچواندن کو های ل خۆ نینە.

ژبلی لاسایی بوون و سواوەبوونا زۆربەی ڤان وێنەیان، ئەڤ جۆرە وێنەیە ب ئاوایەکێ سنووردار ژی دهێنەبکارئینان، واتە ئاراستەیا زال مرۆڤگەراییە و پرانیا جۆرێن دیێن پەیوەندیێ کێمتر دهێنە دیتن، پرانیا جاران ژی ل هندەك جهێن دیارکری ب تایبەت وەسفا سروشتی دهێنەدیتن:

لیمۆ قەدەح لە چاوی ترنجە کە نۆشی کرد
بەدمەست و سەرکەشە بەشی خورما نەمایەوە
هەنگامی وەسڵە پەڕ و مینا بە یەك ئەگەن
پەردەی زەفافە قەوس و قەزەح ڕاکشایەوە
گەردن کەچە وەنەوشە لە زەنبەق و سەلام ئەکا
نیلوفەرە ب قەهقەهە لێوی کرایەوە...(حەمدی (دیوان)، ل٤٢)

دەستی چناری ڕووت، سەری شاخ، لێوی گول
ڕازانەوە ب خەلعەتی دیبا و بەرگ و تووك...(نالی (دیوان)، ٢٦٦)

کانی دەزێن بە ئاو و درەخت ئاوسن بەبا
شایی بەهارە بولبولە داماد و غونچە تووك...(نالی (دیوان)، ل٢٦٧)

مرۆڤگەرایی د وێنەیێن وەکو (چاوی ترنجە، لیمۆ قەدەح نۆشی کرد، بەد مەستی خورما، بە یەککەیشتنی پەڕ و مینا، گەردەن کەچە وەنەوشە، سەلامکردنی وەنەوشە، قەهقەهەی و لێوی نیلوفەر، دەستی چنار، سەری شاخ، لێوی گولێ، کانی دەزێن، ئاوسبوونی درەخت) دیارە. تەڤایا ڤان وێنەیان کو پەیوەستن ب وەسفا سروشتی لدویف نەریتێ شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی لسەر بناغەیێ مرۆڤگەراییێ واتە سازکرنا پەیوەندیێ دناڤبەرا دیاردەیێن سروشتی و ڕەفتار و ئەدگارێن مرۆڤی هاتینە پێشکێشکرن.ئەڤ جۆرە وێنەیە ل بابەت و مەبەستێن دی ل هەمبەر لێکچواندن و خواستنان گەلەك کێمتر دهێنە بکارئینان.

نهۆ دشێین بێژین بوێرییا شاعران د پێشکێشکرنا وێنەیێن نوییێن ب ڤی رەنگی پێنگاڤەکا گرنگە بۆ رزگار بوون ژ ئەدگارێن لاساییکرییێن وێنەیێ شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی. دەمێ شاعر پشتا خۆ ددەتە نەریتێن شعرییێن باو و پیڤەرێن روونبێژییا عەرەبی ـ ئیسلامی؛ دشێت ب رێکا ڤان جۆرە مەجازان وێنەیێن نوی پێشکێش بکەت. ئەم دشێین ئەو نموونەیێن دەگمەنێن شعرا کلاسیکییا کوردی کو پتر بەرهەمێ کاریگەرییا سۆفیگەرییێنە ب وێنەیێن نوی و داهێنەرانە د شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی ل قەلەم بدەین:

بە نووری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نـەکەم، چ بکـــەم؟
بـە شـــەمعێکی وەهـا چاری شەوێکی وا نەکـــەم چ بکـەم؟...(مەحوی (دیوان)، ل٣٠٥)

(نووری بادە) و (زوڵمەتی تەقوا) دوو وێنەیێن مەجازینە کو پرانیا ڕێکارێن ڕەوانبێژی و رەخنەیا عەرەبی ـ ئیسلامی نەشێن ئیستاتیکا و جوانییا وان بەرجستە بکەن، ڕەنگە هندەك د ڤێ باوەرییێدا بن کو بادە ب نووریێ و تەقوا ب تاریاتییێ هاتینە لێکچواندن لێ ئەڤە لگەل لێکچواندنا باو د شعرا کلاسیکیدا ناگونجیت، چونکە ڕوویێ لێکچواندنێ د ناڤبەرا (تەقوا و نوور) و (بادە و زوڵمەتێ) دا هەیە، شاعری ب خۆ ل نیڤە دێرا دوویێ (نووری بادە) ب شەمالکێ و زوڵمەتی تەقوا ب شەڤێ وەکهەڤ کریە ؛ ئەڤە ژی ئاماژەیە بۆ ڤێ چەندێ کو د (نووری بادە)دا بادە ب شەمالکێ

هاتیە لێکچواندن و د (زولمەتی تەقوا)دا تەقوا ب شەڤێ هاتیە لێکچواندن، یانکو د هەر دوو دەربڕینان دا خواستنەکا ڤەشارتی هەیە لێ لادانا ڕاستەقینە د پەیڤێن نور و زولمەتێدا هەیە. ئەڤ دوو پەیڤە مەجازینە لێ مەجازەك کو ب ڕێکا شرۆڤەکرنا پەیوەندییا لێکچواندنییا ئاشکرا ناهێتە ڕۆهنڤەکرن، مەجازەك کو لێلی و نەروهنیێ دئێخیتە واتایێ و ڕۆلێ خواندەڤانی چالاك دکەت و دەرگەهێ ڕاڤەکرنێ ڤەدکەت. ڕەنگە جۆرە وەرگرتن یان لاساییکرنەك د ڤان وێنەیاناندا ژی هەبیت لێ نکۆلی ل هندێ ناهێتە کرن کو ئەڤ وێنەیە ڕۆهنی و ئاشکرایی و ماتریالیبوونا شعرا لاساییکرییا رۆژهەلاتا ئیسلامی پێشێل دکەن و شعرێ بەرەڤ ئاراستەیەکا نوی دبەن.

د شعرا کلاسیکییا کوردیدا (مەولەوی ) ڕۆلەکێ مەزن د پیپێشکێشکرنا وێنەیێن مەجازییێن ب ڤی ئاوایی هەیە، (مەولەوی) بوێرانە سەرەدەرییێ لگەل زمانی دکەت و کۆمەکا وێنەیێن مەجازی پێشکێش دکەت کو نموونەیا وان نە ب تنێ د شعرا کلاسیکییا کوردی بەلکو د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا ژی کێمن. ئەو ب تنێ پشتبەستنێ لسەر مرۆڤگەراییەکا سواوە و پەیوەست ب هندەك مەبەستێن دیارکری ناکەت، بەلکو مرۆڤگەرایی د شعرێن ویدا وێنەیێن نوی و داهێنەرانە بەرهەم دهینیت:

تەوقی خەم گەردەن شــەوقەکــەم بەستەن

کــەفــی پــای شــادیم خــار تێ شکــەستــەن...(مەولەوی (دیوان)، ل٢١٦)

مرۆڤگەراییەکا بهێز د ڤێ دێرێدا هەیە، شەوق خودان گەردەنە و شادی ژی خودان پێیە، پێیەك کو ئستریيەك تێرا چوویە و تێدا شکەستییە، شادی و شەوق ب مرۆڤەکی هاتینە لێکچواندن، پەیڤێن گەردەن و شەوق ژی مەجازن، مەولەوی شیایە ب ڕێکا مرۆڤگەراییێ دەربڕینێ ژ خەم و ژانێن خۆ بکەت ئەڤە ل وی دەمی کو پرانیا جاران د شعرا کاریگەر ب شعریەتا قەسیدەیێ بۆ دەربڕینا خەم و خەفەتان مفا ژ لێکچواندن و خواستنان دهێتە وەرگرتن. هندەك جاران لدەڤ مەولەوی چ سنوور بۆ پەیوەندییێن مەجازییێن ب ڤی ڕەنگی ناهێتە دیتن:

مە تەرسۆ جە حیفز تەقریری ئەحوال
سۆچۆ خەزانەی خەیالی شەمال...(مەولەوی (دیوان)، ل٤٢)

ئەگەر تەماشەی دەربڕینا (خەزانەی خەیالی شەمال) بکەین دێ ڕووبەرووی وێنەیەکی بین کو نموونەیا وێ د شعرا کلاسیکییا کاریگەر ب قەسیدە و غەرەلا کەڤن گەلەك دەگمەنە، ل ڤێرێ دوو خستنەسەرێن نەلۆژیکی دهێنە دیتن، یا ئێکێ خەیال بوویە خودان کۆگا و پاشی شەمالک ژی بوویە خودان خەیال، واتە تشتەکێ مەعنەوی هاتیە لێکچواندن ب تشتەکێ ماددی (ماددەگەرایی) و تشتەکێ نە زیندی ژی هاتیە لێکچواندن ب مرۆڤی (مرۆڤگەرایی)، وێنەیێ مەجازی وێنەیەکێ لێلە و عەقلییەتا ڕەوانبێژیێ نەشێت وێ شرۆڤە بکەت. مفاوەرگرتن ژ مەجاز و پەیوەندییێن جیاواز و هەبوونا بوێرییا داهێنان و نویکرنا وێنەیی بوویە ئەگەر کو شاعر بشێت وێنەیێن وەسا پێشکێش بکەت کو دەربڕینا وان ب ڕێکا پەیوەندییێن لێکچواندنی و باوێن شعرا کلاسیکی گەلەك ب زەحمەتە:

باوەشین مەکەرد ئەو سەفحەی بێ گەرد
نازکیش جە باد ئیحتیات مەکەرد...(مەولەوی (دیوان)ل٢١٥)

د نیڤەدێرا ئێکێدا (سەفحە) خواستنەکا ئاشکرایە، مەبەست ڕوویێ یارێیە، د شعرا کلاسیکیدا گەلەك جاران ڕوویێ یارێ ب لاپەرا سپی هاتیە لێکچواندن لێ د دێرا دوویێ وێنەیەکێ دەگمەن هەیە کو بەرهەمێ مرۆڤگەرایییە، نازکی ب مرۆڤ یان گیاندارەکی هاتیە لێکچواندن کو خۆ ژ بایێ باوەشینکێ د پارێزیت، چونکە هند نازکە کو ڕەنگە ئەڤ بایە زیانێ بگەهینیتێ، ڕەنگە ئەو چێژا کو د نیڤەدێرا دوویێدا دهێتە دیتن د نیڤەدێرا ئێکێدا نەبیت، دەستنیشانکرنا پەیوەندییێن لێکچواندنییێن نیڤەدێرا ئێکێ گەلەك ب ساناهییە، لێ بەرجستەکرنا پەیوەندییێن مەجازییێن نیڤەدێرا دوویێ کارەکێ ساناهی نینە.

ژبلی ڤان وێنەیان کۆمەکا وێنەیێن دی ژی د شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا دهێنە دیتن کو پرانیا وان پەیوەستن ب هونەرێن جوانکارییا واتاییڤە، وەکو (جوانی بایس، موبالەغە، دژیەك، توانج پۆشی..). ئەڤ وێنەیە د رەوانبێژییا عەرەبی ـ ئیسلامیدا د چارچووڤێ وان هونەراندا هاتینە پۆلینکرن کو ل سەردەمێ عەباسیان و پشتی هنگی باوبووینە، ب جوانکاری هاتینە نیاسین و ژ هونەرێن رەوانبێژیێ هاتینە جوداکرن، هەر وەسا ب تەکەلوف و سنعەتکارییڤە هاتینەگرێدان؛ هەر ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو پەنابرن بۆ ڤان جۆرە وێنەیان و بکارئینانا وان د ئاستێ بکارئینانا وێنەییێن رەوانبێژییێدا نەبیت. ئەو سەرەدەرییا کو زانایێن رەوانبێژیێ لگەل ڤان وێنەیان دکەن دبیتە ئەگەر کو مەجازەکێ سەربەستێ سواوە کو چێدبیت چ بهایەکێ وێنەیی ژی نەبیت؛ ب گرنگتر و ب نرختر ژ وێنەیەکێ داهێنەرانەیێ پەیوەست ب جوانکارییا واتاییڤە بهێتە زانین. نهۆ پێویستە ئەم ب نێرینەکا نوی تەماشەی ڤان وێنەیان بکەین و خۆ ژ بریار و چێژا لاساییکرییا رەوانبێژییا عەرەبی ـ ئیسلامی رزگاربکەین و ئەو پێنگاڤێن داهێنەرانەییێن کو شاعرێن کورد د ڤی بواریدا هاڤێتین ب وینەییێن نزم و پلە دوو ل قەلەم نەدەین:

بۆی عەنبەر نە تۆی دەماخم دوورکەرد

فرسەتش ئاوەرد هەوای وەبای دەرد...(مەولەوی (دیوان)، ل٧٥)

ل ڤێرێ د پەیڤا (عەنبەر)دا توانج پۆشی یان ئیهام هەیە، پەیڤا عەنبەر ژبلی واتا خۆیا فەرهەنگی یان واتا خۆیا مەجازی (زولف)، ئاماژەیێ ددەتە ناڤێ (عەنبەر خاتوون)، هەڤژینا مەولەوی، ئەڤە ب تنێ گەمەیەکا ووشەیی نینە بەلکو وێنەیەکی ژی پێشکێش دکەت لێ وێنەیەك کو ئالۆزی تێدایە و مرۆڤ نەشێت بریارەکا ڤەبر سەبارەت ب مەبەستا شاعری بدەت، ئەڤە ژی ئەو تشتە کو دژی زەلالخوازییا رەوانبێژی و شعریەتا قەسیدەییێیە.

هەلیدا زولفی چەوگانی کورەی خورشیدی دا بەر شـەق

کە دایدا چی مەلایک بوو لە گەردوون هاتە سەر ئەرزی...حاجی (دیوان)،ل١٦٥)

پرانیا وێنەیێن کول ڤێ دێرێ دهێنە دیتن بەرهەمێ موبالەغە یان زێدەرۆیییێنە، لێ نە زێدەرۆییا کو روونبێژییا عەرەبی ـ ئیسلامی پشتەڤانییا وێ دکەت، واتە ئەڤە زێدەرۆیی ب رێکا بکارهینانا هونەرێن روونبێژیێ نینە، بەلکو زێدەرۆییەکە بێ بکارهینانا لێکچواندن و خواستنان. ئەڤ زێدەرۆییە مینا وان زێدرۆییانە کو د ئەفسانە و داستانێن کەڤندا دهاتنە بکارهینان. زانایێن روونبێژیێ کو باوەری ب هەبوونا راستییا لۆژیکی د دێرا شعرێدا هەنە پشتەڤانییا ڤان جۆرە وێنەیان ناکەن. ل نیڤە دێرا ئێکێ  زولف ب چەوگانێ هاتیە لێکچوندن، ئەڤە وێنەیەکێ سواوەیە د شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا، لێ (کورەی خورشیدیدا  بەر شەق) و (هاتنا فریشتەیان بۆ سەر عەردی) موبالەغەیە.

ل گولێن تەی تەر و نازك کو سەخەر گرتی خـونـاڤ

د ئــەبــاریق و قــنـینان ژ حــەســـەد صـوهـتـی گـولاب...(جزیری (دیوان)، ل٦٢)

د نموونەیا  دوویێ ژی ژبلی مرۆڤگەراییێ (حەسەد وەکو سیفەتەکێ مرۆڤان هاتیە دان بال گولاڤێ)، جوانی بایس ژی هەیە، شاعر حەسیدیێ ب ئەگەرێ کەلینا کولاڤێ د (ئبریق) و (قەنین)ان دا ل قەلەم ددەت.

## ٣ . ١- ٢- ٤- فەرامۆشکرنا ڕۆلێ زمانێ ڕاستەقینە د ئافراندنا وێنەیان دا:

زمانێ مەجازی ڕۆلەکێ سەرەکی د ئاڤاکرنا وێنەیێن شعریدا دبینیت و زمانێ شعری ژ زمانێ ڕۆژانە جودا دکەت، لێ لگەل هندێ ژی ئەم نەشێین بێژین کو دەربڕینێن ڕاستەقینە یان حەقیقی چ جارا ئەدەبی نینن، بەلکو بەروڤاژی ڤێ چەندێ ئەم دشێین لسەر بناغەیێ وێ نائاشناکرنا کو (شکلوڤێسکی) باسکریە، جوانترین وێنەیان ب ڕێکا زمانێ ڕاستەقینە یانکو وەسفێن ڕاستەوخۆ پێشکێش بکەین، واتە (پێدڤی نینە هەمیشە پەیڤ و دەربڕین ـ هەر وەکو زانایێن ڕەوانبێژیێ خوازیارێن ڤێ چەندێنە ـ وێنەیەکێ ئەدەبیێ مەجازی پێشکێش بکەن، هندەك جاران پەیڤ و دەربڕین ڕاستینە و ب وێنەکرنا هونەرییا دیمەن یان هەلویستەکێ دەروونی ب ئاوایەکێ ڕاستگۆیانە ڕادبن و هەلگرێن خەیالەکا ب پیتن...لەوما وێنەیێ ئەدەبی د ڤەکۆلینێن نویدا گەلەك بەرفراوانترە ژ ڕەوانبێژیێ کو ب تنێ هاتیە سنووردارکرن ب لێکچواندن و خواستن و درکەیێ)[١٠٣].

(ئەرشیبالد مکلیش) ڕەخنەیێ ژ تێگەهشتنا باو بۆ وێنەی و جوانییا وێنەی دگریت، ئەو هندەك شعرێن چینی وەك نموونە دهینیت کو کۆمەکا وێنەیێن شعری د واندا هەنە کو لسەر بناغەیێ دەربڕینێن ڕاست چێبووینە و مەجازی نینن. ئەڤ وێنەیە دەربڕینێ ژ ئەزموونا شعرییا ڕاستەقینە دکەن و پێکڤەگرێداینە و کاریگەریەکا مەزن دئافرینن.[١٠٤] (ئەرشیبالد مکلیش) ئێکگرتنا وێنەیان ب ئامرازەکێ سەرەکی بۆ سازکرنا پەیوەندیێ د ناڤبەرا وان تشتێن کو چ پەیوەندی د ناڤبەرا وان دانینە ل قەلەم ددەت. پرانییا ڕەخنەگرێن ڕۆژئاڤایی ڤێ هێزێ ددەنە بال هێمایان و وەسا هزردکەن کو هێما یان سیمبۆل ب سازکرنا ڤێ پەیوەندیێ ڕادبیت بۆ نموونە دبێژن کو خواستن سەرەکیترین ئامرازە بۆ سازکرنا پەیوەندیێ د ناڤبەرا تشێن جیاواز و نەپەیوەندیدار دا. (ئەرشیبالد مکلیش) ڤێ ڕاستیێ نیشان ددەت کو د هندەك دەقێن شعرییێن ناڤدارادا سەرەرای هندێ کو پەیڤ بۆ واتا خۆ یا

ڕاستەقینە هاتینە بکارهینان لێ ئێکگرتنا وێنەیان و پەیوەستبوونا وان ب هەڤدوو بوویە ئەگەرێ بالکێش بوونا ڤان شعران.[(١٠٥)]

پێویستە ئەم پەیوەندییا بهێزا د ناڤبەرا وێنە و خەیالێ ژبیر نەکەین، ئەگەر خەیال بریتی بیت ژ (کۆمەکا سەرەدەرییێن ڕوونبێژی و مەجازی کو د شعرێدا دهێنە دیتن، وێنەی ژی ب واتایەکا پیچەك فراوانتر هەر دەربڕینەکا بەرجستە و دەستنیشانکری بخۆڤەدگریت، ڤێجا خۆ ئەگەر چ نیشانەیەك بۆ بکارهینانا مەجاز و لێکچواندنێ د ناڤ شعرێدا نەبیت، بۆ نموونە هندەك جاران هینانا سیفەتان بێ مفا وەرگرتن ژ مەجاز و لێکچواندنێ مۆرکەکێ خەیالی هەیە و دبیتە ئەگەرێ دروستبوونا وێنەی... ڕۆلێ وەسفێ دوێنەیدا هند گرنگە کو هندەك ژ ڤەکۆلەرێن هەڤچەرخ د ڤێ باوەرییێدانە کو گرنگییا وێ پترە ژ مەجاز و لێکچواندنێ، ئەو د ڤێ باوەرییێدانە کو باشترین ئامراز بۆ دەربڕینا وێنەیی هینانا سیفەتانە، تەنانەت وان مەجاز و لێکچواندن ب بتێن ڕەوانبێژییا ڕۆژهەلاتێ ناڤکریە، ژبەر ڤێ چەندێ گەلەك ژ فەیلەسوفێن ڕۆژئاڤایی و ژ وان (هیگل) ل هەمبەر شعرا ڕۆژهەلاتی و ئیسلامی ڕەشبین بووینە)[(١٠٦)].

ئەدگارێن شعرا جاهلی و سروشتێ کارێ زانایێن ڕەوانبێژیێ بوویە ئەگەر کو د ڕەوانبێژییێدا گرنگی ب جۆرە زمانەکێ مەجازیێ تایبەت بهێتەدان و ب مۆرکێ ڤەبڕێ شعرێ بهێتە ناساندن، هەتا وی ڕادەی کو دشێین بێژین (ڕەخنەیا ئەدەبییا عەرەبی ب تەمامی لسەر بناغەیێ هەڤبەرکرنا شعرێ لگەل وێنەی هاتیە ئاڤاکرن... ڤێجا چ لسەر شعرێ بهێتە پراکتیزەکرن یان بۆ شعرێ بهێتە ئاراستەکرن، ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو شعرا عەرەبی لدور چەمکێ لاسایکرنەکا بینراو و بەرهەست دا بهێتە سنووردارکرن)، لێ ب ڕاستی (زانایێن ڕەوانبێژیێ نەشێن بێژن کو زمانێ مەجازی زمانێ شعرێیە، چونکە ئەزموونێ یا سەلماندی کو شعرێن وەسا هەنە کو وێنەییێن مەجازی د واندا نەهاتینە بکارهینان، هەر وەسا ل دەرڤەی بیاڤێ شعرێ ژی زمانێ مەجازی دهێتە بکارهینان)[(١٠٧)]، واتە چەوا گرێدانا مەجازێ ب زمانێ شعری ب تنێ کارەکێ هەلەیە ب هەمان ئاوا دەرخستنا زمانێ ڕاستەقینە

ژی ژ چارچووڤێ شعرێ کارەکێ هەلەیە، یانکو ب کورتی (مەرج نینە کو وێنە ب رێکا پەیڤ و دەربڕینێن مەجازی بهێتە دروستکرن، چێدبیت هەمی دەربڕین ڕاست بن لێ لگەل هندێ ژی وێنەیەکێ هویر و خەیالەکا بهێز پێشکێش بکەن...)[١٠٨]

وەسف بابەتەکێ بەرفرەهە و وێنەیێن ڕوونبێژیێ ژی دخزمەتا وەسفێدانە لێ لگەل هندێ ژی ئەم نەشێین بێژین کو وەسف هەر لێکچواندنە. چێدبیت ئاخفتنا (ابن رشیق)ی دەربارەی وەسفێ تیشکەکا باش بێخیتە سەر پەیوەندییا د ناڤبەرا وەسف و لێکچواندنێدا، ئەو دبێژیت ((وەسف گونجاوە بۆ لێکچواندنێ و لێکچواندنێ ب خۆڤەدگریت، لێ وەسف لێکچواندن نینە))[١٠٩]. سەرەرای جیاوازبوونا وەسف و لێکچواندنێ لێ دیارە کو د رێرەوێ لاساییکرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی لێکچواندن بسەر وەسفێدا زال بوویە، یانکو ڕاستە کو (لدەڤ عەرەبان جیاوازی د ناڤبەرا ڤان دوو تشتاندا هەیە، وەسف بریتیە ژ پێشاندانا ئەدگارێن ڕاستەقینەیێن تشتەکی و لێکچواندن بریتیە ژ مەجاز و نواندنێ چونکە لسەر بناغەیێ وەکهەڤییا ئەدگارێن دوو تشتان ئاڤابوویە نە جوداکرنا وان، لێ ب دیتنا هندەك ڤەکۆلەران شاعرێن جاهلی گرنگی داینە وەسفێ، لێ شاعرێن پشتی وان، واتە یێن سەدێ ئێکێ و دوویێ کۆچی شعر بەرەڤ لێکچواندنێڤە برینە)[١١٠]، یانکو پشتی هاتنا ئیسلامەتیێ شاعران پتر گرنگیدایە لێکچواندنێ و پشتا خۆ دایە وێنەیێن وەسفیێن ڕاستەقینە.

دەمێ شاعرێن کورد لگەل شعر و ڕەخنەیا شعرییا عەرەبی و فارسی کو بەرهەمێ لاساییکرنا ئەدگارێن قەسیدیێنە ئاشنا بووین، چ ڕێکێن دی ژبلی پشتبەستنەکا زێدە لسەر هونەرێن ڕوونبێژی و ب تایبەت لێکچواندنێ بۆ وان نەما چونکە ئەڤ هونەرە بووبوونە پیڤەر بۆ هەلسەنگاندنا شعران؛ هەر ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو شاعرێن کورد پشتبەستنەکا کێم لسەر وان وێنەیان بکەن کو ب ڕێکا وەسفێ یان زمانێ ڕاستەقینە دهێنە ئاڤاکرن.پرانیا نموونەیێن کو بەری نهۆ مە ئاماژە ب وان داین و ئەوێن کو دێ ل بابەتێ سواوەبوون و قەرەبالغییا وێنەیاندا هێنە باسکرن، ڤێ چەندێ پشتراست دکەن کو شاعرێن کورد ب ئاوایەکێ ژ

ڕادەبدەر وێنەیێن ڕوونبێژیێ و ب تایبەت لێکچواندن بکارئینانینە و گەلەك بەریێ خۆ نەدانە وەسفێ، واتە بکارهینانا وێنەیێن وەسفیێن ب ڤی ڕەنگی ل هەمبەر بکارهینانا وێنەیێن ڕوونبێژیێ گەلەك کێمە:

مەکەن مەنعم لە شیوەن ئەی ڕەفیقان
کە مەحزوون و غەمین و دل شکاوم
لە ژینی خۆم ئومێدم قەتعە (نالی)
کە سووتاوە هەموو جەرگ و هەناوم...(نالی (دیوان)، ل٣٠٤)

هەتا تۆم ئاشنا بووی ئاشنام بوون
ئەمێستا موو بە مووم ئەغیارە بێ تۆ
هەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەمسال
تەمەنای مردنی پێراوە بێ تۆ...(نالی (دیوان)، ل٣٩٣- ٣٩٤)

ئەڤە چەند دێرێن ژ شعرەکا (نالی)، نکۆلی ل کاریگەری و بالکێشییا وان ناهێتە کرن، ژبلی هندەك مەجازێن ئاسایی کو د ئاخفتنا ڕۆژنەدا ژی دهێنە دیتن چ وێنەیێن وەها کو لسەر بناغەیێ هونەرێن ڕوونبێژیێ هاتبنە دارشتن ناهێنە دیتن، ئاخفتن سادە و ڕۆهن و ڕاستەوخۆیە لێ وێنەیەکێ تەڤگر ژ بارودۆخێ دەروونیێ شاعری پێشکێش دکەت. ڕەخنەیا کلاسیکی نەشێت خزمەتا جوانی و ئیستاتیکا نموونەیێن وەها بکەت، ئەڤە بەروڤاژی ئەو دێرێن شعرییێن کو وێنەیێن ڕوونبێژیێ ب خۆڤە دگرن دبنە جهێ سەرنجا ڕەخنەگر و زانایێن ڕەوانبێژیێ:

مووی سپی کردم بە شووشتن ئاوی عەینی شۆرە شەت
شۆرە شەت یەعنی کە تێدا خود بە خود قەل بوو بە بەت...(نالی (دیوان)ل١٤٧)

باری غەمی جان ئەبرووەتی تیر و کەمان کرد
یەعنی قەدەکەی ئەلفی منە ئێستە کە دالم...(نالی (دیوان)، ل٢٩٧)

ئەڤ دوو دێرە ژی  دەربڕینێ ژ دۆخێ دەروونیێ شاعری دکەن، لێ وەکو دیارە شاعری ب ڕێکا هونەرێن ڕوونبێژیێ ب تایبەت لێکچواندنێ و هونەرێن جوانکاریێ ئەڤ کارە کریە، ئەگەر تام و چێژ و شعریەتا نموونەیا دەستپێکێ ژ ڤان دوو نموونەیان پتر نەبیت کێمتر ژی نینە، تەنها تشتێ ئەم دشێین بێژین ئەڤەیە کو ئەو وێنەیێ کو ب ڕێکا زمانێ ئاسایی دهێتە پێشکێشکرن پێدڤی وەسف و درێژبریەکا پترە لێ د  وێنەیێن کو ب ڕێکا ڕوونبێژیێ پێکهاتینە کورتبڕی دهێتە دیتن.

شاعرێ کلاسیکی وەسا هزردکەت کو بۆ وەسفکرنا هەر دیمەنەکی پێدڤیە پترین وێنەیێن ڕوونبێژیێ بکار بینیت، ئەڤە ل وی دەمی کو چێدبیت ئەڤ قەرەبالغییا وێنەیان ببیتە ئەگەرێ دروستبوونا وێنەیەکێ دەستکرد و بێ جان، وێنەیەك کو چ کارتێکرنەکا وەسا لسەر خواندەڤانی نینە، بۆ نموونە پێدڤی ناکەت بۆ وەسفکرنا دیمەنێن سروشتی شاعر تنێ ب ڕێکا کەلەکەکرنا وێنەیێن ڕوونبێژیێ ڤی کاری بکەت، بەلکو  جارنا دشێت خۆ ژ ڤی شێوەیێ لاساییکری ڕزگاربکەت و جوانترین وێنەیان پێشکێش بکەت:

ل چـــریـــا پـــاشـیێ پـێـدا، مـەلایـێ باتـەیـی کـانـێ
سەفەر کێشا ب موکسێ دا ل سەر وەقـتێ زڤستـانێ
زڤستانێ ل ڤـێ یـۆلێ  ل ڤـــێ بـــەریێ ل ڤـــێ چۆلـــێ
گـــەرۆڤـــێ گـــرتـی داهـــۆلێ  مژێ هـاڤێتـە زۆزانـێ
گەرۆڤێ گرتی نەسرینا، جەمەد شین بوون ل سۆلینا
گـــریا مـەتێ ژبۆ ئاسـمـینا پـــەریـشـانـم ژ تـــالانـــێ

...(مەلایێ باتەیی (دیوان)، ل١٧٩)

شعر بریتی نینە ژ کۆمەکا لێکچواندن و خواستنێن ل پەیهەڤ، شاعر ب ڕێکا تەڤلیهەڤکرنا هندەك دیمەنێن زڤسانێ لگەل دۆخێ خۆیێ دەروونی جوانترین وێنەیان پێشکێش دکەت، ل ڤێرێ وەسف یان سالۆخدانە کو وێنەێ شعری دئافرینیت و شاعر خۆ ب هونەرێن ڕوونبێژی و سنعەتکارییێڤە مژیل ناکەت.

د شعرا كلاسيكييا كورديدا (مەولەوى) شيايە ب ڕێكا مفاوەرگرتن ژ زمانێ راستەقينە و وەسفا ڕاستەخۆ و سازكرنا پەيوەنديێ د ناڤبەرا وێنەياندا، وێنەيێن ناوێزە پێشكێش بكەت:

وەهـــاران ســەوزەن ئــاوەن ســەركــاوەن هــاژەی وەفــراوان، شــاخــەی شــەتــاوەن

ســاقــييــەن بادەن نەسيــمــەن بــادەن بــولبول جــە دەوری گــولان ئــازادەن

بــەزمەن شــاديەن عەيشــەن نيشاتــەن كەيفەن شۆخييەن شــەوقەن حەياتەن

سەنگەن كۆسارەن سەركــووەن هــەردەن خــەمەن مــەينــەتــەن زوخــاوەن دەدەن

هيجــرون دووريــيەن عيــجــزەن فيــراقەن واوەيــلا و شينــەن نــالــەی عــوشــاقــەن

....(مەولەوى (ديوان)، ل٥٢٣)

شاعر ب وەسفا سروشتى ڕابوويە بێ كو هەولبدەت ڤێ وەسفێ بێخيتە ژێر كونترۆلا هندەك وێنەيێن ڕوونبێژيێن دەستنيشانكرى، ئەو ب تنێ ب ڕێكا ڕێزكرنا هندەك دياردەيێن سروشتى و ديمەنێن خۆشى و ڕابوردنێ لگەل وێنەيێن نەخۆشى و خەم و پەژارەيێ؛ جوانترين وێنەيان پێشكێش دكەت. گەلەك وێنەيێن ب ڤى ڕەنگى د شعرێن (مەولەوى)دا دهێنە ديتن و دبنە بەلگە بۆ سەلماندنا ڤێ ڕاستيێ كو ئەڤ شاعرە شيايە هەڤسەنگييەكێ بێخيتە د ناڤبەرا بكارهينانا وێنەيێن ڕوونبێژيێ و وێنەيێن وەسفيدا، ئەو نە بتنێ د بوارێ وەسفا سروشتى وێنەيێن وەها پێشكێش دكەت، بەلكو هەبوونا وێنەيێن ب ڤى ڕەنگى ئێكە ژ تايبەتمەنديێن شعرێن وى.

(بابا تاهرێ هەمەدانى) ژى وەكو شاعرەك كو ب تەمامەتى نەكەفتيە ژێر كاريگەرييا شعرا لاسايكرييا ڕۆژهەلاتا ئيسلامى، پشتبەستنەكا ژ ڕادەبدەر ناكەتە سەر وێنەيێن ڕوونبێژيێ. د شعرێن ويدا زمانێ ڕاستەقينە و وەسف ڕۆلەكێ مەزن د ئاڤاكرنا وێنەياندا دبينن:

مو ئان ڕەندم كە نامم بى قەلەندەر نــە خان ديرم، تە مان ديرم، نە لەنگەر

چو ڕۆژئايە بگەردم گردێ كــۆيەت چــو شەو ئايە بە خشتى وانەهەم ســەر

...(باباتاهر (دووبەيتيەكان)، ل٣٠)

ئەو تشتێ کو ل ڤێرێ دهێته دیتن وەسفکرنا دۆخێ شاعریە، لێ نە ب ڕێکا کۆمەکا وێنەیێن ڕوونبێژیێ بەلکو ب ڕێکا وێنەیێن وەسفی. شاعر ب ئاشکرایی باسێ هندێ دکەت کو کەسەکێ هەژار و بێ سامانە و چ جه بۆ مان و ئاکنجیبوونێ نینە، دەمێ دبیتە ڕۆژ ل دور وارێ یارا خۆ دزڤریت و دەمێ دبیتە شەڤ ژی سەرێ خۆ ددانیتە سەر خشت یانکو لبنەکێ و دنڤیت. ل ڤێ نموونەیێ ژی هەمان تشت دهێتە دیتن:

| | |
|---|---|
| مـوکـە سەر دەر بیابوونم شەو و ڕۆژ | سروشـک ئەز دیدە باروونم شەو و ڕۆژ |
| نە تەب دیرەم، نە جایەم میکونە دەرد | هـەمیزوونم کە نالوونـم شەو و ڕۆژ |

...(باباتاهیر (دووبەیتەکان)، ل٣٥)

جارەکا دی شاعر ب وەسفکرنا دۆخێ خۆ ڕادبیت، کەسەکی وەسف دکەت کو شەڤ و ڕۆژان ل بیابانێ سەرگەردانە و ڕۆندکێن وی تێنە خوارێ، چ نەخۆشی لێ نینن و چ جهێن وی نائێشن، لێ هەر نالە نالێ دکەت. ژبەر نەبوونا ئەو وێنەیێن ڕوونبێژیێن کو د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا گەلەك باون ئەم نەشێین باسێ نەبوونا وێنەی د ڤان دووبەیتیاندا بکەین، وێنە د ڤان دوو بەیتیان دا هەیە لێ وێنەیەکە کو گەلەك پشتبەستنێ لسەر هونەرێن ڕوونبێژیێ ناکەت.

### ٥.٢.١.٣. قەرەبالغییا وێنەیان:

دیارە هەر د شعرا جاهلیدا پشتبەستنەکا زێدە لسەر لێکچواندنێ هاتیە کرن هەتا وی ڕادەی کو گەلەك جاران مرۆڤ هەست ب هندێ دکەت کو شعر ب تنێ ژ لێکچواندنان پێک هاتیە (ئێک ژ تایبەتمەندییێن شعرا عەرەبی بهەڤگەهشتنا و ناڤهەڤچوونا لێکچواندنانە، هەر ئێک ژ ڤان لێکچواندنان بازنەیەکا جودایە، و بهایێ خۆ یێ سەربەخۆ د زنجیرەکا دویر و درێژا لێکچواندناندا هەیە، هندەك جاران نیڤا شعرێ ژ زنجیرەکا لێکچواندنان پێک دهێت، ئەڤ لێکچواندنە پێکڤە گرێدداینە و وێنەکێ بەرفرەه ژ دەوروبەرێ شاعری پێشکێش دکەن، پرانیا جاران

خەلەكا ئێكێ ژ زنجبیرەیا لێكچواندنان پەیوەندیدار نینە ب داوی خەلەكا زنجیرەیێ چونكە ئێك ژ تایبەتمەندییێن ڤێ زنجیرەیێ ئەڤەیە كو هەر خەلەكە پەیوەندیدارە ب خەلەكا دویڤ خۆ)[١١١]. هەرچەندە كو ئەڤە ئێك ژ ئەدگارێن شعرا جاهلیە، لێ وەسا دیارە كو لگەل بورینا دەمی زێدەرۆیی تێدا هاتیەكرن، ئێك ژ هۆكارێن ڤێ چەندێ لاوازبوونا وەسفێ و لێكچواندنێن تێروتەسەل یان ب دەربڕینەكا دی زالبوونا كورتبڕییێیە، ئەڤە ژی یەكسانە لگەل بكارهینان و زالبوونا لێكچواندنێن كورت و خواستنان بسەر شعرا عەرەبی، هەتا وی ڕادەی كو دشێین بێژین (قەرەبالغی و كەلەكەبوونا وێنەیان و كاریگەرییا وێ یا نێگەتیڤ د شعرا عەرەبییا سەدێ چوارێ و پێنجێ كۆچی دهێتە دیتن.)[١١٢]

ل دەستپێكا سەرهلدانا شعرا فارسی ژی شاعران گرنگیدایە وەسفێ و بكارهینانا لێكچواندنێن تێر و تەسەل لێ لگەل دەربازبوونا دەمی (ئێدی وێنەیێن شعری ژ حالەتێ خۆ یێ وەسفی دەردكەڤن و شاعر گەلەك لسەر دیمەنەكی ناراوەستن، وێنە بەرەڤ كورتكرنێڤە دچن و د چارچووڤێ دێر یان نیڤەدێرەكێدا دهێنە سنووردارکرن، یانكو هندەك وێنە كو شاعرێن بەرێ شەش دێر بۆ وەسفكرنا وان تەرخان دكرن د دێرەكێدا هاتنە كورتكرن. ئەڤ جۆرە هزركرن و تێگەهشتنە بۆ وێنەی لسەر شعرا فارسییا نیڤا دوویێ ژ سەدێ پێنجێ زالە. ئێكەمین نیشانەیێن ڤێ بزاڤێ ژی د دیوانا (عنصری)دا خویایە، وی ب نێرینەكا لۆژیكی و هزرەكا عەقلانی مفا ژ ڕەگەزێن وێنەیێن شاعرێن بەری خۆ وەرگرتیە و هەمی هەولێن خۆ بۆ هندێ تەرخانكریە كو د ناڤبەرا وان ڕەگەزان دا جۆرە پەیوەندیەكا لۆژیكی یان ڕێكخستنەكا عەقلانی سازبكەت)[١١٣].

كەواتە لگەل گەشەكرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی هێدی هێدی ڕۆلێ وەسفا ڕاستەوخۆ و زمانێ ڕاستەقینە بەرەڤ لاوازییێڤە چوویە و لێكچواندنێن تێروتەسەل ژی بەرەڤ كورتكرنێڤە چووینە، ئەڤێ چەندێ ژی كاریگەریەكا مەزن كریە سەر شعرێ ب تایبەت بەرهەمێن داستانی. ئەم دشێین بۆ نیشاندانا ڤێ چەندێ ئاماژەیێ بدەینە (شبلی نعمان) كو باسێ جیاوازییا د ناڤبەرا (فردوسی) و

(نظامی گنجوی) دکەت ، ئەو د ڤێ باوەرییێدایە کو فردەوسی د وەسفکرنا دیمەنان دا سەرکەفتییە و باسێ وردەکاریان دکەت لێ نزامی ژ بەر زێدەرۆیی د هونەرێن رەوانبێژییێدا گرنگیێ نادەتە وردەکاریان، بۆ نموونە فردەوسی ب جوانترین شێوە نەریتا ڤەخوارنا شەرابێ ل سەردەمێن کەڤن وێنە دکەت و باسێ هەمی کار و کردەوەیێن گرێدای ب ڤێ چەندێ دکەت لێ چونکە (نزامی) دەربڕینا خۆ پڕ ژ لێکچواندن و خواستنان دکەت نەشێت ڤان وردەکاریان ڤەگوهێزیت.[١١٤]

ژبلی کاریگەرییا ڕۆلێ لاساییکرنا ئەدگارێن قەسیدەیێ و کارتێکرنا ڤەکۆلینێن ڕوونبێژییێ، چێدبیت گەشەکرنا شعرێ د کۆچکا دەستەلاتدارێن دەولەتا ئیسلامی و گرنگیدان ب کورتبڕیێ و داخباربوونا شعرێ ب سەقایێ کۆچکان فاکتەرەکێ دی بیت بۆ بکارهینانا ژرادەبدەرا وێنەیێن ب ڤی ڕەنگی. ( محمد ڕضا شفیعی کدکنی) سەبارەت ب کەلەکەبوون و قەرەبالغییا وێنەیان د شعرا فارسییا د ناڤبەرا سەدێ چوارێ و پێنجێ کۆچیدا د ڤێ باوەرییێدایە کو ژیانا ئەرستوکراتی کاریگەریەکا مەزن کریە سەر بکارهینانا وێنەیی د شعرا فارسیدا و ب شێوەیەکێ گشتی هونەرێ ئیسلامی ژی هەر د ڤێ ئاراستەییێدا چوویە. شاعران گرنگیدایە وێنەی نە وەك ئامرازەك بۆ ڤەگوهاستنا هزران بەلکو ب تنێ وەکو ئامرازەك بۆ جوانکرنێ؛ ئەو جوانکرنا کو پێدڤی بوو د هەر ستایشکرنەکێدا مفا ژێ هاتبا وەرگرتن، واتە وێنە ب تنێ مینا بویاخەکی بوویە کو بۆ بۆیاخکرنا دیوارەکی یان دەرەکی دهاتەبکارهینان؛ بێ کو بزانن کو ئایا ئەڤ ئاڤاهیە پێدڤی بۆیاخکرنێیە یان نە، ئەگەر پێدڤیە چ جۆرە بویاخەك و تا چ ڕادە...)[١١٥].

کەواتە وێنە ب تنێ بوویە ئامرازەك بۆ خەملاندنا شعرێ و ئێدی بوویە ئەگەر کو ( ل داوییا سەدێ پێنجێ کۆچی شاعر ب تنێ هەول بدەن وێنەیان کۆم بکەن و وان ل تەنیشت هەڤدوو دانن، ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ دیاردەیا کەلەکەبوون یان قەرەبالغییا وێنەیان سەرهلدایە، ڕەنگە هەر ئەڤ چەندە ژی پالدەرەك بیت بۆ هندێ کو شاعر زێدەتر گرنگیێ بدەنە بکارهینانا خواستن و وێنەیێن وەکو خواستنێ و ژ وردەکاری و وێنەیێن تێر وتەسەل دویربکەڤن؛ داکو بشێن پترین ژمارەیا وێنەیان د

دێرەکێدا بکاربینن، ئەڤە ل وی دەمی کو وێنەیێن شعرا فارسییا بەری ڤێ قوناغێ تێروتەسەلتر بوون و گرنگیدان وەرەکاریان)[١١٦]. هەر ئەڤ قەرەبالغییا وێنەیان بوویە ئەگەر کو گەلەك جاران هەڤدژی د ناڤبەرا وێنەیێن دێرەکا شعرێدا دروست ببیت، بۆ نموونە ئێکەمجار شاعر دێ وێنەکێ ئینیت کو ئاماژەیێ ددەتە شەڤەکا تاری پاشی ل دویفدا دێ وێنەکێ دی ئینیت کو وەسفا ڕۆژەکا ڕۆهن دکەت.[١١٧]

لاساییکرنا ئەدگارێن قەسیدە و غەزەلا کەڤن بوویە ئەگەر کو شاعرێن کورد گرنگیەکا زۆر بدەنە وان وێنەیان کو لسەر بناغەیێ وەکهەڤیێ دروست دبن ب تایبەت لێکچواندن و خواستنێ (مەبەستا مە پتر خواستنا ئاشکرایە)، هەر ئەڤ چەندە بوویە ئەگەر کو گەلەك جاران شاعر زێدەرۆییێ د بکارهینانا ڤان وێنەیاندا بکەن، واتە دێرا شعرێ لدەڤ وان ببیتە پێشانگەها لێکچواندن و خواستنان، ئەڤ دیاردە ل دەڤ پرانیا شاعرێن کلاسیکیێن کورد دهێتە دیتن و ئەم دشێین زاراڤێ قەرەبالغییا وێنەیان یان کەلەکەبوونا وێنەیان بۆ ڤێ دیاردەیێ بکاربینین؛ قەرەبالغییەك کو پرانیا جاران ئەنجامێ کەلەکەبوونا لێکچواندنێن سواوەیە. شاعر دزانیت کو سروشتێ ڕەوانبێژی و رەخنەیا شعرا کلاسیکی پشتەڤانییا وان دێرێن شعری دکەت کو پڕ بن ژ لێکچواندن و خواستنان لەوما ب ڕێکا بکارهینانا پترین ژمارا لێکچواندن و خواستنان دێ شیانێن خۆ بۆ خواندەڤانی دیارکەت:

دیدەت وەکوو گول سوورە، پڕی شەبنمی ئەشکە
یا لالەیی ژالەیە دوو نەرگسی شەهلات...(نالی (دیوان)، ل١٣٧)

ئەگەر ئەم زولفە موشکینە، وەگەر ئەم لەعلە ڕەنگینە
دەڵێی سەحرایی ماچینە، دەڵێی کانی بەدەخشانە...(حاجی (دیوان)، ل١٧٦)

شەب کاکولە، خال فلفلە، چین سونبلە دێم کەوکەبە
من غەفلەتێ دی قبلەتێ وەك ماه دتەیسا غەبغەبە...(جزیری (دیوان)، ل٤٥٩)

کەچ ئەبرۆ، دیدە ئاهوو،شۆرشین خۆ، فیتنەجۆ، تورکێ
خورۆش و شۆر و شینی خستە ناو ئەهلی نەظەر لە نوێ...(مەحوی (دیوان)، ل٣٩٩)

نەقشی چین بوویی خەتا خوویی فەرەنگ، موویی حەبەش

هـیندوویی خـال و عـەرەب دیـدە، نـەزاکـەت عـەجـەمیٚ...(سالم (دیوان)، ل١٠١٠)

وەکو خویایە د ڤان دێراندا دیاردەیا کەلەکەبوونا وێنەیان دهێتە دیتن کو پرانیا وان لێکچواندنێن سواوەنە، ئامانجا شاعری ب تنێ رێزکرنا لێکچواندنانە، شاعر لسەر وێنەیەکێ دیارکری ناراوەستیت، بلەزاتیەکا زۆر ژ وێنەکی دەربازی وێنەیەکێ دی دبیت. ئەڤ قەرەبالغی و چرۆپرییا لێکچواندنان ل وی دەمی دگەهیتە کوپیتکا خۆ کو شاعر هەر دوو لایەنێن لێکچواندنێ وەکو پەیڤەکا لێکدراو پێشکێش دکەت:

چ خوش گولخەد و نەیقەددە

چ جـادۆچـەشـم و لـەبقـەندە

چ شـیریـن و شـەکـەرخـەندە

هــەزار وەك مـن ب قــوربــانــە...(هادی (دیوان)، ل٣٤)

پەیڤێن لێکدراوێن (نەیقەد، جادۆچەشم، شەکرخەندە، لەبقەند) د بنەرەتدا هندەك لێکچواندنن کو گەهشتینە دویماهیک قوناغا کورتکرنێ، واتە بووینە پەیڤێن لێکدراو، بکارهینانا ڤان جۆرە لێکچواندنان دەلیڤێ ددەتە شاعری کو پترین لێکچواندنان د دێرەکێدا بکاربینیت.

شاعر دشێت ب رێکا بکارهینانا خواستنان ژمارەکا زۆرتر ژ وێنەیان د دێرەکێدا بکاربینیت. د شعرا هندەك شاعرێن کورددا خواستن ژی ب رێژەیەکا بەرچاڤ بەشداریێ د دروستبوونا قەرەبالغییا وێنەییدا دکەن، ئەڤ دیاردە ب ئاشکرایی د شعرێن (مەلایێ جزیری) دا دهێتە دیتن:

شـەتری و زولف و بەلگ و پەر هەمیان ل دێم دەعوی و شـەر

ئیلان ل سەلوێ بوونە گەر عەقرەب خویابوون ئەز گەرەف

عـەقـرەب نـهـن ئــەو سونـبولـن، بـۆ عـەنـبـەرن داڤـا دلـن

نیــشان ژ میســک و فـلـفلن، وان سینەیێ من کـر هەدەف...(جزیری (دیوان)، ل ٣١٣)

دا ژ میحــرابا دو نوونان ســەجدە بــەت ئـەسوەد حەجەر
دل ب میــزان مــاهی نــەو ئــەبرۆ نومــایی ڕاست و چەپ...(جزیری (دیوان)، ل٩١)

خواستنێن (ئیلان، عەقرەب، سونبول، عەنبەر، میحراب، ئەسوەد حەجەر، ماهی نەو) خواستنێن ئاشکرانە و لگەل هندەك لێکچواندنێن دی دبنە ئەگەرێ قەرەبالغییا وێنەیان.

قەرەبالغییا وێنەیان هەتا وی ڕادەی بسەر هندەك شعرێن کوردیدا زالبوویە کو ئەگەر ئەم ڤان شعرا وەرگرین؛ ژبلی پەیوەندییێن لێکچواندنی ( لێکچواندن و خواستن)چ تشتەکێ دی نابینین، واتە قەرەبالغییا پەیوەندییێن لێکچواندنێ ژ سنووورێ دێرەکا شعرێ دەربازدبن و سەرتاپایێ شعرێ بخۆڤە دگرین:

موسا یەدێ بەیزایـە ئەو، یا موعجیزێ عـیـســایـە ئــەو
یا قەیصەر و کیسرایە ئەو، یا واحدێ قــەهــارە حـوب
یــا کــاسەچین و بــادەیە، یا جـەوهـەرێ جـانێ مـەیە
یــا بەنکـەیا مـەیخـانـەیـە یـانی ددل دا نــــارە حــوب
ئـەڤ ڕوحێ جانی بلبلە، ئـەو عـەنـدەلیـب و دل کــولـە
ئەو نێرگزە یان سونبلە، ئەڤ غونچەیێ پڕ خارە حوب...(شیخ نورالدین (دیوان)، ل ٧١)

ئەڤ سێ دێرێن ژ شعرەکا دویر و درێژا (شیخ نورالدینێ بریفکانی)، ئەڤ شعرە بۆ ستایشکرنا پلە پایەیا (حوب)ێ یانکو ئەڤینیێ هاتیە ڤەهاندن و (٦٦) دێرا ب خۆڤە دگریت. پرانیا دێرێن ڤێ شعرێ ژ پەیوەندییێن لێکچواندنی پێک هاتینە، قەرەبالغییا وێنەیان ب درێژییا شعرێ دهێتەدیتن. چەندین لێکچواندنێن نوی و دەگمەن و هزرێن کویر و ناوێزە د ناڤ ڤان دێران دا هەنە لێ قەرەبالغییا وێنەیان ب تایبەت لێکچواندنان بوویە ئەگەر کو وەکو پێدڤی ڕۆلێ وان خۆیا نەبیت و هەست ب هەبوونا وان نەهێتەکرن.

دیارە کو ئەڤ قەرەبالغییا وێنەیان کو بەرهەمێ تێگەهشتن و وەرارا ئەدگارێن قەسیدەییێیە؛ گەلەك جاران بوویە جهێ سەرنج و گرنگیپێدانا

ڤەکۆلەرێن داخبار ب ڕەوانبێژی و رەخنەیا شعرییا عەرەبی ـ ئیسلامی، بۆ نموونە (عەلائەدین سەجادی) ڤێ دێرا (ناری) وەك نموونە دهینیت:

ڕووت وەکو ئاگر، موژەت وەك شیشە، ئەبرۆ قیمـەکـێش
مــروەحــەت زولــف و کــەبــابت جەرگی پارەی نارییە

(سەجادی) باسێ هێز و جوانییا وێنەیێن ڤێ دێرێ و دێرێن دیێن ڤێ شعرێ دکەت و وان ب نموونەیێن بەرزێن شعرا کوردی د بوارێ لێکچواندن و ڕەوانبێژییێدا ل قەلەم ددەت[١١٨]، ئەڤە ل وی دەمی کو تشتێ بالکێش د ڤێ دێرا شعرێدا پتر قەرەبالغییا وێنەیان و زێدەرۆیکرن د بکارهینانا پەیوەندییێن لێکچواندنێیە.

## ٦.٢.١.٠٣. پشتبەستن ب وێنەیێن سواوە و دووبارەکری:

هەڤتێکستیێ ئەڤ ڕاستییە سەلماندیە کو چ دەق سەربخۆ نینن یانکو هەر دەقەك ب دەقێن بەری خۆڤە هاتیە گرێدان، لەوما شعرەك وەکو دەقەکێ ئەدەبی پەیوەستە ب دەقێن دیڤە ب تایبەت دەقێن شعرییێن شاعرێن بەرێ و گەلەك ژ وێنەیێن شعرییێن دەقەکی هەر ئەون یێن کو د شعرێن کەڤندا هاتینە بکارهینان، بەری سەرهلدانا هەڤتێکیتیێ ژی گەلەك ڕەخنەگر و ڤەکۆلەران هەست ب ڤێ چەندێ کریە، بۆ نموونە (شکلوفسکی) دبێژیت (هندی هوین پتر ڤەکۆلینێ لسەر قوناغەکێ بکەن، پتر دێ دلنیا بن کو ئەو وێنەیێن هوین ب داهێنانا فلان شاعری دزانن؛ ژ شاعرێن دی و تا ڕادەیەکێ زۆر بێ گۆهرین هاتیە وەرگرتن... کارێ قوتابخانەیێن شعری زێدەتر وەرگرتنا وێنەیانە تاکو ئافراندنا وێنەیان، وێنە بەری هنگی هاتینەپێشکێشکرن، دشعرێدا ل جهێ هندێ کو پتر هزرا خۆ د وێنەیاندا بکەن، وان دئینینە بیرا خۆ. ب هەر ڕەنگەکی بیت ئەو تشتێ کو تەڤایا تایێن هونەری پێکڤە گرێددەت ئەو هزر نینە کو لسەر بناغەیێ وێنەیان هاتیە ئاڤاکرن، هەر وەکو کو گۆهرینا وێنەیان بناغەیێ وەرچەرخانا شعرێ نینە)[١١٩]. ئەڤ هزر و ئاخفتنێن ب ڤی ڕەنگی نابنە پاساو بۆ هندێ کو ئەم پشتەڤانییا هەمی جۆرێن

لاساییکرن و دووبارەکرنا وێنەیی بکەین و ئەو شاعرێن کو ب داهێنانا وێنەیێن نوی ڕابووین یان وێنەیێن کەڤن ب ئاوایەکێ نوی پێشکێش کرین فەراموۆش بکەین. نکۆلی ل هندێ ناهێتە کرن کو (هەر شاعرەکی وێنەیێن خۆ هەنە، دەمێ شاعر سەرەدەرییێ لگەل وێنەیێن سواوە و کەڤن دا دکەت؛ مرۆڤ هەست ب لاوازییا شاعری دکەت)[١٢٠] یان ب دەربڕینەکا دی (یێن خودان شێواز و ئەزموون و وێنەیێن خۆ بن خودان کەسایەتینە لێ یێن کو خودان کەسایەتییەکا سەربەخۆ نەبن ب دزیێ ڕادبن).[١٢١]

ل ڤێرێ نابیت ئەم توند ئاژۆیێ بکەین و هەمی تشتان ب دووبارەکری و سوواوە ل قەلەم بدەین و بێژین (ئەو تشتێ شاعر هەستێ پێ دکەت هشیارییا دەستپێکی و ئەزموونا ئێکێیە و ئەو تشتێ ژ وی دگەهیتە شاعرێن دی، دبیتە تشتەکێ پلە دوو یانکو یێ بۆ ئێکەمجار ڕوویێ یارا خۆ ب گولێ لێکچواندی شاعرە و یێن پشتی وی لاسایکەرن)[١٢٢]، چونکە ژ لایەکیڤە هندەك وێنە هەنە کو هەمیشە پەیوەندیدارن ب ژیانا مرۆڤیڤە و ژ لایەکێ دیڤە چەوانییا پێکێشکرنا وێنەیەکی ژێ گرنگە، واتە ڕەنگە شاعر بشێت گیانەکێ نوی بدەتە وێنەیەکێ کەڤن.

هەر وەکی بەری نوکە مە ئاماژەپێدای ئێک ژ گرفتێن وێنەیێ شعری د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی ئەڤەیە کو ژ لایەکیڤە سیستەمەکێ وێنەسازیێ دیارکری بسەر شاعران هاتیە سەپاندن و ئەو ئازاد نەبووینە کو ل دویڤ حەزا خۆ گۆهرینێ د وێنەیاندا بکەن و ژ لایەکێ دیڤە ئەو شکۆمەندییا کو کلتورێ ئیسلامی دایە قەسیدەیا جاهلی بوویە ئەگەر کو جۆرە نائۆمێدیەکا وێنەیی ل دەڤ شاعران پەیدا ببیت. (ئەڤ دیاردە ژ سەدێ چوارێ کۆچی دەستپێدکەت و لگەل بورینا دەمی توندتر لێ دهێت، ئەڤ چەندە د دەروونێ نڤیسەراندا جێگیر دبیت کو یێن بەری وان هەمی واتا تەواوکرینە وچ بۆ وان نەهێلاینە و چ ڕێک ژبلی دووبارەکرنا واتایێن بەرێ و تەکەلوف و ئالۆزکرنا ڤان واتایان بۆ وان نەمایە. ئەڤ چەندە د شعر و نامەیێن پەخشانکیدا خویایە، نڤیسەر و

شاعر هزرا خۆ د وی تشتیٚ کو دبێژن ناکەن، بەلکو هزرا وان لدور ئامرازێن گوتنیٚ، وەکو وێنەییێن ڕوونبێژی و هونەرێن جوانکارییٚ دزڤریت. هەتا وی ڕادەی کو دووبارەبوونا ڤان وێنەیان دبیتە ئەگەریٚ بێزارییا مرۆڤی، هەر وەکو ئێدی عەقلیٚ هەمیان نەزۆك بوویە و نەشێت تشتەکی پێشکێش بکەت کو ببیتە جهیٚ چێژوەرگرتن و خۆشییا مە)[١٢٣]، تەنانەت ئەگەر ئەم بەرێخۆبدەینە شعرێن شاعرەکیٚ ناڤداریٚ وەکو (عمر بن ابی ربیعه) دیٚ بینین وی هەول نەدایە چ وێنەییێن نوی پێشکێش بکەت، کاریٚ وی زێدەتر لاساییکرن بوویە و خواستن و لێکچواندنێن بەریٚ دووبارەکریە[١٢٤].

ژ ئەنجامیٚ داخباربوون ب شاعرێن بەریٚ و هەولدان بۆ لاساییکرنا وان و سەرهلدانا نائۆمێدییا وێنەیی، شاعران هشیارییا خۆ هەمبەر گرنکییا ڕۆلیٚ وێنەی ژدەست دایە. ئەڤ دیاردە بۆ ناڤ شعرا فارسی ژی هاتیە ڤەگوهاستن، سەرەرای هندیٚ کو شعرا فارسی ل ژێر کاریگەرییا شعرا عەرەبی سەرهلدایە، لیٚ ( ل قوناغێن دەستپێکییا شعرا فارسی واتە هەتا نیڤا سەدیٚ پینجیٚ (ب تایبەت هەتا دویماهییا سەدیٚ چواریٚ) وێنەییێن کو شاعر بکاردهینن تا ڕادەیەکیٚ زۆر سادە و ڕەسەنن و جۆرە ڕێککەفتنەك د ناڤبەرا وێنە و هەستێن شاعریدا دهێتە دیتن، لیٚ لگەل بورینا دەمی هێدی هێدی ڕەسەنایەتییا وێنەیان بەرەڤ لاوازیێڤە دچیت ب ڕەنگەکیٚ وەسا کو ل داوییا سەدیٚ پێنجیٚ ب تایبەتی د شعرا شاعرێن وەکو (معزی)دا هەر جۆرە وێنەیەك دهێتە بکارهینان. ئەڤ بیٚ ئاگەهیە ژ لایەکیڤە ژبەر کاریگەرییا شاعرێن بەریٚ و پربوونا مێشکیٚ شاعران ژ وێنەییێن وان بوویە، چونکە وان هزر دکر کو پێدڤیە ئەو ب تنیٚ د چارچووڤیٚ دەربڕینێن شاعرێن بەریٚ شعرێن خۆ بڤەهینن، ئەڤە هەر ئەو نەخۆشییە کو سەدەیەك بەری ڤی دەمی د ئەدەبیٚ عەرەبیدا سەرهلدابوو، ژ لایەکیٚ دیڤە نەبوونا شاعرەکیٚ توانا کو خودان ئەزموونەکیٚ سەربەخۆ بیت و ب ئافراندنا وێنەییێن دایک ڕابیت بوویە ئەگەر کو د دیوانا شاعرێن دویماهیکا ڤی سەدەی ب تنیٚ قەرەبالغییا وێنەیان بهێتە دیتن بیٚ کو مرۆڤ هەست ب هەبوونا وێنەیەکیٚ نوی بکەت.[١٢٥]

ب شێوەیەکێ گشتی پرانیا شاعرێن کلاسیکی ب ڕێژەیێن جیاواز ل ڤێ ڕاستیێ نەگەهشتینە کو (ڕەگەزێ نەژگاڤیێ یان سورپرایزکرنێ ڕۆلەکێ سەرەکی د کاریگەرییا وێنەیێ شعریدا دبینیت، واتە ئەو وێنە کو نەژگاڤ دهێنە بکارهینان و خواندەڤانی سورپرایزدکەن، کاریگەرترن ژ ئەو وێنەیێن کو ب ڕێکا هندەك یاسایێن هشک و سنووردار دهێنە دروستکرن)[١٢٦]. ڕەخنەگرێن شعرێ ژی گرنکی نەدابنە ڤێ ڕاستیێ کو (پەیڤا مەجازی ژ ئەنجامێ دووبارەکرنا ژ ڕادەبدەر ژ قوناغا مەجازیبوونێ بەرەڤ قوناغا ڕاستیێڤە دچیت) [١٢٧]و (چ دیوار د ناڤبەرا ڕاستی و مەجازێدا نینن)[١٢٨]، یانکو بکارهینانا زێدە و لاساییکرن دبیتە ئەگەر کو وێنە چێژا خۆ ژ دەست بدەت لێ وەکو خویایە ڕەخنەگرێن شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی ب تایبەت پشتی زالبوونا عەقلانیەتا ژرادەبدەر لسەر ڤەکۆلینێن شعری گەلەك گرنگی نەدابنە چێژێ.

بابەتێ وێنەیێن سواوە یان مەجازێن سواوە بابەتەکە کو د ڕەوانبێژی و ڤەکۆلینێن زمانیێن ئوروپیاندا گرنگی پێ هاتیەدان، بۆ نموونە (فۆنتانی ئاماژەیێ ددەت ڤێ چەندێ کو ئەم دشێین هزاران وێنەیان وەك نموونە بینین کو گەلەك باون و ژبەر گەلەك بکارهینانێ ئەدگارێ وێنەیی بوونا خۆ ژدەست داینە. هەر وەسا زانایێن ڕەوانبێژیێ ئەڤ پیڤەرە ژی ژبیرنەکرینە کو: هەر دەربڕینەکا نامۆ وێنەیەکێ ڕەوانبێژی نینە، هەر وێنەیەکێ ڕەوانبێژی ژی هەمی دەمان دەربڕینەکا نامۆ نینە. (فونتانی) لگەل ڤێ چەندێیە کو بکارهینان ببیتە پیڤەرەك بۆ وێنەی واتە ئەو وێنەیێن کو گەلەك هاتینە بکارهینان ئێدی هەژی هندێ نینن کو ب وێنە بهێنە نیاسین...)[١٢٩]. هەر وەها (ڕودونفیل)ی ژی وەکو زمانڤانەك پێشنیارکریە کو ب ڕێکا دابەشکرنەکێ جیاوازی بهێتە کرن د ناڤبەرا مەجازێ سواوە و مەجازێ داهێنەرانە. یێ ئێکێ بەشەکە ژ ئاخفتنا هەڤپشک و یێ دوویێ ب تنێ داهێنانەکا تاکەکەسیە.[١٣٠]

(ئەرشیبالد مکلیش) ژی وەکو ڕەخنەگرەکێ ڤی سەردەمی دەمێ باسێ خواستنێ دکەت، جەختێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو مەبەستا وی خواستن د

شعریدایە نە دەرڤەی شعرێ، ب دیتنا وی خواستنێن دەرڤەی چارچووڤێ شعرێ؛ خواستنێن باون کو د هەمی بکارهینانێن زمانیدا هەنە، ئێک ژ ڤان بکارهینان ژی زمانێ رۆژانەیە. جیاوازی ئەڤەیە کو خواستن د ئاخفتنا رۆژانە دا و پرانیا جۆرێن پەخشانێ خواستنەکا نیف مریە، واتە د ناڤ پەیڤێن دیدا بەرزە دبیت، هەر وەکو ئەو پشیکا خۆلەمێشی کو د ناڤ تاریاتییا شەڤێدا مرۆڤ هەستێ ب هەبوونا وێ ناکەت. ئەڤ خواستنە سواوەنە، بێ گومان ژمارەکا زۆر ژ ئاست نزمترین و بێزارکەرترین جۆرێن خواستنێن زمانی ئەڤ خواستنێن نیف مرینە، یێن کو ئێدی نەشێن دەربڕینێ ژ چ پەیوەندییان بکەن[١٣١]. وەسا دیارە کو د رەوانبێژییا عەرەبیدا نە ب تنێ گرنگی ب ڤێ چەندێ نەهاتیەدان بەلکو دژی سروشتێ کارێ وان بوویە، ئامانجا وان خزمەتکرنا قورئانێ بوویە و کەفتینە ژێر کاریگەرییا ئیعجازا قورئانێ، هزرا ئیعجازێ ژی ڤێ دەلیڤێ نادەت کو مرۆڤ هزرا کەڤن بوون و سواوەبوونا وێنەیان لسەر بناغەیێ خواندن و چێوەرگرتنێ بکەت، دەمێ چ جیاوازی د ناڤبەرا مەجازی د شعرێ و ئاخفتنا رۆژانە دا نەهێتەکرن؛ چ جاران بابەتێ سواوەبوونا وان ژی نابیتە جهێ گرنگیپێدانێ.

پێدڤیە ئەم سواوەبوون و سواوەنەبوونا وێنەیان بێخینە بەر باس و گفتگۆیێ، ئێدی (ئەم دشێین ئەو وێنە و خەیالێن کو مۆرکێ داهێنەرانەبوون و نوییبوونا خۆ ژ دەست داینە وەکو زمان و پێکهاتێن زمانیێن نەشعری بێخینە بەر ڤەکۆلینێ، چونکە ئەڤ وێنە وخەیالە هند دووبارە و سواوەنە کو تەنانەت ئەگەر کەسەك پیچەك ئاشنایی لگەل شعر و زمانی هەبیت دشێت وان بکاربینیت.پێدڤیە لگەل پێکهاتەیێن زمانی و تەنانەت پەیڤێن بەربەلاڤێن زمانی باسێ وان بهێتەکرن...)[١٣٢]

فاکتەرەکێ دیێ کاریگەر کو بوویە ئەگەرێ باوبوونا وێنەیێن سواوە گرنگیدانا رەخنەیا عەرەبی- ئیسلامی ب دزیێن ئەدەبیە، هەر وەکو بەری نوکە مە ئاماژەپێدای مەسەلا دزییا ئەدەبی د رەخنەیا عەرەبی ئیسلامیدا پرە ژ هەڤدژیان و تەنها چەکەك بوویە بۆ تەپەسەرکرنا داهێنان و نویکرنا شعرێ و پاراستنا

شکۆمەندییا شعرا کەڤن، هەر ل ڤێرێیە کو لاوازبوونا چەمکێ دزییا ئەدەبی بۆ شرۆڤەکرنا بابەتێ سواوەبوونا وێنەیان خۆیا دبیت. د دزییێدا خاوەنداریێتی گرنگە، لێ پرانیا جاران د وێنەیێن سواوەدا خودان دیار نینە. (بۆ نموونە لێکچواندنا چاڤان ب نێرگزێ یان بکارهینانا نێرگزێ وەکو خواستن بۆ چاڤی، تشتەکە کو د پەرتووکێن ڕەوانبێژییێدا هاتیە باسکرن و کەس نزانیت کا کەنگی بۆ ئێکەمجار هاتیە بکارهینان و هەمی شاعران لژێر کاریگەرییا شاعرێن بەری خۆ ئەڤ وێنەیە بکارهینانینە، لەوما ئەڤ وێنەیە و وێنەیێن دیێن ب ڤی جۆری ژ بیاڤێ دزیێ دەردکەڤن).[١٣٣] هەر ل وی سەردەمێ کو بازارێ دزییا ئەدەبی د رەخنەیا عەرەبی ئیسلامیدا گەرم بوویە کەسەکێ وەکو (قاضی جورجانی) وێنەیێن سواوە ژ چارچووڤێ دزیێ دەرئێخستیە، ئەو دبێژیت (لێکچواندنا جوانیێ ب ڕۆژ و مەهێ، لێکچواندنا مرۆڤێ مەرد ب عەور و دەریایێ، لێکچواندنا مرۆڤێ بیرکۆل ب بەری و لێچواندنا مرۆڤێ دلێر ب شێر و ئاگری...د هزرا هەمی کەساندا هەیە، یێن شاعر و یێن نەشاعر و یێن شارەزا د زمانیدا و یێن نەشارەزا د زمانیدا د بکارهینانا وان دا یەکسانن، لەوما دزی ژ ڤان ناگریت و ئەڤە ناچنە چارچووڤێ پێرەویکرنێدا)[١٣٤]. هەر ئەڤە ژی بوویە ئەگەر کو شاعر ل ژێر ناڤێ واتایێن هەڤبەش و گشتی پتر پشتبەستنێ لسەر ڤان وێنەیان بکەت چونکە پێشکێشکرنا هەر وێنەیەکێ نوی دبوو ئەگەر کو ڤەکۆلەرێن شعرێ بکەڤنە گومانێ و لدویڤ ڕەهـ و ڕیشالێن وێ بچن. کاریگەرییا ڤێ چەندێ هەتا نوکە ژی لسەر مە مایە و فەرە نهو هزرا خۆ د ڤێ چەندێدا بکەین کا وەرگرتنا وێنەیەکێ نوی کو خودانێ وی دیارە پتر خزمەتا چێژا ئەدەی دکەت یان ئەو وێنەیێ کو سەدها سالە دهێتە دووبارەکرن.

جارنا ژی بکارهینانا وێنەیێن سواوە دبیتە ئامانجا شاعری، ئەڤە ژی نەریتەکێ کەڤنە د قەسیدەیا عەرەبیدا و بەشەکە ژ هزر و تێگەهشتنا عەرەبی ـ ئیسلامی بۆ شعرێ و گرێدایە ب مەسەلا لایەنگرییا لەفزێ و فەرامۆشکرنا واتایێ. (ئامانجا شاعرێ عەرەب ڤەدیتنا هزرەکا نوی نینە، وی نەڤێت کو وەرگرێن شعرێ ژبەر ڕەسەنایەتییا هزران داخبار بکەت، بەلکو مەبەستا وی وەرگرتنا هزرەکا کەڤن

و بۆیاخکرنا ویٚ ل دویف شیانیٚن خۆیه؛ دا کو بهیٚزتربوونا شیانیٚن دەربڕینا خۆ ل هەمبەر شاعریٚن دی بدەت خویاکرن)[١٣٥]. دیاره کو پیٚشکیٚشکرنا ویٚنەییٚن کەڤن ب ئاوایەکیٚ نوی داهیٚنانه و ب کارەکیٚ هونەری دهیٚته هژمارتن ،لیٚ چونکه ڤان شاعران زۆربەی جاران گرنگی نەدایه لایەنیٚ واتاییٚ نەشیاینه گۆهرینەکا ڕیشەیی بیٚخنه دڤان ویٚنەیاندا.

دەمیٚ ئەم تەماشەی شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دکەین، ئەڤ ڕاستییه بۆ مه خۆیا دبیت کو ب تنیٚ د قەسیدەیا عەرەبیدا ویٚنەییٚن سواوه بسەر ویٚنەییٚن داهیٚنەرانه دا زال نینن، بەلکو د شعرا فارسیدا ژی ئەڤ چەنده دهیٚته دیتن، بۆ نموونه (سەنائییٚ غەزنەوی) کو پیٚشەنگیٚ شعرا سۆفیگەری و قالبیٚ غەزەلیٚیه، (پتر پشتبەستن لسەر خواستنیٚن ئاشکرا ییٚن بەریٚ کریه، خواستنیٚن وەکو (بت، صەنەم، گول، لەعل، سەرو، نیٚرگز)[١٣٦]، واته ئەو خواستنیٚن کو ب دریٚژییا هەبوونا سەبکیٚ خوراسانی د قەسیدەیاندا مفا ژوان هاتینه وەرگرتن.

هندەك لیٚکچواندنیٚن شعرا عەرەبی و فارسییا کەڤن هند سواوه بووینه کو ئیٚدی د پەخشاناندا ژی هاتینه بکارهینان، بۆ نموونه پرانیا ئەو لیٚکچواندنیٚن کو (ثعالبی) د (غررالسیر)دا بۆ وەسفکرنا ئافرەتا نموونەیی ل دویف دیتنا (خسرو پرویز)ی بکارئینایین هەمان لیٚکچواندنن کو د شعرا کلاسیکییا عەرەبی و فارسیدا دهیٚنەدیتن، لیٚکچواندنیٚن وەکو (برو کڤان، چاڤ مینا باهیڤانه، ددان وەکو مراریان، گەردەن وەکو سوراحی، ڕەنگ وەکو دنکیٚن هناریٚ، پیست وەکو حەریر، کەمەر باریک وەك میٚشا هنگڤینی).[١٣٧]د پەرتووکا (سمک عیار) ژی کو ل سەدیٚ حەفتیٚ کۆچی هاتیه نڤیسین ل جهەکی نڤیسەر وەسفا جوانییا کچەکیٚ ب ناڤیٚ (پەری) دکەت و کۆمەکا لیٚکچواندنان بکار دهینیت، مینا (زلف وەکو کەمەندیٚ، برو وەکو کڤانی، چاڤ مینا نیٚرگزیٚ، مژیلانک وەکو تیران، لام وەك زیڤی، دیٚم وەکو گولیٚ، ..هتد)[١٣٨] ئەڤە ژی هەر ئەو لیٚکچواندنیٚن باون کو د شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا دهیٚنه دیتن.

تایبەتمەندییا گەلەك ژ وێنەیێن شعرا كلاسیكییا كوردی ژی سواوەبوونا وانە، باوەری هەبوون ب پێرەویكرن ژ شاعرێن بەرێ و خواندن و ژبەركرنا شعرێن وان، زالبوونا پیڤەرێن عەقلانییێن شعریەتا قەسیدەیێ و خۆگرێدان ب یاساییێن ڕەوانبێژییێ بووینە ئەگەر كو شاعرێن كورد ژی ژمارەكا زۆر ژ وێنەیێن سواوە بكاربینن.

پشتبەستنا زێدەییا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی لسەر پەیوەندییا لێكچواندنێ و بكارهینانا وێ وەكو ئامرازەكێ سەرەكییێ دەربڕینێ بوویە ئەگەر كو سواوەبوون پتر د لێكچواندناندا بهێتەدیتن، نكۆلی ل هندێ ناهێتەكرن كو ئەڤ لێكچواندنە وێنەنە لێ نكۆلی ل لاوازبوونا نرخ و بهایێ هونەرییێ وان ژی ناهێتەكرن، بۆ نموونە لێكچواندنا لێڤان ب (لەعل)ێ ئێكە ژ ڤان لێكچواندنێن سواوە كو بەری سەرهلدانا شعرا كلاسیكییا كوردی ب ئاوایەكێ بەرفرەهـ د شعرا كلاسیكییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا و ب تایبەت شعرا فارسی هاتیە بكارهینان و شاعرێن كورد ژی لسەر بناغەیێ چاڤلێكرنێ ئەڤ لێكچواندنە كو جارنا وەكو خواستنەكا ئاشكرا ژی خۆیا دبیت بكارئینانینە:

ژ لەبێ لەعلی شەكەربار قە نەكر پرسا مەلێ
میصریان گەزمە ڕەشاندن كو كشاندن ئەلماس...(جزیری (دیوان)، ل٢٦٣)

ئەز ژ زولفا تە ڤەرستم مە گەلەب كر لەبێ لەعل
لێ د چاها ژەقەنێ بێ سەروپا چوومە هەلەك ...(جزیری (دیوان)، ل٣٣٧)

ئەز لەبی لەعل ئابی حەیوان بت نەصیب
قودسیان ڕاگرتی یین دەستێ دوعایێ ڕاست و چەپ ...(جزیری (دیوان)، ل٩٩)

شیرەیی جانە وتم یا مەیە؟چا بوو فەرمووی
عەكسی لەعلی لەبی مەرجانە لە فنجانمدا ...(نالی (دیوان)، ل ٨٨)

تەخسیری دلی كردم، حەملەی صەفی موژگانت
هۆش و خیرەدی بردم، لەعلی لەبی خەندانت...(كوردی (دیوان)، ل٨٨)

رۆح و دڵ و دیـن هـەرسـێ دەكـەم بەزل و نـەسـاری

كامی دڵی مـن گەر لە لەبی لەعـلی ڕەوا كــا ...(شیخ ڕەزا (دیوان)، ل٢٦)

لــەب لــەعـل عــەتـیـق، مــەتــای مــەهــاره

خـــارا جـــە ڕۆمـــات بــەلــخ و بـــوخـــاره...(خانای قوبادی (دیوان)، ل٢٧)

ئەڤ وێنەیە هند زارڤەكری و سواوەیە كو تەنانەت پرانیا جاران هەر پەیڤا فارسییا (لەب) واتە لیڤ وەكو لێچو دهێتە بكارهینان و ب دەگمەن پەیڤا لێو یان لیڤ جهێ وێ دگریت، هەر ب ڤی ئاوایی لێكچواندنا بەژنا یارێ ب دارا سەروێ وێنەیەكێ سواوەیە:

گـەر بێیە دەرێ، سەروی ڕەوانی لە ئیرەمدا

وەر نەییە دەرێ، ئاهووی چینی لە حـەرەمدا ...(نالی (دیوان)، ل ٨٩

قەدی تۆ سەروە و كەناری منە جۆباری سروشك

چ ســزاوارە، ئــەگــەر بێیە كــەنــارم بــە خــودا ...(ئەدەب (دیوان)، ل٥١)

سـونبوولی زولـفـت پـەریشانە قەدی سەروت بلند

دل پــەریشــانــی پــەسەندە نــالــەبــاری لائـیـقـە...حاجی قادر (دیوان)، ل١٣٠)

ئەم دشێین بێژین كو چ داهێنانەكا وەسا د بكارهینانا ڤان جۆرە وێنەیاندا نینە و شاعر نەشێت ڤێ چەندێ ڕابگەهینیت كو وێنەیەكێ نوی پێشكێشكریە.

هندەك لێكچواندنێن شعرا كلاسیكی كو گەلەك ب ناڤودەنگن و گەلەك باسێ جوانی و سەرنجراكێشبوونا وان دهێتەكرن و چەندین ڤەكۆلین و ووتار لدور فەلسەفە و پەیاما وان هاتینە نڤیسین؛ دبنەرەتدا هندەك وێنەیێن سواوەنە كو ژ بەر دووبارەكرنا زێدە چێژا خۆ ژ دەست داینە، ئێك ژ ڤان وێنەیان (پەروانە و شەمع) یانكو (پەلاتینك و شەمال)ن:

گـەلۆ دیسا ببینم ئـەز چـرایێ وەصـلـەتێ هـل بـت
بـســۆژم شـوبهی پـەروانـێ د بەر وێ نـور و شــەوقـێ دا...(جزیری (دیوان)، ل ٤٣)

دیــارە خـــۆ پــەروانە خـۆ هــەر سـووتانە ئەسلی موددەعـای
بۆیە ئێمەش عاشقین، ئەی شەخسی ئاتەش خـوواب خــووت... (مەحوی (دیوان)، ل١١٠)

لە شـەوقی ئاتەشی ڕۆخساری یارم
وەکــو پـــەروانـە دایم بێ قــەرارم...(کوردی (دیوان)، ل٣١٦)

نــاری دڵەکەی مــەوتە ئەنێو چاهی فیراقت
پەروانە سیفەت ئێستە بە سووتانە موعەززەب...(ناری (دیوان)، ل٥١)

شەمعی ڕووتی دیوە بۆیە ئاگری تێ بــەربووە
مەیلی سووتانی هەیە باقڵ وەکو پەروانە ڕۆژ...(حەمدی (دیوان)، ل٣٢)

دل شوبهەتی پەروانە بوو عاشقێ شەمعانە
جان دایە ب جانانە هەم دین و ڕووح و مالە...(هادی (دیوان)، ل١٠٩)

سەرەرای هەولێن ڤەکۆلەرێن شعرا کلاسیکی ب تایبەت لایەنگرێن ئاراستەیا سۆفیگەریێ، پێویستە دان ب ڤێ چەندی بهێتە دان کو لێکچواندنا عاشق و مەعشوقان ب پەروانە و شەمعێ و تەنانەت ب گول و بلبلێ ژ وێنەیێن لاسایکریێن شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی و تایبەت شعرا فارسینە. ڤی وێنەی ژبەر دووبارەکرنا ژ ڕادەبدەر تام و چێژا دەستپێکی ژ دەست دایە و سواوە بوویە، تەنانەت هەلهێنجانا هزرێن فەلسەفی و سۆفیگەریێ ژ پەیوەندییا د ناڤبەرا سوتنا پەلاتینکێ و دۆخێ مرۆڤێ عاشق ژی نەشێن سواوەبوونا ڤی وێنەی ڤەشێرن یانکو ئێدی ناڤونیشانێن ب ڤی ڕەنگی ((سووتانی پەروانە یا پراکتیزەکردنی چەمکی (عیشق) لە شیعرەکانی (مەحوی)دا))[١٣٩] دکەڤنە بەر گومانێ.

گەلەك جاران وێنەیەکێ کەڤن ب دارشتنەکا نوی و جیاواز دهێتە پێشکێشکرن لێ ئەڤ گۆهرینە د وی ئاستیدا نینە کو سواوەبوونا ڤان وێنەیان

ڤەشێریت یان وان بینیتە ڕێزا وێنەیەکێ نوی، بۆ نموونە ئێک ژ سواوەترین وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردی قوربانیکرنا شاعری بدەستێ یارێیە:

کە دادی یەئسی خۆمم بردە لا ئەم عارفە توند بـــوو
وتی ئاخر سوبەینێ جەژنە، خوێنی تۆ لە پێ دەگـــرم...(مەحوی (دیوان)، ل٢٩٣)

عیدە و حبیبێ نەزرە لێ یان دێ ب قـوربان بــێ مەلـێ
یـارەب ببینم ڕۆژ هەلێ سکین ددەســـت قـــەصــاب دا...(جزیری (دیوان)، ل ١٨)

غەم مەخۆ قوربان لە بۆ قــوربانی عیدی وەسلـــی تۆ
مــودەیێکــە بـەو ئـومێدە حـاجی خۆی دابـەسـتووە...حاجی قادر (دیوان)، ل ١٣٩

وەکو خویایە هەر سێ دێر تا ڕادەیەکێ زۆر وێنەیەکێ وەکهەڤ دووبارە دکەن و ب تنێ جیاوازیەکا کێم د ناڤبەرا واندا هەیە، د هەر سێ دێراندا ئەڤ لێکچواندنە دهێنە دیتن (یار= قەصاب)، (شاعر وەکو عاشق= قوربانی)، لگەل ڤێ چەندێدا ژی د هەر سێ دێران دا ئاماژە ب (جەژنا قوربانێ) هاتیە کرن. ئەڤ وێنەیە د شعرا کلاسیکیدا ب گەلەك ئاوایێن دی هاتیە پێشکێشکرن کو پتریا جارن هەمان سەقا و دیمەنێ وێنەیێ قوربانیکرنێ پیشان ددەن:

تا موعەییەن بێ کە زۆرن دەس گری و دەس کـوژی
فەرقی سەر، پەنجەی بە خوێناوی حەنا ڕەنگین دەکا...(نالی (دیوان)، ل١٠٨)

حــەنــایی کــردووە پەنــجـەی بە خوێناوی دڵـــی زارم
ئەمە ڕەنگە شەهادەت بێ کە کوشتەی دەستی دلدارم...(نالی (دیوان)، ل٢٨١)

وەرە بـنـــوارە دوو دەســتـــی حـنـــاییـم
حەنایی چی؟ هەموو خۆ خوێنە قوربان...(نالی (دیوان)، ل٣٢٦)

وەرە دەســتــی بــە خــوونم کە نیگارین
خــوێنــی مـــن حــەلالـت بێ نیگـــارا...(مەحوی (دیوان)، ل٤١)

لێکچواندنا خوینێ ب خەنایێ یان ئاماژەدان ب ڕەنگینکرنا دەستان ب خوینێ، هەر دووبارەکرنا وێنەیێ ڤەکوشتن و قوربانیکرنا باوە و دچیتە چارچووڤێ دووبارەکرنا واتایەکا کەڤن ب ڕەنگەکێ نوی.نموونەیێن ب ڤی ڕەنگی د شعرا کلاسیکییا کوردیدا زۆرن، بۆ نموونە لێکچواندنا دەڤی ب (نوقتە)یێ ب ئاوایێن جۆراوجۆر دهێتە دووبارەکرن:

ئـــەمـزانی چییە یری دەهانی وەکـــو نوقتەت
خۆی نوقتەیی مەوهووم و جیهان قەیدیە لـەودا ...(ئەدەب (دیوان)، ل٥٠)

گـــەر دەلیلێ وەکـــو نـــوقـتـەی دەهــەنت نەبوایـە
منیش ئینکارم ئەکرد وەك حوکەما جەوهەری فەرد ...(شیخ ڕەزا (دیوان)، ل٥٤)

د ڤان دوو دێراندا ب ڕێکا گەمەکرن لگەل پەیڤان هەمان وێنەیێ کەڤن و سواوەیێ لێکچواندنا (دەڤی ب نوقتە)یێ دووبارە بوویە.(*)

چێدبیت سواوەبوونا وێنەیەکی د شعرێن شاعرەکیدا ژی بهێتە دیتن. لب ڤێرێ شاعر ب خۆ ب سواوەکرنا وێنەیەکی ڕابیت. ل دەستپێکێ شاعر وێنەیەکی نوی یان نەباو بکاردهینیت، لێ پشتی هنگی مەسەلا دووبارەکرنا واتایێن کەڤن ب ئاوایەکێ نوی دەلیڤێ ددەتە شاعری کو چەندین جاران وی وێنەی ب ڕەنگێن جودا جودا دووبارەبکەت، بۆ نموونە وەکهەڤکرنا دۆخێ خوناڤێ ل دەمێ دەرکەفتنا ڕۆژێ لگەل حالێ عاشقی ل دەمێ دیتنا یارێ کو د شعرا کلاسیکییا فارسیدا هاتیەبکارهینان(**)، د شعرێن (مەحوی) دا وەکو وێنەیەکێ سواوە خۆیادبیت:

کــە دڵ دەتــوێــتەوە بۆ تــۆ دەکـــەی ئـــەو ڕۆژە تــۆ بـــروا
کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر دڵ وەکو شەونم لە خۆ بـروا ...(مەحوی (دیوان)، ل٦٥)

دەپـــرسی مـــن بۆچـی دەرکــەوتم و دڵ بوو لــە تۆ غــایب
کە وەختی ڕۆژهەڵات، ئەلبەت دەبێ شەونم لە خــۆ غایب...(مەحوی (دیوان)، ل٨٣)

تۆ کە دەر کەوتی مەپرسە چی بەسەر دێ جان و دل

حالەتی شەونم تەماشاکە بە وەقتی ڕۆژهەلات...(مەحوی (دیوان)، ل٩٠)

بە جیلوەی ئەو وەکوو شەونم فری هەر عەقل و هۆشی بوو

کە سێبەر لەو جێیە هەتاوی لەحەزەیەك لێ کەوت...(مەحوی (دیوان)، ل١١٧)

بە پیری ئەو ڕۆژەوە ((مەحوی)) ئەوەندە

بەسەر چووبوو، وەکو شەونم لەسەر کەوت...(مەحوی (دیوان)، ل١٢٠)

شەو بە ئێمە با نەویدی هاتنی جانانی دا

یەعنی ئەی شەونم گەلینە!مژدە بێ میوانە ڕۆژ...(مەحوی (دیوان)، ل٨٣)

دیارە کو (مەحوی) گەلەك ب ڤی وێنەی داخباربوویە و گەلەك جاران ئەو دووبارەکریە، ڕاستە کو شاعری هندەك جاران دلێ خۆ ب خوناڤێ لێکچواندنیە؛ ئەو خوناڤا کو لگەل دەرکەفتنا ڕۆژێ کو مەبەست ڕوویێ یارێیە نەشێت خۆ بگریت و دوەریت، هندەك جاران خۆ یان عەقل و هۆشێ خۆ ب خوناڤێ لێکچواندیە و ڕوویێ یارا خۆ ب ڕۆژێ تەشبیهکریە لێ ب شیوەیەکێ گشتی لێکچواندن ژ بازنەیا (عاشق و مەعشوق وەکو خوناڤ و ڕۆژ)ێ دەرنەکەفتییە، لەوما دشێین بێژین کو ئەڤ لێکچواندنە د شعرێن (مەحوی) دا بەرەڤ سواوەبوونێڤە دچیت.

فەرە ئەم وێنەیێن سواوە کو پرانیا وان بەرهەمێ دووبارەکرنا لێکچواندن و خواستنێن کەڤنن ژ وێنەیێن نوی و دەگمەن و داهێنەرانە کو د هندەك شاعراندا دهێنە دیتن جودا بکەین و هەمان سەرەردەرییا کو لگەل وێنەیێن سواوە دکەین لگەل ڤان وێنەیان نەکەین. بەری هەر تشتەکی یا باش ئەوە کو ئەم باسێ وان وێنەیان بکەین کو لاساییکرینە، لێ د هەمان دەمدا سواوە نینن و گیانەکێ نوی دبەخشنە شعرا کلاسیکییا کوردی، چێدبیت گەلەك جاران شاعر وێنەیەك ژ شاعرەکێ دی وەرگرتبیت؛ ل ڤی دەمی سەرەرای هندێ کو وێنە وێنەیەکێ لاساییکریە، لێ کاریگەرییا وێ پترە ژ وێنەیێن بەریەلاڤ و سواوە کو ژ بها و کاریگەرییا وان کێم بوویە. ل دەستپێکێ پێدڤیە ئەم خۆ ژ مۆرکێ ڕەوشتیێ

چەمکێ دزییا ئەدەبییا بەربەلاڤ د د ئەدەبیاتا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا رزگاربکەین و وەسا هزر نەکەین کو ئەو دزییا نەهێتە سەلماندن باشترە ژ وێ دزییا کو دهێتە سەلماندن، واتە رەواتییێ بدەینە وێنەیێن سواوە لسەر ڤێ بنەمایی کو بەشەکن ژ نەریتێ ئەدەبی و وەرگرتنا وێنەیەکێ نوی ببەینە چارچووڤێ دزییا ئەدەبی:

گەرچی دەر دیوانێ حەضرەت پور حەقیرین شوبهی مور
چــەشــمێ تە چەشــمێ ســولــەیمانی ب حــالێ مور بێ...(جزیری (دیوان)، ل ٥١٩)

ئـــەو کـــەبکێ خەرامان کو د کۆزێ ل قەبـو هــات
شـــاهــین قـــــەضایێ ب تــەغافول ژ خـــــوەرا گــــرت...(جزیری (دیوان)، ل١١٩)

تشتێ ئاشکرا ئەڤەیە کو ئەڤ دوو دێرە لسەر بناغەیێ لاساییکرنا دوو دێرێن حافزی هاتینە ڤەهاندن:

نظـرکردن به درویشان منافی بزرگی نیست
سلیمان با چنان حشمت نظرها بود با مــورش...(حافظ (دیوان)، ج١، ل٥٦٢)

دیـدی آن قهقهه کـبــک خرامان حـــافظ
کــه ژ ســــرپنجه شــاهین قضا غــافــل بود...(حافظ (دیوان)، ج١، ل٤٢٢)

راستە کو ئەڤ وێنەیە ژ داهێنانا شاعری نینن، لێ د هەمان دەمدا سواوە ژی نینن، دویڤچوونا ڤان جۆرە وەرگرتنان رەوایە لێ مەزنکرنا قەبارا وان و بکارهینانا وان وەکو پیڤەرەك بۆ لاساییکرنێ هەلەیە، چونکە بکارهینانا وێنەیێن وەها د ناڤ کۆمەکا وێنەیێن سواوەدا نە بتنێ رۆلەکێ نێگەتیڤ نینە، بەلکو کاریگەریەکا پۆزەتیڤ هەیە. ئەگەر شاعرێن کورد ل جهێ وێنەیێن سواوە و دووبارەکری پشتبەستن لسەر ڤان جۆرە وێنەیان کربان، دا گۆهرین و جۆراوجۆرییەکا باشتر کەڤیتە د وێنەیێن شعرا کلاسیکییا کوردیدا. ل ڤێرێیە کو ئێدی ئەم دشێین باسێ دوو تشتان بکەین یێ ئێکێ داهێنان و ئافراندنە، یێ دوویێ چێژبەخشبوونە؛

ئەگەر لێکچواندن دەگمەن و لاساییکری بیت ئەم دشێین باسێ چێژبەخشبوونا وێ بکەین و ئەگەر نوی بیت ئەم دشێین هەردوو ئەدگاران بدەینە بال وێڤە:

زەرەیــەك بـــووم د هــەوایا تـــە د وێـــرانــەیــەكـــێ
میسلێ ڕۆژێ ب شوعاعا خوە تە مەشهور كـرین...(جزیری (دیوان)، ل٣٨٤)

شاعر خۆ ب گەردەك د هەوایا كاڤلەكیدا وەكهەڤكریە، كەس هەستێ ب هەبوونا ڤێ گەردێ ناكەت ب تنێ ل وی دەمی نەبیت كو تیشكێن ڕۆژێ د ناڤبەرا ڤان گەردان دا دەربازدبن. شاعری خۆشتڤیا خۆ ب ڕۆژێ و نێرینا وێ ب تیشكێن ڕۆژێ لێكچواندیە، پەیوەندیەكا لێكچواندنییا نوی د ناڤبەرا دیاردەكا سروشتی و دۆخێ شاعری و مەعشوقا وی هاتیە سازكرن، ئەڤە وێنەیەكێ دەگمەنە د شعرا كلاسیكییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی و چێدبیت ژ داهێنانا (جزیری) ب خۆ بیت، لێ ئەگەر هات و مە دویڤچوونەكا هویر ئەنجامدا و بۆ مە ئاشكرابوو كو شاعری ئەڤ وێنەیە ژ شاعرەكێ بەری خۆ وەرگرتییە، پێویستە هەر وەكو وێنەیەكێ نوی سەرەدەرییێ لگەل بكەین چونكە هەبوونا وێنەیەكێ وەسا دەگمەن د ناڤبەرا كۆمەكا وێنەیێن سواوەدا چێژ و كاریگەرییا خۆ یا تایبەتی هەیە، هەر ب ڤی ڕەنگی ئەڤ دێرا (نالی) ژی وێنەیەكێ وەها ب خۆ ڤە دگریت:

هــەرچەندە كە ڕووتم، بە خـــودا مائـیلی ڕووتــم
بێ بەرگییە عیللەت كە هەتیو مەیللی هەتـــاوە...(نالی (دیوان)، ل٥٤٠)

رەنگە ئێك ژ ئەگەرێن سەرەكییێن بناڤودەنگبوونا ڤێ دێرێ و كاریگەرییا وێ لسەر خواندەڤانان بكارهینانا وێنەیەكێ دەگمەن بیت، شاعری دۆخێ خۆ ب دۆخێ زارۆكەكێ هێتیم وەكهەڤ دكەت كو ژبەر ڕویسبوونێ واتە نەبوونا جل و بەرگان خۆ ددەتە بەرهەتاڤێ، واتە چەوا زارۆكەكێ هێتیم ژبەر هەژاری و نەدارییێ ل هیڤییا دەركەفتنا ڕۆژێ دمینیت دا خۆ بدەتە بەر هەتاڤێ، ئەو ژی ل هیڤییا دەركەفتنا یارا خۆیە داكو هەستێ ب گەرماتییا عەشق و ئەڤینێ بكەت. لدویف

خواندن و زانینا مه ئەڤە ژی وێنەیەکێ نوییە و چێدبیت ژ داهێنانا (نالی) ب خۆ بیت لەوما جیاوازە ژ وێنەیێن سواوە و دووبارەکری کو چ بهایێ خۆ نەماینە.

جارنا هندەك لێکچواندن نە ب تنێ سواوە نینن بەلکو ب لادانەك ژ شێوەیێ باوێ لێکچواندنا د شعرا لاساییکرییا رۆژهەلاتا ئیسلامی ژی دهێنە ل قەلەمدان، ئەڤ جۆرە لێکچواندنە د وان شعراندا دهێنە دیتن کو مۆرکێ عرفان و سۆفیگەرییێ لسەر وان زالە:

موسیف و جورعەکێشێ هیجرانـم

نــوقــطــەیــا دائیــرەیــا زیـنــدانـم

لـەو شـوبی دائیـرە سـەرگــەردانـم

بـــادەنـوشـی قـــەدەحــی حـیرمانم...(جزیری (دیوان)، ل٥٣٤)

ئەڤ جۆرە لێکچواندنە ژ لایەکیڤە دەگمەنن و لایەکێ دیڤە دژی پرەنسیپێ ئاشکرایا لێکچواندنا باو د قەسیدە و غەزەلا رۆژهەلاتینە، شاعر جارەکێ خۆ ب (نوقطەیا دائیرەیا زیندانی) و جارەکا دی خۆ ب (بادەنوشێ قەدەحێ حیرمان)ێ وەسف دکەت. ل ڤێرێ دشێین بێژین کو گەریان لدویڤ روویێ لێکچواندنێ کارەکێ هەروەیە، هەر دوو دەربڕین ب خۆ ئالۆزن و ب دەربڕینێن مەجازی دهێنە هژمارتن. لێکچواندن د ناڤبەرا شاعری و وێنەکێ مەجازیێ ب ڤی رەنگیە کو لێلی و نەرۆهنیێ پەیدا دکەت. ژ لایەکێ دیڤە لێکچواندنا شاعری ب دائیرێ ژی لێکچواندنەکا دەگمەنە یانکو دشێین بێژین ئەڤ وێنەیێن نوی دبنە ئەگەر کو کاریگەرییا نێگەتیڤا زالبوونا وێنەیێن سواوە لسەر شعرا کلاسیکییا کوردی کێم ببیت.

(مەولەوی) رۆلەکێ مەزن د ڤی بواریدا هەیە، سەرەرای هەبوونا وێنەیێن کەڤن و سواوە د شعرێن ویدا لێ د هەمان دەمدا ڤەدیتنا پەیوەندییێن نوی و پێشکێشکرنا وێنەیێن تازە، ئێکە ژ تایبەتمەندییێن شعرا وی:

چون دانەی سەر ساج هور ئامانم جارجار

جــە تــاوی دووکــەل، جە شەرارەی نـــار...(مەولەوی (دیوان)، ل٣٠)

شاعر خۆ ب وێ دنكا كو دكەڤیتە سەر سێلا نانی وەكهەڤ دكەت، ئەڤ دنكە ژ لایەكیڤە بەر گەرمێ ناحەوییێت و بەردەوام د بزاڤێدایە و ژ لایەكێ دیڤە دویكێلا ئاگری وێ ئازار ددەت.

وێنەی عەقدەی پێچ ڕیشەی ئەروا و دل
بەستە بۆ نم خووی مۆبەت زەنگل
سیلسیلەی پێچ پێچ زولفی نازاران
زەنگلە بەستەوە جە دانەی واران...(مەولەوی (دیوان)، ل ١٩٦)

ئەڤ جۆرە لێكچواندنە د شعرا كلاسیكییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا دەگمەنن، پەیوەندیەكا لێكچواندنی د ناڤبەرا دێرا ئێكێ و دێرا دوویێدا هەیە: چەوا ڕەهـ و ڕیشەیێن گیان و دلێ عاشقان ب خوها ئەڤینیێ و مەیلا خۆشەویستان هاتیە گرێدان، هەر ب ڤی ڕەنگی چیكێن بارانێ ژی وەكو زەنگلان ب زنجیرا زولفا یارێڤە شۆڕبووینە.

## ٢.٣. كاريگەرییا لاساییكرنێ لسەر وێنەیێ گشتیێ شعرێ:

د ڤەكۆلینێن ئەدەبیدا باسێ گەلەك جۆرێن ئێكەتیێ هاتیەكرن. هەر ڤەكۆلەرەكی لدویڤ تێگەهشتنا خۆ و سروشتێ وێ شعرا كو ڤەكۆلینێ لسەر دكەت جۆرەك ژ جۆرێن ئێكەتیێ بۆ شعرێ ب مەرج ل قەلەمدایە. سەرەرای ئەو جۆراوجۆری و ئالۆزییا كو د ڤی بواریدا هەیە، چەند جۆرێن سەرەكیێن ئێكەتیێ پتر بووینە جهێ گرنگیپێدانێ (وەكو ئێكەتییا بابەتی كو مەبەست پێ ئەوە كو شعر لدور بابەتەكێ دیاركری بیت یان ئەو ئێكەتییا كو لسەر بناغەیێ پشتبەستن ب چیرۆكێ یان ڕویدانێن مێژوویی خۆیا دبیت یان ئێكەتییا دەروونی كو بریتیە ژ دەربازبوونا شاعری ژ هزرەكێ بۆ هزرەكا دی لسەر بناغەیێ هەست و سۆزێن دەروونی. ژ هەمیان گرنگتر ئێكەتییا ئۆرگانیە كو گەلەك ناكۆكی لسەر دەستنیشانكرنا زاراڤ و واتایا وێ هەنە، هندەك ڤەكۆلەران زاراڤێن ئێكەتییا شعرێ و ئێكەتییا هونەری یان ئێكەتییا ناڤەكی ل جهێ ڤی زاراڤی بكارئینایە. سەبارەت ب ڕامانا وێ ژی هندەك د ڤێ باوەرییێدانە كو ئێكەتییا ئۆرگانی ئەوە كو شعر هەر ژ دەستپێكێ هەتا داویێ ئەزموون یان سۆزەكا دیاركری بخۆڤەبگریت. هندەك ڤەكۆلەرێن دی ژی د ڤێ باوەرییێدانە كو ئێكەتییا ئۆرگانی ڕێگر نینە ل هەمبەر فرەئەزموونی و فرەسۆزیێ لێ تشتێ گرنگ ئەڤەیە كو ئەڤ سۆز و ئەزموونە هەڤچەشن و پێكڤەگرێدای بن. هندەكێن دی ژی وەسا بۆ دچن كو ئێكەتییا ئۆرگانی بریتیە ژ ئێكەتییا هەست و سۆزان واتە زالبوونا سۆزەكا دیاركری لسەر تەڤایا شعرێ)(١٤٠).

سەبارەت ب ئێكەتییا ئۆرگانی یا باش ئەوە ئەم ڤی زاراڤی كو بۆ ئێكەمین جار ژلایێ (ئەرەستو)یڤە هاتیە بكارهینان، ب مەبەست و واتایەكا نوی بكاربینین، (چونكە دەمێ ئەرەستوی باسێ ئێكەتییا ئۆرگانی كری مەبەستا وی شعرا درامی و تراژیدییا یانكو شعرا بابەتی بوویە و وی چ ئاماژە نەداینە شعرا لیریكی...).(١٤١) ئەو ئێكەتییا ئۆرگانییا كو ئەو باس دكەت (د شعرا درامی و داستاناندا بهێزتر و

خۆیاترە چونکە ڕێزبوون و ل پەیهەڤهاتنا هزر و ڕویدانان د ڤان بەرهەماندا دهێتە دیتن و ئەگەر ئەڤ چەندە نەبیت دێ بنیاتێ وان هەرفیت، ئەڤە ل وی دەمی کو د شعرا لیریکیدا ئێکەتییا ئۆرگانی لسەر بناغەیێ ڕێکخستنا هزر و وێنەیان و پەیوەستبوونا وان ب پێلێن هەست و سۆزانڤە دهێتە ئاڤکرن...)[١٤٢]، یانکو تایبەت بوونا ئێکەتییا ئۆرگانی ب بەرهەمێن درامی و داستانی نابیتە بەلگە بۆ ڤێ چەندێ کو ئەم ب ئێکجاری نکۆلیێ ل هەبوونا وێ د شعرا لیریکیدا بکەین. ئەم دشێین ب ئاوایەکێ دی باسێ ئێکەتییا ئۆرگانی د شعرا لیریکیدا بکەین و بێژین (ئێکەتییا ئۆرگانییا شعرێ بریتیە ژ ئێکەتییا وان هەست و سۆزێن کو شعر وان ب خۆڤەدگریت، زێدەباری هەماهەنگ بوونا وێنە و هزران لگەل وەرارا شعرێ ب ئاوایەکێ وەسا کو شعر ب ڕەنگەکێ ئۆرگانیک و سروشتی بهێتە ئافراندن، هەر بەشەك ب ئاوایەکێ زنجیرەیی ئەرکێ خۆ ئەنجام بدەت، واتە شعرێ ژی مینا بوونەوەرەکێ زیندی بنیاتەکێ هەماهەنگ و پێکڤەگونجای و سروشتی هەبیت...)[١٤٣].

نهۆ دشێین بێژین هەرچەندە ئێکەتییا ڕەها و ڤەبڕ د شعرا لیریکیدا نینە لێ ئەڤە ڕەوابوونێ نادەتە هەمی جۆرێن ڤەقەتیان و دابڕانان، بۆ نموونە (دابەشکرنا مەبەستان د شعرێدا تشتەکە کو لگەل گیانێ شعرا لیریکی ناگونجیت، شاعر و ڕەخنەگرێن کەڤن دابەشکرنا مەبەستان کرینە ئەدگارەك بۆ شعرا نموونەیی و لدەڤ وان قەسیدە پێشانگەهەك بوویە بۆ مەبەستێن جوداجودا...)[١٤٤]، واتە نەبوونا ئێکەتییا ڕەها د شعرا لیریکیدا نابیتە پاساو بۆ بەرەلایی و پەرتەوازەبوونا واتایی و وێنەییا ژ ڕادەبدەر. پێویستە هەر وێنەیەك د ئەزموونا شعریدا ئەرکێ خۆ وەکو بەشەك ژ وێنەیێ گشتیێ شعریێ بجھ بینیت یانکو دڤێت وێنەیێن پاژەیی لگەل هزر و هەستێ گشتیێ شعرێ بچن و بەشداریێ د بزاڤا گشتییا شعرێدا بکەن و وێ بگەهیننە کوپیتکا پێگەهشتنێ. ئەڤێ چەندێ ژی دێ ئەنجامێ خۆ یێ سروشتی هەبیت کو ئەو ژی پێکهاتنا ئێکەتییا ئۆرگانییا گشتی و پێگەهشتییا شعرێیە.[١٤٥]

ب دەربڕینەکا دی ئێکەتییا ئۆرگانی (جیاوازیێ دئێخیتە د ناڤبەرا دو جۆرە

خەیالاندا، یا پێکڤەگرێدایی کو وێنەیێن شعرێ پێکڤە گرێ ددەت و تەڤایا وان ب ڕەنگەکێ سۆزدارییێ ئێکگرتی بۆیاخ دکەت و ب ڤی ئاوایی شعر دبیتە وێنەکرنا ساتەك ژ هەست و سۆزێن شاعری، یا دوویێ ژی خەیالا پەرتەوازەیە کو پشتبەستنێ لسەر وێنەیێن ڤەقەتیای و ماتریالی دکەت، وێنەیێن ژێک جودا و سەربەخۆ کو چ تشتەك وان پێکڤەگرێنادەت ژبلی ئێکەتیا پارچا شعرێ و ئێکەتیا مەبەستێ)[١٤٦]. هەر ئەڤە ژی جارەکا دی مە بەرەڤ هەبوونا وێنەیێ گشتییێ شعرێ دبەت چونکە (وێنەیێ گشتییێ شعرێ پێدڤی ئێکەتیا ئۆرگانییە و بێ هەبوونا ئێکەتیا ئورگانی دێ هەڤسەنگیا وێ بەرەڤ لاوازییێڤە چیت...)

قەسیدەیا عەرەبییا کەڤن پتر سەر ب جۆرێ دوویێ ژ خەیالا شعریە، (ب چ شێوەیان ئێکەتیا ئورگانی د شعرا جاهلییا عەرەبیدا نینە، چونکە چ پەیوەندیەکا هزری د ناڤبەرا پاژەیێن وێدا ناهێتەدیتن. ئێکەتیا وێ ئێکەتیەکا دەرەکیە و ژبلی خەیالا شاعرێ جاهلی و دۆخێ وی یێ دەروونی و وەسفکرنا سەفەرا شاعری بۆ گەهشتن ب کەسێ ستایشکری چ پێکڤەگرێدانەکا دی تێدا نینە.ئەڤ جۆرە پێکڤەگرێدانە ژی ئەدگارەکە ژ ئەدگارێن سەردەمێ جاهلی کو پشتی هنگی بوویە لاساییکرن و ب درێژییا چەندین سەردەمان هاتیە پاراستن...).[١٤٧] هەر وەسا ئەڤ بابەتە، واتە ئێکەتیا ئۆرگانی ((نەبوویە ئێک ژ بابەتێن رەخنەیا عەرەبییا کەڤن، ئەوا هەی ژی ب تنێ هندەك ئاماژەیێن پەرتەوازەنە کو داکۆکیێ ل پێویستبوونا جۆرە پێکڤەگرێدانەکێ د ناڤبەرا پاژەیێن قەسیدەییێدا دکەن. ئەڤ ئاماژەیە ژی ناگەهنە وی ئاستی کو بچنە ژێر سیبەرا چەمکێ ئێکەتییا ئۆرگانی))[١٤٨]، کەواتە ئێکەتی د قەسیدەیا عەرەبییا کەڤندا نینە و ئەڤ شعرە ب تنێ ژ هندەك دێرێن هەڤسوی پێک دهێت کو سەروا وان پێکڤە گرێ ددەت[١٤٩]. دیارە ئەڤ ئەدگارە بۆ ماوەیەکێ درێژ د شعرا عەرەبیدا بەردەوام بوویە چونکە (شوقی ضیف) د وێ باوەرییێدایە کو (هەتا سەردەمێ وی ژی شعرا عەرەبی ب تەمامەتی لگەل ئێکەتییا گشتییا شعرێ ئاشنا نەبوویە، ئەگەر ژی ئەڤەیە کو شاعرێن عەرەب لاساییا شعرا جاهلی کرینە و د شعرا جاهلیدا ژی ب چ ڕەنگەکی

ئەڤ ئێکەتیە خۆیا نینە، شعرا جاهلی وەکو بیابانێیە کو هەمی تشت تێدا دگونجن). [١٥٠]

نهۆ ڕەخنەگر و ڤەکۆلەرێن شعرا فارسی زێدەتر لژێر ناڤونیشانێ (لاوازبوونا تەوەرێ ستوونیێ خەیالا شعری) باسێ ڤێ تایبەتمەندییا قەسیدەیێ دکەن. تەوەرێ ستوونیێ خەیالا شعری زاراڤەکە کو ژ لایێ (محمد رضا شفیعی کدکنی) هاتیە بکارهینان و ل ڤان داوییا ن د بابەتێن پەیوەست ب ڕەوانبێژیێ و جەوانییا پێکهاتن و هەماهەنگییا د ناڤبەرا بەشێن شعرێ د ڕەخنە و ڤەکۆلینێن ئەدەبییێن فارسیدا باو بوویە)[١٥١].

(محمد رضا شفیعی کدکنی)باسێ هەبوونا تەوەرێ ئاسۆیی و ستوونیێ خەیالا شعری دکەت، ئەڤ زاراڤە ژی ڕاستەوخۆ پەیوەستن ب وێنەیێ شعریڤە، چونکە ڤی ڤەکۆلەری زاراڤێ (صور خیال) یانکو وێنەیێن خەیالێ بۆ وێنەیێن شعری بکارئینایە و هەتا نهو ژی ئەڤ زاراڤە د ڕەخنە و ڤەکۆلینێن فارسیدا بۆ (وینەیێ شعری) دهێتەبکارهینان. ئەو جەختێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو د هەر شعرەکێدا هزرا شاعری د دوو تەوەراندا کاردکەت. تەوەرێ ئێکێ تەوەرێ ستونی یان ئاڤاهیێ گشتیێ شعرێیە. ل ڤێرێ شاعر مفای ژ هەمی ئەزموون و بیرەوەری و پێکاریگەربوونێن خۆ د بوارێن جودا جودا دا وەردگریت؛ داکو شێوە و پەیکەرێ گشتیێ شعرێ د ڤی تەوەریدا ئاڤا بکەت. تەوەرێ دی ژی تەوەرێ ئاسۆیێ خەیالێ واتە دیرێن تاك تاك و وێنەیێن ڕوونبێژییێنە[١٥٢]، لەوما (لگەل گرنگیدان ب خەیالا شاعری د تەوەرێ ئاسۆیێ شعرێدا دکارین باسێ خەیالێ د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا ژی بکەین یانکو ئەم دشێین ڤەکۆلینێ لسەر ئاڤاهیێ شعرێ بکەین. ئەگەر ئەم دویڤچوونا شعرا عەرەبی و فارسییا کەڤن بکەین دێ بینین کو پرانیا هەول و بزاڤێن شاعران د تەوەرێ ئاسۆیێ شعرێدایە، داهێنان و نویکرنێن وان د تەوەرێ ستوونیدا هاتینە سنووردارکرن لەوما ئاڤاهیێ شعرەکێ... ژ وەسفا بهارێ و گرین بۆ یارێ و خەما دویربوون و جودابوونا وێ بەرەڤ بیرەوەرییا بهەڤگەهشتنا شاعری و یارا وی و پاشی بەرەڤ ستایش یان مەبەستەکا دیڤە دچیت...). [١٥٣]

قەسیدە ل قوناغێن سەرەتاییێن شعرا فارسی و هەتا داوییا سەدەییێ شەشێ کۆچی لسەر شعرا فارسی زال بوویە و ل هەمی قوناغێن شعرا فارسی ئامادە بوویە، لێ هەمی دەمان خودان تەوەرەکێ ستوونیێ لاواز و لاساییکری بوویە[١٥٤]، یانکو ئێک ژ ئەدگارێن قەسیدەیا فارسی (گرنگینەدانە ب تەوەرێ ستوونیێ خەیالا شعری، ئاریشە ژی ئەڤەیە کو شاعران لسەر بناغەیێ لاساییکرنێ ئەڤ چەندە ژ شاعرێن بەرێ وەرگرتیە...شاعرێن فارس د ڤێ پێڤاژۆییێدا لاساییا شاعرێن عەرەب کرینە...د شعرا عەرەبیدا هەر ژ سەدێ سێیێ کۆچیڤە تەوەرێ ستوونیێ خەیالا شعری هاتیە دەستنیشانکرن و مینا یاسایەکێ هاتیە پەسەندکرن)[١٥٥].

نەبوونا ئێکەتییا ئۆرگانی د قەسیدەییێدا لگەل دەربازبوونا دەمی بهێزتر بوویە، نەخاسمە دەمێ کو قەسیدە بوویە بەشەك ژ رۆشنبیرییا کۆچکا خەلیفەیێن ئەمەوی و عەباسی د شعرا عەرەبیدا و کۆچکا دەستەلاتدارێن سامانی و غەزنەوی و سەلجوقی د شعرا فارسیدا، چونکە (ئێدی شعر هاتیە تەرخانکرن بۆ خزمەتا کۆچکان. دەستەلاتداران ژی ژبلی ستایشکرنێ چ تشتێن دی ژ شاعران نەڤیایە ژبەرهندێ هزر و نێرینا شاعران سنووردار و ئێک رەنگ بوویە و ئێکەتیەکا گیانی د بەرهەمێن وان دا ناهێتە دیتن)[١٥٦].هەر لسەر ڤی بناغەی دشێین بێژین زۆربەی جاران ئێکەتییا ئۆرگانی یانکو پەیوەستبوونا وێنەیان د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا لاوازە، نەخاسمە ئەگەر شعر بۆ سەر چەند مەبەستان هاتبیتە دابەشکرن.

ب شێوەیەکێ گشتی لاساییکرن و بەردەوامبوونا تایبەتمەندییێن قەسیدەیێ د شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی بوویە ئەگەرێ لاوازبوونا پەیوەندییا د ناڤبەرا وێنەیان د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا، هەر ئەڤ چەندە ژی هۆکارەکە بۆ لاوازبوونا وێنەیێ گشتیێ شعرێ. ئەم دشێین ڤێ یەکێ ژی ب رێکا باسکرنا سێ ئەدگارێن شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی بدەینە خویاکرن: یا ئێکێ بریتیە ژ بەردەوامیدان ب لاساییکرنا مەبەستێن شعرییێن کەڤن کو دبیتە ئەگەرێ دووبارەبوونا وێنەیەکێ گشتیێ لاساییکری، یا دوویێ بریتیە بەردەوامبوونا سیستەمێ قەسیدەیا کەڤن یانکو فرەمەبەستیێ کو هۆکارەکە بۆ

لاوازبوونا ئێکەتییا ئۆرگانییا د ناڤبەرا وێنەیان د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا، یا سێیێ ژی بریتیە ژ پێرەویکرن ژ ئێکەتییا تاکەدێرێ کو دبیتە ئەگەرێ سنووردارکرنا وێنەی د دێرەکا شعریدا و ب ڤی رەنگی ئەو ژی فاکتەرەکە بۆ لاوازبوونا وێنەیێ گشتیێ شعرێ.:

## ٣.٢.١. بەردەوامبوونا مەبەستێن شعری و هەبوونا وێنەیەکێ گشتیێ لاساییکری:

قەسیدە وەکو کەڤنترین قالبێ شعرییێ زال د شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامیدا ماکا پێکڤەگرێدانا شعر و مەبەستێیە. ((قەسیدە ب خۆ ژ پەیڤا قەصد یانکو مەبەست هاتیە، چونکە ل سەردەمێن کەڤن قەسیدە بۆ ستایشکرن و پیرۆزباهی و سەرەخۆشی و ئامۆژگاریکرنا مەزنان هاتیە بکارهینان))[١٥٧]، لەوما دشێین بێژین کو (مەبەست ئێک ژ ستونێن سەرەکیێن قەسیدێیە، ئەو پالدەرە کو دبیتە ئەگەرێ ڤەهاندنا شعرێ و دەربڕینێ ژ تەڤایا ئەزموون و ورووژانێن شاعری ل دەمێ گوتنا شعرێ دکەت)[١٥٨]. کەواتە مەبەستێن سەرەکییێن قەسیدەیێ ئەو مەبەستن کو ڕاستەخۆ بۆ وەرگری دهێنە ئاراستەکرن، ئەڤە ژی مە بەرەڤ هندێ دبەت کو بێژین (چێدبیت چەمکێ مەبەستێ پرەنسیپێ خۆبخۆیی بوونا (لزومیە) شعرێ پێشێل بکەت و وێ بکەتە نامەیەك کو بۆ وەرگری دهێتە ئاراستەکرن).[١٥٩] هەر لسەر ڤی بناغەی دشێین بێژین کو تەڤلیهەڤبوونەك د ناڤبەرا غەرەز و قەسیدەییێدا هەیە واتە ئەگەر غەرەز ـ ئەوا ئەم زاراڤێ مەبەستێ بۆ بکاردئینین ـ بریتی بیت ژ ئەو ئامانجا کو شعر پێخەمەتی وێ هاتیە ڤەهاندن، دێ بیتە ئەو تشتێ کو گەلەك جاران ب (بابەتێ دەقی) دهێتە نیاسین، لێ ئەگەر غەرەز ب واتا ئامانجێ بهێتە بکارهینان دێ توشی گەلەك هەڤدژی و نەگونجانان بین و دێ تەڤلیهەڤبوونەك د ناڤبەرا غەرەز و قەسیدەییێدا پەیدا بیت[١٦٠]، لەوما هندەك ڤەکۆلەر د ڤێ باوەرییێدانە کو غەرەز و تەڤایا زاراڤێن دی کو بۆ ڤێ مەبەستێ هاتینە بکارهینان گونجاو نینن و باشترین زاراڤ بۆ ڤێ چەندێ زاراڤێ (بابەتێن شعرێ)یە وهندەك ڤەکۆلەرێن دی ژی زاراڤێن جیاواز پێشکێش دکەن وەکو ڕەمزێن شعری[١٦١].

ئەم دشێین ژ گەلەك ڕوانگەهانڤە مەبەستێن شعری پۆلین بکەین. ئێک ژ ڤان ڕوانگەهان ژی ئاراستەیی بوون و نەبوونا وانە.غەرەز بریتیە ژ ئامانج یان پێدڤیاتی یان مەرەما شاعری، ژ بەرهندێ هەمی دەمان غەرەزا شعری مەبەستەکێ ب خۆڤە دگریت. ئەم دشێین ڤێ مەبەستێ بکەینە دوو جۆر، واتە چێدبیت مەبەست وەرگر بیت وەکو ئەو شعرێن ستایشیێن کو شاعران ئاراستەی دەستەلاتداران کرینە؛ مەبەستێن ستایشکرن و داشۆرین و شانازیکرن دچنە ڤی چارچووڤەیدا. ل ڤێرێ شعر بۆ کەسەکی دهێتە ئاراستەکرن ئەم دشێین بێژینە ڤان مەبەستان مەبەستێن دەرەکی. جۆرێ دوویێ ژ ڤان مەبەستان ئەو مەبەستن کو شاعری چ ئامانجێن دەرەکی نینن بۆ نموونە وەسف کو ئامانج ژێ ب تنێ وەسفە وەکو وەسفکرنا گیانەوەران، ئەم دشێین ڤان مەبەستان ب مەبەستێن ناڤخۆیی بدەینە نیاسین، لێ ئەڤ مەبەستێن ناڤخۆیی ژی ڕەها نینن، چونکە چێدبیت مەبەستا شاعری ژ وەسا حێشترێ پێشاندانا وێ مادیبوونێ بیت کو شاعری د سەفەرا خۆ دا دیتی، یانکو وی دڤێت ب ڤێ ڕێکێ کارتێکرنێ لسەر کەسێ ستایشکری بکەت.[١٦٢]

سەبارەت ب مەبەستێن ناڤخۆیی ژی فەرە بێژین کو پرانیا جاران ئەڤ مەبەستە ژ مەبەستێن سەرەکیێن قەسیدەیێ نەبووینە. بۆنموونە ـ هەر وەکو مە بەری نهۆ ئاماژەپێدای ـ غەزەل هەتا سەردەمێ ئەمەویان ژی وەکو پێشەکییا قەسیدەیێ ڕۆلێ خۆ دیتیە. وەسف ژی ل سەردەمێ عەباسیان جارنا وەکو هونەرەکێ سەربەخۆ دیاربوویە، ئەڤە ژی ژبەر کاودانێن تایبەتیێن ڤی سەردەمی کو بوو ئەگەر شاعر گرنگیێ بدەنە وەسفکرنا کۆچکان و باغان و دیاردەیێن سروشتیێن وەکو باران و وەرزێ بهارێ و وەسفا جەنگان ب تایبەتی ئەوێن لگەل ڕومیان دهاتنەکرن، پتر ژ هەمی تشتان ژی گرنگی ب وەسفا مەیێ هاتیە دان[١٦٣]، کەواتە مەینۆشی ژی وەکو مەبەستەکا شعرێ هەتا سەدێ دوویێ کۆچی ب هونەرەکێ ئەدەبیێ سەربەخۆ نەهاتیە هژمارتن و وەکو مەبەستەکا لاوەکی د پێشەکیاندا خویابوویە؛ هەر وەکو ڕاوەستیان لسەر وێرانەیان و وەسفا حێشترێ؛ واتە د پێشەکییا قەسیدەیێدا هاتیە بکارهینان و مینا ئامرازەکی بوویە

بۆگەهشتنا شاعری ب مەبەستا سەرەکییا قەسیدەیێ[١٦٤]. نهۆ ئەم دشێین بێژین مەبەستێن سەرەکییێن قەسیدەیا کەڤن ستایشکرن و شانازیکرن و داشۆرین و لاوانەوە بووینە و مەبەستێن دی پتر د خزمەتا ڤان مەبەستاندا بووینە.

لگەل هاتنا ئیسلامەتییێ گۆهرینەك بسەر ڤان مەبەستاندا هاتیە، ژبلی هندێ کو هێدی هێدی هندەك مەبەستێن وەکو غەزەل و وەسف و مەینۆشییێ بووینە مەبەستێن سەرەکی، هندەك مەبەستێن سەرەکییێن بەرێ ژی بەرەڤ لاوازییێڤە چووینە. مەبەستا شانازیکرنێ لسەردەمێ عەباسیان بەرەڤ لاوازییێڤە چوویە، چونکە ژ لایەکیڤە زۆربەی شاعران سەر ب چ عەشیرەتێن ناڤدارێن عەرەبان نەبوون؛ دا کو شانازییێ ب کۆك و ڕەسەنایەتییا خۆ بکەن، ژ لایەکێ دیڤە ژی دەمارگیرییا قەبەلی بەرەڤ لاوازییێڤە چوویە[١٦٥]. مەبەستا داشۆرینێ ژی لاوازبوویە، چونکە لگەل کاودان و بارودۆخێن پشتی هاتنا ئیسلامەتییێ نەدگونجیا. ئەو مەبەستا کو پشتی ئیسلامەتییێ نە ب تنێ بەردەوامیدایە هەبوونا خۆ بەلکو بهێزتر ژی لێهاتیە، مەبەستا ستایشکرنێیە. هەر ئەڤ قەسیدەیا ستایشکرنێ بوویە بناغە بۆ پرانیا هەلسەنگاندن و بریارێن ڕەخنەییێن زانایێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دەربارەی شعرێ. لگەل ڤان هەمی گۆهرینان دشێین بێژین کو ب شێوەیەکێ گشتی تەنانەت ل ((سەردەمێ عەباسیان ژی گوهڕینەکا وەسا بسەر مەبەستێن شعرێ نەهاتیە و ب تنێ چەوانییا پێشکێشکرنا وان هاتیە گۆهرین...))[١٦٦]

مەبەستێن شعری بریتی نینن ژ جۆرێن جودا و دەستنیشانکری بەلکو بریتینە ژ هندەك کێلگەیێن واتایی کو خودان هندەك تایبەتمەندییێن زمانینە.لێ ڕەخنەگرێن کەڤن ئەڤ مەبەستە بۆ پۆلینکرنا شعرێ بکارئینایینە و وەکو جۆرێن ژێك جودا سەرەدەری لگەل وان کرینە[١٦٧]، لێ دیارە ئەڤ دابەشکرنە و جوداکرنە بەرهەمێ لاساییکرن و تێگەهشتنا شاعرێن کەڤن بوویە و نەوە بۆ نەوە هاتیە پاراستن و بوویە ئەگەر کو شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی د بازنەیا چەند مەبەستێن دیارکریدا بهێتە سنووردارکرن.

د ڤەكۆلینێن شعرییێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامیدا گەلەك زاراڤێن جودا بۆ مەبەستێن شعرێ هاتینە بكارهینان، هندەك جاران زاراڤێ هونەرێن مەبەستان (فنون الاغراض) یان هونەرێن ڕێبازا شعرێ (فنون الطرق الشعرية)، یان ماكێن ڕێبازا ڤەهاندنا شعرێ (امهات الطرق الشعرية) یان جۆرێن شعرێ (اصناف) و جارنا زارڤێ ستوونێن شعرێ (اركان) و چەندین زاراڤێن دی هاتینە بكارهینان[١٦٨]، هەڤواتاكرنا بابەت یانكو مەبەستێن شعرێ لگەل هونەر و ماك و جۆر و ستوون و چەندین زاراڤێن دی ڤێ چەندێ ددەتە دیاركرن كو تا چ ڕادە پێرەویكرن و دویڤچوونا ڤان مەبەستان گرنگ بوویە و شعر و شاعربوون تا ڕادەیەكێ زۆر ب پێرەویكرن ژ ڤان مەبەستانڤە هاتیە گرێدان.

دیارە شعرا عەرەبی وەكو سەروكانییا لاساییكرنا شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بەری شعرا مللەتێن دیێن ڕۆژهەلاتا ئیسلامی كەفتیە داڤا لاساییكرنا مەبەستێن شعری. ل ڤێرێ (شاعر نەچار بوویە ئەزموونێن شعرییێن كەڤن بكاربینیت، چونكە شعرا عەرەبی هەر شعرەكا لیریكی بوویە و بابەتێن وێ نەهاتینە گۆهرین، چ گۆهرین بسەر غەزەل و داشۆرین و لاوانەوە و شانازیكرن و بابەتێن دیدا نەهاتیە، ئەڤ شێوەیێ دووبارەكری هەر د مێشكێ شاعراندا مایە یانكو شعرا عەرەبی ژ لایێ بابەت و وێنە و جۆریڤە چ گۆهرین ب خۆڤە نەدیتینە...بابەتێ شعرێ هەر وەكو خۆ مایە، واتە بریتی بوویە ژ ستایش و داشۆرین و لاوانەوە و وەسف و غەزەلێ، یانكو نویكرن د ڤان بابەتان دا هاتیەكرن بێ كو بهێنەگۆهرین لەوما ئێدی ڕێكا شاعران هاتیە بەرتەنگ كرن و چ ڕێك ژبلی داهێنان د وێنەیاندا بۆ وان نەمایە، ئەڤە ژی ب ڕێكا دەستكاریكرن و خەملاندن و بۆیاخكرنا وان ب هندەك هونەرێن جوانكارییا ووشەیی و واتایی هاتیە ئەنجامدان)[١٦٩]، ب دەربرینەكا دی ئێك ژ مەزنترین هۆكارێن دووبارەكرنا وێنەییێن كەڤن مەبەستێن شعرینە؛ پێرەویكرن و لاساییكرنا هەر مەبەستەكا شعری دبیتە ئەگەر كو كۆمەكا وێنەییێن لاساییكری بهێنە ناڤ شعرا هەر شاعرەكی.

ئەڤ لاساییکرن و دووبارەکرنە ل وی دەمی بهێزتر دکەڤیت کو تەڤلی سنعەتکارییا زال بسەر شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دبیت، واتە ل وی دەمی کو بسەر شاعران دهێت سەپاندن یان شاعر ڤان مەبەستان دکەنە پیڤەرەك بۆ شعر و شاعربوونێ. (رەخنەگرێن بوارێ شعرێ هەر ژ سەدێ ئێکێ و دوویێ کۆچی لسەر ڤێ چەندێ رێککەفتن کو ئەو شاعرێ د مەبەستێن جۆراوجۆردا شعران دڤەهینیت؛ بهێزتر و خودان شیانترە ژ وی شاعرێ کو شعرێن وی ب تنێ سەر ب مەبەستەکا دیارکریڤەنە)[١٧٠]. هەر ژ سەردەمێن کەڤن رەخنەگر و شاعرێن عەرەب شانازی ب وان شاعران کرینە کو د هەمی مەبەستان دا شعر ڤەهاندینە، یانکو ئەو شاعر ب بهێز هاتیە نیاسین کو د هەمی مەبەستاندا شعر ڤەهاندبیت، بۆ نموونە لایەنگرێن (اعشى)ی گەلەك شانازی ب وی دکرن کو د بوارێ ستایش و داشۆرین و وەصف و غەزەلێدا شارەزا بوویە[١٧١]، ب ڤی رەنگی چێدبیت شاعر باسێ دلداریێ یان مەینۆشیێ بکەت بێ کو چ کارلێکەك لگەل وان هەبیت. ل ڤێرێ مەسەلا راست و درەوێ رۆلێ خۆ دبینیت، واتە گرنگ نینە کو بابەتێ شعرێ پەیوەست بیت ب باوەرییێن شاعری یان بەشەك بیت ژ ئەزموونا وی، چونکە درەو ساخلەت و ئەدگارێ شعرێیە. شاعر ب تنێ بۆ نیشاندانا شیانێن خۆ هەولددەت شعرێ د هەمی مەبەستاندا ڤەهینیت؛ ئەڤە ژی مەترسییا دووبارەکرنا وێنەیێن بەرێ زێدەتر لێ دکەت، چونکە نەبوونا کارلێکەکا ڕاستەقینە لگەل بابەتەکی، شاعری نەچاردکەت کو پتر پشتبەستنێ ب ئەزموونا شاعرێن بەری خۆ بکەت.

هەرچەندە کو پرانیا مەبەستێن شعری هەلگرێن وێنەیێن گشتییێن لاساییکری و دووبارەکرییێن تایبەت ب خۆنە، لێ چونکە ل ڤێرێ مە دەلیڤا باسکرنا تەڤایا ڤان مەبەستان نینە، دێ ب تنێ مەبەستا غەزەل یانکو دلداریێ وەرگرین کو رەنگە د شعرا کلاسیکییا کوردیدا پتر ژ مەبەستێن دی گرنگی پێهاتبیتە دان و دێ هەولدەین ڤێ چەندێ بدەینە دیارکرن کو چەوا لاساییکرنا ڤێ مەبەستا شعری بوویە ئەگەرێ دروستبوونا وێنەیەکێ گشتیێ لاساییکری د شعرا کلاسیکییا کوردیدا.

غەزەل وێنەکێشانا بەختەوەری و ئازارانە، وەسفکرنا بهەڤگەهشتن و جودابوونێیە، یانکو بریتیە ژکومکرنا هەڤدژان ب ئاوایەکێ هونەری[١٧٢]، لەوما ب ڕاستگۆترین مەبەستێن شعرێ دهێتە هژمارتن. ئەو پالدەرێ کو د ڤێ مەبەستێدا هەیە هەمان پالدەرێ ستایشکرن و داشۆرین و لاوانەوەیێ نینە، چونکە ئەڤ مەبەستە پتر ب دووروویێ دهێنە نیاسین و ڕاستبوونا هەست و سۆزان و گۆر و تینا سۆزداریێ و ڕاستەقینەبوونا ویژدانێ د واندا ناهێتەدیتن، لەوما گەلەك جاران دبنە ئەگەرێ دروستبوونا شعرێن دەستکرد و وێنەیێن نزم و لاواز. بەروڤاژی ڤان مەبەستان د غەزەلێدا و ب تایبەت غەزەلا پاك، شاعر بێ هەبوونا چ بەرژەوەندیێن ماددی وەکو بدەستڤەهینانا پارە و بەخشیشان شعرێ دڤەهینیت[١٧٣].

غەزەلا جاهلی غەزەلەکا حسی ماتریالییە کو بناغەیێ وێ ئەڤینەکا تێکەل ب حەزێن شەهوانی یان سۆزێن ئاشوپییێن زەحمەتە، هەر وەسا وەسفێن وەسا ب خۆڤە دگریت کو ڕەنگە ب تنێ د ئەدەبێ بێ پەردەدا بهێنە بکارهینان[١٧٤]، ئەم دشێین بێژین د بنەرەتدا غەزەلەکا سکسییە، (هەر ئەڤ غەزەلا سەردەمێ جاهلی نموونەیە بۆ غەزەلا سەردەمێن دیێن شعرا عەرەبی...) [١٧٥].

(هەر چەندە کو غەزەلا عەرەبی ل هەر سەردەمەکی خودان ئەدگارێن خۆ یێن تایبەتە لێ بەلگەیێن بەردەست ئاماژەیێ ددەنە ڤێ ڕاستیێ کو غەزەلا تەڤایا ڤان سەردەمان تارادەیەکێ زۆر ژ لایێ واتا و ناڤەرۆك و بابەتان وەکو هەڤ بوویە)[١٧٦]. ب شێویەکێ گشتی د ( غەزەلا عەرەبیدا شاعران زێدەرۆی د وەسفا خۆمەزن کرن و بەرزخوازی و ڕازینەبوون و پیتپینەدانا ئافرەتێدا کرینە، ب وەسفکرنا ڕۆژێن دووری و جودابوون و ئێش و ئازارێن وێ ڕابووینە، باسێ ژیانەکا پڕ ژ مەرگەسات و چەرمەسەری و نەخۆشیێ کرینە، ئاماژە داینە خۆشیێن بەرێ یانکو ئەو ڕابردوویا کو پڕ بوویە ژ خۆشی و شادیێ، ئەو ڕۆژێن کو یارا وان ب ڕەزامەندییا خۆ و بێ هیچ خۆ گرانکرنەکێ سەرا شاعری ددا، د ڤێ غەزەلێدا یار ب زالم یانکو ستەمکار هاتیە وەسفکرن، ئەڤە زوڵمەکا مەعنویە کو ژبەر خۆمەزنکرن و پیتەپێنەدان و جودا بوونا یارێ هەست پێ دهێتەکرن. جودا بوون د غەزەلا عەرەبیدا

بابەتەکێ گەلەك گرنگ بوویە و مینا جەهنەمەکێ بوویە بۆ شاعری، چوون و کۆچکرنا یارێ ب دیمەنێن گەلەك کاریگەر و هەلویستێن دژوار د غەزەلا عەرەبیدا دهێنە ل قەلەمدان[١٧٧]، گەلەك جاران د غەزەلا عەرەبیدا سیفەتێن وەکو نازداربوون و سلبوون و حیلەبازبوونێ ژی بۆ ژنێ دهێنە بکارهینان[١٧٨]. ئەڤە و چەندین نەریتێن دی بێ گۆهرین ماینە و بەردەوام بووینە، لێ لگەل هندێ جۆرە جۆراوجۆری و بەرفرەهیەك د شێوە و بابەتێن غەزەلا عەرەبییا سەردەمێ ئەمەوی و عەباسیدا دهێتە دیتن.

ل سەردەمێ ئەمەویان دوو جۆر غەزەل هەبووینە، غەزەلا عوزری و غەزەلا سکسی، ئەدگارێن غەزەلا عوزری بریتینە ژ ڕاستی، وەفادارییا ڕەها، زەلال بوون و پاقژی، شکۆمەندی، شەرم و پەرۆشی و بێخەوی و گرین ژ بەر جودایی و ئازارا چاڤەرێبوونێ، نیگەرانی و زڕخەوبوون، زێدەباری هەستکرن ب ترسێ ژبەر هەڤرك و ڕەقیبان ...)[١٧٩]، گازندەکرن ژ مەعشوقێ دیاردەکا بەربەلاڤە د غەزەلا عوزرییا سەردەمێ ئەمەوی[١٨٠]. (جمیل بن معمر) پێشەنگێ ڤێ جۆرە غەزەلێیە غەزەلا وی ب تنێ بریتیە ژ پێشاندانا پەرۆشیێن شاعری و گازندەکرن ژ دوورییا یارێ بێ کو بەرەڤ وەسفکرنا جوانییا وێ و چێژا بهەڤگەهشتنێ بهێتەکرن، ئەڤ غەزەلە ب غەزەلا پاك یان بەدەوی هاتیە نیاسین...)[١٨١]

غەزەلا سکسی ژی ئەو غەزەلە کو (عمربن ابی ربیعە) سەرکێشییا وێ دکەت و نێزیکە ژ ساخلەتێن شعرا جاهلی (تێدا شاعر وەسفا جوانییا لەشێ ئافرەتێ دکەت و باسی چێژا دیدارا خۆ لگەل یارێ دکەت، ل ڤێرێ بەژن وەکو تایێ دارێیە (البان) کو مینا لەڤەنا حەیزەرانێ دلڤیت، پرچ مینا شەڤێ تارییە، چاڤ مینا چاڤێن گایێ کیڤی و سینگ وەکو خۆدیکەکا زەلالە، گەردەن مینا داڤێیە... هتد)[١٨٢].

لسەر بناغەیێ شعرێن (عمربن ابی ربیعە) و شعرێن (جمیل بن معمر) دشێین ئەدگارێن غەزەلا ئەمەوی بدەینە دیارکرن و بێژین ( غەزەل ئەو شعرە کو بابەتێ وێ لدور حەژێکرن و عەشقێیە، شاعر تێدا دەربڕینێ ژ لێدانێن دلێ خۆ

دکەت و ئەو ئالۆزییا کو ژ ئەنجامێ ئەڤینا یارێ دکەڤیتە د دلێ شاعریدا نیشان ددەت، ئاخفتنا دلییە بۆ دلی، هونەرێ ئاخفتنێیە لگەل ئافرەتێ جارنا ب گەرمی و پەرۆشیڤە و جارنا ب نازاندنێڤە، هەر وەسا گازندەکرنەکە ژ رۆژگارێ، زێدەباری نیشاندانا ئەو حالەتێن کو توشی شاعری دبن هەر ژ ئومێدەوار بوون و نائومێدبوونێ و ئارامی و نیگەرانیێ و دوور بوون و بهەڤگەهشتنێ)[١٨٣].

پشتی سەردەمێ ئەمەوی پێدڤیە باسێ غەزەلا عەباسی ژی بهێتە کرن چونکە ژ لایەکیڤە هەر ل ڤی سەردەمی ئێکەمین بەرهەمێن کلاسیکیێن ئەدەبێ فارسی سەرهلدانە و ژ لایەکێ دیڤە ژمارەکا بەرچاڤ ژ شاعرێن ڤی سەردەمی هەر د بنەرەتدا ئیرانینە. گەلەك لایەنێن هەڤپشک د ناڤبەرا غەزەلا سەردەمێ عەباسی و غەزەل یانکو تەغەزولا سەبکێ خوراسانیدا هەنە. (هەبوونا ژمارەکا زۆر ژ جاریەیان و گەشەکرنا ستران و مۆسیقایێ ل سەردەمێ عەباسیان، ژ فاکتەرێن گەشەکرنا غەزەلێنە، تەنانەت ڤی سەردەمی غەزەلا تایبەت ب رەگەزێ نێر ژی ژدایکبوویە)[١٨٤]. غەزەلا سەردەمێ عەباسیان ( وێنەکێ راستەقینەیێ ڤی سەردەمی پێشکێشی مە دکەت، شاعر باسێ بجهـ هینانا ئارەزو و حەزێن خۆ دکەن و ب خەم وپەژارە گازندەیان ژ ژدەستچوونا دەلیڤێن خۆشی و چێژوەرگرتنێ دکەن، ئەو راستەوخۆ دەربرینێ ژ حەز و شەهوەتا خۆ دکەن. ئەوا د غەزەلێدا دهێتەگوتن دەربرینێ ژ رابورادنێن وی سەردەمی دکەت، ئەڤە ژی نە تشتەکێ سەیرە، چونکە ژینگەها وی سەردەمی تژی بوویە ژ جاریە و غولمانێن جوان و دەستبژێر، زێدەباری کاریگەرییا بەردەواما هەبوون و ڤەخوارنا مەیێ کو زێدەتر سەقا بۆ موسیقا و ستران و خۆشگوزەرانیێ بەرهەڤ دکر...)[١٨٥]، کەواتە ئێدی غەزەل ب تنێ د چارچووڤێ وەسفا رەگەزێ مێ نەمایە و گەلەك بابەتێن دی ژی هاتینە ناڤ غەزەلا ڤی سەردەمی. ب شێوەیەکێ گشتی جیاوازیەك د ناڤبەرا غەزەلا سەردەمێ جاهلی و ئیسلامی یانکو غەزەلا بادیە و ژیانا شارنشینییێدا هەیە، ابن رشیق (عەشق و ژهەڤ دوورکەفتن و هەبوونا حەسوود و رەقیبان ب گرنگترین تایبەتمەندیێن غەزەلا سەردەمێ ئیسلامی ـ کو پتر ل پێشەکییا قەسیدەیاندا دهاتە بکارهینان ـ ددەتە نیاسین)[١٨٦].

لاساییکرنا شاعرێن بەرێ بوویە ئەگەر کو غەزەل پرانیا جاران هەلگرا چارچووڤەکێ واتایێ دیارکری بیت، واتە د بازنەیا (وەسفا جوانییا یارێ، دویربوون ژ یارێ و دیدارا یارێ، ئامازەدان ب ئێش و ئازارێن عەشقێ، خۆ شکاندن بۆ یارێ، گلەییکرن ژ دلۆڤان نەبوون و هۆڤاتییا یارێ، هەبوونا ڕەقیبان)بزڤریت.

راستە کو (وێنەیێ مەعشوقێ د تێکستێن سۆفیاندا؛ دێ بهایێ خۆ ژ دەست دەت ئەگەر ب ب نێرینەکا غەزەلی بهێتە تەماشاکرن چونکە سەرەدەریکرنا وان لگەل مەعشوقێ لادانە ژ شعرێن غەزەلییێن پاك و سکسی. ل ڤێرێ مەعشوق هێمایێ حیکمەت و عەشقێیە و جوانییا وێ ب تنێ ئامازەیەکە بۆ جوانییا هەتاهەتایی)[١٨٧]، لێ تشتێ سەرنجراکێش ئەڤەیە کو (د چارچووڤێ بکارهینانا ژنێ وەکو ڕەمزەکێ ئیلاهی، شاعرێ سۆفی بەرێ خۆ ددەتە تەڤایا میراتا غەزەلی ب تایبەت غەزەلا پاك، واتە ب سەرژنوی وەبەرهێنانا وان ب شێوەیەکێ ڕەمزی ڕادبیت. ئەڤ پێکهاتەیا ڕەمزی ل سەدێ شەشێ خویابوویە، دەمێ کو دوو ژ مەزنێن سۆفیان واتە (عمر بن فارض) و (ابن عربی) ب ڤی کاری ڕابووین)[١٨٨]، یانکو پرانیا جاران شاعرێن سۆفی د بوارێ دلداری یانکو غەزەلێدا وێنەیێن نوی پێشکێش ناکەن، بەلکو هەمان وێنەیێن کەڤن د چارچووڤەکێ ڕەمزیدا بکاردهینن، لەوما ئەڤ غەزەلە ژی تا ڕادەیەکێ زۆر پشتبەستنێ لسەر هەمان چارچووڤێ لاساییکرییێ غەزەلێ دکەت.

راستە کو غەزەلا بێ پەردە یانکو سکسییا عەرەبی گەلەك نەبوویە جهێ سەرنجا شاعرێن فارس لێ لگەل هندێ ژی گەلەك تایبەتمەندییێن غەزەلا عەرەبی د شعرا فارسیدا دهێنە دیتن، تەنانەت هندەك ئەدگارێن غەزەلا عەرەبییا سەردەمێ عەباسی وەکو غەزەلا تایبەت ب ڕەگەزێ نێر سەرنجا شاعرێن فارس ڕاکێشایە[١٨٩]، یانکو ب شێوەیەکێ گشتی پرانیا جاران عەشق و دلدارییا شعرا فارسی ژی ژ چارچووڤێ واتاییێ غەزەلا عەرەبی دەرناکەڤیت.

دیارە کو عەشق و خۆشەویستییێ جهەکێ تایبەت د شعرا کلاسیکییا کوردیدا هەیە و د پرانیا شعرێن لیریکییێن کوردیدا گرنگی ب بەرجستەکرنا

عەشق و خۆشەویستیێ هاتیە دان.شاعرێن کلاسیکیێن کورد باسێ جوانییا خۆشتڤییا خۆدکەن و چەندین دێران بۆ پیشاندنا ئەزموونا عەشق و خۆشەویستییا خۆ تەرخان دکەن. ئەڤە هەتا وی ڕادەی کو دکارین بێژین خواندەڤانێ شعرا کلاسیکییا کوردی هەمیشە چاڤەرێی بکارهینانا وێنەیێن دلداری و دەربڕینێن تایبەت ب عەشق و خۆشەویستییێیە، لێ ئەو تشتێ کو جهێ بایەخدانێیە ئەڤەیە کو لایەنێ عەشق و دلدارییا شعرا کلاسیکییا کوردی ژی پرانیا جاران پەیوەستە ب لاساییکرنا چارچووڤێ واتاییێ غەزەلا فارسی و عەرەبی و هەمان ڕەگەزێن لاساییکرییێن مەبەستا غەزەلا رۆژهەلاتا ئیسلامی بکاردئینیت؛ ئەڤە ب خۆ ژی دبیتە ئەگەرێ دروستبوونا وێنەیەکێ گشتیێ لاساییکریێ پەیوەست ب دلدارییێ د شعرا کلاسیکییا کوردیدا:

أ. وەسفا جوانییا یارێ:

شاعر ل هەمبەر خۆشتڤییا خۆ ڕادوەستیت و وەسفا جوانییا وێ دکەت، جوانییەکا نموونەیی و بێ کێماسی، ئەم دشێین بێژین کو چ شاعرێن کلاسیکیێن کورد نینن کو وەسف و وێنەیێن وەسا بکار نەئینا بن:

قــامــەتی تۆ نەخلی تــووره تەلعەتی تۆ نووری تـــوور
دەم بە دەم وا وەجهی جیلوەت مەست و حەیرانم دەکا...(وەفایی (دیوان)، ل٤٠)

دەڵـێـی شەکــرفرۆشی شاری میسره وا بە شــیریــنی
بنازم!خاڵی وەك هیندوو لە گۆشەی لێوی خەندانت
تــەلیـسمی بابلە، یا سیحری حەلالە، ڕەنگی ڕیحــانە
شـکــەنج و بـەنــد و یــاخــــۆد زولــفی ســـەر شـــانت ...(وەفایی (دیوان)، ل٥٧)

وەسفا جوانی و نازکییا یارێ تشتەکێ سروشتیە، لێ تەقلیدیبوونا ڤان وەسفان و دەرنەکەفتنا وان ژ چارچووڤێ وەسف و وێنەیێن کەڤنە کو ئەزموونا دلدارییا شاعرێن کلاسیکی دئێخیتە گومانێ و ڤێ هزرێ بۆ مە چێدکەت کو

ئەو جوانى و نازكييا كو د شعرێن واندا دهێتە باسكرن ب تنێ دووبارەكرنا وان وەسف و وێنەيانە كو د قەسيدەيا عەرەبى و خوراسانى و سەبكێن دييێن شعرا فارسيدا باوبووينە.

د قەسيدەيا كەڤنا عەرەبى و خوراسانيدا پتر باسێ پرچا ڕەش و چاڤێن ڕەش هاتيەكرن، ديارە ئەڤە پيڤەرێن جوانيێ بووينە ل دەڤ شاعرێن عەرەب و پاشى ژ لايێ شاعرێن سەبكێ خوراسانى ژى هاتينە دووبارەكرن، شاعرێن كلاسيكييێن كورد ژى پرانيا جاران ژ ڤى چارچووڤەى دەرنەكەفتينە و وێنەيێن وان هەر لدور چاڤێن ڕەش و پرچا ڕەش دزڤرن، ڕەنگێن دى تا رادەيەكێ زۆر هاتينە پشتگوهـ هاڤێتن، سەيرە كو ڕەنگێن سەرنجراكێشێن چاڤێن كەسك و شين چ ئامادەبوونەكا وەها د شعرا كلاسيكييا كورديدا نينە:

ب ***سياهێ*** چەشمێ نەززارە ب قەددا تە غـەيـور
هەمە ئكسيرە بخو نە قرە و سـارا چ عـەجـەب...(شيخ نورالدين (ديوان)ل ٦٥)

ڕۆن كـر پـورەيـا تـا سـەرا دلبەر ل جامێ داكـەرا
ناچە تو جلد و دەفتەرا، وەسفێن حەبيبا چاڤ د ڕەش...(قەدريێ جزيرى (ديوان)ل ٢٨)

ئـەى پـەرتـەوى ڕەنگت وەكو ڕەنگى هەمەرەنگە
خـالـت بە مـەسەل زولفى ***سياەت*** شەوە زەنـگـە...(تاهيربەگ (ديوان)ل ٧٧)

گەر بە ئۆمێدى ويسالى ***شامى*** زولـفـى تۆ نەبێ
سەر لەكەل دەرنايەنێ هەر نايەوێ ئـەو مانـە ڕۆژ...(حەمدى (ديوان)ل ٣٢)

چـەشـمـەيا خـەددێ تە چـون پـوڕ نـوور بـوو
زولـفـێ ***شەب*** ڕەنگێ تە خـوەش لێ بـوو نقـاب...( فەتحى (ديوان)ل ٨٢)

سـيەهـ زولفێ كو پەيدا بـوو، ژ ڕۆژێ، نـوورە هـنـدا بوو
عەجيب نوورەك ل من دابـوو، هەتا شەهمارێ قاتل هـات...(مەلايێ باتەيى (ديوان)ل ١٥٥)

کەواتە خۆشتڤییا هەمی شاعران چاڤرەش و پرچ ڕەشە، ڤێجا جارنا شاعر ب ڕێکا وەسفا چاڤان ب ڕەنگێ ڕەش یان سیاهـ ڤی وێنە پێشکێش دکەت یان ب ڕێکا بکارهینانا خواستن و لێکچواندنێن وەکو (شەڤ، شەب، شام..).ئەڤ چەندە بروی و دەڤ و ئەرزینک و گەردەن و بەژنا یارێ ژی ب خۆڤە دگریت، ب دەربڕینەکا دی خۆشتڤییا هەمیان ئێکە، ئەو پرانیا جاران هەر پیڤەرێن جوانییا باو د قەسیدەیا کەڤندا دووبارە دکەن، بێ کو کارلێکێ لگەل خۆشتڤیەکا ڕاستەقینە بکەن. لاساییکرن د ڤی بواریدا هند بهێزە کو بچویکترین گۆهرین دبیتە ئەگەرێ دروستبوونا نەهەڤسەنگی و ناهەماهەنگیێ، بۆ نموونە (شیخ عبدالقادرێ هەزانی) د شعرەکا خۆ دا ل جهێ ڕەنگێ (سپی) مەعشوقا خۆ ب (ئەسمەر) وەسفکریە، هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەر کو هەڤدژی و نەگونجانەك د ناڤبەرا وێنەیێن ویدا دروست ببن:

دێرا ئێکێ:

(ئــیــرۆ مــە دیــتــی ئــەســمــەرێ شیــریـن قـــەدێ خــوەش خــەبەرێ
دەمــا دلـــێ مـــن ب کـــەســـەرێ اهـــلا و ســهــلا مــرحــبــا
دێــرا دەهــێ: رەیحــان و سورگول مــاوەری زەندێ سپــی دێـمــا زەری
کــێ دی گــەلـۆ ئــەو ڕەنگ پـــەری اهـــلا و سهـــلا مــرحـبــا
دێرا دوازدێ: دێما زەری زەنـدێ سـپـی ئـیشـــەڤ د خــەونێ دا مــە دی
مـن کــەس ب مــثــلــێ وێ نــەدی اهــلا و ســهــلا مـــرحـــبــا
دێرا چواردێ:تەبعەت مەلەك خوەش بەشەرە نوورین جەبینە ئەنوەرە
بـــەدرەك تـــەمـــامـــە قـــەمـــەرە اهــلا و ســهــلا مـرحـبـا

دێرا شازدێ:

نوورەك شەفافە ڕوهنییە دێم ئەسمەرە خوەش جندیە
ب نسبەت طـەریقەت غـەوثییە اهلا و سهلا مرحبا)(١٩٠)

راستە كو نەگونجانا د ناڤبەرا (ئەسمەر، زەندێ سپی، دێما زەری، نورین جەبین، دێم ئەسمەر) بۆ لاوازبوونا تەوەرێ ستوونییا خەیالا شعری دزڤریت لێ د هەمان دەم دا تەڤایا لێكچواندن و خواستنێن گرێدای ب جوانییا ئافرەتێ بۆ ڕەنگێ سپی هاتینە دانان و هەر لادانەك ژ ڤێ چەندی دبیتە ئەگەرێ ئالۆزی و ناهەماهەنگییا كارێ شاعرێن لاسایكەر كو وێنە و دەربڕینێن خۆ ژ شاعرێن بەرێ وەردگرن. هەر چەندە شاعری چەند جاران داكۆكی لسەر ئەسمەربوونا یارا خۆ كریە لێ نەشیایە خۆ ژ وەسف و وێنەیێن تایبەت ب ڕەنگێ سپی ڕزگار بكەت.

**ب. دویربوون ژ یارێ و دیدارا یارێ:**

ڕەهـ و ڕیشالێن دویربوون ژ یارێ و ئارەزوویا دیتنا وێ بۆ پێشەكیێن قەسیدەیا عەرەبی و خوراسانی ڤەدگەریت، داكۆكی كرنا ژ ڕادەبەدەرا شاعرێن عەرەبێن جاهلی لسەر كۆچكرنا خۆشتڤیان و باسكرنا (فیراق) و (هیجران)ا یارێ بوویە ئەگەر كو كو ئەڤ تۆخمە بۆ قەسیدەیا خوراسانی ژی بهێتە ڤەگوهاستن، ئێدی باسكرن ژ كۆچا یارێ و دووربوونا وێ و حەزا دیتنا وێ بوویە بەشەك ژ ناڤەروكا دلدارییا شعرا كلاسیكییا دەڤەرێ.

هیجران و فیراق وەكو ئێک ژ پێدڤیاتییێن بابەتێ دلدارییێ د پرانیا شعراندا دهێتە دووبارەكرن، ئەم نەشێین ڤێ چەندێ ب ژیانا تەڤایا شاعرانڤە گرێبدەین و بێژین كو تەڤایا وان ژ یارێن خۆ دووركەفتینە بەلكو دووبارەبوونا ژ ڕادەبدەرا وێنەیێن ب ڤی ڕەنگی ڤێ ڕاستیێ بۆ مە ددەنە خویاكرن كو ئەڤە چەندە ب ڕێكا لاساییكرنێ هاتیە وەرگرتن:

لە یەك میصرەع ئەگەر سالم بنووسێ شەرحی هیجرانت
بـەسـەر مـەعنای كـەلامـا تا حەشـر دوڕی ڤەمین ئـەرژێ...(سالم (دیوان)، ل ١٠٠٦)

كارێ كە خەم و دەردی فیراقت بە منی كـرد
سـەرمـا بـە هـەتـیو، بـا بە دەواری شـڕی كـرد...( شیخ رەزا (دیوان)، ل ٢٦)

طــەمــەفا سەبرێ مە نایێ كو ژ هجرێ مـرین
چو حەكیمان قەنەدی مایە ل سەكز طەمەفا ...(شیخ نورالدین (دیوان)ل٤٤)

عیدە و هەر كەس موفەررەح ئەو ژ دیدارا حـەبیب
ئەز تەنێ مەهجورێ یار و زار و گریان و كـەئیب...(فەتحی (دیوان)ل ٨٦)

ڕەنگە مەبەستا هەر ئێك ژ وان ژ ڤێ یارێ تشتەكێ جیاواز بیت. یانكو چێدبیت یار حەقیقی یان مەجازی بیت، لێ تشتێ كو هەمیان پێكڤە گرێددەت ئەوە كو هەمی باسێ هیجران و جودایی و دووریا یارا خۆ دكەن.

ج. ئاماژەدان ب ئێش و ئازارێن عەشقێ:

گەلەك جاران شاعرێ كلاسیكی د چارچووڤێ دلدارییێدا باسێ ئێش و ئازارێن خۆ دكەت، لاوازییا شاعری و بێ هیزییا لەشی و داكۆكیكرن لسەر بەردەوابوونا وی د عەشقێدا، موبالەغەكرن د وەسفا ئێش و ژانێن خودییێن شاعری ژ ئەدگارێن ڤان وەسفانن:

هــەر دەمــێكــە لــە خــەمــا غــەرقــەیــی خــوونم
هەر لەحزە لە دەس جەورە فەلەك مات و زەبوونـم
بەسراوە بــە زنجــیری ئــەلــەم گــەردنی شــەوقم
مـەشهورە لە ناو ئـەهای جیهان شـۆری جـنـوونم...(تاهیر بەگ (دیوان)، ل٥٠)

ئێک ژ دیمەنێن باو د ڤی بواریدا  ئێش و ژانێن شەڤێ و نەنڤستن و هشیاربوونا هەتا بەیانێیە:

شــەو تا سەحەر وەك گوڵ پڕ لە خـوێناوم

یا خودا شەماڵ بێنێ، بێنی عەرەقی چینت...(وەفایی (دیوان)ل٦٤)

هــەر شــەڤم نـەعـرەزەنـان تـا ب ســەحـەر

ب ســەگــێ کـوی تورا هــەم نـەفـەسین...(جزیری (دیوان)، ل ٣٩٣)

شـــەوان تـــا وە ڕۆ فـکــرم جــە لاتــەن

ڕۆحــی ڕەوانــم نــە خــاکـــی پــاتــەن...(مەولەوی (دیوان)، ل ٤٣-  ٤٤)

ل تەڤایا ڤان دێران وێنەیێ نەنڤستن و دەربازکرنا شەڤێن دژوار دهێتە دیتن.

**د. خۆ شکاندن بۆ یارێ:**

ئێک ژ کەڤنترین ئەدگارێن غەزەلا عەرەبی و فارسی خۆشکاندن و پەستبوونە ل هەمبەر خۆشەویستێ، ئەڤ چەندە مینا دەروازە یا ڕێخۆشکەرەکی بوویە بۆ بۆ ستایشکرنا دەستەلاتداران، خۆ ب کێم زانین و خۆشکاندن بۆ یارێ سەقای بۆ ستایشکرنێ بەرهەڤ دکەت. ئەڤ ئەدگارە پشتی لاوازبوونا قەسیدەیێ ژی هەر بەردەوام بوویە و پرانیا جاران ئەو  دەربڕینێن کو دڤی بواریدا دهێنە بکارهینان دبنەرەت دا بەشەکن ژ زمانێ ستایشکرنێ.

شاعر گەلەك جاران خۆ ب ئاخا بنێ پێ یارێ ل قەلەم ددەت یان ب چاڤەکێ پیرۆز تەماشەی وێ ئاخێ یان وی جهی دکەت کو یارێ پێ خۆ دانایە سەر :

خەیلێن گەردی پانت نە دیدەم دوور بێ

یانەی چــەم وێران تـــەمـام خـــاپـور بێ...(مەولەوی (دیوان)، ل ٧٦)

مەحەللی سەجدەگاهم خاکی بەر دەرگانەکەی تۆیە

ڕەقیب ڕووی ڕەش بێ، ناهێڵێ بگا دەستم بە دامانت...(کوردی (دیوان)ل ١٠٤)

تاهیر سەری تەسلیمە لەبەر خاکی بەری پێت

داینـاوە ئیتر حەیفە مەکە، بەسیە قسە و باس...(تاهیربەگ (دیوان)، ل٤٤)

جارنا ژی شاعر خۆ ب خولام و خزمەتکارێ بەر دەرگەهێ یارێ دزانیت:

مەحاڵە ئیمشەو گیان وە ڕۆ بەردەن

جارێوتەر تەواف ئاسانەش کەردەن

یا خوا سەبووری وە دڵ باوەری

خەزانەی ئارام پێم عەتاکەری...(مەولەوی (دیوان)، ل٦٦)

دەریشم کەیت و سەد هیندەش ڕەقیبم لێ لە کارا بێ

غولامی حەلقە دەرگۆشم دەبێ دەرباری دەرگا بم...(کوردی (دیوان)، ل ٢٨٤)

مەفەرموو عارە پێم بەندەت کە دێ بێتە غولامی تۆ

گەدایی ئاستانەی تۆ، بە تاجی قەیسەری نادا...(ئەدەب (دیوان)، ل٥٣)

من کە مەجبوورم بە مەحکوومی غولامانی دەری

شورشی عیشقی ڕوخی موحتاجی دەربانم ئەکا...(ناری (دیوان)ل٤٤)

تو پادشاهی و ما گەدایم

تو تاجێ سەری و خاکێ پایم...(پەرتۆ بەگێ هەکاری...(دیوان)، ل١٩٢)

هەر وەسا شاعر خۆ ب سەیێ بەر دەرگەهێ مەعشوقێ وەکهەڤ دکەت:

ب تولێن ئاستانێ ڕا ڤەخوندم میر ب دەرگاهێ

ب ڤێ چاڤێ حەبیب دیتم شوکور ئەڤ شەفقە مەولێ دا...(جزیری (دیوان)،ل٥١)

دەخیلی ئەو سەگی بەرقاپییەم جارێ بە یەکجاری

سەرئەفرازم بکە، فەرموو: سەگی بەر دەرکی خۆمانە...(مەحوی (دیوان)، ل١١٤)

رەقیبت دەرکە ئەم بەردەرکە پاکە پیس ئەکا، فەرمووی:

کــە بــەم بـــەرقـاپییـە لازم سـەگـێکـی وایــە، بـــۆ بـــروا ؟.. (مەحوی (دیوان)ل٦٦)

حـەیفە سەگی قاپیت لە زیانا بی زەمـانی

بیّ باکم ئەگەرنا هەزار جورم و جینایەت...(حەریق (دیوان)، ل٣٠)

نــوبــەداریّ قـوللەهــیّ خــوە

دەرگەڤانیّ دەرگەهیّ خـوە

بینە بیر و ئاگــەهیّ خـــوە

تــوولەیــیّ ئاسـتانم ئەز

تـــوولەییّ دەرگاهیّ یـارم

شـــەزڤ و ڕۆژان نـــوبـــەدارم

وەســتــاییّ دەر ئـنـتـظـارم

چــاڤەرێی سـولتانم ئەز...(فەقی تەیران (دیوان)، ل٨٥)

هەر لەحزە دەلێم من سەگی دەرگام و ڕەقیبیش

دێتە سەر و چاوم کە منیش سەگ مەگـەسێکـم...( نالی (دیوان)، ل٢٩٤)

چێدبیت پرانیا وێنەیێن ب ڤی ئاوایی بەرهەمیّ پێکڤەژیانا غەزەل و ستایشکرنیّ بن، چونکە هەر وەکی بەری نهۆ مە ئاماژەپێدای ئەڤ مەبەستە بۆ ماوەیەکیّ درێژ وەکو پێشەکییا قەسیدەیێن ستایشی ڕۆلیّ خۆ دیتیە و وەکو دەروازەیەکیّ د خزمەتا ستایشکرنێدا بوویە.

**و. کلەییکرن ژ دلۆڤان نەبوون و هۆڤاتییا یاریّ:**

خۆشەویست د شعرا کلاسیکییا کوردیدا ژی ب هەمان ئەدگارێن باو د شعرا کلاسیکییا عەرەبی و فارسی دهێتە سالۆخدان، ئەو سیفەتێن کو بۆ خۆشەویستیّ دهێنەبکارهینان نێگەتیڤن و لگەل نازکی و سروشتیّ ویّ حەژێکرنا کو د داستانێن ڕۆژهەلاتی و فلکلۆریّ کوردیدا هەنە ناگونجن.ئەڤ خۆشەویستە

بێ وەفا و خائینە و نەدلۆڤانە وکێم جاران باسێ وەفادارییا وێ دهێتەکرن، ئەڤ چەندە د شعرا کلاسیکییا کوردیدا ژی دهێتە دیتن:

ئەی ڕەفیقان بێن بە خەنجەر بمکوژن ئێوە و خودا
تا خەلاصیم بێ لە دەس هیجرانی یاری بێ وەفـا...(کوردی (دیوان)، ص٥١)

دلبەرەی قەد عەرعەرەی بێ ڕەحمەکەی بەدبەختەکەم
دل ڕفێـنـەی شـۆخـەکـەی بـێ عـەهد و پەیمـانم وەرە...(تاهیربەگ (دیوان)، ل٦٤)

ژیلی بێ وەفا بوونێ ئەڤ خۆشەویستە ئازادە، جار ل دەڤ شاعریە و جار لدەڤ ڕەقیبیە، دەمدەیە و جهێ باوەریێ نینە:

دوێنێ شـەوێ فەرمووت:عەهد بێ بێ وەفایی قەت نەکـەم
کامە شەو بوو چاوەکەم، سەد وەعدی وا سەختت نەبەست...(ئەدەب (دیوان)، ل٨٠)

دەسـتی من دامێنی تۆ ئەی خامەیی موشکین نـەفەس
با بـنووسین مـاجـەرای هیجرانی یاری بـولهـەوەس...(حاجی (دیوان)، ل٧٣)

خۆشەویست هندەك شەڤان ژڤانێ لگەل شاعری دادنیت و پاشی سۆزا خۆ بجهـ نائینیت و دچیتە دیدارا کەسەکێ دی، پەیڤا (بولهەوەس) ژی بۆ وێ خۆشەویستێ دهێتە بکارهینان کو هەر ڕۆژ لسەر بۆچوون و بڕیارەکا جیاوازە.

ئەڤ یارا بێ وەفا و دەمدەمی ستەمکار و بکۆژە و ڕەوشتێ وێ مینا ڕەوشتێ دڕندەیانە، سیفەتێن وەسا دهینە دان بال خۆشەویستێ کو پتر بۆ جەنگاوەرکێ نێر گونجاون تاکو ژنەکا نازك:

گـروهی عـاشقان ئەمرۆ هەموو هاتوونە پابـۆسیت
منیش هاتووم بفەرمووی بمکوژن بمکەن بە قوربـانت
لە کـوشتن گـەردەنـت ئـازادە، بێیە سـەر قـەبرم
بە ڕۆژی جومعە بمنێژن لە لای قەبری شـەهـیدانـت...(کوردی (دیوان)ل ١٠٤)

هەر لەحزە ئــەدەی وەعدەیی وەسل و نییە ئەســلی
کــارت وەکــو دونیایە هــەر ئەمــرۆیە بە فـــەردا
مەقسوودی لە سەر کوشتنی عـوشاقی زەعــیـفـە
وەختیَ کە دەکا خەنجەری تیژی بە کەمــەر دا ...(تاهیربەگ (دیوان)، ل٣٤)

یــاری مــن هــەرگیز لە قـەتلی عـاشقی پەروای نییە
چونکە ڕوومەت شەمعە بۆیە حەز بە سووتانم دەکــات...(وەفایی (دیوان)، ل٣٩)

جارنا ژی شاعرێن کورد زێدەرۆیی د ڤیَ چەندێدا کرینە هندەك تایبەتمەندییێن دییێن نێگەتیڤ داینە بال خۆشەویستا خۆ:

تووشی یاریَ هاتووم سەححار و دوزد و حیلەباز
تورك ڕەفتار و تەبیعەت کافر و صوفی نــومـا ...(کوردی (دیوان)، ل٥١)

ئەڤ یارا کو شاعر سالۆخا ویَ ددەت یارەکا ئاست نزم و بەدرەوشتە و ب چ ڕەنگان نێزیکی سیمبۆلێن عەشقا ڕۆژهەلاتی نینە، کەواتە ئەم دشێین ببێژین ئەدگار و سیفەتێن کو د شعرا کلاسیکییا کوردی بۆ یار یان خۆشەویستیَ دهێنە بکارهینان پتر وێنەییَ ژنا ئازادا سەردەمیَ جاهلی و جاریە و غولامێن سەردەمیَ عەباسی و کۆچکێن دەستەلاتدارین خوراسانییە. بیَ وەفایی، دەمەدەمی بوون، بیَ ڕەوشتبوون و حیلەبازبوون ژ تایبەتمەندییێن جاریە و غولامان بوو کو چ سۆز و پەیمان بۆ کەسیَ نەبوون، بکۆژبوون و ستەمکاربوون ژی ژ ئەدگارێن غولامێن تورکێن کۆچکا سامانی و غەزنەوی و سەلجۆقیانە.

**ی. ڕەقیب:**

پرانیا جاران ڕەقیب وەکو بەشەك ژ ململانا خۆشەویستییا شعرا کلاسیکییا کوردی ڕۆلیَ خۆ دبینیت، ڕەقیب کەسەکە کو دکەڤیتە د ناڤبەرا شاعر و خۆشتڤیا وی، ڕەقیب ژی مینا شاعری هەڤرکییَ د بدەستڤەهینانا خۆشتڤیا شاعری ددەت، خیانەت و حەسیدی و پیلان دانان و دژایەتیکرن ژ سیمایێن ڤی کەسینە:

Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەری زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

- سەرکەفتن بسەر ڕەقیبی:

کە ڕەقیب دیی، من و یار پێکەوە نیشتووین لە ڕقـا
وەك سـەگـی پەت بکرۆژێ، دەم و لێـوی دەکرۆت...(کوردی (دیوان)، ل١٠٨)

ڕەقیب و موددەعی وەك پووش و پـووشـو
بسووتێنین کە وەك بەرقین، لە بەر قـین...(نالی (دیوان)، ل٣٦٠)

- سەرکەفتنا ڕەقیبی بسەر شاعری:

دل بە سەد خوێنی جگەر خونچەی گەیاندێ بۆ گـولم
ئـەو ڕەقیبە گـەبـر ئێستا مونعی گـولـزاری دەکـا...(ئەدەب (دیوان)، ل٦٠)

دلـخـوشـیا ڕەقـیـبی، دە هیـجـرەتـا غـەریـبی
سوننەت کرن حەبیبی، لەو چوونە من ئـەطـایب...(شیخ نورالدین (دیوان)، ل٨٣)

لەم ڕێگەیە تەقدیری ئەزەل وابوو کە ئێـمە
پامالی جەفا بین و ڕەقیب سەیر و سەفا کا...(شیخ رەزا (دیوان)، ل٢٦)

یارم لە ئەندەروون هات دەستی ڕەقیب لە دەستا
غـەمناك و شـادمانم ڕەحمەت عـەزابـی هـێنـا...(سالم (دیوان)، ل٣٩)

با ساتێچ ڕەقیب دووریت بکێشۆ
شەوێ وێنەی من وەی ڕۆوە نیشۆ...(مەولەوی (دیوان) ل٥٩)

نهۆ ئەم دشێین بێژین تابلۆیا دلدارییا غەزەلا کوردی یانکو وێنەیێ گشتیێ عەشقێ، تابلۆیەکا لاساییکری و سواوەیە و بەرهەمێ لاساییکرنا مەبەستا غەزەلا شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامیە و کێم جاران شاعران هەولا گۆهرینان ڤێ تابلۆیێ دایە.گەلەك ژ غەزەلێن کلاسیکیێن کوردی ب تایبەت یێن کو پتر گرنگیێ ددەنە دلداریێ تەڤایا ڤان توخمان ب خۆڤە دگرن وەکو ڤێ غەزەلا (ئەدەب)ی:

ئـەی شـەككرین دەهـانی، شـەككەر نـوتفی، لێـو نـەبات
شیــرین هــەمــووشــەمایل و شیــریــن هەمــوو ئـــەدات
جـاریٚ لـــە حـــالی خـەســتە دلٚانـت بـە لــوتف و نـــاز
بۆچـی دەبـی نەپرسـی؛ کـە چـۆنن لـە خـاکـی پـات
جـــان و ســـەرم بــە بـــادا لـــە خــاکـــی ڕێـــت
نەمـــزانی تـا ســـەرت نییـە؛ ئـــەی بــیٚ بـەقـا: وەفـات
عـومـرێکــی بــیٚ لـەبــت گـــوزەرا؛ بــۆ مــە مــردنە
وەك مـــردنی بـەرابـــەری تــۆ، بـــۆ مـــەیە حـــەیات
یـــا ڕەب! دەبـــیٚ هـــەر ئـــەمــن و تـــۆ بـین، بـیٚ ڕەقیب
بگـرم؛ لـە گـەردنی بخـەم، ئـــەو زولفـی تـــا بـــە تـــات
وەعـــدەت بـە وەسـلٚ بێنـــییە جـیٚ؛ هـــات و دەولـەتـــە
چ بکـەم ئەگـەر نـەهاتی! چ دەکـریٚ دە گـەلٚ نەهـــات
بـــۆ ئیـمـتیـــازی بـەیـــنی مـــن و عـاشـقـــانـــی تــۆ
یـەك بۆسـە کافییـە، کـە کـەرەم کـەی بـە ئیلتیفـات
خـوێـــنی مـــنـت حــەڵالــە، بـــە شـــەرتێکی خـۆت بلێـی
ماچـیٚ لـە کـونجی دوو لـەبی خوێنیمـە؛ خـوێن بەهـات
شـام و سـەحەر دوعاتـە ((ئـــەدەب)) بـــۆ ویـســالـــی یـــار
جـــارێکی وا نــــەبوو، بـە ئـیـجـــابــەت بـگـــا: دوعـــات

...(ئەدەب (دیوان)، ل٧٥) ...(ئەدەب (دیوان)، ل٧٥)

دێرا ئێکێ: وەسفا جوانییا یارێ، دێرا دوویێ: گازندە و خۆشکاندن، دێرا سێیێ: بیٚ وەفایی، دێرا چوارێ:ئێش و ئازارێن عاشقی، دێرا پێنجێ: ڕەقیب، دێرا شەشێ: جودایی و دیدار، دێرا هەشتێ: زۆرداریيا یارێ، دێرا نەهێ: جودایی و دیدار، کەواتە د ڤێ شعرێدا سەرەرای هەبوونا چەندین وێنەیێن پاژەیی، لێ وێنەیەکێ گشتی ژی هەیە کو ژ چارچووڤێ وێنەیێ گشتیێ شعرا لاسایيکرییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی دەرناکەڤیت. هەر ئەڤ وێنەییێن گشتییێن دووبارەکری دبنە بەلگە بۆ ڤێ چەندێ کو پرانیا جاران شعرا کلاسیکییا کوردی ژی پەیوەستە ب پرەنسیپێن

تەقلیدییێن وەکو درەوبوونا شعرێ و گرنگ بوونا لەفزێ چونکە ئەگەر شعر بەرهەمێ ئەزموونا ژیانا شاعری بیت؛ وێنەیێن گشتییێن شعرا وی هەمیشە وەکو شاعرێن دی نابیت، لێ ئەگەر بابەتێن وەکو دلدارییێ مینا مەبەستێن شعری و مەیدانا سنعەتکارییا شاعری بهێنە تەماشاکرن؛ دێ پەیوەستبن ب وێنەیێن گشتییێن شعرا شاعرێن بەرێ و ژ چارچووڤێ لاساییکرنێ دەرناکەڤن

## ٣.٢.٢. رۆلێ سیستەمێ قەسیدە و فرەمەبەستییێ:

د شعرا عەرەبیدا ژی ژبلی قەسیدەیێن پێشەکیدار قەسیدەیێن بێ پێشەکی ژی هەنە کو پتر ئەو شعرن کو ڕەنگڤەدانا ورۆژانا دەم لدەست و بلەزا شاعری بەرامبەر دیارەکا دیارکرینە، ل ڤێرێ شاعر ڕاستەخۆ دچیتە سەر بابەتێ سەرەکی و ئەو دەلیڤەیە نینە کو خۆ ب پێشەکییێ ڤە مژیل بکەت.[١٩١] ئەڤ قەسیدەیێن بێ پێشەکی ژی ب (محدود) یان (مقتضب) یانکو بڕی یان ڤەقەتیای هاتینە نیاسین.[١٩٢] لگەل هەبوونا ڤان جۆرە نموونەیان لێ پرانیا جاران قەسیدەیا عەرەبی شعرەکا پێشەکیداربوویە.

قەسیدە و ب تایبەت قەسیدەیا ستایشکرنێ سیستەمێ خۆ یێ تایبەتی هەبوویە، ئەو سیستەمێ کو (ابن قتیبە)ی ب (نظام القصیدة) ناڤکریە. لدویڤ ڤی سیستەمی پێدڤیە قەسیدە ژ پێشەکیەکا (طللي) یانکو ڕاوەستیان لسەر کاڤلان و گریان بۆ شینوارێن یارێ دەست پێبکەت و پاشی بەرەڤ غەزەلێڤە بچیت و پشتی ب دیماهیکهاتنا پێشەکییا قەسیدەیێ بەرەڤ مەبەستا قەسیدەیێ کو پرانیا جاران ستایشە بچیت. هەرچەندە کو ئەڤ سیستەمە بەرهەمێ ژیان و ژینگەها بیابانێیە لێ بوویە ڕێبازەك بۆ وان شاعران ژی کو چ ئەزموونەکا وەسا لگەل ژیانا بیابانێ نەبووینە.[١٩٣]

د پێشەکییا قەسیدەیا جاهلیدا شاعر باسێ سەفەرا خۆ د بیابانێدا دکەت. ئامانجا وی ژ سەفەرێ ئەوە کو بگەهیتە وی کەسێ کو وی دڤێت ستایشا وی بکەت. یان ب کورتی دەروازەیەکە بۆ مەبەستا سەرەکییا شعرێ. دەمێ

(ئامەدی) د موازەنا خۆ، ئەوا د ناڤبەرا (بوحتوری) و (ئەبی تەمامی)دا کری باسێ پێشەکی یان دەروازەیا قەسیدەیێ دکەت، ئاماژەیێ ددەت حەفت بابەتێن سەرەکی کو هەر دوو شاعران ل پێشەکییا قەسیدێن خۆدا ئەو بکارهینانینە، ئەڤە ژی هەر ئەو بابەتێن باون د قەسیدەیا جاهلی و ئەمەویدا:

١. دەستپێکرن ب ڕاوەستیان لسەر کاڤل یانکو شینوارێن ئاکنجیبوونا کوچکریان.
٢. پرسیارکرن ژ وی واری و نەبوونا چ بەرسڤان وگریانا شاعری.
٣. ئاماژەدان ب جودابوون و خاترخواستن و بارکرن ژ واری و گرین بۆ ئەوێن ژێ بارکرین.
٤. وەسفکرنا ئافرەتان و پەسنا وان و ئاماژەدان ب پەرۆشی و بیرەوەری و حەژێکرنێ کو دچنە چارچووڤێ غەزەلێدا.
٥. وەسفکرنا بهێزییا عەشق و حەژێکرنێ و شەیدایی و خەم و ڤیان و بجههینانا ژڤانان و بێ سۆز و پەیمان بوونێ و بابەتێن ب ڤی ڕەنگی.
٦. باسکرن دەربارەی گەنجاتی و پیرییێ، وەسفکرنا پیرییێ و نەمانا گەنجاتییێ.
٧. باسکرن دەبارەی ڕۆژگارێ و زۆردارییا وێ، ئاماژەدان ب ڤێ چەندێ کو چەوا ڕۆژگار ڕزقی ددەتە مرۆڤێن نەزان و بێ شیان و بێن زانا و خودان شیان د ئێخیتە د تەنگاڤییێدا. هەر وەسا گرنگی ب بابەتێن وەکو هەدار و ڕازیبوونێ و پاشی هەلەت و تێکۆشان و گەریانا لدویڤ ڕزقی لسەر پشتا حێشترێ د بیابانێدا هاتیەدان.[١٩٤] (جیاوازی و جۆراوجۆری د بکارهینانا ڤان بابەتاندا هەیە لێ لگەل هندێ ژی مەرجێ قەسیدەیێ ئەوە کو بابەتێن بکارهاتی ژ چوار هەتا پێج بابەتان کێمتر نەبن و بەشێن سەرەکییێن کو پێدڤیە هەر هەبن بریتینە ژ پێشەکی (طللي یان غەزلی)، وەسفکرن و شکۆبەخشین ب وی وار و جهێ کو شینوارێ کۆچکریانە، وەسفا جهێن سەفەرا شاعری، وەسفا جهـ و بیرەوەرییێن خۆشتڤییا شاعری و پشکا

وەسفکرنێ)[١٩٥]کەواتە دابەشکرن یان کەرتکرنا شعرێ ئێک ژ تایبەتمەندییێن قەسیدەیا عەرەبی بوویە، نە ب تنێ شعر بۆ سەر پێشەکی و مەبەستێ هاتیە دابەشکرن بەلکو پێشەکییا قەسیدەیێ ب خۆ ژی بۆ سەر چەند بەشان هاتیە دابەشکرن.

راستە کو هەر ژ دەستپێکا سەرهلدانا شعرا فارسی هەتا نوکە قەسیدە ب دوو شێوازان هاتیە ڤەهاندن، واتە یان شاعر بێ تەشبیب و تەغەزول و پێشەکی ئێکسەر چوویە سەر بابەتێ سەرەکی یان بۆ ڕاکێشانا سەرنجا گوهدار و خواندەڤانان تەغەزولەك لدور دلداریێ یان ستایشا شەرابێ یان وەسفا سروشتی و وەرزێن سالێ، یان شیرەت و ئامۆژگاری یان بابەتەکێ دی ل دەستپێکا قەسیدەیێ بکارئینایە و پشتی ب دیماهیک هاتنا ڤێ تەغەزولێ ب ڕێکا (تەخەلوص)ێ ژ ڤێ پێشەکیێ بەرەڤ بابەتێ سەرەکیێ شعرێ کو ستایشکرنە چوویە[١٩٦]، لێ پرانیا قەسیدەنڤیسێن بناڤودەنگێن شعرا فارسی و نەخاسمە یێن سەر ب سەبکێ خوراسانی گرنگیدانە بکارهینانا پێشەکیێ. تەنانەت هندەك جاران لاساییکرن د ڤی بواریدا هند بهێزبوویە کو هندەك شاعرێن وەکو (منوچهری) د چەند قەسیدەیاندا هەمان پێشەکییا بیابانییا قەسیدەیا عەرەبی بکارئینانە، واتە باسێ حێشتر و بیابان و ڕاوەستیان لسەر کاڤلان کریە.[١٩٧] دیارە هەر ئەڤ نموونەیێن ب ڤی ڕەنگی بووینە ئەگەر کو ڤەکۆلەرەکێ وەکو (محمد رضا شفیعی کدکنی) پشتی باسکرنا سیستەمی قەسیدەیێ ل دەڤ (ابن قتیبە)ی بێژیت: (( هەر ئەڤ هزرا چارچووڤەدار د شعرا شاعرێن سەبکێ خوراسانیدا دهێتە دیتن، واتە ئەو شاعرێن کو حەزا نڤیسینا قەسیدەیێ ل دەڤ وان بهێزبوویە)).[١٩٨]

پرانیا قەسیدەنڤیسێن سەر ب ئەدەبێ فارسی قەسیدەیێن خۆ ب تەشبیب یان نەسیب واتە وەسفکرنا جوانییا یارێ دەست پێ دکەن داکو سەرنجا گوهداری ڕاکێشن پاشی ب ڕێکا دێرەکێ کو ب (تەخەلوص) یان (گوریزگاه) دهێتە نیاسین شاعر ژ ڤێ پێشەکیێ بەرەڤ مەبەستا سەرەکی کو پرانیا جاران ستایشە دچیت.ئەگەر شاعری داخوازەك ژی ژ کەسێ ستایشکری هەبیت دێ ل ئێک ژ

دێرێن داویێ ڤێ داخوازا خۆ بێژیت کو ئەڤ دێرە ب (بیت الطلب) دهێتە نیاسین، (بیت المقطع) ژی داوی دێرا قەسیدیە.[199] جۆراوجۆرییەك د مەبەستێن قەسیدەیا فارسیدا دهێتە دیتن[200]، هەر وەسا پێشەکییا قەسیدەیا فارسی واتە تەغەزولا دەستپێکا قەسیدەیێ گەلەك جاران جیاوازە ژ قەسیدەیا عەرەبی و پتر پێشەکییەکا بهارییە[201]، لێ ب هەر ئاوایەکی بیت د قەسیدەیا فارسیدا ژی وەکو قەسیدەیا عەرەبی فرەمەبەستی و پارچەپارچەکرنا شعرێ ژلایێ واتایی و وێنەیڤە دهێتە دیتن.

لاساییکرنا ئەدگارێن شعرا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی بوویە ئەگەر کو ئەڤ دیاردەیە د شعرا کلاسیکییا کوردیدا ژی بهێتە دیتن، هەر ژ بەردەوامبوونا وێ د چارچووڤێ دابەشکرنا شعرێ بۆ سەر پێشەکی و مەبەستێ بگرە هەتا زالبوونا فرەمەبەستییا شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی. بەردەوامبوونا لاساییکرنا فرەمەبەستی و دابەشکارییێن سیستەمێ قەسیدەیێ دبیتە ئەگەر کو شعر ب سەر دوو یان چەند بەشێن سەربەخۆ بهێتە دابەشکرن تەنانەت گەلەك جاران ئەڤ دیاردەیە دگەهیتە وی ڕادەی کو هەر دێرەك وەکو پارچەیەکا سەربەخۆ یان مەبەست و واتایەکا جودا خۆیا ببیت، هەر لسەر ڤی بناغەی هەبوونا چەند تابلۆیێن جیاواز یان وێنەیێن گشتی کو پەیوەندیەکا ئۆرگانییا بهێز د ناڤبەرا وان دا نینە، ئێکە ژ دیاردەیێن باو د شعرا کلاسیکییا کوردیدا.

د شعرا کلاسیکییا کوردیدا نموونەیێن وەها هەنە کو بەرهەمێ لاساییکرنا قالبێ قەسیدەیا عەرەبی– خوراسانینە، ل دەستپێکێ پێشەکی دهێتە پێشکێشکرن و پاشی شاعر ب ڕێکا دێرەکێ بەرەڤ مەبەستا شعرێڤە دچیت، پرانیا جاران مەبەستا ڤان جۆرە شعران ستایشکرنە و ناڤەرۆکا پێشەکییێ ژ شعرەکێ بۆ شعرەکا دی دهێتە گۆهرین لێ ب شێوەیەکێ گشتی ژ چارچووڤێ بابەتێن پێشەکییا قەسیدەیا عەرەبی و تەغەزولا قەسیدەیا فارسی دەرناکەڤن.

(شیخ ڕەزای تالەبانی) شعرەکا هەیە کو ل دەستپێکا وێ باسێ سەرهاتیەکا خۆ یا بێ پەردە دکەت:

رۆژی یەکشەممە کە مەشهورە بە رۆژی بازار
مەن بە غار کەوتمە دومبالی کوڕێکی بولغار
کوڕ چ کوڕ چاوی وەکو لالەیی حەمرا ڕەنگین
کوڕ چ کوڕ چاوی وەکو چاوی نێرگسی شەهلا بیدار...(شیخ ڕەزا (دیوان)، ل٥٥)

ئەڤ سەرهاتیە نێزیکی بیست وسێ دێران ب خوڤە دگریت و تێدا شاعر باسێ هندێ دکەت کو چەوا کورەکێ تورکنەژاد سەرنجا وی ڕاکێشایە و چەوا ئەو لگەل وی کوڕی کەفتییە گفتگۆیێ و ئەو ڕازی کریە و کارێ سکسی لگەل وی ئەنجام دایە، پشتی ب دویماهیک هاتنا ڤێ سەرهاتیێ شاعر ب ڕێکا دێرەکا شعرێ بەرەڤ بابەتێ سەرەکی یانکو مەبەستا شعرێ دچیت:

ئەمە دوو ڕۆژە کە حەیران دەگەرێم
کێم هەیە غەیری وەلی نعمەتی فەرخوندە شیعار...(شیخ ڕەزا (دیوان)، ل٥٦)

پشتی ڤێ دێرێ شاعر حەفت دێران بۆ ستایشکرنا (ئەحمەد پاشایێ بابان) تەرخان دکەت، ئەڤە ئێکەمین دێرا تایبەت ب ستایشکرنا ناڤبرییە:

یەعنی هەمنامی نەبی حەزرەتی ئەحمەد پاشا
فەخری دین، کانی حەیا، بەحری کەرەم، کوهی ویقار...(شیخ ڕەزا (دیوان)، ل٥٧)

هەرچەندە کو بەروڤاژی نەریتێ باو د قەسیدەیا عەرەبی و فارسیدا ژمارا دێرێن پێشەکیێ پترە ژ وێ بەشا کو بۆ ستایشکرنێ هاتیە تەرخانکرن لێ ب شێوەیەکێ گشتی لاساییا سیستەمێ قەسیدەیێ هاتیەکرن. ئەم دشێین پێشەکیا ڤێ قەسیدەیێ ژی ببەینە ڕێزا وان غەزەلێن بێ پەردە کو لسەردەمێ جاهلی و ئەمەوی ل دەستپێکا قەسیدەیان دهاتنە بکارهینان لێ لگەل ڤێ جیاوازیێ کو مۆرکێ نێرخوازیێ بسەردا زالە..

(بێخود) ژی شعرەکا خۆ بسەر دوو بەشان دابەش دکەت، واتە پێشەکییەك و بەشەکا تایبەت ب ستایشکرنا پێغەمبەرێ ئیسلامێ، ئەڤ شعرە ب ڤی ڕەنگی دەستپێدکەت:

دیسان چەمەن لە ڕوضەیی خولدی بەرین ئەکا
گوڵ خونچە لە لێو دەمی حووری عین ئـەکـا
ئـــاخـــۆ چ مـــانییێکە کە سەحـرا و شـــاخ وداخ
ژەنگــار و زەرد و سـپــی و سـەوز و شـــین ئـــەکــا...(بێخود (دیوان)، ل٢٢)

شاعر شعرا خۆ ب وەسفا سروشتی دەست پێ دکەت و ١٤ دێران بۆ ڤی بابەتی تەرخان دکەت، سەرەرای وەسفا سروشتی هندەك توخمێن تایبەت ب غەزەلا دلدارییێ ژی لگەل بابەتێ سروشتی هاتینە ئاوێتەکرن، شاعر دێرا پازدێ وەکو پرەکێ د ناڤبەرا پێشەکی و مەبەستا شعرێ بکاردهینیت:

ئـــەم شـــایی و ســـرووره لــە شـــەوقــی بــەهــارە، یــا
عەشقی گولێکە عەفووی هەموو موزنبیین ئەکـــا؟...(بێخود (دیوان)، ل٢٣)

پشتی ڤێ چەندێ د حەفت دێراندا ستایشا پێغەمبەرێ ئیسلامێ دهێتە کرن، ئەڤ پشکا شعرێ ژی ب ڤی ڕەنگی دەستپێدکەت:

زاتـێـکـــی وا بـــە ڕەحـمـــە لــــە ڕۆژی شـــیـفـاعـــەتـــا
هـەرچـی جەهەننەمی هەیە جـــەنـنـەت نـشـن ئــەکا
ڕۆح فەرشی ڕێگەی کەسێکە کە مەجموعی کائینات
بـۆ پێی مـوبارەکـی لـــە پـەڕەی دڵ سـەرین ئـەکـــا...(بێخود (دیوان)، ل٢٤)

ئەڤ شعرا (بێخود)ی ژ ٢٢ دێران پێک دهێت و لسەر سیستەمێ قەسیدەیا ڕۆژهەلاتی هاتیە ڤەهاندن یانکو شعر بۆ سەر دوو بەشان هاتیە دابەشکرن، وێنەیێن پاژەیێن هەر بەشەکی پێکڤە وێنەیەکێ گشتی دروست، لێ پەیوەندیەکا ئۆرگانی د ناڤبەرا هەر دوو بەشاندا ناهێتە دیتن.

ب شێوەیەکێ گشتی کەرتکرنا شعرێ بسەر دوو بەشان لاساییکرنا سیستەمێ قەسیدەیا پێشەکیدارا کەڤنە لێ لگەل هندێ ژی جارنا نموونەیێن وەها ژی دهێنە دیتن کو شعر بۆ سەر پتر ژ دوو کەرتان هاتیە دابەشکرن. بۆ نموونە، (مەحوی) د وێ شعرا خۆدا کو تایبەتە ب ستایشا (مەولانا خالدێ نەقشبەندی)، لاساییا سیستەمێ قەسیدەیێ دکەت لێ دەمێ ئەم تەماشەی ڤێ شعرێ دکەین دگەهیننە ڤی ئەنجامی کو پێشەکیا شعرێ ژ دوو بەشێن جودا پێکهاتیە. ئەڤ شعرە ژ ٢٤ دێران پێک دهێت، شاعر شعرا خۆ ب بابەتێ دلداریێ دەست پێدکەت و باسێ ئێش و ئازارێن خۆ ل دەمێ نهو یانکو دەمێ گوتنا شعرێ دکەت:

دلم ئـەمــشەو نـەخـۆشی نیسبەتی چاوێکی بیمـارە
جگەر غەلتانی خوێنی حەسرەتی لێوێکی خوونخوارە
سەرم شێواوی شێوەی فیـتنە هــەڵگیرسێنی شۆخێکە
حەواسم تەفرەقەی عیشوەی دڵ ئاشـووبێکی عـەیـارە...(مەحوی (دیوان)، ل٥٤٥)

هەتا دێرا نەهێ ژی شعر لدور ڤی تەوەرییە لێ دێرا دەهێ مینا دەستپێکا پشکا دوویێ رۆلێ خۆ دبینیت:

لە کونجی بێ کەسیدا موددەییێکم بردەسەر، ئاخر
شەوێ دڵ کەوتە بەحسی بێ وەفایی ئەو ستەمکارە...(مەحوی (دیوان)، ل٥٤٨)

ڤێ دێرێ و دێرێن پشتی وێ پەیوەندیەکا ڕاستەوخۆ ب نەهـ دێرێن بەری هنگی ڤە نینە چونکە بەری هەر تشتەکی شاعر ژ دەربڕینا ئێش و ئازارێن خۆ یێن نهۆ (ئەم شەو)، بەرەڤ ڕویدانێن شەڤەکا دی دچیت و پێنج دێران بۆ ڤێ چەندێ تەرخان دکەت.دێرا پازدێ ژی دبیتە پرەك د ناڤبەرا پێشەکییا شعرێ و مەبەستا شعرێ کو ستایشا (مەولانا خالد)ییە:

لە کونجی بێ کەسیدا موددەییێکم بردەسەر، ئاخر
شەوێ دڵ کەوتە بەحسی بێ وەفایی ئەو ستەمکارە...(مەحوی (دیوان)، ل٥٤٨)

پشتی ڤێ دێرێ شاعر ئێدی باسێ مەزناتییا (مەولانا خالید)ی و پەرۆشییا خۆ بۆ وی دکەت لێ ڕاستەوخۆ بابەتی ناگۆهریت بەلکو هێدی هێدی بابەتی بەرەڤ ستایشکرنێ دبەت و ل دێرا بیستێ دبێژیت:

لــە فــەیضی ناوی مەولانا ضیاءالدینەوە ئێستە

هەموو ڕۆژە شەوم، قەترەی وجودم بەحری ئەنوارە...(مەحوی (دیوان)، ل٥٥٠)

کەرتکرنا ڤێ شعرێ بۆ سەر چەند بەشان بەرهەمێ بەردەوامبوونا سیستەمێ قەسیدەیا کەڤنە، د شعرێدا سێ تابلۆ یانکو وێنەیێن گشتی دهێنە دیتن کو ڕەنگە پەیوەندییا ئۆرگانییا د ناڤبەرا واندا گەلەك بهێز نەبیت.

دابەشکرنا شعرێ بۆ سەر چەند بەشان و فرەمەبەستی کو ئێک ژ ئەدگارێن قەسیدەیا کەڤنە ب ئاوایێن جۆراوجۆر د شعرێن کورت یانکو غەزەلاندا ژی دهێتە دیتن، گەلەك غەزەلێن کلاسیکی ژلایێ واتا و وێنەیانڤە بسەر دوو بەشان یان زێدەتر دهێنە دابەشکرن یانکو ب دەربڕینەکا دی ئەڤ غەزەلە وێنەیەکێ بچویککریێ سیستەمێ قەسیدەیێ پێشکێش دکەن، جارنا د کورتترین غەزەلاندا ژی ئەڤ دیاردەیە دهێتە دیتن:

| | |
|---|---|
| ئـەهلی تەعدادی مەحاسین نووسیان | خال یەك و زولفی دوان، هـەر دوو سیان |
| کـوفری زولفـە تـار و مـاری ئــەرقەمن | سـفری خــالە حەلقـەیی هیـندووسـیان |
| زولفی جـەڕاڕی سەراسـەر خستە پـێش | یــەعنی زەنــگی لەشـکری قـیر و سـیان |
| ئـەم غــەزالانە کــە نەقشـی دیـدەمن | تـەن ســپی و چـاو و خـال و مـوو سـیان |
| حاکمـانی مــەحکەمە نـامە سـیان | قـــەت نــەماوە غــیرەت و نامووووســیان |
| نـەرم و زەرقــی خەرقــەیی سالووسـیان | شــــاهیدی زووە زوبــــانی لــووســــیان |
| چـاوەکەم مـــەنوارە ڕەنگـی زاهـیری | خــۆ دەزانــی ڕووسـپی چـەند ڕووسـیان |
| ناوی مــەخمووران نەبـەی نـالی لـە نێو | حـەلقــەیی واعیـز، لـەوێن جاسووسـیان |

...(نالی (دیوان)، ل٣٣٥)

ل ڤێرێ ئەم نەشێین بێژین کو پەیوەندیەکا ئۆرگانیک د ناڤبەرا چوار دێرێن دەستپێکا ڤێ شعرێ و چوار دێرێن داوییا وێ هەنە، ئەڤ دوو پارچەیە ژلایێ ناڤەرۆك و بابەتی ژ هەڤ جودانە، رەنگە ئەم بشێین بێژین چوار دێرێن دەستپێکێ کو پتر غەزەلینە رۆلێ پێشەکیێ دبینن و چوار دێرێن دویڤدا ژی کو جۆرە رەخنەگرتن یان داشۆرینەکێ ب خۆڤەدگرن بریتینە ژ مەبەستا سەرەکییا شعرێ، کەواتە سەرەرای کورتبوونا ڤێ شعرێ لێ سیستەمێ قەسیدەیێ د ڤێ شعرێدا هاتیە پێرەوکرن و پەیوەندیەکا ئۆرگانیک د ناڤبەرا وێنەیێن ڤێ شعرێ د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا ناهێتەدیتن و دشێین بێژین شعر بسەر دوو وێنەیێن گشتییێن جودا هاتیە دابەشکرن.د شعرەکا (مەلای جزیری) ژی هەمان دیاردە دهێتە دیتن، ئەڤ غەزەلە ب تنێ ژ شەش دێرا پێکهاتیە:

هەی هەیا رەقس و سەمایا تە چ خوەش بەستییە چەرخ
کو د بورجێ ب سەما تێتە لسەر دەستێ خوە بەرخ
صوفی یێن هەر د گەوافێ حەجەر الاسودە قەصد
گول و سونبول ب سەماتێن حەمیان زەمزەم و چەرخ
نەقشێ ئەلماسی ل ئەلماسی بنێ گرتییە حەرف
خەطێ یاقوتی ل یاقوتی شکێناندیە نەرخ
کەرخین ئەم د قیامێ مە ژ دل پەردە دراند
عارفی وەقتم و مەعروف بلا بێتە ژ کەرخ
دا بناسی خەتەری رێ تو نەبی غافل بی
دیجلە لێ دپرن برپری پیل و بەر و مەرخ
پیری شەعارە د شیعرێ و مەلێ شال فرۆش
تو نیشان من مەدە فەرخی کو لنک من بوویە فەرخ

...(جزیری (دیوان)، ل٢٠٥- ٢٠٧)

دشێین بێژین کو شعر ب سەر دوو بەشان هاتیە دابەش کرن، بەشێ ئێکێ کو هەر سێ دێرێن دەستپێکێ ب خۆڤە دگریت و وەکو پێشەکییێ ڕۆلێ خۆ دبینیت، هەر سێ دێرێن داویێ ژی تا ڕادەیەکێ زۆر هەلگرێ مەبەستا شاعرینە.

ئەگەر غەزەلەکا شەش دێرییا (مەحوی) ژی وەرگرین ب ئاشکرایی دێ هەستێ ب دووبارەبوونا ڤێ دیاردەیێ کەین:

دەپرسـی بۆچـی مـن دەرکـەوتـم دڵ بـوو لـە تـۆ غـایـب
کـە وەختـی ڕۆژهـەلات، ئەلبـەت، دەبـێ شـەونم لـە خـۆ غـایب
چ یـارایە، بـە بـێ ئـیمایی ئـەبـرۆ سـەیری ئـەو چـاوە
حەرامـە مەیکەشـی لـەم مەیکـەدە بـێ ڕۆخـسەتی حـاجیـب
دەپرسـن: کیمیا ؟خدمـەت بـە مـەرد، ئـەمـما بـە ئیـخلاصـی
وەگـەرنا کـەم (لـە بووبـەکر)ی نـەبوو خدمـەت (ئـەبووطـالب)
بـە نـاو ئیـمـەش ڕیجـالـین و ڕیـجـالی ((هـم ڕجـال) هـەم
بە فەجری ناو دەبەن، سەد حەیف، ئەگەر صادیق، ئەگەر کازیب
لـە عـاریف عامییـەك پرسـی هـەوالی مەسلـەخ و قەسـاب
بـە ئەنگوشـتی شـەهادەی کـرد ئیشـارەی مـەحکەمە و نائیـب
لـە حـەق بێـژی بـووە بـەحری ((انـا الحـق)) هـەر قەسـیدێکم
لـە بـاتی جـائیزە، واجـب گـەڕا قەتلـم بـکەن واجـیب
دڵـە عەرشـی خـودا (مـەحوی) خەجالـەت بـە لەبـەر غەفلـەت
کـە بۆتـە بوتکـەدەی بـێ بەرهەمـەن یـا دەیـری بـێ ڕاهیـب

.. (مەحوی (دیوان)، ل٨٣- ٨٦)

خویایە کو هەر دوو دێرێن دەستپێکێ زێدەتر پێشەکییا شعرێ پێک دهینن و ژ لایێ واتایی و وێنەییڤە ب تەمامەتی جیاوازن ژ هەر پێنج دێرێن داوییا شعرێ کو شاعر هەولددەت ب ڕێکا وان پەیاما خۆ بگەهینیت، کەواتە نەبوونا پەیوەندیەکا ئۆرگانی د ناڤبەرا هەر دوو بەشێن شعرێ یانکو د ناڤبەرا هەر دوو وێنەیێن گشتییێن ڤێ شعرێدا دهێتە دیتن.

هندەك شعر ژی بسەر دوو بەشان یان زێدەتر  هاتینە دابەشكرن لێ ئەم نەشێین ڤێ دابەشكرنێ ببەینە چارچووڤێ مەسەلا هەبوونا پێشەكی و مەبەستێ، واتە ب تنێ دابەشكرنا شعریە ل ژێر كاریگەرییا لاساییكرنا  فرەمەبەستییا شعرا كەڤن.غەزەلەكا (مەلایێ جزیری)كو ژ (١٥) دێران پێك دهێت ب ئاشكرایی بسەر دوو بەشان هاتیە دابەشكرن، ئەڤ غەزەلە ب هندەك بیر و باوەرێن عرفانی و خوداناسیێ دەست پێ دكەت:

حەیف د قـەیدا خاك و گل بت عـارفی چالاك ڕوح
دێ مــوجــەرەد بت كو پورتەو دەت ژ نورا پــاك ڕوح
قەیدێ خاك و گل نەبت دا بێ حیجاب و پەردەبت
میثلێ بەدرێ جارنــان تێخیت خوسوفێ خـــاك ڕوح...(جزیری (دیوان)، ل١٨٢)

هەتا دێرا دەهێ ژی بابەت و ناڤەروكا شعرێ لدور ڤی بابەتییە لێ ل دێرا یازدێ وەرچەرخانەكا نەژگاڤ د ڕێرەوێ شعرێدا دروست دبیت:

هەر دوو ئیلانێن تە دێ طە وقێ گەردەن كر مودام
دامە هەربێتن تەبەسســوم وەك گولا زەحــحاك ڕوح...(جزیری (دیوان)، ل١٨٢)

ئێدی هەتا دێرا داویێ شعر زێدەتر لدور بابەتێ دلداریێ و داخباریوونا شاعری ب یارێ دزڤریت و شعر بەرەڤ ئاراستەیەكا جیاوازڤە دچیت.ئەم دشێین بێژین د بنەرەتدا ئەڤ شعرە ژ دوو بەش یان دوو وێنەیێن گشتییێن جودا كو تەنانەت وەكو  دوو شعرێن جودا خۆیا دبن پێك هاتیە و پەیوەندیەكا ئۆرگانییا بهێز د ناڤبەرا واندا نینە. لگەل هندێ ژی ئەم نەشێین بێژین كو پشكا ئێكێ ژ ڤێ شعرێ ڕۆلێ پێشەكیێ دبینیت چونكە وەكو خویایە پەیاما شاعری د ڤی بەشی دایە و بەشێ دوویێ ب تنێ هەلگرێ كۆمەكا وێنە و  دەربڕینانە كو د شعرا كلاسیكییا ڕۆژهەلاتیدا باون.

هەر ئەڤ دابەشکرنە د شعرەکا (١٩) دێرییا (نالی)دا ژی دهێتە دیتن، ئەڤ شعرە ب ڤی ڕەنگی دەست پێدکەت:

ماتەم وەکو زولفەینی سییەه، گرتی سەراپات
پۆشی لە ڕوخت تەعبییەیی بەیدەق و شامات
تاقانە یەتیمی خەلەفی ئاخری نسیان
تۆ خۆش بی، سەدەف بوو بە فیدات، دوور بی لە ئافات...(نالی (دیوان)، ل١٣٦)

وەکو خویایە شاعری ئەڤ شعرە ئاراستەی کچەکا جوان (رەنگە حەبیبە بیت) کریە، ڤێ کچێ کەسەکێ خۆ یێ نیزیک (چێدبیت بابێ حەبیبەیێ بیت) ژدەست دایە. یانکو شاعر ب شێوەیەکێ هونەری لاوانەوەیەکا غەزەلی پێشکێش دکەت، شعر هەر ب ڤی ئاوایی بەرەڤ پێش دچیت هەتاکو ل دێرا دوازدێ شاعر داوییێ ب ڤی بابەتی دهینیت:

بێ بابی موورادی من و تۆ بوو بە تەمەننا
بێ بابی دوعایی من و تۆ بوو بە موناجات...(نالی (دیوان)، ل١٣٩)

پشتی ڤێ دێرێ، واتە ل دێرا سێزدێ بەشێ دوویێ یانکو دیمەنەکێ نوی و جیاواز دهێتە پێشکێشکرن، شاعر دەست دهاڤێژیتە وەسفکرنا سروشتی د وەرزێ بهارێ دا:

گول تاجی لەسەر نا و چەمەن مەخمەلی پۆشی
هات موژدە کە خەلعەت گەییە بەر بە موهابات
هات زەمزەمەیی بولبول و ئاوازەیی قومری
هات بادی سەبا، دێن و دەچن عەرعەر و بانات...(نالی (دیوان)، ل١٤١)

گەلەك جاران ئەڤ فرەمەبەستیە دگەهیتە وی ڕادەی کو دێرەکا شعری ژی وەکو بەشەکێ سەربەخۆ خۆیادبیت، واتە پەیوەندیەکا ئۆرگانییا بهێز د ناڤبەرا دێرەکا شعرێ ودێرێن بەری هنگی ژی ناهێتە دیتن، بۆ نموونە دشێین

ئاماژەیێ بدەینە وان دێرێن داوییا  شعران کو تێدا شاعر نازناڤێ خۆ پێشکێش دکەت. ل ڤێرێ پرانیا جاران شعر بەرەڤ ئاراستەیا شانازیکرن ب خۆ یانکو ستایشکرنا خودیڤە دچیت:

نـالـیا ئـەم غـەزەلــەت تــازە بــە تــازە وتـــووە

بـــە دووســـەد مـەسـنەوی و (لووبی لـوبـاب)ی نادەم...(نالی (دیوان)، ل ٣١٧)

پیری شـەعارە د شیعـرێ و ((مـەلێ)) شـال فـروش

تو نیشان من مەدە فەرخی کو لنک من بوویە فەرخ...(جزیری (دیوان)، ل ٢٠٧)

خـەزنـەییێکە بەیتـی مـن دوو میسرەعم داخستـووە

کـەس تەماعی تـێ نەکـا ڕێگـای دزم لێ بەستووە

بیکـە بـەر دیبـایی نــەزمـم تـا قـیامــەت نــادرێ

چـونکـە ئەبکـاری مەعانی تـار و پـۆیی ڕسـتـووە

زاهیرەن بەیتم لە نالی و کوردی زۆر کـەمتر نـییە

تالعم بەرگەشتە  بەد بەختم بەخـتـم نـوسـتـووە...(حاجی (دیوان)، ل ١٣٧)

ڤان وێنەیان چ پەیوەندیەکا ئۆرگانی ب دێرێن بەری خۆڤە نینە، شاعر پشتی ب دویماهیکهینانا شعرا خۆ کو پرانیا جاران لدور عەشقێیە، ئێکسەر ب ڕێکا هندەك وێنەیان کو پتر لێکچواندن یان خواستن یان موبالەغەیە پەسنا خۆ دکەت. دەمێ فرەمەبەستی و دابەشکرنا شعرێ بۆ سەر چەند بەشان دگەهیتە ئاستێ تاکەدێرێ، فاکتەرەکێ دی کو ئەو ژی ئێکەتییا تاکەدێرێیە ڕۆلێ خۆ دبینیت و ئێکەتییا ئۆرگانییا شعرێ زێدەتر بەرەڤ لاوازییێڤە دچیت.

## ٣.٢.٣. ڕۆلێ ئێکەتییا تاکەدێرێ:

شاعرێ عەرەبیێ کەڤن (ل دەمێ ڤەهاندنا شعرێ ب تنێ پێیگری ب نموونەکا دیارکری کریە کو ئەو ژی بریتیە ژ دێرا شعرییا کو ژ دوو نیڤەدێرێن یەکسان پێک دهێت. ئەڤ ئەندازیارییا ڕۆخسارییا دێرا شعرێ ژی شاعری

نەچاردکەت کو هزرا خۆ لدویف قەبارەیا ڤی فۆرمی دابرێژیت. پێدڤیە شاعر دەربڕینا خۆ لگەل بدویماهیکهاتنا دێرا شعری ب دویماهیک بینیت.ئەگەر بهێت و واتا ژ دێرەکێ دەربازببیت و د دێرا دویڤدا تەمام ببیت دێ ب کێماسیەکا مەزن هێتە ل قەلەم دان کو ڕەخنەگران زاراڤێ (تضمین)ێ بۆ بکارئینایە.هەر وەسا چێنابیت شاعر دەربڕینێن کورتتر یان درێژتر ژ دێرا شعری بکاربینیت)[٢٠٢]

ل دەڤ عەرەبان دێرا شعرێ یەکەیەکا جودا و سەربەخۆ بوویە. ئەو یەکەیا کو چ پەیوەندی ب یەکەیێن بەری خۆ و پشتی خۆ نینە، لەوما پتر شانازی ب دێرا شعرێ کرینە. بکارهینانا دەربڕینێن وەکو (باشترین دێر، بهێزترین دێر د غەزەلێدا یان باشترین دێر بۆ هاندانێ و...) د ڤەکۆلینێن واندا گەلەك باون.[٢٠٣] پرانیا زانا و ڤەکۆلەرێن کەڤن ژی داکۆکی لسەر ڤێ تایبەتمەندییا شعرێ کرینە بۆ نموونە (ابن خەلدون) د پێناسەیا خۆ بۆ شعرێدا (داکوکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو شعر ژ هندەك پاژەیێن ژهەڤ جودا و سەربەخۆ پێک هاتیە، ب دیتنا وی سیناعەتا شعرێ زەحمەتە و ئێک ژ مەزنترین زەحمەتیێن وێ ژی دانانا دێرێن تاك و سەربەخۆیە...).[٢٠٤] (ابن رشیق) ژی داکوکیێ لسەر ڤێ چەندێ دکەت کو باشترە هەر دێرەك سەربەخۆ بیت و پێدڤی دێرێن بەری خۆ و یێن پشتی خۆ نەبیت.[٢٠٥]

د بوارێ رەخنەیا ئەدەبیدا ژی تاکەدێر تەوەرێ کارێ ڕەخنەگرێن کەڤن بوویە، گرنگترین ئەدگارێ چێژا عەرەبی د بوارێ شعرێدا گرنگیدانە ب تاکەدێرێ، ڕەخنەگر ب خۆ ل دویف (بیت القصید) دگەریت. ئەو دێرا کو مینا نموونە یان پەندێ دهێتە بکارهینان، ئەو دێرا کو دگەهیتە کوپیتکا ڕەوانبێژی و شێواز و واتایێ، ئەو حەژ وان شعرا دکەن کو تێدا چەند دێرێن ب ڤی ڕەنگی هەبن و لدەڤ وان ئەڤ جۆرە شعرە باشترە ژ وێ شعرا کو دێرێن نموونەیی تێدا نەبن...)[٢٠٦] بڕیارێن ڕەخنەییێن عەرەبان کو د ئەنجامدا شاعرەك ب باشتر ژ شاعرەکێ دی دهاتە ل قەلەم دان، لسەر بناغەیێ دێرا تاك بوون. واتە ڕەخنەگرێن عەرەبان تەڤایا شعرێ نەکرینە بنەما بۆ بڕیارێن خۆییێن ڕەخنەیی.[٢٠٧] لەوما لدەڤ وان (بیت المبتور)

ب کێماسییەك ژ کێماسییێن واتا و کێشێ هاتیە ل قەلەم دان. مەبەست ژ (بیت المبتور) ژی ئەوە کو واتا هند درێژ بیت کو د شیانا عەرووزێدا نەبیت وێ د دێرەکێدا بگونجینیت یانکو واتا ژ سنووری سەروایا دێرەکێ دەرباز ببیت و ل دێرا دویڤدا بهێتە تەمامکرن.[٢٠٨] (ئەگەر رەخنەیا عەرەبی باوەری ب ئێکەتییا دێری هەبیت نەشێت گرنگیێ بدەتە ئێکەتییا شعری، و ب ڕاستی ئەڤ دوو تشتە گەل ئێک ناگونجن)[٢٠٩] یانکو دشێین بێژین (ئێکەتییا ئۆرگانی چ جهـ د رەخنەیا عەرەبییا کەڤندا نینە و رەخنەیا عەرەبییا کەڤن پشتەڤانییا سەربەخۆبوونا دێرا شعرێ و تەنانەت نیڤە دێر و هندەك جار چارێکا دێرا شعرێ دکەت).[٢١٠]

ب کورتی (رەخنەیا عەرەبییا کەڤن گرنگی ب ئێکەتییا ئۆرگانی و ب رەخساندنا ئۆرگانییا وێنەیان نەدایە و شاعران ژی بایەخ ب پەیوەستبوونا وێنەیان ب هزرا گشتی و ئەو هەست و سۆزێن کو هەولا وێنەکرنا وان دهێتە دان نەدایە. پرانیا جاران وێنەیێن پاژەییێن شعرێ پێکڤەگرێدایی نینن و نەشێن وێنەیێ گشتیێ شعرێ بەرجستە بکەن...)٢١١ هەر ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەر کو (عزالدین اسماعیل) د ڤێ باوەرییێدا بیت کو (ئێکەتییا هەست و سۆزان د شعرا عەرەبیدا نینە بەلکو تشتێ زال هەبوونا ئێکەتییا تاکەدێرییە.)[٢١٢]

تشتەکێ ئاساییە کو ئەڤ دیاردەیە د شعرا فارسیدا ژی کو لسەر بناغەیێ لاساییکرنا قەسیدەیا عەرەبی سەرهلدایە بهێتە دیتن و بۆ شعرا کوردی ژی بهێتە ڤەگۆهاستن و ببیتە ئەگەر کو گرنگیدان ب تەوەرێ ئاسۆیی شعرێ واتە ئاڤاکرنا دێرا تاك ببیتە ئامانجا شاعران. ب ڤی رەنگی پرانیا جاران وێنەیێن شعری ژ سنووری دێرەکا شعرێ دەرناکەڤن و کورتبڕی دبیتە ئێک ژ سیماییێن سەرەکییێن ڤان وێنەیان، ب دەربڕینەکا دی وێنەیێن وەسفییێن تێروتەسەل و یان تەرخانکرنا چەند دێران بۆ بەرجستەکرنا وێنەیەکێ دیارکری ب دەگمەن دهێتە دیتن.

بەری هەر تشتەکی گرنگیدان ب ئێکەتییا دێرا تاك و حەزا هەبوونا دێرێن نموونەیی کو ب (بیت القصید) دهێنە نیاسین و هەر وەسا بایەخدانا زێدە ب

کورتبڕیێ بووینە ئەگەر کو گەلەك دێرێن شعرا کلاسیکییا  کوردی وەکو یەکەیێن سەربەخۆ دەرکەڤن، ب ڤی ئاوایی جوانترین هزر و  دەربڕین د تەوەرێ ئاسۆیێ شعرێدا یانکو دێرا تاکدا هاتینە پێشکێشکرن. گەلەك دێرێن شعرا کلاسیکی هەلگرێن واتا وێنەیێن ب ڤی ڕەنگینە کو  مرۆڤ دشێت وان دێران ب تنێ بکەتە تەوەرێ گفتگۆ و دانوستاندنێ:

تـۆوی سـەر خسـتووە بن خاکە، سەر ئەفـرازی بـەر

هـەر لـە ڕێـگـەی تـەلـەبـا بـوو سـەری دانـا دانـا ...(مەحوی (دیوان)، ل٦٤)

من د باغێ گولفرۆشان دیت عەجەب ڕەسمەك غـەریب

خـارتەبعان گـولددەسـت و گـولپەرستنا خـاریـەس...(جزیری (دیوان)، ل٢٦٧)

نە دوویـن بەلکـی یەکـین، ئەز ب خـۆ فەرقـێ ناکـەم

چنکـو ڕولـقـودوسـین، مـریەم و عـیـسا چ عـەجـەب

...(شیخ نورالدینێ بریفکانی(دیوان)ل٦٤)

دولـبـەر مـامـزیـیـە بـازی بـە ڕەفـتـاری کـەوە

ئـەی دڵـی خـەسـتـە وەکـو کوربە بە شوێنی مەکەوە

...(حاجی قادر (دیوان)، ل١٣١)

د ڤان نموونەیێن سەریدا واتایەکا مەزن و بەرفرەهـ ب ڕێکا دێرەکا شعرێ هاتیە  دەربڕین و وێنە ژ سنوورێ دێرەکا شعری دەرباز نابیت.ئەڤ دێرە یەکەیێن سەربەخۆنە و د وی ئاستی دانە کو مینا دێرێن نموونەیی یان وەکو (بیت القصید) سەرەدەری لگەل وان بهێتە کرن.تەنانەت پرانیا جاران جوانترین واتایێن عرفانی و سۆفیگەری  ژی ب ڕێکا وان وێنەیان دهێنە پێشکێشکرن کو ژ سنوورێ دێرەکا شعرێ دەربازنابن:

فەلەکا ئەگلەسێ سەرگەشتە د جاما مە حوبابە

مەوج ددەت قولزمێ عەشقێ مە لسەر دەست غـورابە...(جزیری (دیوان)ل٤٣٠)

خەیالەکا بهێز بوویە هێڤێنێ ئافراندنا وێنەیەکێ شعریێ دەگمەن، هزرەکا بەرفرەهـ ب رێکا تاکەدێرەکێ هاتیە پێشکێشکرن. تەڤایا فەلەکێ ب پەقیشکا ناڤ جامێ هاتیە لێکچواندن و پاشی جام ژی ب گەمیەکێ بچویک لسەر دەریایا عەشقێ هاتیە لێکچواندن. ب ڤی رەنگی شاعر شیایە بچویکبوونا جیهانێ ل هەمبەر مەزناتییا عەشقێ بدەتە دیارکرن. ئەم دشێین گفتگۆیەکا زۆر لدور واتا و وێنە و لایەنێ هونەریێ ڤێ دێرا شعری بکەین.

حەزا بکارهینان و هەبوونا دێرێن هونەری و نموونەیی لگەل دەربازبوونا دەمی وەرارەکا مەزن ب خۆڤە دیتیە، واتە ئەگەر د قەسیدەیێن کەڤندا شاعری ئێک یان دوو دێرێن ب ڤی ئاوایی هەبن، شاعرێن پشتی وان زێدەرۆیی د بکارهینانا ڤان جۆرە دێران کرینە هەتا وی رادەی کو ئەم دشێین بێژین بەشەکێ مەزن و تەنانەت هندەك جاران تەڤایا دێرێن هندەك شعران ل سەر ڤی بناغەی هاتینە دانان. یانکو ئێدی شاعری دڤێت هەمی دێرێن وی سەربەخۆ و د هەمان دەمدا نموونەیی بن:

داری ئـیـراك و داری هـیند هـەر دوو کە عوودە ئیسمیان
هەمدەمی سوننەتە ئـەوەم مەیلی ئەبوولـەهەب دەکـا
سەهم و نەسیبی ئەسلییە، بەحسی گیا و گول نیـیە
تـوتـنە خـەرجـی سـووتنە، مـوودنە ماچـی لەب دەکـا
لەومەی زەمان دەکەی کە بـۆچ حواریی راسـتی دەوێ
غافلی دەستی راستی خۆت خزمەتی دەستی چەپ دەکا...(نالی (دیوان)، ل٩٤- ٩٦)

ل ڤێرێ شاعر شیایە د سێ دێراندا سێ وێنەیێن جیاواز پێشکێش بکەت، هەر سێ دێر د ئاستێ دێرێن نموونەیێن دانە. ژلایێ واتایی و وێنەییڤە سەربەخۆنە و پەیوەست نینن ب دێرێن دیڤە. شاعر لگەل ب دویهاهیکهاتنا هەر دێرەکێ ئێکسەر هزرا خۆ د هندێدا دکەت کو ب رێکا سازکرنا پەیوەندیێ د ناڤبەرا دوو تشتێن جودا دا، وێنەیەکێ تەواو و سەرنجراکێش پێشکێش بکەت.

ژبلی هەبوونا ئێکەتییا تاکەدێرێ کو دیاردەکا باوە د شعرا کلاسیکییا کوردیدا، پێدڤیە ئەم باسێ ئێکەتییا نیڤەدێرێ ژی بکەین، جارنا ئێکەتییا نڤیەدێرێ ژی د شعرا کلاسیکییا کوردیدا دهێتە دیتن:

صوفی یێن هەر د گەوافا حەجەر الاسودە قەصد
گول و سونبول ب سەماتێن حەمی یان زەمزەمە و چەرخ
نەقشێ ئەلماسی ل ئەلماسی بنێ گرتییە حەرف
خەگێ یاقوتی ل یاقوتی شکینانديە نەرخ

...(جزیری (دیوان)، ل٢٠٥- ٢٠٦)

جەبهەت و دێمێ ل قودرەت لێ نڤیسی حەر حەرف
کاکولان تاتا لسەر حەرفان کشاندی لامولام
لیله القدر و بەراتن زولف و جەبهەت صوبحێ عید
دێم وەکو فەصلا بهارێ لێ قیامەت قەدد و قام

...(جزیری (دیوان)، ل ٣٦٣)

ل ڤێرێ ئێکەتییا نیڤەدێرێ دهێتە دیتن، هەر نیڤەدێرەك واتایەکا سەربەخۆ و وێنەیەکێ جودا پێشکێش دکەت، کورتبڕی ئێکە ژ سیمایێن وێنەیێن بکارهاتی. شاعر هەولددەت پترین وێنەیان د تەوەرێ ئاسۆیدا واتە دێر و تەنانەت نیڤە دێرا شعرێدا پێشکێش بکەت ب ڤی رەنگی د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا شاعر ژ وێنەیەکی دچیتە وێنەیەکێ دی و ژمارەیەکا زۆر ژ لێکچواندن و خواستنان بکاردهینیت.نهۆ ئەم دشێین بێژین کو پرانیا جاران داهێنانا وێنەیی د شعرا کلاسیکییا کوردیدا ئاسۆیە واتە لسەر بناغەیێ دێرا تاکە، شاعر د زانیت کو زانایێ رەوانبێژیێ لسەر بناغەیێ دێرا تاك شعرا وی هەلدسەنگین لەوما ئەو ژی هەولددەت جوانترین وێنەیان د دێرا شعریدا پێشکێش بکەت.

بەروڤاژی قەسیدەیان و ئەو قالبێن کو لسەر بناغەیێ نموونەیا قەسیدەیێ چێبووین، وەکو غەزەلێ، د قالبێن دیێن شعرا کوردیدا سەرەرای پێکاریگەربوونا شاعران ب شعریەتا قەسیدەیا کەڤن لێ گەلەك جاران وێنە سنوورێ دێرەکا

شعرێ دەربازدکەت و چەند دێرەك پێکڤە وێنەیەکی پێشکێش دکەن، وەك نموونە دشێین ئاماژەیێ بدەینە دووبەیتیێن باباتاهرێ هەمەدانی:

منــم ئان ئازەرین مــورغێ کە فیل حــال
بســـوجم عالەمێ گەر بەر زەنەم بـــال
موسەویر گەر کیشەد نەقشم بە دیــوار
بسووجم عالەم ئەز تەئسیرێ تـیمـــســـال...(باباتاهیر،(دووبەیتەکان)،ل٤٥)

ل دێرا ئێکێ شاعر خۆ ب بالندەیەکی ئاگرین وەکهەڤ دکەت کو ئەگەر بالێن خۆ لێک بدەت دێ جیهانەکێ سۆژیت. ل دێرا دوویێ شاعر ئەو وێنەیێ کو ل دێرا ئێکێ پێشکێشکری ژبیرناکەت بەلکو ب رێکا موبالەغێ یانکو زێدەرۆیێ وێنەیەکێ دی پێشکێش دکەت کو ڕاستەخۆ پەیوەستە ب وێنەیێ دێرا ئێکێ، ل ڤێرێ شاعر دبێژیت ئەگەر نیگارکێشەك وێنەیێ ڤی بالندەی لسەر دیوارەکی بکێشیت جیهان دێ ل ژێر کاریگەرییا وی نیگاری شەوتیت.ژ لایەکیڤە وێنە و ناڤەرۆکا وێنەی نوییە و ژ وێنەیێن سواوەیێن شعرا کلاسیکییا ڕۆژهەلاتا ئیسلامی نینە و ژ لایەکێ دیڤە ئەو وێنەیێ ل دێرا دوویێ هاتیە پێشکێشکرن تەمامکەرێ وێنەیێ دێرا ئێکێیە.

ئێکەتییا تاکەدێرێ نە بتنێ دبیتە ئەگەرێ سنووردارکرنا وێنەی د سنوورێ دێرا شعری دا، بەلکو جارنا دبیتە ئەگەر کو کو د ناڤبەرا دێرێن شعرێدا وێنەیێن هەڤدژ ژی بهێنە دیتن. ب تایبەت لدەڤ وان شاعران کو داهێنان و نویکرنەکا کێم د شعرێن واندا دهێتە دیتن و کارێ وان پتر چاڤلێکرنێ بوویە. بۆ نموونە ئەڤ چەندە د شعرەکا (فەتحی) کو د پەسنا (شیخ عبدالقدرێ هەزانی) گوتییە خویایە، هزرا شاعری ب تنێ د تەوەرێ ئاسۆییدا کارکریە و گرنگی نەدایە پەیوەندییا ستوونیا د ناڤبەرا دێرێن شعرێدا:

دێــــرا ئێکــــێ: چ خـــوش شـــاهی چ خـــوەش خـــانی تـــو ســـەیدا
د مـولـکـــــــێ دل دە سـولـگـــانــــــــی تـــــو سـەیـــــــدا

دێـــــرا نــــــەهێ: تـەیـــــی ڕوســـــتەم کـــــوڕێ زالێ زەمـانــــی
وەزیـــــــرێ شــــــــاهێ ئـیـرانـــــــی تــــــــو ســـەیـــــــدا
دێـــــرا دەهـــــــێ: تـــە مـــولکێ دل سەراســـەر گـــرت ئـــیرۆ
ل تــــەخـتـــــــێ دل ســــولــەیـمـانـــــــی تـــــــو ســـــــەیدا
دێــــرا شــــــازدێ: ل تـەخـــــتێ دلبــــــەرێ ڕوونــــــە ب شاهـــــی
شــــەهــێ شــاهــانــێ دەورانـــی تــو ســەیــدا ...(فەتحی (دیوان)، ل٧٦- ٧٧)

کەسێ ستایشکری جار بوویە شاهـ و جار بوویە وەزیرێ شاهێ ئیرانێ و جارەکا دی و هەر ل دێرا دویڤدا بوویە شاهـ و ل دێرا شازدێ بوویە شاهێ شاهان.

گەلەك جاران پێرەویکرن ژ ئێکەتییا تاکەدێرێ و دابەشکارییێن سیستەمێ قەسیدەیێ یان فرە مەبەستی پێکڤە کاریگەرییێ دکەنە سەر شعرێ و دبنە ئەگەر کو پەیوەندییا واتایی و وێنەیێ د ناڤبەرا وێنەیان د تەوەرێ ستوونییێ شعرێدا بەرەڤ لاوازییێڤە بچیت، یانکو ب دەربڕینەکا دی ئەگەر ژ لایەکیڤە پرانیا وێنەیان د چارچووڤێ دێرەکێدا بهێنە سنووردارکرن و ژ لایەکێ دیڤە فرەمەبەستی بگەهتە ئاستێ تاکەدێرەکێ پەیوەندییا ئۆرگانییا د ناڤبەرا وێنەیان ب درێژییا شعرێ یانکو تەوەرێ ستوونییێ شعرێ دێ بەرڤ لاوازییێڤە چیت و د ئەنجامدا وێنەیێن پاژەیی نەشێن وێنەیێن گشتییێن بهێز و ئۆرگانیک دروست بکەن.ئەڤ لاوازییا تەوەرێ ستوونییێ شعرێ تایبەت نینە ب شاعرەکێ دیارکری بەلکو دیاردەکا باوە د شعرا کلاسیکییا کوردیدا:

ســابوونی کـەففی پێیــە کـەفی زاری چـاپـلــووس
خـاسییەتی ڕەقــقی هــەیــە نـەرمی زوبانــی لـــــووس
ئــەی دل خـەراجی حاســلی زولماتــی بەحـــر و بـــەر
میراتـی ئیـعتــیبارە لـە فـــورزەنــدی فەیلـەقـــــووس
بـونیــاتی کـیـبر و سەرکەشیە تاقــی کیســرەوی
دانــانـــی زولـم و ڕوورەشـیـیە تەخــتی ئــابنــــووس
بنـــــوارە بـــوونی ئـەوولت و چـوونی ئاخـرت هـــاتی
چ ڕووت و قـــــووت و هەڵاتـــی چ لــــووس و پـــــووس

گەر فەرو تاج و زینەت و شەوکەت و وەفای

دەبوو بێ دەردیسەر دەمانەوە بۆ تاس و خرووس

گەر ئاب و تابی جەننەتیی و دۆزەخت دەوێ

بنوارە نێو چەوانی بەشووش و بڕۆی عەبووس

بۆ مەشقی عیشقی زولفی نیگار و نیگارشی

نالی لە خامە دا بووەتە شاهی تورەنووس

دێرا ئێکێ باسێ مرۆڤێ چاپلووس دکەت و کەفێ زمانێ مرۆڤێ چاپلووس یانکو مەلاق ب کەفێ سابینێ وەکهەڤ دکەت، هەر وەسا د وێنەیەکێ دیدا ئەدگارێ ڕەقیێ ددەتە بال نەرمییا زمانێ مرۆڤێ مەلاق. دیرا دوویێ و سێیێ و چوارێ و پێنجێ پتر بریتینە ژ دووبارەکرنا واتایەکێ ب ئاوایێن جیاواز تەڤایا وان ل دور هندێ دزڤرن کو چارەنڤیسێ هەمی کەسان تەنانەت مرۆڤێن مەزن ژی هەر مرنە، مرۆڤ چەوا ژدایک دبیت وەسا ژی بێ مال و سامان دهێتە ڤەشارتن. دێرا شەشێ جیاوازییا د ناڤبەرا مرۆڤێ بگرنژین و مرۆڤێ ئەنی گرێ ددەتە خویاکرن، ناڤ چاڤێن مرۆڤێ ب گرنژین وەکو بەهشتێیە و ناڤ چاڤێن مرۆڤێ ئەنیگرێ ژی وەکو جەهەنەمێیە. ل دێرا داویێ ژی شاعر پەسنا شعرێن خۆ یێن دلداریێ دکەت، واتە شعرێن کو بۆ وەسفا زولفا یارێ و جوانییا وێ هاتینە نڤیسین ب (گورەنڤیس) واتە ئەو نەخشێن کو ل دەستپێکا نامەیێن شاهانەدا دهاتنە کێشان و مینا مۆرا شاهان بوون وەکهەڤ دکەت. ڕاستە کو د ناڤبەرا وێنەیێن دێرا دوویێ هەتا دێرا پێنجێ پێکڤەگرێدانەك هەیە، لێ پەیوەندیەکا ئۆرگانییا بهێز د ناڤبەرا وان و وێنەیێن دێرا ئێکێ و شەشێ و حەفتێدا نینە.ل ڤێرێ هەر دوو فاکتەر واتە ئێکەتییا تاکەدێرێ و دابەشکارییێن سیستەمێ قەسیدەیا کەڤن یانکو فرەمەبەستی پێکڤە دبنە ئەگەر کو پەیوەندی و ئێکەتییا ئۆرگانییا بهێز د ناڤبەرا وێنەیێن شعرێ د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا نەهێتە دیتن.

ب شێوەیەکێ گشتی ئەو شعرا کلاسیکییا کوردی کو لسەر بناغەیێ لاساییکرنا قەسیدە و غەزەلا کەڤن هاتیەدانان گرنگیێ ددەتە تەوەرێ ئاسۆیێ شعرێ و خزمەتا پەیوەستبوونا دێران د تەوەرێ ستوونیدا ناکەت. گەلەك جاران ئەو پەیوەندییا کو د ناڤبەرا وێنەیان د تەوەرێ ستوونیێ شعرێدا دهێتە دیتن،

پەیوەندیەکا سواوەیە و لاساییکریە، هەروەسا گەلەك جاران فرەمەبەستی و ئێکەتییا تاکەدێریٚ دبنە بەربەست د رێکا دروستبوونا پەیوەندی یان ئێکەتیەکا ئۆرگانییا بهێز د ناڤبەرا وێنەیان د تەوەریٚ ستوونییٚ شعریٚ. ب ڤی رەنگی سواوەبوون و پەرتەوازەبوون دبنە دوو ئەدگارێن وێنەیان د تەوەریٚ ستوونییٚ شعرا کلاسیکییا کوردیدا.نکۆلی ل هندیٚ ناهێتەکرن کو گەلەك جاران سۆفیگەری و عیرفان پالدەرەك بووینە کو نویکرن و پەیوەستبوونەك د ناڤبەرا وێنەیان د تەوەریٚ ستوونییٚ شعرێدا بهێتە دیتن لیٚ ب شێوەیەکیٚ گشتی هێزا شعرا کلاسیکییا کوردی پتر د تەوەریٚ ئاسۆیی یانکو تاکەدێر و وێنەیێن پاژەیی دایە و کێم جاران وێنەیێن گشتییێن نوی یان ئۆرگانیک دهێنە دیتن، ئەڤە بەروڤاژی ئەو شعرا کو ب تەمامەتی سەر ب رێرەویٚ لاساییکرنا شعرا رۆژهەلاتا ئیسلامی نینە و گەلەك جاران وێنەیێن گشتییێن بهێز و نوی د شعراندا دهێنە دیتن:

پەل پەل خەزانان مەرێزان نە خاك — مەکەران بە نێش پەردەی دل چاك چاك
دل جە زام گاز پەری خەستەی وێش — قەتـرە قەتـرە هوون جیا مەبۆ لێش
مەیۆ نە دەوران دیدەی پڕ خومار — مەوارۆ رووی زەرد خەزانی خەمبار
هەر خەزان وەڵگی زار مەرێزییۆ — دل دەرۆش بە دین ئەو مەخێزییۆ
مەر پەرواز مەبۆ مەر سینەم بۆ چاك — نەبا چوون خەزان غەلتان بۆ نە خاك
جە ئەزرەت رێزان بەرگان جە دەروون — ئەو رێزیای خاکەن مەن غەلگان هوون

...(بیسارانی (دیوان)، ل٤٩)

شعر د هەر دوو تەوەرێن ستوونی و ئاسۆییدا چالاکە، ژبلی وێنەیێن پاژەیێن کو د دێرێن شعرێدا دهێنە دیتن، شاعر وێنەیەکیٚ ستوونی ژی پێشکێش دکەت.شاعر د هەر دوو تەوراندا پەیوەندییٚ د ناڤبەرا وەریانا بەرگێن داران د وەرزیٚ پاییزیٚ و ئێش و ئازارێن خودییێن خۆ ساز دکەت، ئەو سەرتاپاییٚ شعریٚ دکەتە وێنەیەکیٚ گشتییٚ نوی و ئۆرگانیک کو رەنگە نموونەیا ویٚ د شعرا کلاسیکییا رۆژهەلاتا ئیسلامی ژی کێم بیت.

(١) فرانسوا مورو، البلاغة مدخل لدراسة الصور البيانية، ترجمة: محمد الولي وعائشة جرير، إفريقيا الشرق، الداراالبيضاء، ٢٠٠٣، ص ١٥.

(٢) بشرى موسى صالح، الصورة الشعرية في النقد العربي الحديث، المركز الثقافي العربي، بيروت، ١٩٩٤، ص١.

(٣) صلاح حفني، في الصورة الشعرية دراسة تطبيقية على شعر الحبس في تراث المشرق العربي، مكتبة دار العلوم، الفيوم، ٢٠٠٦، ص ١٩-٢٠.

(٤) شرف الدين ماجدولين، الصورة والنوع والمتخيل الثقافي قراءة في نموذجين نقديين، مجلة نزوى، العدد ١٠، اكتوبر، ٢٠٠٣، ص١٠٣.

(٥) عبدالله خلف عباس.دراسات جمالية نصية في الشعر السعودي الجديد ـ ممارسة في النقد التطبيقي، ٢٠٠٥، http://skoubia.blogspot.com

(٦) ...، حول مفهوم الصورة، www.fayoum.edu.eg/thesesdatabase.

(٧) تيزفيتان تودوروف، الادب و الدلالة، ترجمة: محمد نديم خشفة، مركز انماء الحضاري، حلب، ١٩٩٦، ص٩٦.

(٨) سي دي لويس، الصورة الشعرية، ترجمة: أحمد نصيف الجنابي وآخرون، دار الرشيد، بغداد، ١٩٨٢، ص٢١.

(٩) بشرى موسى صالح. الصوره الشعريه في النقد العربى الحديپ،...، ص٣.

(١٠) سيسل دى لويس.الصوره الشعريه،...، ص٢٠.

(١١) وحيد صبحي كبابة، الصورة الفنية في الشعر الطائيين بين الانفعال و الحس، منشورات اتحاد كتاب العرب، دمشق، ١٩٩٩، ص٧.

(١٢) هاوژین سلیوه عیسی، بنیاتی وێنه هونەری له شیعری شێرکۆ بێکەس دا، دەزگای سەردەم، سلیمانی، ٢٠٠٩، ص٣٩- ٧٧.

(١٣) ئاسۆ عومەر مستەفا، بەها ئیستاتیکییەکانی شیعر لای پیرەمێرد و شیخ نوری شیخ سالح وگۆران، دزگای موکریانی، چاپخانا خانی، دهوك، ٢٠٠٩، ص١٣٧.

(١٤) ئاسۆ عومەر مستەفا، بەها ئیستاتیکییەکانی شیعر لای پیرەمێرد و شیخ نوری شیخ سالح وگۆران، ...، ص١٣٧.

(١٥) وحيد صبحي كبابة، الصورة الفنية في الشعر الطائيين بين الانفعال و الحس، ...، ص٧.

(١٦) ارشيبالد مكليش، الشعر و التجربة، ترجمة: سلمى الخضراء الجيوشي، دار اليقظة العربية، بيروت، ١٩٦٣، ص٥٤.

(١٧) محمد غنيمي هلال، النقد الادبي الحديث،...، ص٤٤٢.

(١٨) هەمان ژێدەر، ل٤١٧.

(١٩) وحيد صبحي كبابة، الصورة الفنية في الشعر الطائيين بين الانفعال و الحس، ...، ص٨.

(٢٠) هەمان ژێدەر، ص٩.

(٢١) هەمان ژێدەر، ص١١.

(٢٢) سيسل دى لويس،الصورة الشعرية،...، ص٧٦.

(٢٣) عبدالستار ابراهيم، افاق جديدة في دراسة الابداع،...، ص٢٣-٢٤.

(٢٤) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص٤٨.

(٢٥) هەمان ژێدەر، ص٢٥٣.

(٢٦) عوضي الوكيل، الشعر بين الجمود و التطور،...، ص٩٥.

(٢٧) طاهر احمد مكي، الشعر العربي المعاصر روائعه و مدخل لقرائته، دار المعارف، لبنان، ١٩٨٠، ٨٥-٨٦.

(٢٨) سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی، بنیاتی هونەری لە شیعری کوردیدا (١٩٧٠-١٩٩١)، دەزگای سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٤،ص٢٧٣.

(٢٩) سعيد رەپيما، مقايسة حركت و ايستايى در صور خيال، تارنماى تبيان، ٢٨ اسفند، ١٣٨٧، ص٤٧.

(٣٠) رحمان خليفة بشار، الربيع و دوره في الادب العباسى، http://www.diwanalarab.com/spip.php?article

(٣١) http://www.diwanalarab.com/spip.php?articl رحمان خليفة بشار، الوصف الطبيعة في الثقافة العربية.

(٣٢) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص٤٧.

(٣٣) هەمان ژێدەر، ص٤٠٥.)

(٣٤) سيدمحمدرضا ابن الرسول، تأثير فرهنط عربى در غزل فارسى، .....، ص٤٥.

(٣٥) سيروس شميسا، كليات سبك شناسى،...،ص٦٥.

(*) بۆ نموونە: (تنور لاله چنان برفروخت باد بهار    كه غونچه غرق عرق گشت و گل به جوش آمد) (حافظ شيرازى)

(شبنم نكرد داغ دل لاله را علاج    نتوان به گريه شست خط سرنوشت را) (صائب تبريزى)

(٣٦) أ.كبلوتى قندوز، مصادر الصورة الشعرية عند شعراء المدينة في عصر الجاهلي، مجلة ابوليس، جامعة محمد شريف مساعدية، سوق اهراس، الجزء٢، عدد١، ٢٠٠٨، ص٢١٧.

(٣٧) احمد بن عمر بن على نظامى سمرقندى، ضهار مقالة،...، ص١٨.

(٣٨) هەمان ژێدەر،ص٢٩٩.

(٣٩) زهرا پارساپور. بررسى ارتباط انسان با طبيعت در شعر، مجلة ادب فارسى، دورة ،٢ شمارة ١، بهار -تابستان ١٣٩١، شمارة ثياثى٩، ص٧.

(٤٠) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص٧٩.

(٤١) هەمان ژێدەر، ص٤٦.

(٤٢) عبدالستار احمد فراج، نديم الخلفاء، الطبعة الثانية، دار المعارف، قاهرة، بدون سنة، ص٨.

(٤٣) هەمان ژێدەر، ص١٨- ١٩.

(٤٤) ميلاد جعفرپور. مبهمات عناصر اشرافى در اشعار منوچهرى دامغانى، پژوهشنامه فرهنگ و ادب، شماره سيزدهم، سال هشتم، بهار و تابستان ١٣٩٣، ص١٤٥- ١٤٦.

(٤٥) نادر وزين پور.مدح داغ ننگ بر سيماى ادب فارسى،...، ص٥٠- ٥١.

(٤٦) حسين رزمجو.نقد و نظرى بر شعر گذشته فارسى از ديدگاه اخلاق اسلامى، انتشارات دانشگاه فردوسى، جلد دوم، مشهد، ١٩٩٣، ص٢٩.

(٤٧) لجنه من الادباء، الوصف، الطبعة الثالثة، دار المعارف، قاهره، بدون سنه، ص٨٥.

(٤٨) حسين رزمجو.نقد و نظرى بر شعر گذشته فارسى از ديدگاه اخلاق اسلامى،...، ص٦٧.

(٤٩) هەمان ژێدەر، ص٧٢.

(٥٠) سیروس شمیسا، شاهدبازی در ادبیات فارسی، انتشارات فردوس، تهران، ١٣٨١، ص١٥.

(٥١) محمود حیدری. بررسی تطبیقی صبغة اشرافی شعر عنصری و ابن معتز، نشریة ادبیات تطبیقی، دانشکده ادبیات و علوم انسانی دانشگاه شهید باهنر کرمان، سال ٨، شماره ١٥، پاییز و زمستان ١٣٩٥، ص٩٢- ١١٠.

(٥٢) محمد رضا شفیعی کدکنی، صور خیال در شعر فارسی،...، ص٣٠٠- ٣٠١.

(٥٣) https://fa.wikipedia.org ویکیپیدیا، ٢٠١٧، همجنسگرایی،

(٥٤) سیروس شمیسا، شاهدبازی در ادبیات فارسی،...، ص١٤- ١٥.

(*) گەلەك ڤەكۆلەرێن عەرەب سەرهلدانا ڤێ دیاردەیێ د شعرا كلاسیكییا عەرەبیدا ددەنە بال كاریگەریا فارسان، ئەڤە ل وی دەمی كو ڤەكۆلەرێن فارس ژی سەرهلدان و گەشەكرنا وێ ددەنە بال تەڤلیهەڤبوونا فارسان لگەل توركان، یانكو ب دەربڕینەكا هەر ئێك هەولددەت بەلاڤبوونا ڤێ دیاردەیێ بدەتە بال نەتەوەیەكێ دی.

(٥٥) سیروس شمیسا، شاهدبازی در ادبیات فارسی،...، ص٣٠.

(٥٦) عزالدین اسماعیل. في الادب العباسي، بیروت، ١٩٧٥، ص١٩٢.

(٥٧) حسین رزمجو.نقد و نظری بر شعر گذشته فارسی از دیدگاه اخلاق اسلامی،...، ص١٤٧.

(٥٨) هەمان ژێدەر، ص١٤٧- ١٤٨.

(٥٩) سیروس شمیسا، شاهدبازی در ادبیات فارسی،...، ص ٣٧- ٣٨.

(٦٠) هەمان ژێدەر، ص ٣٩.

(٦١) محمد رضا شفیعی كدكنی، صور خیال در شعر فارسی،...، ١٣٨٣، ص٣٠٦.

(٦٢) سیروس شمیسا، شاهدبازی در ادبیات فارسی،...، ص٧١.

(٦٣) محمد رضا شفیعی كدكنی، صور خیال در شعر فارسی،...، ص٩٠- ٩١.

(٦٤) هەمان ژێدەر، ر،ص٧٩.

(٦٥) نادر وزین پور.مدح داغ ننگ بر سیمای ادب فارسی،...، ص٨٣.

(٦٦) ئیبراهیم ئەحمەد شوان، قادر لە ڕوانگەی شیعرەكانی مستەفا بەگی كوردییەوە، گۆڤاری كاروان، ژمارە:١٩٩٩،١٣٦، ل١٣٦.

(٦٧) سیروس شمیسا، شاهدبازی در ادبیات فارسی،...، ص١٤.

(*) (سیروس شمیسا) دبێژیت کو مەبەست ژ (سەبزە) یان (خەتی سەبزە) ڕهێن کورێن سنێلەیە لێ چێدبیت هندەك جاران ژی مەبەست پێ سمبێل یان ڕیهـ و سمبێل پێکڤە بن

(٦٨) هەمان ژێدەر، ص٥١.

(٦٩) حمد النیل محمد الحسن إبراهیم، أثر الحرب في تشکیل الصورة الأدبیة،( ) مجلة جامعة أم القری لعلوم الشریعة واللغة العربیة وآدابها، جزء١٩، عدد٣١، رمضان ١٤٢٥هـ، ص٦٣١.

(٧٠) هەمان ژێدەر، ص٦٣٢.

(٧١) هەمان ژێدەر، ص٦٣٨.

(٧٢) هەمان ژێدەر، ص٦٤٤.

(٧٣) هەمان ژێدەر، ص٦٤٦- ٦٤٨.

(٧٤) شبلی نعمان.شعر عجم یا ادبیات منظوم ایران،...، ص١٢٩- ١٣١.

(٧٥) محمد رضا شفیعی کدکنی، صور خیال در شعر فارسی،...، ١٣٨٣ص٣٠٤.

(٧٦) هەمان ژێدەر، ص٣٠٦.

* پلەیەکا سەربازی بوویە ل سەردەمێ غەزنەویان.د پلەیێن سەربازییێن ڤی سەردەمی دا، پلا سەرهەنگیێ پشتی پلا سالاریێ دهێت، واتە سەرهەنگ ڕێنماییێن سالاری جێبەجێ دکەت. ژمارا چەکدارێن بن دەستەلاتا سەرهەنگی د ناڤبەرا سەد هەتا پێنج سەد کەسان بوویە.بۆ زانیارییێن زێدەتر بنێرە (حسن زاده، اسماعیل. ساختار و عملکرد سپاه غزنویان، پژوهشنامه علوم انسانی، دانشگاه الزهراء، شماره٥٢، ١٣٥٨ه.ش، ص١٢٣.

(٧٧) سیروس شمیسا، شاهدبازی در ادبیات فارسی،...، ص٤٤.

(٧٨) محمد رضا شفیعی کدکنی، صور خیال در شعر فارسی،...،ص٣١٣.

(٧٩) میرجلیل اکرمی.کارکردهای بلاغی عناصر دیوانی در غزل فارسی از قرن ششم تا هشتم با تکیه بر غزلیات شاعران برجسته، نشریه زبان و ادب فارسی، دانشکده ادبیات، دانشگاه تبریز، سال ٦٩، شماره:٢٣٣، بهار و تابستان ٩٥، ص٥.

* دیارە لگەل بورینا دەمی ئێدی گەلەك جاران پەیڤا تورك ب ئاوایەکێ مەجازی بۆ مەعشوقان هاتییە بکارئینان

(*) هەر ئەڤ شعره د دیوانا (مەستووره)ییدا ژی هەیە، بنێره: (مەستووره (دیوان)، لێکۆلینەوه:محەمەد عەلی قەرەداغی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠١١، ل٢٧) .

(٨٠) سیروس شمیسا، شاهدبازی در ادبیات فارسی،...، ص٤٠- ٤٤ .

(٨١) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص١٣٣

(٨٢) نبيل رشاد نوفل.العلاقات التصويرية بين الشعر العربي و فن الاسلامي،...، ص٧٢-٧٣.

(٨٣) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص١٦٠.

(٨٤) هەمان ژێدەر، ص١٦٢ .

(٨٥) محمد عيد.قضايا معاصرة في الدراسات اللغوية و الادبية،...، ص١٢٤-١٢٥.

(٨٦) احمد قربانى.نقد ادبى يا اعدام ادبى،...، ص٨-٩.

(٨٧) سیروس شمیسا، درمعرفت شعر (گزیده المعجم في معايير اشعار العجم)،...، ص١٨٨ .

(*) بۆ نموونە: ( اى صنم ماهروى،خيز به باغ اندر آى

زانكه شد از رنگ و بوى باغ بسان صنم)...(منوچهرى دامغانى)

(**) بۆ نموونە: ( عروس باغ را مشاطه باغ صبا

هر نفس مى افكند در سنبل مشكين شكن)... (خواجوى كرمانى)

(*) بۆنموونە: (سحر العيون النجل مستهلك

لُبّى وتوريد الخدود الملاح )...(البحترى)

(عراقى از دل و جان آن زمان اميد بريد

كه چشم جادوى تو چين در ابروان انداخت)...(عراقى)

(٨٨) ستاری پیرداود.خوێندنەوەی میتافۆر، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠١٠، ل٦٦.

(٨٩) محمود عباسى. بررسي انواع استعارة در غزليات حافظ شيرازى بر مبناى زبانشناسى شناختى، مجلة علوم ادبى، سال٦، شمارة٨، زمستان ١٩٩٥، ص١٦٤-١٦٦.

(٩٠) وحيد صبحي كبابة، الصورة الفنية في الشعر الطائيين بين الانفعال و الحس،...، ص٨.

(٩١) سيسل دى لويس.الصورة الشعرية،...، ص٢٧.

(٩٢) حسين آقا حسينى و عباس نيكبخت.جايگاه استعاره در غزل سبك عراقى، نشريه ادب و زبان دانشگاه شهيد باهنر كرمان، شماره ٣٠، زمستان ١٣٩٠، ص٢٦.

(٩٣) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص٢٦٦.

(٩٤) هەمان ژێدەر، ص١١٩.

(٩٥) ادونيس، الشعرية العربية،...، ص٧٦.

(٩٦) عبدالفتاح محمد احمد.شيوهاى اسطورهاى در تفسير شعر جاهلى، ترجمه:نجمه رجايى، مشهد، ١٣٧٨ه.ش، ص١٤٩.

(٩٧) عصام القصبجي، اصول النقد العربي القديم،...، ص١٦٩-١٧٠.

(٩٨) نبيل رشاد نوفل، العلاقات التصويرية بين الشعر العربي و فن الاسلامي،...، ص٨٤.

(٩٩) داود سلوم، مقالات في تاريخ النقد العربى،...، ص٢٢٣.

(١٠٠) سيروس شميسا، بيان و معانى ، انتشارات فردوس، چاپ هشتم، تهران، ١٣٨٣، ص٦٦- ٦٧.

(١٠١) جميل حمداوي، انواع الصورة، html.http://www.almothaqaf.com/qadaya

(١٠٢) سيروس شميسا، بيان و معانى،...،ص٦٦.

* بۆ نموونە: (خشت زير سر و بر تارك هفت اختر پاى دست قدرت نگر و منصب صاحب جاهى)...(حافظ شيرازى)

(**) بۆ نموونە: (به زبان صراحى و لب جام

هاتف صبح را جواب دهيد)...(خاقانى شروانى)

(***) بۆ نموونە: (زمين مرده و ابر گريان بر او

صبا كرده باردگر جان در او)...(سعدى شيرازى)

(*) بۆ نموونە:( چو گل در مهد آمد بلبل مست

به پيش مهد گل نعرەزنان شد)... (عگار نيشابورى)

(١٠٣) على شلشل، في العالم الشعر، دار المعارف، قاهره، بدون سنه، ص١٢٣.

(١٠٤) ارشيبالد مكليش، الشعر و التجربه،...، ص٦٧- ٦٨.

(١٠٥) هەمان ژێدەر، ص٨٨- ٩١.

(١٠٦) محمد رضا شفيعى كدكنى، صور خيال در شعر فارسى،...، ص١٦.

(١٠٧) تيزفتيان تودوروف.الادب و الدلاله...، ص١١٤.

